ناوی کتێب: خوێندەواری ڕێگەیەکی سەخت و درێژ لە کوردستاندا
نووسینی: غازی حەسەن
بڵاوکراوەی ئاراس - ژمارە: ٨٠٩
هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری + شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر - ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٦٨٣ی ساڵی ٢٠٠٨ی
دراوەتێ

ئەو دەوڵەتانەی کەلایەنن لە پێکهاتنەکەی ئێستادا، بڕیاری مافی هەر تاکێك لە خوێندەواریدا دەدەن و لەگەڵ ئەوەدان کە ڕۆشنبیری بەرەو گەشەکردنێکی هەموو لاگرێ کەسایەتیی مرۆڤایەتی و بۆ هەستکردن بەکەرامەتی ئاراستە بکرێت و هێزی ڕێزگرتن و مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنچینەییەکانی پتر بکا، هەروەکو لەگەڵ ئەوەشن کە ڕۆشنبیری توانا بە هەموو کەسێك بدا کە بەشێوەیەکی کاریگەر لەکۆمەڵگایەکی ئازاددا، بەشداری لە یەکتر گەیشتن و لەیەکتر بوردن بکات و لە دۆستایەتیی نێوان هەموو نەتەوەکان و توخم و ڕەگەزی یان ئایینیدا بەهێزبکات ببێتە پشتیوانی چالاکیی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆپاراستنی ئاشتی پشت ئەستوور بکات.

بەندی ١٣ی پێکهاتنی نێو دەوڵەتی.

# باری گشتیی خوێندەواری

بەشێوەیەکی گشتی باری ڕۆشنبیری لە خوارووی کوردستاندا لە پاش لەناوچوونی ئەمارەتی بابان هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی وەکو بەشەکانی تری کوردستان لەچاو وڵاتانی تردا زۆر دواکەوتوو بووە و حکوومەتی عوسمانی و ئێران کە بەجووتە دەستیان بەسەر کوردستاندا گرتبوو و هیچ جۆرە بایەخێکیان بەخوێندەواری لەناو میللەتی کوردا نەداوە و هەوڵیان دەدا هەر تەقەلایەك لەو ڕووەوە پووچەڵ بکەنەوە. سالمی شاعیر لەو شیعرەیدا کە بۆ وەڵامی شیعرەکەی (نالی)ی وتووە، باسی ئەو سەردەمەی ناوچەی بابانی داگیرکراوی کردووە کە چۆن کەوتووەتە ژێر باڵی ڕەشی عوسمانلییەوە و خوێندەواری و ڕۆشنبیری پشتگوێ خراوە.

وەکو چۆن لە دوای ڕووخانی ئەمارەتی بابان بەدەستی عوسمانلییەکان ئیتر خوێندەواری کەوتە کزی و شوێنی خوێندن و فێرگەکان بێ ناز مانەوەو سەرپەرشتیکەرێکی خەمخۆر و دڵسۆز و دەسەڵاتداری ئەوتۆ نەبووە کە پەرە بە خوێندن بدات، هەر بەو جۆرەش لە کوردستانی ئێراندا ، ڕووخاندنی ئەمارەتی ئەردەڵان، خوێندەواری و شوێنی خوێندگاکان لاواز بوون و مایەوە سەر تاکولۆکە هەرکەس بەجیا مشووری خۆی و منداڵی خواردووەو خوێندن و خوێندەواری لەناو چەند کەسێکی کەمدا ماوەتەوەو شێوەی (گۆران) کە شێوە زمانێکی ڕەسمیی ناو میرنشینی ئەردەڵان بوو، وردە وردە بەکارهێنانی کەم بووەوە. بەڵام لەدوای شۆڕشی مەشرووتە لە ئێران و تورکیادا، کوردیش لە هەردوولا کەوتنە خۆ و هەندێك لەو کوردانەی تورکیا کە پەیوەندییان بەناوچەی ژووری خۆرئاوای ئێرانەوە بووە و شێوەی زمانەکەیان لەگەڵ هەندێك ناوچەدا لەیەك چووە، توانیویانە لەناو هەندێك شاردا چالاکییەکی ڕۆشنبیری و خوێندەواری بنوێنن.

لەکۆتاییی سەدەی پێشوو بەم لاوە لە خوارووی کوردستاندا روشدی موڵکی و روشدی عەسکەری کە لە سلێمانی لە ساڵی ١٨٩٣ز. کراوەتەوە. گیانێکی تازەی بەخشیوە بەناوچەکەو ژمارەیەك خوێندەوار لە (ئەرێ بابە)ی ناو مزگەوتەکان ڕزگاریان بووەو بەمنداڵی چوونەتە ئەو قوتابخانەیە لەدوای چەند ساڵێك لەوانەیە ژمارەیەك ئەفسەر و خوێندەواری ڕۆشنبیر پێ گەیشتن کە توانییان لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی ڕۆڵێکی

ئاشكرا ببينن (ڕوشدی عەسكەری سەعيد پاشای خەندان لە سلێمانی دای نابوو). خوێندن لەشوێنەكانی تر جگە لە لەم دوو قوتابخانەیە، بريتی بوون لە خانەقا و ژووری مزگەوتەكان كە چەند مەلايەكی زيروك و وريا و چەند شاعيرێكيان تيادا هەڵكەوتووە.(١)

بەهۆی نالەباريی باری ئابووری و كۆمەڵايەتی دواكەوتوويی دەستڕۆيشتوان و داگيركەرانی كوردستان، دواكەوتنێكی هەمە لايەنە كوردەواريی داگرتبوو، رووخانی ئيمارەتەكان و گەڕان بەدوای خوێندن لە مزگەوتەكاندا ئەركی خوێندنی قورس كردبوو، بەڕێژەيەك كوێرەوەری دواكەوتن زاڵ بوو، لە چەند سەدەيەكدا بەقەد ژمارەی پەنجەكانی هەردوو دەست خوێندەوار و كەسانی ديار دەدۆزيتەوە، كە ئەمە كارەساتێكی گەورەيە، هەروەها ئەو تاقە سوارەی بەكۆششی خۆی فێری خوێندن بووە، نەيتوانيوە ببێتە قوتابخانە و بنكەيەكی ميللی بۆ بڵاوكردنەوەی خوێندەواری. ڕووخانی ئيمارەتەكانی بۆتان و ئەردەڵان و بادينان و سۆران و بابان كاريگەرييەكی زۆريان لەسەر وەستانی خوێندەواری و زاڵبوونی دواكەوتن بەجێ هێشتووە.

دوای ئەو سەرهەڵدان و گۆڕانكارييانەی لە سەرەتای سەدەی بيستەم لەناو دەسەڵاتی داڕزيوی عوسمانيدا پەيدابوون، ئەستەمبۆڵ بووەوە كۆی دياری خوێندەوارانی كورد. لە كاتی ئەو كەفوكوڵەدا ژمارەيەك لە كوردی ڕۆشنبير لەوانەی لە سوپای عوسمانليدا بوون يا فەرمانبەر بوون يا قوتابيی ناو قوتابخانەكان، يا كاسب و بازرگان بوون. دەستيان كرد بە كردنەوەی قوتابخانەی كوردی بۆ فێركردنی منداڵان و كۆمەڵ و ڕێكخراوی سياسی و كۆمەڵايەتی و ڕۆشنبيری هاتنە كايەوە و توانييان لە كۆ بوونەوە و كۆنفراس و كۆنگرەكاندا دەورێكی گرينگ ببينن.

لە خوارووی كوردستاندا لە زەمانی ئەمارەتی بابان و لەدوای ڕووخانی گەلێك زاناو خوێندەوار هەبوون، وەكو محەمەد ئيبن حاج و مەولانا خاليدی نەقشبەندی و شێخ مارفی نۆدەهی كە لە قامووسێكی كوردی عەرەبيدا، كە بەشيعر بۆ كاك ئەحمەدی كوڕی داناوە بەناوی ئەحمەدييەوە بۆ ئەوەی فێری عەرەبيی بكات، و مەلا عەبدورەحمانی نووشەيی و مەلا مەحموودی دێلێژەی باوكی مەلای چاوماری بەناوبانگ و، كاك ئەحمەدی شێخ و مەلا سەعيدی زلزلەيی و زاناكانی بيارە و تەوێڵە و جەلی زادە و مەلای گەورە لە كۆيێ، گەلێك زانا لە كوردستانی ئێران كە پەيوەندييەكی زۆريان بەخوارووی

(١)م. ڕەسووڵ هاوار

کوردستانەوە بوو و هەندێك لە زاناکانی مەردۆخی (ناوچەی سنە) هاتوونە ناوچەکانی خوارووی کوردستان و دەوری خۆیان بینیوە وەکو (شێخ بابا عەلی) لە سلێمانیدا(٢).

لەمەڕ نەخوێندەواری و کۆڵەواریی کورد، کە بووەتە هۆکاری دیار بۆ تواندنەوە و لاوازبوونی کەسێتی و پاشکەوتوویی لە ڕووی هۆشیاری کۆمەڵاتی و لاوازبوونی ڕۆشنبیری، م. ڕەسوول هاوار دەبێژێت، «لەسایە و سێبەری ئەو ڕژێمە زۆردارانەی لە تورکیای عوسمانی و ئێرانی قاجاریدا هەبوون، کە شان بەشانیشی سیاسەتی تواندنەوەی میللەتە بچووکەکان بەکاردەهات، بەتایبەتی لە تورکیادا، لەم دۆخەدا کوردە دامەزراوەکان بەرە بەرە نیشانەی نەتەوایەتیی خۆیان لەدەست چوو و لە ناو تورك و فارس و عەرەبەکاندا توانەوە ئەوەی یارمەتیی ئەم سیاسەتەی دەداو وای دەکرد سەر بگرێت دواکەوتوویی کوردە خۆی بوو لە مەیدانی خوێندەواریدا.

ئەوەندە بەسە بڵێین کە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لە هەموو کوردستاندا، کوردستانی تورکیا و ئێران و عێراقدا یەك دانە قوتابخانەی کوردی نەبوو، ئەگەر لەسەر ئەو ژمارەیەی «گاڤان» داوێتی، دەربارەی رادەی خوێندەواریێتی کورد لەم سەردەمەدا کە گوایە کوردەکان لە ئێران ٩٥٪ نەخوێندەوار بوون و لەتورکیا ٩٠٪و لە عێراقدا ٨٥٪ و لەسووریا ٨٠٪ ئەگەر بەپێی ئەم ژمارانە حوکم بدرێ، دەتوانین بڵێین لەسەدەی نۆزدەمدا لەناو کوردەکاندا بەدەگمەن یەکێك دۆزراوەتەوە خوێندنەوە و نووسینی زانیبێت. زۆربەی ئاغا و بەگەکانیش نەخوێندەوار بوون، لەم ماوەیەدا یەك نووسراو بەکوردی دەرنەدەچوو. هەروەها ڕۆژنامەیەکی کوردی نەبوو، بگرە هەتا نووسینێکی تایبەتی کوردی نەبوو، یەکەم پەرتووك بە زمانی کوردی لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٨٩٧دا لە چاپ درا، یەکەم ڕۆژنامەی کوردیش لە ساڵی ١٨٩٨ لە قاهیرە دەرچوو، لەو هەژاری و بێ دەرامەتییەی چینی زەحمەتکێشی تورك و ئێرانی دەیکێشا کورد هەتا لەوەشدا لەوانی پتر دەچێژاو بێ دەرامەتتر بوون(٣).

بۆ یەکەم جار لە ڕۆما (گارزۆنی) کە قەشەیەکی ئیتالییە ساڵی ١٧٨٧ کتێبکی بەکوردی و ئیتالیایی چاپ کردووە. ساڵی ٩٢٠ پێش یەکەم کتێب کە سەرتاپای

---

(٢) م. هاوار

(٣) گۆڤاری برایەتی ژمارە (٩) ساڵی (١) خولی دووەم، سەرەتای کانوونی یەکەمی ١٩٧٠، کتێبی برایەتی و کێشەی کورد ، و دکتۆر کاوس قەفتان. ل١٤

کوردی بێت و بەئەرکی کورد چاپ کرابێت کتێبی ئەنجومەنی ئەدەبیاتی کوردە، کە ئەمین فەیزی بەگی ئەفسەرو ڕۆشنبیر لە ئەستەنبوڵ چاپی کردووە. لە بیستەکاندا (٢٨) کتێب و لەسییەکاندا (١٥٠) کتێب لە (١٩٣٩– ١٩٤٥) تەنیا (٥٢) کتێب چاپ کراوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هەفتەنامەی گوڵان، غازی حەسەن، ڕۆشنبیریی کوردی لە سەدەیەکدا، ژ، (٢٦ ) ٢٠٠٠/١/١٣

لەمەڕ کێشە و ئاستەنگەکانی بەردەم خوێندەواری قسە و باسی زۆر هەن، ئەگەر ئەمە باری سەدەی نۆزدەم بووبێت، بەڵام لە سەدەی وریابوونەوەی گەلان و دروستبوونی چەندین دەوڵەتی تازە، نەتەوەیی کورد بەهۆی زوڵم و چەوسانەوەی سیاسییەوە لە سەرسەختترین قۆناغەکانی دواکەوتن ژیاوە و لێنەگەڕاون بەزمانی زگماکی خۆیە بخوێنێ، ئەو خوێندنەی کە هۆشیاریی نەتەوەیی لاواز کردووە و نەخوێندەواری و کوێرەوەریی زۆری لە کوردستاندا بڵاو کردووەتەوە. (لازاریف) باسی پتر لەسەد ساڵ پێش ئەو سەرنجانە دەکات کە هەندێك ڕۆژنامە نووسی چیکۆسلۆفاکی (میرۆ سلاڤ زیکمۆند) و (نیرژی گانزینگا) باس لە ساڵی ١٩٥٨ دەکەن و ساڵی ١٩٦٢ لەپراگی چیکدا لە کتێبی «کوردستان وڵاتی ڕاپەڕین و ئەفسانە و هیوا» دەنووسن: کورد ئیتر ئەو میللەتە نییە بەزمانی لووس تەفرە بدرێت، بۆیە ئامادەیە ئیش بکات بەڵام نایەوێت بێدەنگ بێت، چۆن بێدەنگ بێت کاتێك باش دەزانێت کەوا نیشتمانەکەی کەوتووەتە سەر گۆمێکی بێ سنوور لە ئاڵتوونی ڕەش، کە تەنیا تا ساڵی ١٩٥٠ سێسەد ملیۆن تەن نەوتی لێ هەڵنجراوە، کەچی ئەمیش تا ئێستا لەسەر لووتکە شاخەکانییا تاریکیی شەوە زەنگ هەروەك سەردەمی کاوەی ئاسنگەر بەچراوگە دەڕەوێنێتەوە».

کورد تەنیا گیرۆدەی تاریکیی شەوە زەنگ نییە، لەویش زیاتر بەدەست تاریکیی نەخوێندەوارییەوە دەناڵێت هەر (٤٠) هەزار کورد لە تورکیادا قوتابخانەیەکی سەرەتاییان بەردەکەوێت، کورد بێدەنگ نابێت، ئیش دەکات و لە کۆڕی ئیش پیاوی نەمری وەك نەجمەدین مەلا دروست دەکات[٤].

لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ئەمریکییەکان هاتوونەتە کوردستان، کاری بڵاوکردنەوەی فکری دینییان گرتۆتە ئەستۆ، لە (وان، خەربوت، بتلیس، دیاربەکر،

---

(٤) گۆڤاری برایەتی ژ(٦) ساڵی (١) خولی دووەم، تشرینی یەکەمی ١٩٧٠، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان وڵاتی ڕاپەڕین و ئەفسانە و هیوا. ل١٧.

میردین، مووش) و ناوچەکانی تر کاریان کردووە و ئامانجیان پاڵپشتی ئەرمەن بوو. کورد ئەم نیازەیان زانیبوو. چاپخانەیان لە (ئەنتاکیە) هەبوو، (١٦٠٠) کتێبی دینییان بە کوردی چاپ کرد. ساڵی (١٨٧٨) قوتابخانەیان لە خەرپوت بەناوی (کولیژا فراتێ) کلیەی فرات کردەوە. تەنیا ئەرمەنییەکان تێدا دەیانخوێند و بە ئەرمەنییش بوو، ساڵی (١٩٠٨) بڕیاریان دا قوتابیی کوردیش تێدا بخوێنێت، بەڵام ئەرمەنییەکان ئەمەیان رەفز کردەوە، لە شاری (تارسوس) قوتابخانەیەکیان بەناوی (ئامۆژگاریی عزیز باقلوس) کردەوە، قوتابیی کوردیش ساڵانی (١٩٠٢ – ١٩٠٣) دەچوونە ئەم قوتابخانەیە بۆ خوێندن.(٥)

عوسمانییەکان ساڵی ١٨٦٥ یاسای بەڕێوەبردنی وڵاتی ژێر دەستیان لە عێراق داناو لەسەر شێوەی ویلایەت و سنجاق و ناحیە، کارەکانیش لە ڕێگەی ئەنجومەنی ویلایەت کە «والی» سەرۆکایەتیی دەکرد، بەڕێوە دەچوون، لەو سەردەمەدا سێ ویلایەت مووسڵ و بەغدا و بەسرە هەبوون کە هەریەك لەوانەش ژمارەیەك «سنجاقی» یان بەسەرەوە بوون.

تا ساڵی ١٨٨٣ هیچ جۆرە دەزگایەکی پەروەردەیی لە بواری پەروەردە و مەعارف لە عێراقدا نەبووە، ئەو ساڵە لە ویلایەتەکان ئەنجومەنی مەعارفی دامەزراو ئەوانەش سەر بەدیوانی وەزارەتی مەعاریفی باڵا بوون. یەکەم ئەنجومەنی مەعاریفی لە ولایەتی بەغدا ساڵی ١٨٨٤ دامەزراو دواتر لە سەر هەمان شێوە لە ویلایەتی مووسڵ و بەسرەش دامەزراو لیژنەی مەعاریفیش لە هەندێك سنجاق دامەزرا(٦).

ئەنجومەنی مەعاریف پتر بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان و بەشێوەیەکی نەگونجاو ڕێك خرابوو، دەوڵەتی عوسمانی زۆر سوور نەبوو لەسەر پەرەپێدانی ڕۆشنبیری لە عێراق و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری، کەسانی لاواز کەوتبوونە ناو ئەنجومەکانی مەعارف و هەندێکیان هەر تەنیا کەسایەتیی دیاری ویلایەتەکە بوون و بۆ ڕێکخستن و پەیوەندی بەئەنجومەنی مەعاریف لەلایەن حکوومەتەوە دامەزرێنرابوون.

خوێندن لەو سەردەمدا بەم شێوەیە بوو: خوێندنی سەرەتایی و ڕوشدیە (ناوەندی)

---

(٥) حنان عیسی الجبوري مشكلات ادارة المدرسیة الثانویة في العراق، بغداد، مطبعة الارشاد، ١٩٧٠، ل٦١.

(٦) گولان العربي، ژ (٢٩) تشرینی یەکەمی ١٩٩٨، الکتشاف امریکا من قبل الکورد (١٩١٥– ١٩٣٠) ڕۆهات ئالاکوم – ترکیا، ترجمة عبدالحمید سعید.

قۆناغی دووەم ئامادەیی و (سلطانیە) بووەو لە سێیەم قۆناغیشدا خوێندنی باڵا هەبوو. بەمەرجێکیش قوتابخانەی سەرەتاییان لە گەڕەك و گوندەکاندا دەکردەوە، کە ژمارەی خانووەکانی لە (٥٠٠) پتر بووایە. لە شارۆچکەکانیش ئەگەر (٥٠٠) خانوو هەبووایە قوتابخانەی روشدیە (ناوەندی) یان دەکردەوە، جا دانیشتووانەکەی موسڵمان بوونایە، یاخود نا. خوێندن لە قۆناغی سەرەتایی و ڕوشدیە لە (ناوەندی) ٤ ساڵ بووە و بەهەردووکیان دەیکرد ٨ ساڵ(٧).

ئەمە ڕێگر بووە لەبەردەم درەنگ کرانەوەی قوتابخانە و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری چ لە عێراق بەگشتی و چ لە کوردستان بەتایبەتی، دەبێت ئاماژە بەوە بکەین لەو سەردەمەدا کوردستان وەکو وڵاتێکی دواکەوتووی سیستمی دەرەبەگایەتی و خێڵەکی بەسستی بەرەو خوێندەواری و خوێندن دەچوو، هەروەها لە ئاکامی دواکەوتن و قورسیی باری ژیان و مەمرە و مەژیی خەلکەکەی و باجی زۆری دەسەڵاتدارانی عوسمانی داهێزرانێکی مەرگ هێن بوو، کە ئەمانە دەبوونە ڕێگر لەبەردەم چوونە بەر خوێندن و کرانەوەی قوتابخانە ڕەسمییەکانی، دەسەڵاتی ناوخۆییی سەرەك خێڵەکان و پەیوەستبوونی جوتیار و ڕەنجبەر و وەرزێریَ نەدار بەزەوییەوە، دەرفەتی خوێندنی گەلێك بەرتەسك کردبۆوە، چونکە لەو سەردەمەدا دەبووایە خەرجیات و پێویستیی قوتابخانە سەرەتاییەکان لە لایەن خەڵکی گەڕەك و گوندەوە دابین بکرێ، خوێندنی ڕوشدیەش لەلایەن سندووقی مەعاریف دابین دەکرا. ئەگەر قۆناغی یەکەمی خوێندنی سەرەتایی و ڕوشدیە بە خۆڕایی بووایە، وەلێ دەبووایە لە قۆناغی خوێندنی ئامادەیی و پەیمانگا (سلطانیە) و باڵا قوتابی کرێیەکی سادەی دەدا (٨). ئەمەش دەبووە باجێکی تری قورسی سەر شانی خەڵکەکە.

خوێندنی ئامادەییش لەهەر شارو شارۆچکەیەکدا دەکرایەوە، کە ژمارەی خانووەکانی لە (١٠٠٠) هەزار پتر بووایەن و لە سندووقی مەعاریف پارەکەی خەرج دەکرا، ئەوانەی

---

(٧) هەمان سەرچاوە، ل٦٢ بەپێی زانیارییە تۆمارکراوەکان، یەکەم وەزارەتی مەعاریف لە دەوڵەتی عوسمانی دوای چاکسازییەکانی هێڵی گلخانە ساڵی ١٨٣٩ دامەزراوە، ساڵی ١٨٦٩ سیستەمی مەعاریف گشتی دەرچووە، بەم پێیە سیستەمی مەدەنی تەواو بۆفێربوونی ڕەسمی سەربەدەوڵەت دامەزراوە. د.عبد الفتاح عەلی بۆتانی، مدرسة ١١ آذار اول مدرسة كوردية في مدينة الموصل الطبعة الاولى ١٩٩٩، ص٢٥

(٨) هەمان سەرچاوە ل٦٤.

لێیان دەخوێند خاوەنی بڕوانامەی ناوەندی بوون، سێ ساڵ تێیدا دەخوێندرا، لە قۆناغی (سلطانیە)ش بەدوو قۆناغ خوێندن تەواو دەکراو دوو هۆبەی هەبوو. هۆبەی یەکەمیان پێی دەگوترا (هۆبەی خوێندنی باڵا) سێ ساڵ، یا چوار ساڵ تێیدا دەخوێندرا و دەرچووی ئامادەیی وەردەگرت. هۆبەی دووەمیش ناوی (گشتی) بوو، سێ ساڵ تێیدا دەخوێندراو دەرسەکانی قۆناغی ئامادەیی بەشێوەیەکی سادە تێیدا دەخوێندران.

لە خوێندنی باڵا یا (قوتابخانەی باڵا)دا، کە مەبەستیان خانەی مامۆستایان و خانەی هونەر و سەرجەم قوتابخانە هونەری و پیشەییەکان بوو، ئامانجی پێگەیاندنی مامۆستای سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی بوو، لە ناوەندی هەر ویلایەتێك خانەیەکی مامۆستایان کرایەوە و دەرچووی ناوەندیی وەرگرت، خوێندن بەزمانی تورکی بوو، زۆربەی مامۆستایانیش تورك بوون، ئەمەش وای دەکرد کە قوتابی لەدەرسەکان نەگات(٩) و نەشتوانێت بەزمانی زگماکی خۆی بخوێنێت.

کوردستان لەو کاتەدا پێك هاتبوو لە ویلایەتی مووسڵ و کەرکووك و هەولێر و سلێمانی، ڕاستە قوتابخانە لە سەردەمێکی زووی دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە مووسڵ دامەزراوە، بەڵام بەهۆی دواکەوتنی دەسەڵاتی عوسمانییەوە و بارودۆخی سیاسیی ئەوکات قوتابخانە لە ویلایەتی مووسڵدا بڵاو نەبووتەوە، یەکەم جار ساڵی ١٨٦١لە سەردەمی کەنعان پاشا قوتابخانەی ڕوشدیە لە مووسڵ کرایەوە، تا ساڵی ١٨٩٠ یەك قوتابخانەی ڕوشدیە و یەك قوتابخانەی سەرەتایی هەبوون.

لەساڵی ١٨٩٤یش قوتابخانەی (روشدیە) لە سنجاقەکانی سەر بەویلایەتی مووسڵ بەم شێوەیە کرایەوە.

قوتابخانەی ڕوشدیەی کوڕان لە هەولێر، ژمارەی قوتابییەکانی (٢٩) بوو، قوتابخانەی ڕوشدیەی کوڕان لە ڕواندز ژمارەی قوتابییەکانی (٣٠) بوون، هەروەها قوتابخانەی ڕوشدیەی کوڕان لە سەلاحیە کە ژمارەی قوتابییەکانی (١٩) و قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری لە سلێمانی ژمارەی قوتابییەکانی (١٣٨)کەس بوو.

ساڵی ١٨٩٥ قوتابخانەی ڕوشدیە لە مووسڵ گۆڕا بۆ قوتابخانەی (ئامادەیی مەلەکی) بەپێی ساڵنامەی ١٣٢٥ کۆچی، ژمارەی قوتابییەکانی ئەم قوتابخانەیە گەیشتە (٢٤) قوتابی و زۆربەی مامۆستاکانیش ئەفسەری تورك بوون بەپلەی (زۆرباش).

---

(٩) هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

سالّی ۱۹۰۸ قوتابخانەی (ئامادەییی مەلەکی) ویلایەتی مووسڵ بەم جۆرە بوو.

– قوتابخانەی ئامادەییی مەلەکی لە مووسڵ (٢٤١) قوتابی.

– قوتابخانەی ئامادەییی مەلەکی لەکەرکووك (١٣٥) قوتابی.

– قوتابخانەی ئامادەییی مەلەکی لە سلێمانی (١٦٣ ) قوتابی.

خوێندن بەزمانی تورکی بوو، هەتا ڕێزمامی عەرەبیش بەتورکی دەخوێندرا، لە سیستمی قوتابخانەکە شێوەیەکی عەسکەری بەسەرەوە بوو، لەو سەردەمدا قوتابی دەبووایە دروشمی (پادشاهم جوق پاشا) بڵێنەوە، سەرباری ئەو سروودە تورکییانە مەدحی سوڵتانیان دەکرد(١٠).

سەبارەت بە خوێندەواری، شاری سلێمانی پێش شارەکانی تر دێت، پێم وایە ئەمەش بۆ دوا ئیماراتی کوردی بگەڕێتەوە کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە لەم شارەدا کۆتاییی پێ هات و هەروەها ژمارەیەکی دیاریش لە زانایانی ناودار لەم ناوچەیە ڕۆڵیان گێڕاوە، ئەمانەش تێکرا بوونەتە ڕێگە خۆشکەر کە مەسەلەی خوێندن و بڵاوبوونەوەی خوێندەوارییش پتر ڕوو لەم شارە بکات (قوتابخانەی روشدیە) پەرە بسێنێت ومەسەلەی ڕۆشنبیری شان بەشانی ڕۆڵی سیاسیی کۆمەڵایەتیی شارەکە، گەشەی کردووە و یەکەم زانکۆی کوردستانیش لەدوای نیوەی سەدەی بیستەم لەم شارەدا دروست کراوە.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر مەسەلەی قوتابخانەیەی روشدیە لە سلێمانی و پایگەکانی گەشەکردنی. لەم شارەدا هەوەڵین قوتابخانەیەك دروست بووبێت قوتابخانەی ڕوشدی موڵکی و ڕوشدی عەسکەری بووە، کە ئەوەی دووەمیان هەندێك پاش یەکەمیان بە تەقەڵای سەعید پاشای خەندان لە ساڵی (١٣١١) کۆچی و ١٨٩٣ زاینی کراوەتەوە. دەورێکی گرینگی بووە وە ژمارەیەکی باشی خوێندەواریە پێ گەیاندووە کە بوون بە ئەفسەر لە سوپای عوسمانیدا پایەی بەرزیان بووە و گەڕاوەنەتەوە کوردستان و دوای شەڕی یەکەمی جیهانی هەندێکیان لە حوکمدارییەکەی شێخ مەحموود هاوکارییان کردووە و هەرچەند ئەوانە لە دواییدا بەهاندان و بەهەڕەشەی ئینگلیزەکان لە شێخ تەکینەوە و چوونە ناو دەزگاکانی عێراقەوە.

تەوفیق وەهبی لە باسی دامەزراندنی مەکتەبی عەسکەری لە بەغدا دەڵێت، لەو پێنج کەسەی کە مەکتەبی عەسکەرییان لە بەغدا داناو خەریکی ڕێك و پێکخستنی کاروباری

(١٠) هەمان سەرچاوە، ل٧٢

سوپای عێراق بوون لە دەست پێکردنیا سێ کەسی لەوانە کورد بوون (یاسین هاشمی و ئەمین و خۆی).هەروەها لە باسی ڕوشدیەی عەسکەری گوتوویەتی( حاجی قلندر) کابرایەکی زۆر زیرەك بووە و باش فەراشی ئەو مەکتەبە بووە، بەڵام کە مامۆستایەك نەچووایەتە پۆلەوە ئەو جێگەی دەگرێتەوە و قوتابییەکان ئەوەندەیان خۆش دەویست خوای ئەوەیان بوو هەموو ڕۆژێك مامۆستایەکیان نەچێتە پۆلەوە. لەمەڕ (ئەمین فەیزی بەگ) دەڵێت، زیرەك و بلیمەتی وامان کەم بووە.

سەرچاوەکان زۆربەیان دەڵێن لەو سەردەمدا خوێندن لە قوتابخانەکاندا بەتورکی بووەو نامەنووسین لەگەڵ یەکتردا بەزۆری فارسی بووە، تاکولۆ کە یەکێکی وەکو کاك ئەحمەدی شێخ کە بەکوردی دەرسی وتۆتەوە لای هەندێك کەس جێگەی ڕەخنە بووەو حاجی قادری شاعیر لە شیعرێکیدا باسی کوردێکی لای خۆیانی کردووە کە لە کۆیەوە چووە بۆ ئەستەنبوڵ و گلەیی لەوە کردووە کە کاك ئەحمەد بەکوردی دەرس دەڵێتەوەو حاجی قادریش بەشیعرە ناسراوەکەی لێی تووڕە بووە و پێی وتووە: «هێشتا لەسەر کەری ماوی: چا بوو مستێکم نەدا لە نێوی چاوی»(١١).

خوێندەواری بەشێوەیەکی گشتی لە کوردستاندا کزولاواز بووە، لەم بارەیەوە مامۆستا م. ر. هاوار وەها باسی خوێندەواری دەکات. بەبیرم دێ هەتا سەردەمی منداڵی ئێمەش لەشوێنێکی وەکو شاری سلێمانی هەندێك جار یەکێ: ئەگەر نامەیەکی لەشوێنی دوورەوە بۆ بهاتایە، یا خۆی نامەیەکی بنووسیایە گەڕەکاو گەرەك دەگەڕا بەشوێن خوێندەوارێکدا کە نامەکەی بۆ بخوێنێتەوە یانامەیەکی بۆ بنووسێت(١٢).

گومانی تێدا نییە لەو کاتدا کوردستانی باشوور خەریکی بووژاندنەوەیەکی باش بوو، کوردەکان سەرەتا لە ئەستەمبوڵ دەستیان بەبووژانەوە کرد، خەریکی کردنەوەی قوتابخانە بوون. (کۆمەڵەی نەشرو مەعاریفی کورد) قوتابخانەی کوردیی کردەوە، خەلیل خەیالی دەست بەکاربوو، عەبدوڕەحمان بەدرخان بەهەمان شێوە. لە بەشەکانی تری کوردستان سەرکوتی شۆڕشی کورد دەکرا، لە باشوور ڕۆژنامە بەزمانی کوردی دەردەچوو، حکوومەتی کوردی دامەزرا، سلێمانی لە بووژانەوەی ڕۆشنبیریدا بوو.

خوێندەوارانی کارتێکراو بەجموجۆڵی ئەستەمبوڵ و ئەورووپا دوای گەڕانەوەیان

---

(١١) م.ر. هاوار – بەرگی یەکەم.

(١٢) هەمان سەرچاوە.

کەوتنە کار، کەچی هێشتا لە شارێکی وەکو سلێمانی خوێندەوار بۆ نووسین و خوێندنەوەی نامە و چنگ نەکەوتووە، مستەفا پاشا یاموڵکی کە خاوەنی ڕۆژنامەی (بانگ کوردستان) و(جەمعیەتی کوردستان)و وەزیری مەعاریفی حکوومەتی کوردستان بوو، لە ژمارەی (١)ی (بانگ کوردستان) دەڵێت: «پارچە کاغزی کە بۆ نوشتە چەورو شیرین بن، اویش لە فرنگستانەوە، دین، لە صدا چوارمان تیا نیە کە کاغەزی کس بۆ کس و کاری شریکی محرمی بو عائلەی خۆی بنوسی»[١٣] یانی کەمتر(٤٪) خەڵك لەو سەردەمەدا خوێندەوار بوون و دەست و خەتیان هەبووە، کە ژمارەیەکی کەمیش توانیویەتی بەکوردی بخوێنێت و بنووسێت، چونکە خوێندن بەکوردی نەبووە، ئەوەی بەکوردیشی خوێندووە و دەرسی گوتووەتەوە، کەوتووەتە بەر لۆمەی دواکەوتووان ڕەخنەیان لێ گرتووە.

لە تەك ئەوەی هەندێك هاتنەوە کوردستان و کۆشایان، ژمارەیەکیش نەهاتنەوە سلێمانی و ئەو ژمارەیەش هاتنەوە بۆ هاریکاریی دەسەڵات نشینی شێخ مەحموود کەوتنەوە دڵەڕاوکێ وەکو لە یادداشتەکانی قەدری جەمیل بەگ و بلەج شێرکۆ هەندێك ناویان دێت ئەگەر لەو سەردەمەدا لە خۆیان بباووردایە و ڕوویان بکردایە لای شێخ مەحموود، هەڵوێست لە خوارووی کوردستان دەگۆڕا[١٤].

لەمەڕ ناوچەکانی شێخان هەوەڵین ناوچەکانی دەڤەری بادینان کە لەسەردەمێکی زۆر زوودا عوسمانییەکان قوتابخانەیان تێدا کردۆتەوە، بەنیازی بەرەنگار بوونەوەی بیروڕای خەڵکەکەی و بڵاوکردنەوەی بۆچوون و باوەڕی خۆیان، بۆیە بڕیاریان دا قوتابخانە لە ناوچەکانی شێخان و شەبەك و سارەلو بکەنەوە، بۆ پێگەیاندنی مامۆستایانیش بۆ ئەو ناوچانە، بڕیاری دروستکردنی (قوتابخانەی شێخ عدی) بۆ فێربوون و خوێندنی زانستا بالاکان درا. دەرچووانی مەکتەبە ئەهلییەکانی تێدا قبووڵ کرا. ساڵی ١٨٩٩ لە مووسڵ خانەی مامۆستایان کرایەوە و دوای ساڵی ١٩٠٨ گەشەی پێ درا، لەگەڵ هاتنی سوپای ئینگلیز بۆ مووسڵ ئەم قوتابخانەیە داخرا.[١٥] یەکەم قوتابخانەی نوێ لە شاری مووسڵ ساڵی ١٨٤٠ لەسەر دومینیکانە تەبشیرییەکان

---

(١٣) م.ر. هاوار ل٩٤ بڕوانە ژ (ا) بانگ کردستان ١٩٢٢/٨/٢.

(١٤) هەمان سەرچاوە ل٩٦.

(١٥) حنان عیس الجبوری ل٧٤.

دامەزراوە. دواتر ژمارەیەك قوتابخانەی تر لە شارو گوندە مەسیحییەكانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە دامەزراون، ساڵی ١٨٧٤ لە شاری مووسڵ (١١) قوتابخانەی لەم جۆرە و دە قوتابخانەی تر لە گوندە مەسیحییەكان هەبوون، لە نێویاندا «قوتابخانەی أخوات المحبة» هەبووە، بایەخی بەڕاهێنانی ئافرەتانی مووسڵ لە كاری دەستی و دوورین و نەخش دەدا. لەناو قوتابییەكاندا ئافرەتی موسڵمانیش دەیانخوێند. باسی مێژوو و جوگرافیا و بیركاری دەكرد و زمانەكانی عەرەبی و فەڕەنسی و ئیتاڵی و ئیسپانی دەخوێندران.

یەكەم قوتابخانەی ڕەسمیی عوسمانییەكان لە مووسڵ ساڵی ١٨٦١ دامەزراوە، ئەوەش قوتابخانەیەكی سەرەتایی بووە، لەناوچەی (باب لكش). ساڵی ١٨٩٠ قوتابخانەی رشدیە (ناوەندی). دامەزراوە و ساڵی ١٨٩٤ قوتابخانەیەكی تری سەرەتایی كراوەتەوە، هەمان ساڵیش دائرەی مەعاریف لەم شارە دامەزراوە ساڵی ١٨٩٥یش روشدیە گۆڕاوە بۆ دواناوەندی (مكتب اعدادی ملكی)[١٦].

لەم پێشەكییە خێرایەدا دەبێت ئاماژە بەوەش بكەین كە لە ناوچەكانی بادینان لە تەك خوێندن لە مزگەوت و خوێندنی دینی، خوێندن لە سایەی دەسەڵاتی عوسمانی بەتەواوی پشتگوێ خرابوو، ئەو شوێنە بچووك و بەژمارە كەمانەی تازەش دامەزرابوون، بەكوردی تێیدا نەدەخوێندراو لە چوار سەدە (١٥١٥-١٩١٨) كە ماوەی دەسەڵاتی عوسمانییەكانە لە كوردستاندا خوێندن بایەخی پێ نەدراوە. لە ساڵنامەی موسڵدا لە نێوان (١٨٩٠-١٩١٢) تەنیا ئاماژە بە چەند قوتابخانەیەكی ڕەسمی لە ناوچەی بادینان كراوە. تەنیا ساڵی ١٨٩٤ ئاماژەكراوە كە (١١) قوتابخانەی ئەهلی بۆ منداڵان لە دهۆك (٧) بۆ موسڵمانان و (٢) بۆ مەسیحییەكان ، (٢)ش بۆ جووەكان و تەنیا دەرسی ئاینییان تێدا دەخوێندرا. دواتر ئاماژە بەوە دەكرێت كە لە زاخۆ (كتێبخانە)یەك و قوتابخانەیەكی

---

(١٦) د. عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة «١١آذار اول مدرسة كوردية في مدينة الموصل مع نبذة تأريخية عن التعليم في كردستان - العراق. طبعة الاولى ١٩٩٩ اصدارات جريدة برايەتی، ص٢٦ بەپێی ئەو زانیارییانەی لە كتێبی ناوبراودا هاتوون، ساڵی ١٩٠٥ ژمارەی قوتابخانەی سەرەتایی لەموسڵ (٣٠) قوتابخانە بووە، ساڵنامەی موسڵ ١٣٣٠ كۆچی و ١٩١٢ زاینی دەڵێ: تەنیا(٧) قوتابخانەی كوڕان و كچان لەمووسڵ هەبوون، سەرباری قوتابخانەی ئامادەیی كوڕان و قوتابخانەی ڕوشدیەی كچان و خانەی مامۆستایان. ساڵی ١٩١٠ش ئیتیحاد و تەرەقی قوتابخانەی «مكتب الوطنی»ی بۆ منداڵی هەژاران كردۆتەوە. ص٢٧.

سەرەتـایـی لـە دهـۆك سالّـی ١٩٠٧ کراوە و سالّـی ١٩١٢ش ئـامـاژە بـەوە دەکـات کـە قـوتـابـخـانـەی سەرەتـایـی لـە ئـاکریّ و ئـامێدی و سنـجـارو دهـۆك و زاخـۆ و تـەلـەعفـەر هـەیـە(١٧).

لەم سەرەتایە کورتەدا دەردەکەویّ کە خوێندن لە کوردستاندا زۆر دواکەوتووە، ئەویش کـاریـگـەریـی ڕاستـەوخـۆی لـەسەر پـاشکـەوتـنـی هـۆشیـاری و مـەسەلـەی نـەتـەوەیـی و کوێرەوەریی کۆمەڵگای کوردەواریدا هەبووە. تەنیا کارەساتی نەخۆشیی نەخوێندەواری لە لای ڕۆشنبیر ڕۆشنگەرەکانی کورد هەستی پیّ کراوە، لەشیعر و لە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی «کوردستان ٢ نیسانی ١٨٩٨) و ڕۆژنامە و کۆڤارو داواکارییە سیاسییەکانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم مەسەلەی داواکردنی خوێندن و کردنەوەی قوتابخانە و بایەخدان بە زمانی کوردی بووە.

(١٧) هەمان سەرچاوە. ل٢٨.

# خوێندن بەکوردی.. ڕێگەی یەکەمی داوا نەتەوەییەکانمان

بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی، باری نالەباری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا وەك زۆربەی هەرە زۆری ناوچەکانی تری ئێران و دەوڵەتی عوسمانی گەشتبووە ئاستێك زیاتر لە جاران کۆمەڵانی خەڵك بجووڵێنێت و هەستی نەتەوەییان ببزوێنێت. ئەمە و چەند هۆیەکی تر کارێکی وایان کردبوو ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەی ئەو کەسانەی سەربەخۆیی، یان بەلای کەمەوە خودموختاری (ئۆتۆنۆمی)ی کوردیان دەویست لەزیادبووندا بێت و ئەمە لە پەرەسەندنی هەندێك چالاکیی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خۆی نواند، ئەوە بوو بەر لەشەڕ ژمارەی کۆمەڵ و ڕێکخراوە سیاسییە نهێنییەکانی کوردستان زۆر بوو، تا دەهات سەنگیان لەناو کۆمەڵانی خەڵك و بەتایبەتی ڕۆشنبیراندا پتر دەبوو، ئەم کۆمەڵ و ڕێکخراوانە بەهەر چوارلادا کەوتنە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەو پەخشە(نشرە)ی ئەوتۆ کە پڕبوون لە هەستی نەتەوەیی و رق و کینەی ڕەوا بەرامبەر زۆرو زۆرداریی میری و کاربەدەستانی. یەکێك لەو پەخشانە لەژێر ئەم ناوە پڕمانایەدا بڵاو دەکرایەوە «ئەڤ خۆڵە خۆڵی ئەمەیە» کە بەئاشکرا دژی دەسەڵاتی تورك دەدواو دەیگوت «تورك بە هیچ جۆرێك بەڕێوەبردنی کوردستانیان لەباردانییە»(١٨).

لەتەك دروستبوونی کۆمەڵێك کۆمەڵە و ڕێکخراو وەکو کۆمەڵەی عەزم قەویی کورد و هێزی کوردو کۆمەڵەی هێڤیی کوردو کۆمەڵەی بەرزی و پێشکەوتنی کوردو کۆمەڵەی ئیستخلاصی کوردستان و هتد. بایەخی ڕۆشنبیری و ڕۆڵی ڕۆشنبیری بەدیار دەکەوێت بایەخی خوێندن و پەرەپێدانی زمانی کوردی لە ڕۆژنامەی کوردستانی ٢٢ نیسانی (١٨٩٨)ەوە هاندانی خەڵك بۆ کردنەوەی قوتابخانە و خوێندن و فێربوون هاتە نێو باسانەوە، (قوتابخانە و خوێندن) بەمانای سەردەم و دوور لە مزگەوت و حوجرە و سوود وەرگرتن لە بەرزی و پێشکەوتنی زانست و زانیاریی ئەوان سەردەمدا بە ئامانجی سەرەکی و ڕاستەوخۆی بزاوی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بوو.

د. کەمال مەزهەر گوتەنی یەکێك لە ڕووە هەرە گرنگە نوێیەکانی خەباتی ڕۆشنبیریی

---

(١٨) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا، ١٩٧٥، ل٣٥.

کۆمەڵ و ڕێکخراو و پیاوە سیاسییە ناودارەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان بریتی بوو لە بایەخدان بەبڵاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری لەناو منداڵ و لاوی تازە پێگەیشتووی کوردا لەگەڵ خزمەتکردنی زمان و ئەدەبی گەلی کورد وەك دوو هۆی کاریگەری پاراستن و پەرەپێدانی نەریت و هەستی نەتەوەیی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا.

## عەشیرەت مەکتەبی

سوڵتانەکانی عوسمانی هەر تەنیا بەوە نەوەستان سوارەی حەمیدی بۆ تێکدانی ریزەکانی کورد پێك بهێنن، کە لەکاتی پێویست بۆ دژایەتی ئەرمەن و لێکترازاندنی یەکریزیی کوردان بەکاری بهێنن، کە پێکهێنانی سوارەی حەمیدی یارمەتییەکی زۆری سوڵتانی لە بێ هێزکردن و شێواندنی بزووتنەوەی کورد دا، هەر لەگەڵ پێکهێنانیدا هەندێك قوتابخانەی کوردیشیان کردەوە، منداڵی ئاغاو و سەرهۆزە کوردەکان تیایاندا دەرسی ئاینی و جەنگییان دەخوێند. وایان دانابوو کە لەم قوتابخانەیەدا نەوەیەکی نوێ لەکورە ئاغا و سەرعەشیرەتە کوردەکان پێ بگەیەنن بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ببێتە پاڵپشتی رژێمی دەرەبەگیی سوڵتان و کاروباری سوپایی و ئیداری عەشیرەتەکانیان پێ بسپێرن، هەشت ملیۆن لیرە لە خەزینەی دەوڵەت بۆ دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە تەرخان کرابوو. لە ساڵی ١٨٩٥ لە پانتۆس و سەلماز و تەپراخ و وان و مودراك و شوێنەکانی تر ئەم قوتابخانانە کرابوونەوە، هەروەك پ. یی.. ئاڤریانۆڤ دەڵێت: «مزگەوتێکیان دروست کردبوو و حوجرەیەکیشیان تێدا کردبووەوە کە لەرووی سیاسییەوە بایەخێکی زۆری هەیە»(٢٠).

ئەمەی لەسەرەوە بەنێوی (عەشیرەت مەکتەبی) باسی لێوەکراوە، کارێك بووە لەلایەك بۆ دڵنیاکردنی فریودراوەکانی ئەوانەی لە سوارەی حەمیدی بەشداربوون، لەلایەکی تریش بۆ گوێڕایەڵیی ئەو مەبەستانەی دەسەڵاتدارانی ئەوکاتی عوسمانلی دەیانەوێت ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێ کە گریازنۆڤی جێگری قونسوڵی رووسی لە وان، لەوتاری (کورد و سوارەی کورددا) بایەخ و گرنگیی ئەم قوتابخانەیە بەم جۆرە دەردەخات «کۆششی سوڵتان بۆ ئەوەیە گوایە ئەم کوردە کێوییانە بکاتە شارستانی».

ئەگەر مەبەستی بەشارستانی کردنیانە و دەیەوێت بەرەو پێشەوە بچن، لە باتی ئەوەی لەسەر سنووری رووسیا و تورکیا قوتابخانە بکاتەوە، دەبووایە لە کوردستان خۆیدا ئەمەی بکردبووایە(٢١).

---

(٢٠) جەلیلی جەلیل، هەندێ سیمای ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی و کلتووریی کوردی، و. ئەنوەر قادر محەمەد، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣،ل١٨.

(٢١) هەمان سەرچاوە ل١٥.

ئەم لایەنە ڕوونتر دەردەکەوێت کە ئەم دێڕانە لە نووسینەکەی پ. یی. ئاڤریانوڤ دەخوێنینەوە. بەکۆمەڵ خوێندنی منداڵانی کورد لە بەردەستی ئەو مەلا تورکانەدا، کە کتێبەکانیان پڕ بوون لە فەنتازیای ئاینیی نا ئاشنا بەکورد، هەروەها فێرە تورکی کردنیان بەو شێوەیە، سەری لەسیاسیەتی بەتورك کردنی کوردەوە دەردەچوو و هەر ئەمەش هۆی سیاسی کردنەوەی ئەم قوتابخانە بوو(٢٢). لەمەش مەترسیدارتر یەکێك لە پەیامنێرەکانی ئەو سەردەمە دەڵێت لە ڕاستیدا سوڵتان بەم هۆیەوە توانیی منداڵی سەرۆك هۆزە کوردەکان وەك بارمتە لای خۆی گل بداتەوە. سوڵتان خۆشی زۆرجار ئەم ڕاستییەی دووبارە کردۆتەوە(٢٣).

ساڵی ١٨٩٢ (عەشیرەت مەکتەبی)یان لە ئەستەمبوڵ کردەوە، لەم قوتابخانەیەدا منداڵی بنەماڵە ناسراوەکانی کورد و عەرەب و ئەلبانییەکانیش دەیانخوێند، لەم قوتابخانەیەدا کاتێکی زۆریان بۆ فێرکردنی کاروباری جەنگی و قورئان لەبەرکردن تەرخان کردبوو، ئەوانەی ئەم جۆرە قوتابخانەیان تەواو دەکرد، دەیانتوانی بچنە کۆلێژە سوپاییەکانەوە و لەوێش خوێندنی سوپایی بەرز تەواو بکەن. کار بەمە نەوەستا، ئەوانەی لەو شوێنانە دەیانخوێند لە منداڵی خانەوادە دیارەکانی کورد، ڕێگەی ڕزگاریی و ئازادیی کوردیان گرتەبەر و ئامانجەکانی دەسەڵاتدارانی سوڵتانی عوسمانی نەهاتە دی، لەم بارەوە ساڵی ١٩٠٣ ڕۆژنامەی (گنچاك)ی ئەرمەنی وەهای نووسیوە: «ئەو منداڵە کوردانە لەگەڵ ئەوەشدا، لەقوتابخانە ناوەندییە تورکییەکاندا دەخوێنن، پەیوەندییان لەگەڵ خەڵك و بەرەی ئازادیخوازانی قوستەنتەنییەدا پەیدا کردووە، لەوێ ئەو بیرە لە دایك بووە، کە سوڵتان بەتوندوتیژی دەچوو بەگژیدا، بیری ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوەیی، ئەو لاوانەی بەچاکی لە سیاسەتی چەوت و ناهەمواری سوڵتان تێ گەیشتوون و پەیوەندییەکی پتەو و بەردەوامیان لەگەڵ ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکانی

---

(٢٢) هەمان سەرچاوە ل١٩.

(٢٣) هەمان سەرچاوە، ل٢٠، لەم ڕووەوە ئۆسمان سەبری لە بیرەوەرییەکانی باسی چوونە قوتابخانەی منداڵە دەرەبەگەکانی کوری کردووە، (سلوبك) کە کوڕی سەرەك عەشیرەتی «ئوزی بند»بوو بەبچووکی باوکی ناردوویەتیە قوتابخانەی عەشایری کە سوڵتان عەبدولحەمید بۆمنداڵی سەرۆك عەشیرەتەکان دروستی کردبوو، ئەم کەسە دوای دەرچوون لەم قوتابخانەیە چۆتە قوتابخانەی جەنگی تا بۆتە بینباشی. بڕوانە مذكرات الاستاذ اوسمان صبري – ترجمة دلاور زنكي – چاپی یەکەم – چاپخانەی امیرال، بنان – ل ١١٩.

قوستەنتەنییەدا هەیە، بەڵێ! بیری «کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ» کە تا سەردەمانێکی نزیکیش بەخەونێکی بەدی نەهاتوو لەقەڵەم دەدرا، بووە بەرنامەی کۆمەڵی ئەم لاوە کوردانە». هەر لەم ڕوانگەیەشەوە سوڵتان ساڵی ۱۹۰۷ «عەشیرەت مەکتەبی»ی داخست(۲٤).

دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە بنەماڵەکانی بەدرخان و بابان و بنەماڵە دیارەکانی تر زۆریان لە ئەستەمبوڵ کۆ کرابوونەوە، لە ژێر فشاربوون، بەڵام ڕۆشنبیرەکانیان و ئەوانەی لە ئیدارە و سوپا کاریان دەکرد، ڕۆڵی بەرچاویان لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و هوشیاریی نەتەوەییدا گێڕا و جەلیلی جەلیل گوتەنی سوڵتان دەیەویست دۆست و پیاو بۆ پشتگیری حوکمە بیرۆکراتییە سوپاییەکەی پەیدا بکات، هەر بۆ ئەم مەبەستەش گەلێکی نابوونە بەر خوێندن کەسانێکی زۆر کەم لەم بنەماڵانە خزمەتی سوڵتانیان دەکرد. زۆربەی زۆریان بەتایبەتی خوێندەوارو ڕۆشنبیرەکانیان ڕێگەی تێکۆشانی ئازادیخوازییان گرتبووە بەر، کە ساڵی ۱۸۷۸ کوڕانی بەدرخان بەگ، عوسمان بەگ و حسێن بەگ کە لە سوپای عوسمانیدا بوون و هەمیشەش ڕابەریی خەباتی نەتەوەییی کوردیان دەکرد، هانی میللەتیان دەدا و داوای سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد بەمەش نەوەستا بیروباوەڕی دژ بەسوڵتان لە ناو قوتابییانی قوتابخانە جەنگییەکانی شارەکانی تریشدا بڵاو بووبووەوە. بۆ نموونە لە ساڵی ۱۹۰۳ لە قوتابخانە سوپاییەکەی بەغدا (ڕوشدییەی عەسکەری). عەرەب و کورد دوو کۆمەڵەی دژ بە سوڵتانیان دامەزراندبوو، ژەنەڕاڵی موتەسەریفی بەغدا، توانیی ناکۆکی بخاتە نێو قوتابییە عەرەب و کوردەکانەوە بەم بیانووەوە قوتابخانەکەی داخست و هەموو ئەوانەشی گرت، گوایە «ئاژاوەیان نابووەوە و گێرە شێوێنییان کردبوو»(۲٥).

پێویستە بڵێین کوردە ڕۆشنبیرەکانی ژێردەسەڵاتی عوسمانی بوونە مەشخەڵ هەڵگری بووژانەوەی کلتووری و هاندەر بۆ داڕشتنی بناخەی خوێندەواری و بیروڕای ئازادی لای ڕۆشنبیرانی کوردو کارەکانی دەستپێکی سەدەی بیستەم و دروستکردنی کۆمەڵەو ڕێکخراوە سیاسییەکان و دروستکردنی قوتابخانەی کوردی و خوێندن بەکوردی و بایەخدان بەڕێزمان و زمانی کوردی و چاپکردنی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار بەزمانی کوردی بەڵگەی ئەوەن ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە سوودیان لەو قوتابخانانە وەرگرتووە

---

(۲٤) هەمان سەرچاوە، ل۲۱.

(۲٥) هەمان سەرچاوە، ل۲۳.

و ئەمەش پێچەوانەی مەرامەکانی سوڵتان دەرچوو.

ئـە. د. ژیلـتیکۆڤ و یو، ئـا، پیـترۆسیـان لـەم ڕووەوە نووسیویـانـە کە «قوتـابخـانـە و مـامۆسـتـاکـان لـەژێر چـاودێری و سانسۆرێکـی تـونـدوتـیـژی وەزارەتـی ڕۆشـنـبـیـری و ئەنجومەنی ڕۆشنبیری ویلایەتەکاندا بوون» لەو سەردەمەشدا هەرچی چاپەمەنییەك ئـەگـەر ڕاستـەوخـۆ خزمـەتـی ڕژێمـی نـەکردبـایـە، بـانگی بـەهـێزکردنـی نـەدایـە، ڕێگـەی دەرچوونـی نـەدەدرا. کـەچی لـەگـەڵ ئـەو هـەموو زەبرو زەنـگـەشدا لـە تـورکـیـا ئـەدەبـیـاتـی واپەیدا بووبوو، کە ڕاستەوخۆ یا پەنـامەکی خزمەتی گەشەسەندن و بەرەو پێشەوەچوونـی کلتووری کورد بکات.(٢٦)

لە لـێرەواری (عـەشیـرەت مـەکـتـەبـی)دا گـەلـێك شەنـگـەبـی و شۆڕەسواری بـواری خـوێنـدەواریـی ئـەوتـۆ دروست بـوون، کـە دەبـێت هـەردەم لـە بـواری بـڵاوکـردنـەوەی خوێندەواری و دروستکردنی بنەماکانی خوێندن و کردنەوەی قوتـابخـانەو پەرەپـێدانی زمانی کوردی ناویان بهێنین و لەم سەنگەرە تەنگەبەرەی سوڵتانەکاندا هەنگاوەکانیان بەرەو دونیایەکی فراوان دەست پێ کرد، گەرچی بەهەژاری و نەداریش بوویێت.

---

(٢٦) هەمان سەرچاوە ل٢٤.

## کۆششی کۆمەڵە سیاسییەکان

(کۆمەڵەی هاریکاری و پێشکەوتنی کورد) یەکێکە لەو کۆمەڵە سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییانەی لە ئاقاری ڕۆشنبیری و خوێندەواریی کوردیدا دەورێکی باڵایان گێڕا. لە ئابی ١٩٠٨ دەرفەت ڕەخسا ئەم کۆمەڵەیە دابمەزرێت و هەوڵی یەکبوونی ڕۆشنبیرانی کوردی دا، ئەم کۆمەڵەیە لەتەك بایەخی زۆری بەزمانی کوردی کە لە یەکێك لە بەندەکانی بەرنامەکەیدا نووسراوە «بۆ ساناکردنی چوونە قوتابخانەی سەرەتایی باشترە پەرەو گەشە بەنووسینی کوردی و ئامادەکردنی ڕێزمانی زمانی کوردی لە فەرهەنگ کە سەنگاییی زانستیی هەبێ، بدرێت و کۆمەڵە، خەڵاتی هاندان بەو کەسانە دەبەخشێت کە لە نووسینی باشترین کتێبی قوتابخانە سەردەکەون».

لە ڕۆژنامەی «کورد تعاون و ترقی جمعیتی غزە تەسی» بابان زادە، لە وتارێکی ڕاشکاوانە باسی گرینگیی خوێندن و فێربوونی زمانی کوردی دەکات و داکۆکی لەوە دەکات کە «زۆر پێویستە منداڵی کورد زمانی دایك و باوکیان بخوێنن». هەر لەو سەردەمەدا مامۆستا عومەر عەونی ئەفەندی کە مامۆستای قوتابخانەی روشدیەی (مهورە عزیز) بووە، کتێبێکی بەنێوی «ڕێزمانی کوردی و جێبەجێ بوونی لە ئەدەب» داناوە.

لە بەرنامەی (کۆمەڵەی هاریکاری و پێشکەوتنی کورد) ڕاشکاوانە باسی بایەخی خوێندن و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و پەرەپێدانی ڕۆشنبیری هەیە و دەڵێت کۆمەڵە هەوڵ دەدات لەتەك وەزارەتی پەروەردە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە ناوچەکانی [کوردستان] دروست بکات، کاتێك وەزارەت نەیکات ئەو خۆی و لەسەر ئەرکی خۆی ئەو ئەرکە ڕادەپەڕێنێت و بەپێی هەندێك سەرچاوە کۆمەڵە قوتابخانەیەکی بۆ منداڵانی کورد لە ئەستەمبوڵ کردەوەو چاپخانەیەکیشی دامەزراند، بەڵام دوای نەمانی کۆمەڵە قوتابخانەکەشی داخرا[٢٧].

نابێت لەتەك کاری ئەم کۆمەڵەیە ڕۆڵی مامۆستایەکی نەبەردی وەکو خەلیل خەیالی کە یەکێك بوو لەوانەی لە کارو خەباتی ڕۆژانەیاندا جێگەیەکی بەرز و شایانیان بۆ ئەم

---

(٢٧) گولان العربي، الجبهة الكردية للتعاون والتقدم ونشاطاتها (١٩٠٨- ١٩٠٩) بقلم محمد طيفون، ترجمة د. هوراز سوار، مراقبة د. عبدالفتاح علي بوتاني العدد (٣٣) شباط، ١٩٩٩، ص٥٧.

باسه دانابوو. ئەم نیشتمانپەروەرە دڵسۆزە بەگەرمی هانی ڕۆشنبیرانی کوردی دەدا بەچاوێکی دووربینەوە بڕواننە ئەم ئەرکە گرنگەی سەر شانیان و هەمیشە و لەهەموو شوێنێك باسی ئەوەی کردووە کە نەخوێندەواری یەکێکە لە دەردە گەورەکانی کۆمەڵگای کورد. بەهاندانی مامۆستا خەیالی ژمارەیەك لە ڕۆشنبیرانی شاگردو هاوەڵی، «کورد تعمیم معارف جمعیتی» کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری کوردیان دامەزراند کە بەر لە شەڕ فێرگەیەکی تایبەتی لە ئەستەمبوڵ بۆ منداڵانی کورد کردەوە[٢٨].

هەنگاوی یەکەمی کۆمەڵەکەو کۆششی خەلیل خەیالی ڕێچکە شکاندنێکی بێ وێنەیە لەمێژووی خوێندەواری کوردیدا، چونکە تا ئەوکاتە هیچ جۆرە سەرچاوەیەك چنگ ناکەوێت ئاماژە بەکارێکی وەها بدا کە کۆمەڵەیەکی سیاسی و مامۆستایەکی کوردی خوێندەواری تامەزرۆی فیکری نەتەوەییی کوردو ڕزگاریی کوردستان، قوتابخانەیەکی خوێندنی سەرەتایی بەڕەسمی بکاتەوە. ئەمەش بووە مایەی تۆمارێکی مێژوویی.

(٢٨) د.کەمال مەزهەر، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی جیهانی یەکەم، ل٣٧.

## یەکەم قوتابخانەی کوردی

دوای ئەو ڕابوونە ڕۆشنبیرییەی کوردانی ڕۆشنگەروهەڵگرانی ئالآی رزگاری و ئازادی لەدەست سوڵتانی عوسمانی و ژمارەیەك کۆمەڵە و ڕێکخراویان دروست کرد، لەوکاتەدا کورد بەدەست نەخوێندەواری دەینالآندو دووچاری کوێرەوەی و دواکەوتنێکی مەترسیدار هاتبوو. ڕۆشنبیران بەهۆشیارییەکی زۆرەوە کەوتنە کار بۆ پێکهێنانی بزووتنەوەیەکی کۆمەلآیەتی – ڕۆشنبیری لەپێناو فێرکردن و بلآوکردنەوەی مەعاریف و زانیاری و خوێندەواری.

هەوەڵین کۆشش ئەوەیە کۆمەڵەی بلآوکردنەوەی مەعاریفی کوردی ساڵی ١٩٠٨دامەزرا، خۆی بۆ بلآوکردنەوەی خوێندەواری تەرخان کردو خەلیل خەیالی ڕێبەری بلآوکردنەوەی لەکوردستان و لە یەکەمین پێشەنگانی دروستکردنی قوتابخانە لەکوردستانی مەزندا، بەردی بناغەی خوێندنی لە قوتابخانە دانا و ئەمەی ئەمڕۆ دەیبینین بەهەنگاوی یەکەمی ئەو شۆڕە ڕۆشنبیرە خۆنەویستە دەستی پێ کرد. هەر ئەو کاتەش کە خەلیل خەیالی لە بەناوبانگترین دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە بوو، قوتابخانەیەکی کوردیی بۆ فێرکردنی خوێندنی مندالآنی جالیەی کورد لە پایتەختی عوسمانی بەناوی (قوتابخانەی دەستوری)[٢٩] لەلایەن کۆمەڵە دامەزرا کە ئامانجی کۆمەڵە بلآوکردنەوەی ڕۆشنبیری کوردی بوو. بەرنامەی خوێندنەکەشی وەکو قوتابخانی تورکییەکانی تر سەر بەوەزارەتی مەعاریفی سەردەمی ئیسماعیل حەقی بابانی وەزیری مەعاریف بوو. بەڕێوەبەریی قوتابخانەکە درایە دەست عەبدوڕەحمان بەدرخان و ئەوکاتە (٣٠) قوتابی تێیدا دەیانخوێند و پاش ماوەیەك ژمارەیان زیادی کرد، ئەم قوتابخانەیە بەیارمەتی دەوڵەمەندە کوردەکانی ئەستانە کرایەوە.. ئەمە یەکەم قوتابخانەی ڕەسمیی کوردییە، کە کورد خۆیان بەڕەسمی بیکەنەوە و کۆمەکی بکەن و بەرنامەی وەکو وەزارەتی حکوومەت بێت. کتێبی ڕێزمانی کوردیی لەم ماوەیە چاپ کردووە، مامۆستاکانی کە دەرسیان تێدا گوتۆتەوە، ئەحمەد کوردی زادە و سەعید نەورەسی بوون.

---

(٢٩) (عبدلله محمد علي ، کردستان في عهد الدولة العثمانية، من منتصف القرن الخامس عشر الى بدء الحرب العالمية الأولى، جامعة صلاح الدين، رسالة دکتوراه، ص١٨١.)

لەم قوتابخانەیەدا وەکو د. کەمال ئاماژەی پێ کردووە خوێندن بەزمانی کوردی بوو، شاگردەکان بەگیانی کوردایەتی گۆش دەکران، بەڵام بەداخەوە زۆری نەخایاند و بەناچاری دەرگای ئەم قوتابخانەیە داخرا(٣٠).

وەکو ئاماژەمان پێ کرد کۆمەڵەو رێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمە بایەخێکی زۆریان بەمەسەلەی خوێندن و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و کردنەوەی قوتابخانە و فێربوون و چاپکردنی کتێبی کوردی و رێزمانی کوردی داوە، چەندین هەوڵی دڵسۆزانە لە چوارچێوەی هەلومەرجەکەو تواناکانی سەردەمەکە دراون، رێگەیان نەك تەنیا بۆ بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و پێگەیاندنی سەدان و هەزار خودان قەڵەم و خوێند ـ خۆش کرد، بەڵکە بوونە رێگە خۆشکەریش بۆ کاری سیاسی و پەرەسەندنی هۆشیاریی نەتەوەیی.

کۆمەڵەی تەعمیمی مەعاریفی کورد کە بەڵگەنامە و بەرنامەکانی لە (ژین)ی ئەستەنبول لە ساڵی ١٩١٩ بڵاو کراونەتەوە لە بەیانێکی بەم جۆرە هەندێك لە ئامانجەکانی و بۆچوونەکانی دەخاتە ڕوو، کە لە بەشێکی بەیانەکەیدا هاتووە: مەبەست لە پێکهێنانی کۆمەڵەکەمان درێژەپێدانی کۆششی سیاسیی گەلەکەمان و بۆپێشەوە بردنیەتی بەپێی بنچینەیەکی زانستیی هاوچەرخ... لە بەشێکی تردا هاتووە، بەڵام ئێمە لەم سەردەمی شارستانەتییەدا لە پێناوی داواکردنی مافی ڕەوای خۆماندا تووشی گەلێك کێشە دەبین. دەڵێت ئەگەر گەلان لەم سەدەیەدا بۆ گەیشتن بە مافی خۆیان، خاوەنی زمان و مێژووین، ئەوا دامەزراوی میللیی خۆیانیان دەبێت و تەنیا ئەمانە نیشانەو ناسنامەی دابینکردنی دادپەروەرین... لە درێژەی بەیانەکەدا دەڵێت: ئەمرۆ وێرای ئەوە کە کورد خاوەنی گەنجینەیەکی کتێب دانان نییە و ئەوە زیانێکی گەورەی پێ گەیاندووە، بەڵام چاك کردنەوەی ئەم بارە لە لایەن کورد خۆیەوە کارێکی زەحمەت نییە، تواناییی داهێنانی میللەت زمان و رێزمان بەفراوانی و رێکوپێکی و بەهیممەت و کاتێکی کورت خایان دارشتوون و گەیاندوونییە ئاستێکی بەرز... زۆر شتێکی ناخۆشە کە ئێمە لەم سەدەیەدا سەرقاڵی رێکخستن و هاو ئاهەنگ کردنی زمان بین، کەوا بەردی بناغەی مرۆڤایە تییە و، ئەم ناتەواوییە دەخەینە ئەستۆی زۆربەی زۆری میللەت و لەم ڕووەوە بەرپرسانیش(٣١).

---

(٣٠) د. کەمال مەزهەر کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی جیهانی یەکەم، ل٣٧.

(٣١) (گەلاوێژی نوێ، بەیاننامەی کۆمەڵەی تەعمیمی مەعاریفی کورد، د. شێراز کەریم، شریف سالح، ژمارە (١) مایسی ١٩٩٧، ل١٨٦.

کۆمەڵە لەسەر بنچینەیەکی شارستانی و کەڵك وەرگرتن لە پێشکەوتنی سەردەمەکە و لەسەر بنچینەی ئەوەی کە زمان و مێژوو دوو کۆڵەگەی سەرەکیی بوونی نەتەوەن و هۆکارن بۆ دامەزراندنی دەزگای میللی، کوردیش دەبێت لەم بارەوە خۆی ڕێك خاتەوە و هەوڵی چاپکردنی کتێبان بدات کە تا ئەو کاتە بەنەبووی دادەنێن، بۆیە بەرپرسێتی دەخاتە سەر زۆرینەی میللەت ئەمەش وا لە میللەت دەکا هەموو بکەونە بەر خۆ پرسین و بیرکردنەوە و بپرسن تاوان و بەرپرسێتی ئێمە لەم ڕووەوە چییە و چ کارابین باشە؟!

لە ستایشی زمانی کوردیدا و بوونی ڕەگی مێژووییەوە و لە بەیانەکەدا وەسف کراوە، زمانی ئێمە لەلایەنی ڕێکوپێکییەوەو بەداروباری ئەمڕۆیەوە، دەتوانێت بەپێی پێداویستیی سەردەم خۆ لە زۆر زمانی دیکە بەسەرکەوتووتر دابنێت.. ئەو بەرهەمە کلاسیکییانەی چەرخێك لەمەوپێش کە بۆمان مانەوە، دەری دەخەن کەوا زمانی کوردی خاوەنی ئەدەبێکی دەرکەوتوو بووە، بەڵام، چونکە بەخت و چارەنووس یارمەتییان نەداوە ناچار گیرۆدەی حاڵی خراپی ئەمرۆی بووە... لە درێژەی ئەم بەیانەدا برگەیەکی گرنگ بۆ باسێکی جیددی تەرخان کراوە کە ئەویش ململانێی کۆن و نوێ و شێوازی کۆن و بەسەرچوو، شێوازی سەردەمانە، ململانێی بەشارستانی کردنی کۆمەڵگا و بەدواکەوتوویی هێشتنەوەی و بەفرەکردنی ئاسۆی ڕۆشنبیری و خوێندن لەبەرامبەر گۆشەگیر مانەوەو بەرتەسك کردنەوەی خوێندن لە حوجرە و مزگەوتان، کە بەم شێوەیە دەڵێت: ماوەیەکی درێژخایان بەئاو و تاوەوە بەهۆی دەرسدادانی ئاینییەوە کە پێمل نەبوونی شیاو نییە، ئەوە بەنێو خەڵکدا بڵاوکرایەوە کە پەروەردەی میللی و ڕێزگرتن لە هەڵگرانی بیری زانستی و پێشوازی لێکردنیان بە بنچینەی ئیمان دەژمێردرێن. ئەم جۆرە قسانە بەشێوەیەك لە نێو کوردان و لە ئاستی ویژدان و هەستاندا کاریگەر بوون، ئەو هاوار و بانگەوازە بەئاگاهێنە کە راستییەکانی بەچەشنێکی دیارو ئاشکرا بڵاو دەکردەوە، لە هیچ گۆیێەکدا بەئاستەم دەنگی نەدایەوە. بەڵکە ڕقیشیان لەوانە هەڵدەستا کە لە وشتانە دەدوان و داوایان دەکرد، مۆری ڕەشی کفرو نەفرەتی بەنێو چەوانیاندا بدرێت. ئەوەتا کورد تا ئێستا بەتەرزێکی فێڵاوی و خەڵك فریودەرانە ڕێك خراوەو ئەمە لەلایەن ئەو کوڕە تاوانبارانەوە بەجێ هێنراوە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژانە سزای هەرە قورسی نەك دنیا بگرە هی قیامەتیش دەگەن، ئەو کوردە کە بەدیلی لە نێو بازنەیەکی تەنگ و تاری بێ ئاگاییدا دەژیا، تین و توانی ئەوەی نەبوو بیر لە زمان و مێژوو و ژیانی خۆی بکاتەوە. تەنانەت ئەو جموجۆڵە شارستانییەتیش نەدەبینی کە مرۆڤی گەیاندبووە

بەرزترین ترۆپکی بەختەوەری و خۆشگوزەرانی. چاوی لەدەرو درواسێش نەبوو کە خەریکی جوانکردن و ڕێکخستنی شارەکانیان بوون و لە ئاستیدا چاوبەستەو مێشك قفڵکراو، بەلێواری هەڵدێری نەماندا ڕوو بەدۆزەخ رای دەکرد... ئیدی ڕووناکبیرانی میللەت بێ پەروا دەستیان بەو کارانە کرد کە دەبنە هۆی رزگارکردنی ئەو داهاتووەی کورد کەوا لەژێر زەمینە تاریکەکانیدا دەکولا. کۆمەڵەی (تەعمیمی مەعاریف و نەشریاتی کوردی) بەو بڕیارە لەخۆ بردووانە و پرکێشییە ترسناکە هاتە مەیدان... کۆمەڵەکەمان بەئارەزووی ژیاندنی هەموو کوردان و بە لە بیربردنەوەی شتە لەدەستچووەکانی ڕابردوو، بۆ بەئەنجام گەیاندنی چالاکییەکانی سەبارەت بەزمان و مێژوو و زانستە هاوچەرخەکان، شێلگیرانە بەشوێن ئەو پێداویستییانەدا دەگەڕێت. «کۆمەڵە گۆڤاری (ژین)ی خستووەتە ژێر دەستی خۆی کە زۆر دەمێکە تا خوا حەز بکات لە بڵاو بوونەوە دایە»(٣٢).

ئەم دێڕە بەشێکی ئەو بەیاننامەیە بوو، بەڵام نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە کۆمەڵەکە هەرچییەك بووبێ و چۆن دروست بوو بێ، ئەرکی پاراستنی زمان و بڵاوکردنەوەی و خوێندەواری و چاپکردن و دەرچوواندنی ڕۆژنامە و کتێبی لەئەستۆ گرتووە.. بانگەوازی خەڵك و وشیاران دەکات ئیتر بەکەناری پڕ لە هەڵدێری دواکەوتن و نەخوێندەواری و چاوی بەستەکی ڕانەکەن.

پێمان وایە لەمەش گرنگتر ئەو بەرنامەیە کە لە ژمارە (١٠)ی ١٩١٩/٢/٢ گۆڤاری (ژین) بڵاو کراوەتەوە. بەرنامەکە (٢٠) بەندە، لە بەشی هەرە زۆری پێ لەسەر خوێندن و باری ڕۆشنبیری و ئەو شتانە دادەگرێت کە پەیوەستن بەبڵاوکردنەوەی خوێندەوارییەوە.

**دەقی بەرنامەی کۆمەڵەی (تەعمیمی مەعاریف و نەشری کوردی)**(٣٣).

١- هەموو هەفتەیەك کۆمەڵێك زانیاری بڵاودەکاتەوە.

٢- ئەو بەرهەمانەی زاناو ئەدیب و شاعیرانی کورد کە بەزمانی کوردی نووسراون چاپ دەکرێن.

٣- بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی کە هەموو شێوە زمانەکانی کوردی بەخۆ گرتبێ.

٤- ئەوەی کە لە کتێبەکانی ڕێزماندا لەبەر دەست دابێت، چاپ دەکرێ.

(٣٢) هەمان سەرچاوە.

(٣٣) هەمان سەرچاوە.

٥- دابینکردنی ئەو کتێبانەی کە لە قۆناغی سەرەتاییدا دەخوێنرێن.

٦- کۆمەڵێك پەندی پێشینان کە بەشێوە زمانی جۆراوجۆر گوتراون، بڵاودەکرێنەوە.

٧- کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری لە بارەی دابونەریتی کوردەوە لە شوێنە جیا جیاکانی کوردستاندا.

٨- هەرچی کتێبێکی بەزمانەکانی خۆرهەڵاتی و خۆرئاوایی تایبەت بەمێژوو و جوگرافیای کورد و کوردستان هەن بڵاو دەکرێنەوە.

٩- کتێب لەسەر مێژوو و جوگرافیای کۆن وتازەی کورد دادەنرێت.

١٠- ژیاننامەی پیاوانی ناوداری کۆن و تازە بڵاو دەکرێنەوە.

١١- کردنەوەی کتێبخانەیەك کەلەپووری ناوچەیی و بێگانەی تێدا بێت.

١٢- قوتابخانەی شەوانە دەکاتەوە.

١٣- دەستەی ورد بوونەوە بۆ ئەو ناوچانە دەنێرێت کە کوردیان تێدا نشتەجێیە.

١٤- چاپخانەیەك بۆ کۆمەڵە دادەمەزرێنێت.

١٥- هەوڵ دەدات لە نێو کرێکارانی کوردا ڕێکخستنێکی پیشەیی و هەرەوەزی دابمەزرێنێت.

١٦- تێدەکۆشێت بەپێی دەسەڵات بەشێك لەو منداڵە کوردانە کە لە ئەستەمبوڵ بە سەرگەردانی دەسووڕێنەوە، لە شوێنە پیشەییە هەمەجۆرەکاندا بخاتە بەر شاگردی و هەرچی خەرجییەك کە بۆ مسۆگەرکردنی بەردەوامییان پێویست بێت، ڕێکوپێك دابینی بکات.

١٧- کردنەوەی قوتابخانەیەکی پیشەسازی تایبەتی شەوانە بۆ منداڵە کوردو هەتیو و بێ خاوەنەکان.

١٨- هەوڵ دەدات قوتابخانەیەکی شەوانەی تایبەت بۆ فێربوونی پیشە و سنعات بۆ کچانی هەتیو و بێ خاوەنی کورد بکاتەوە.

١٩- هەوڵ دەدات مۆزەخانەیەك بۆ ئەو کەلوپەلانە بکاتەوە کە پیاو و ژنی کورد ڕۆژانە لەماڵەکانیاندا بەکاری دەهێنن و هێندێك ئامێر و کەلوپەلی خۆماڵیش لە مۆزەخانەکەدا دادەنێت.

٢٠- ئیش بۆ دامەزراندنی خانەیەکی مامۆستایانی کورد دەکات.

د.عەبدولستار تاهیر شەریف دەڵێت، ئەم کۆمەڵەیە ساڵی ١٩٠٨ دامەزراوە و کۆمەڵەیەکی ئەدەبی و پەروەردەییە، قوتابخانەی کوردی لە (چەمبەرلی تاش) کە خەلیل خەیالی بەڕێوەبەری بووە کردۆتەوە، بۆ فێرکردن و پێخوێندنی منداڵی کورد لە ئەستەمبوڵ، کەچی دوای دەست بەسەرداگرتنی تورکە لاوەکان کۆمەڵەکە و قوتابخانەکەش داخران(٣٤).

پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەکە وەکو د. عەبدولستار تاهیر شەریف ئاماژەی پێ کردووە (١٥) بەندەو بەرنامەکەشی (٢٠) بەندە. وەکو لەسەرەوە تۆماریان کردووە. ڕەنگە فەیسەڵ دەباغی نووسەریش بەهۆی تۆمارکردنی ڕاستییەکەی دکتۆر کەمال مەزهەر لە ئاماژە کردنی بەوەی کە بەرنامەی کۆمەڵەکە (٢٠) بەندە(٣٥)، لێی تێکەڵ بووبێ لەگەڵ ئەوەی کە د. عەبدولستار تاهیر شەریف، باسی کردووە، پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەکەیە، نەك بەرنامەکە.

لێرە بۆمان روون دەبێتەوە کۆمەڵەکە هەوڵی داوە قوتابخانەی (سەنعەتی و پیشەیی) و (شەوی) بۆ کوڕان و کچان هەتیوی لێقەوماوی کورد لە ئەستەنبوڵ و (خانەی مامۆستایانی کورد) و قوتابخانەی (پیشەسازی) و (مۆزەخانە) و (کتێبخانە) و (چاپکردنی کتێب) بکاتەوە. ئەمە بەرنامەی کاری ئاسۆی ئەم کۆمەڵەیە بووە. ئەو کۆمەڵەی بناغەیەکی بەرفراوان و پتەوی لە بەرنامە بووە بۆ مەسەلەی پەرەپێدان و پێگەیاندنی خوێندەوار لە کوردستاندا. لەو کوردستانەی بەدەست داگیرکەران و هێزی دواکەوتووی وابەستە بەکوێرەوەریی ناوخۆوە دەینالاند و لە بارێکی ئابووری و کۆمەلایەتی و دەروونیی دژوار و نالەباردا دەژیا.

جەلیلی جەلیلی لەم بارەوە نووسیویەتی، ئەم کۆمەڵەیە هەوڵێکی زۆری دەدا، خوێندەواری لەناو کورداندا بلاو بکاتەوە، ئەندامەکانی ئەمەیان بە ئەرکێکی سەرەکیی سەرشانی خۆیان دەزانی. هەر بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەی «کورد و نەشر مەعاریفی»یان دامەزراند. ئەرکی ئەم لیژنەیەش کردنەوەی قوتابخانە و بەزمانی کوردی کتێب دەرکردن بوو. ئەندامانی ئەم لیژنەیە لەگەڵ وەزیری رۆشنبیریی تورکیادا رێك کەوتبوون

---

(٣٤) د. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، شركة المعرفة، بغداد، ١٩٨٩، ص٣٥.

(٣٥) فيصل دباغ - أضواء على كتاب الجمعيات والمنظمات والاحزاب فى نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨ ص٢٥.

و بۆ ئەم ئامانجە کاریان دەکرد. خەلیل خەیالی خەڵکی مۆتکا، دەورێکی باڵای لەم پرۆژەیەدا دەبینی. کاتێ لە ئەستەنبول قوتابخانەیەکیان کردەوە عەبدولرەحمان بەدرخان (٣٠) لیرەی تورکی پێشکەش کردو بەڵێنی ئەوەشی دا کە بەردەوام یارمەتیی قوتابخانەکە بدات، ئەم قوتابخانەیە لە شەقامی «خواجە پاشا» لە گەڕەکی «دیڤانبۆل» بووە، دەورێکی دیاری لە ژیانی کولتووریی کوردەکانی ئەستەنبوڵدا هەبوو. رۆژنامەکانی پایتەخت بەتایبەتیش «هۆریزۆن» و «ئازاتە مارت» و «ژاماناك» و گەلێکی تر دەربارەی کردنەوەی ئەم قوتابخانەیان نووسیوە. بەرنامەی قوتابخانەکە ئاسایی بوو. پەیامنێری «هۆریزۆن» دەربارەی ئەرك و پرۆگرامی مامۆستایانی ئەم قوتابخانەیە دەڵێت: «ناویان نابوو قوتابخانەی دەستوری» هەرچەندە ئەوەشی نەدەگەیاند، کە تەنیا دەستوری تێدا بخوێنرێت، بەڵام خوێندنەکەیان بەجۆش و گیانی دەستورەوە بوو لە سەرەتادا تەنیا «سی» منداڵە کورد بوون، دواتر ژمارەیان زۆری کرد.

لیژنەکە داوای کردنەوەی قوتابخانەی لە کوردستاندا دەکرد، ڕاستییەکەشی ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە ئەو کادیرو مامۆستایانەی لە ئەستەنبول دەست دەکەوتن، لە دێهاتەکانی کوردستاندا نەبوون، ڕۆژنامەی «ئازاتەمارت»ی ئەرمەنی پیرۆزبایی لە ڕۆشنبیرە کوردەکان کردووە و نووسیویەتی: «هەچ گیروگرفت و نارەحەتییەك کە دێتە بەردەم رۆشنبیریی کوردەوە، نابێت وایان لێ بکات دەست هەڵگرن و واز لەم کارە بهێنن. چونکە داهاتوو و چارەنووسی میللەتەکەیان بەندە بە هوشیاری و خوێندەواری و خەباتی سەختەوە دژی هەموو بارێکی دژوار و نالەبار»[٣٦].

کوردە ڕووناکبیرەکان دەستیان بە بزاڤێکی ڕۆشنبیری پڕ بایەخ کرد، لەتەك بایەخدان بە مەسەلە سیاسییەکان، هەوڵی زۆریان بۆ کردنەوەی قرتابخانە و دەرچووانی کتێبی کوردی و دانانی ئەلف و بێی کوردی و ڕێزمانی کوردی دەدا، کاریگەریی جوولانەوەی ڕۆشنبیری و پێشکەوتنی ئەورووپا لەلایەك و هاندان و پیرۆزباییی رۆژنامەو گەلانی تری ناوچەکە بەتایبەتی ئەرمەنییەکان کە چارەنووسیان پێکەوە لکابوو، لەلایەکی تر ڕۆڵیان دەگێڕا، کە ڕۆشنبیرانی کورد خاوە خاو نەکەن و سوربن لەسەر کارەکانیان، چونکە بناغەی پێشکەوتن «خوێندەواری و زانست»ە.

پەیدابوونی نووسین بە کوردی هەنگاوێکی گەورە بوو، جاران ئەمە کۆسپێکی گەورەی

---

(٣٦) جەلیلی جەلیل. هەندێك سیمای... ل ٧٩.

بەرەو پێشەوە چوونی کولتووری کورد بوو، تێکۆشەرانی کورد لە هەموو ڕوویەکی ئەم مەسەلەیە، لە لاپەڕەکانی گۆڤاری «ڕۆژی کورد» دەدوان. لەو سەردەمەدا لە ئەستەنبول «کۆمەڵەی چاککردن و بڵاوکردنەوەی ئەلف و بێ» دامەزرا. ئەرکی بنەڕەتی دانانی ئەلف و بێیەکی تازەی کوردی بوو. عەبدولرەزاق بەدرخان لەم بارەوە نووسیویەتی: «لەبەر ئەوەی ئەم ئەلف و بێیە کوردییەی (ئێستا) بناغەکەی عەرەبییە و سیستمی فۆنەتیکی زمانی کوردیش لەگەڵ هی عەرەبیدا ناگونجێت لەبەر ئەوە پێداویستیی دانانی ئەم ئەلف و بێیە هاتە کایەوە». لەم بارەوە ساڵح بەدرخانیش پێشنیاری ئەلف و بێیەکی جێ سەرنجی کردووە، داواشی کردووە، گەر کوردەکان بیر لە دانانی ئەلف و بێیەکی کوردی بکەنەوەو بۆ ئەم مەبەستە گۆشەیەکیش بۆ بیروڕا گۆڕینەوە لە ڕۆژی کوردی تەرخان بکەن(٣٧).

باسکردنی ڕۆڵی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لە نووسینی لە مەڕ بڵاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری و هاندانی خەڵك بۆ کردنەوەی قوتابخانە و بایەخدان بەخۆ ڕۆشنبیر کردن باسێکی درێژو بەرفرەیە، نامانەوێت لێرەدا تێکەڵی ئەم باسەی بکەین، بەڵام جێی خۆیەتی لە باسێکی سەربەخۆدا لێکۆڵینەوەی لە مەڕ بکرێت. هەر هێندە بەسە لەو بارەوە هەڵوێستی (ڕۆژی کورد) لەم چەند دێڕە کورت بکەینەوە کە دەڵێت: «قوتابخانە کۆنەکانی کوردستان هەر حوجرەو مەدرەسەی ئاینی بوون». گۆڤارەکە مەبەستی بووە کە گرینگی بەزانستە دنیاییەکان بدرێت، بۆیە لەم بارەوە عەبدولکەریمی سەرنووسەری لە وتاری «منداڵ بۆچ زوو فێری خوێندن بێ»دا، ڕەخنەی لە ڕێبازی دەرزوتنەوەی حوجرە گرتووە و وتوویەتی لەگەڵ ئەوەشدا لێرە ماوەیەکی زۆرە دەخوێنن، بەڵام لە سەرەتاوە بە ئاسانی فێری خوێندەواری نابن. دەڵێت: «بو تەحسیلی علوم ملای او مزگەوتە اول امر دکا جامی بخونە، فقیە چەند سال لگل ردو بدلی عصام الدین و عبدالغفور و عبدولکریم ومحمد افندیا مشغول دبی نهایت اوندە فیر دبی زید بەچی بۆرەو راء عمرە بەچی منصوبە» دوایش دەڵێن ئەمە یارمەتیی قوتابی نادات کە بە زوویی لە مەسەلەی سیاسی و ڕووداوەکانی وڵات تێبگات. لە قوتابخانەکاندا دەبێت باسی دیموکراتییەت و پەرلەمان و ئۆتۆکراتییەت و یاسا و دەستوور و هتد بخوێنرێ، چەند چاکە ئەگەر منداڵ زانستی ئابووری و کشتوکاڵ و کیمیا بخوێنێت(٣٨).

---

(٣٧) هەمان سەرچاوە ل٩٥.

(٣٨) هەمان سەرچاوە ل٩٦.

دوای پاشگەز بوونەوەی تورکە لاوەکان لە بەڵێنەکانیان و هاتنە سەر کاری ئەتاتورك و پشت کردنە هەموو ئەو بەڵێنانەی لە کاتی شەڕو ململانێی بەکوردی دابوون و سەرکوتی خوێناویی شۆڕش و ڕاپەرینەکانی کوردستان. قەدەغەکردنی ئاخاوتنی کوردی و بەرەسمی بوونی نەتەوەی کوردیان لە تورکیا ڕاگەیاندو لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و گۆڕانی ناو تورکیا لە بیستەکان (کوردی بەتورکی شاخاوی) ناوزەد کردو تا ئەمڕۆ نە خوێندن بەزمانی کوردی ڕێگەی پێ دەدرێت و نە کورد وەکو نەتەوەو زمان دانی پیانراوە، نە دەهێڵی لە شوێنە ڕەسمییەکان بە کوردی بئاخفن. نورەدین زازا دەڵێت: لە سییەکان لە تورکیا کێشە بوو، ناکۆکی لە نێوان کوڕی مووچە خۆری تورك و قوتابییانی تر لە دیاربەکر و ناوچەکانی دەورووپشتی زۆر توند بوو. بەڕێوەبەری قوتابخانە قوتابییانی خستبووە ژێر سیاسیەتی (تەتریك) بەتەواوی وشەی کورد و قسەکردن بەکوردیان قەدەغە کرد، تاگەیشتە ئەوەی ڕۆژێك بەڕێوەبەر بانگی قوتابییەکی بەناوی (بحری) کردو پێی گوت تەنیا دەبێت بەزمانی تورکی قسە بکەن و زمانی تر قەدەغەیە، دەنا بەتوندی سزا دەدرێن، لە ئاکامدا لە خوێندن دەریان کرد، چونکە (بحری) لە وەڵامی بەڕێوەبەر گوتی من ئەوە دەزانم، هیچ هێزێك نییە زمانی دایکم پێ تەرك بکات(٣٩).

لە تەواوی یەك سەدەی ڕابردوودا هیچ هەوڵێکی تر بۆ کردنەوەی قوتابخانەی ڕەسمی بە زمانی کوردی لە تورکیا و لە کوردستانی باکور سەری نەگرتووە. ڕاستە ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر خوێندەوار و پسپۆر و مامۆستا و نووسەرو هونەرمەند و زاناو زمانەوان هەن و گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی بەزمانی کوردی دەردەچێ. لە ئەستەنبول و ئەنقەرە بە ئاشکرا لەدوای گۆڕانکاریی نەوەدەکان ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی دەردەچێ، بەڵام ڕێگەی ئاخاوتن و خوێندنی ڕەسمی گیراوە دان بەبوونی کورد و زمانی کوردیدا نەنراوە و قەدەغەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ ئاستی هوشیاری و خوێندەواری و نووسینی و چاپکردنی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار بە زمانی کوردی لەناو کوردەکانی کوردستان باکوور زۆر بووەو بەسەدان کەس دەنووسن و شت چاپ و بڵاو دەکەنەوە.

کوردستان وڵاتێکی دەوڵەمەند نەك هەر لە رووی کشتوکاڵییەوە، بەڵکە زۆربەی کەرەستەی خاو، (ئاسنی خاو و نەوت) دەکەونە ناو کوردستانەوە. بەڵام لە کوردستاندا لە ساڵی ١٩٧٠ بۆ هەر (١٠,٠٠٠) کەس، پزیشکێك هەبوو کەچی (٣/٤) بۆ هەمان ژمارە

---

(٣٩) مذكرات نوردين زازا، ص ٥٩.

لە دانیشتووانی تورك هەبوون(٤٠)، كورد دوچاری گەلێك كێشەی چارەنووساز كراوەتەوە، كێشەی داكۆكیكردن لە ژیان و بەرەنگار بوونەوەی مردنی بەكۆمەڵە. گەیشتووەتە ئەوەی كە گوندو شاری تەخت بكەن، بەڵكە ناوی كوردیش بڤە بێت، وەكو ئەوەی لە كەركووك و شارەكانی تر دەكرا، یا ئەوەی لە كوردستانی ڕۆژهەلاّت و باكور ئەنجام دراوە. كە ئەمەش كوشندەترە، وەها باس كراوە كە لە كوردستاندا بەردەوام نەك هەر ناوی شارو دێ و ناوچە كوردییەكان دەگۆڕن، بەڵكو تەنانەت ناوی كەسانی كوردیش دەگۆڕن(٤١).

پێویست بە بەڵگە هێنانەوە نییە، كورد لە ڕووی خوێندن و ڕۆشنبیرییەوە لەژێر فشارێكی زۆر قورسی مەترسیداردایە. سەرەتا چۆن لە سەدەی بیستەم ڕۆشنبیران كەوتنە خۆ بۆ پرۆسەی ڕۆشەنگەری و بلاّوكردنەوەی خوێندەواری و پشت بەستن بەزانست، ئەمرۆش لە سەردەمی عەولەمە و كۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت لە بەشێكی هەرە زۆرو سەرەكی كوردستاندا خوێندن بە زمانی كوردی یاساغە و لەسەر بەكارهێنانی زمانی كوردی لە شوێنە ڕەسمییەكاندا كەسانیی وەكو (لەیلا زانا) زیندانی دەكرێن. لەتەك تازەكرانەوەی خوێندن لە زانكۆی ئازاد لە ئێران و بوونی كەناڵی ئاسمانی سەحەر بە زمانی كوردی، كەچی خوێندن بە زمانی كوردی نەبووەتە عادەت و دەستەیەك لە ڕۆشنبیرانی كورد لە هەندێك شاری وەكو (سنە) قوتابخانەی تایبەتییان بۆ وتنەوەو (فێركردنی خوێندن و نووسین بە كوردی) لەسەر ئەركی خۆیان كردۆتەوە، كە ئەم حاڵەتە پتر لە سەد ساڵ كوردە ڕۆشنبیرەكان دەستیان داوەتێ و ئەمڕۆش لەسەر هەمان شێوەی بەر تەسك و سادە ماوەتەوە.

لە توركیادا چەوسانەوە و ناوهێنانی كورد و ناوبردنی بە توركی كێوی و قەدەغەكردنی زمانی كوردی گەیشتووەتە ئاستی یاساكانیان و بەرەسمی و ڕاشكاوی ناوهێنانی كورد بڤە و قەدەغە كراوە. بۆ وێنە بەندی ٨٩ لە یاسای توركی ٦٤٨ مێژووی ١٣ تەمموزی ١٩٦٥ لەبارەی حزبە سیاسییەكانەوە كە لە ساڵی ١٩٨٤ خراونەتە ناو

(٤٠) ڕێگای ئاشتی و سۆسیالیزم، مەبدەئی داكۆكیكردن لە مافەكانی مرۆڤ لە یاسای هاوچەرخی نێودەوڵەتی و مەسەلەی كورد، د. پیری شالیار، و. دلزار، ژ (١٩) ساڵی چوارەم ئابی ١٩٨٩. ل ٧٠

(٤١) (هەمان سەرچاوە ل ٧١ ساڵی ١٩٧٠ كورد (٥٠٪) ناوچە نا كوردییەكانی توركیای پێك دەهێنا. زۆربەیان زمانی خۆیان لەبیر كردبوو. بڕوانە ها-ف موریس و جون بلوج، لا اصدقاء سوی الجبال، ترخمة راج آل محمد، مراجعة و تقدیم هادی العلوي، لبنان. ل ١٦٤.

یاسای نوێی تورکی و لە سەردەمی کەنعان ئێڤرین وەها وەسف دەکات. «لە حزبە سیاسییەکان قەدەغەیە داکۆکی لەبیری بوونی هیچ کەمینەیەکی نەتەوەیی بکەنەوە بە شێوەیەکی سەربەخۆ و لەسەر بنچینەکانی نەتەوایەتی و رۆشنبیری و دینی یان زمان یان هەوڵی تێکدانی ئاسایشی نەتەوەیی بدەن لە ڕێگەی پشتگیری کردنی پەرەپێدان یان پروپاگەندە بۆ زمان و رۆشنبیرییەکی تر جگە لە زمان و رۆشنبیریی تورکی»(٤٢).

ئەمەش زۆر بە ڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەخات کە دوای ئەو مێژووە دوورو درێژە کورد بەهیچ شێوەیەك لە هەندێك بەشی کوردستان نەیتوانیوە سوود لە دەرفەتەکان وەربگرێ، یا بەجۆرێك سەرکوت کراوە کە مافی ئاخاوتن بە زمانی زگماکی خۆشی پێ نەدرێ و نەتوانێ بایەخ بە رۆشنبیری و زمانی کوردی بدا و بە زمانی زگماکی بخوێنێت و دەرگاکانی بووژانەوە و خوێندەواری لەسەر داخراون و بەتایبەتیش ئەمە بەڕاشکاوی لە یاساکانی تورکیادا ڕەنگیان داوەتەوە و کورد لە فێربوون بە زمانی دایك و نووسینی و قسەکردن بە زمانی کوردی و گوێگرتن لە مۆسیقای کوردی و لەبەرکردنی جلکی کوردی قەدەغە دەکرێت.(٤٣) گۆڤاری (ئاسیا و ئەفریقای ئەمڕۆ) بڕیاری ویلایەتی سێرتی لەمەڕ قەدەغەکردنی زمانی کوردی کە نموونەی هەموو ناوچەکانی تری کوردستانە، بەم جۆرە بڵاو کردۆتەوە: «بینا لەسەر فەرمانەکانی ویلایەتی سێرت، (سێرت لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا هەڵکەوتووە)، لەسەر فەرمانبەرەکانی فەرمانگە دەوڵەتییەکاندا سەپێنراوە کە تەنیا زمانی تورکی بەکاربهێنن، سەرەڕای عەرەبیش کە لە نەژادا دەچنەوە سەر ناوچە دراوسێیەکانی سووریە و عێراق. جا بە پێی دەنگوباسی ڕۆژنامەکان هەر کەسێك بەم بڕیارەوە دەستگیر نەبێ تووشی دەرکردن دێ»(٤٤).

کورد بەهۆی کوێرەوەری و چەوسانەوە بەدەر لە هەموو عورف و یاسایەکی نێو نەتەوەیی و نێودەوڵەتی دەمکوت کراوە و لە مافە سەرەتاییەکانی فێربوون و خوێندن و سوود وەرگرتن لە یاسا گشتییەکانی نێو دەوڵەتیش بێ بەش کراوە. چارەنووسی بە هۆی قەدەری پڕ لە کوێرەوەری، یا هەڵکەوتنی جوگرافیا، یا پیلانی نێونەتەوەیی تا ئێستاش هەر ئەوە بووە بچەوسێتەوەو نەیتوانیوە بە سوود وەرگرتن لە فێربوون و پەرەپێدانی ڕۆشنبیری گەشە بکات. بەجۆرێك جینۆساید کراوە کە باسکردنی مووڕچڕك بە لەشی مرۆڤدا دەهێنێت.

---

(٤٢) هەمان سەرچاوە. ل ٧٢.

(٤٣) هەمان سەرچاوە. ل ٧٤.

(٤٤) هەمان سەرچاوە. ل ٧٤.

راسته له بەندەکانی (٣٨ و ٣٩ و ٤٠)ی پەیمانی لوزان دان بە مافی کورددا نراوە کە بریتییە لەوەی حکوومەتی تورکیا بەڵێن دەدات بەوەی ئەو کوردانەی بەژمارە لە تورك کەمترن لە تورکیادا، مافی تەواوی ئاخاوتنیان هەیە و لە ناو خۆیاندا و لەبەر دادگاو بۆیان هەیە ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب بە کوردی دەربکەن و یانەی کوردی زانستی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیش دروست بکەن، بۆشیان هەیە بە ئازادی بەسەرتاسەری تورکیادا هاتوچۆ بکەن، هەموو ئەو مافانەشیان هەبێت کە تورك پێی دراوە(٤٥).

ئەم دەقی ئەو بڕیارە نێو دەوڵەتییەیە کە کورد تا ئەمڕۆش پێی نەگەیشتووە، پێچەوانە لە زۆر سەردەم لەبەردەم ئەم وێنە تراژیدیایەی بەسەر کورد هێنراوە، هیچ قسەو باسێك نەبووە و بڕیارەکانیش پشتگوێ خراون، یا کورد وەکو گەمەیەکی نێودەوڵەتی بەکارهێنراوەو مافی خوێندن و فێربوونی بە زمانی خۆشی لێ قەدەغە کراوە، ئەو مافەی بۆ گەلان و نەتەوەکان بە سەرەتاییترین مافی مرۆڤانەیان دادەنرێ. وێنەی هەقیقی سەرکوتکران و لەنێوبردن هێندە فراوان بووە، کە ڕۆشنبیرانی کورد نەتوانن لەبەر داکۆکی لە ژیانی گشتی و ژیانی ئاسایی، داکۆکی لە مەسەلەی فێربوون و زمان و خوێندن بکەن. بلەچ شێرکۆ نووسیویەتی: ژمارەی ئەوانەش کە لە نیشتمانی خۆیان دەرکران و لەبەر نیشتمانپەروەرییان ئازار دران، لەو ماوەیەدا گەیشتنە نزیکەی یەك ملیۆن کەس. ئەگەر ئامارێکی ڕەسمیشمان لەبەر دەستدا نەبێت، بۆ ئەوانەی بەسەلامەتی گەیشتنە ئەو شوێنانەی بە زۆر تیایاندا نیشتەجێ کران، ڕێی ئەوەمان لێ ناگرێ بەدڵنیاییەوە بڵێین ژمارەی ئەوانەی بەدەم ڕێوە لەبەر سەرماو ماندوو بوون و، برسێتی مردن، ئەوانەشیان کە بەدەستی ئەو سەربازانەی تورك کوژران، کە بۆ پاسەوانی لەگەڵ ئەم ڕانە مەڕە مرۆڤانەدا هاتبوون، ئێجگار زۆر بوون(٤٦). ئەم وێنە مەرگەساتاوییە لەم ڕۆژگارەدا بەجۆرێك پەرەی سەندووە، کە هەزارەها گوند و شوێنەراو ڕەزو باخ تەخت و سووتاو و بێ مرۆڤ بهێڵرێنەوە.

---

(٤٥) بلەچ شێرکۆ، کێشەی کورد، دێرینەو ئێستا، و. محەمەد باقی چاپی سێیەم، ١٩٩٢، ل ٨٧.

(٤٦) هەمان سەرچاوە. ل٨٧، ساڵی ١٩٢٣ و لە سێی ئازاری ١٩٢٤ دوای ئەوەی ئەنجومەنی باڵای ئوممە هەڵوەشێنرایەوە. کەمال ئەتا تورك بە بڕیارێکی ڕەسمی بەکارهێنانی زمانی کوردی و خوێندن و بڵاوکردنەوەی بە زمانی کوردی قەدەغە کرد.

بڕوانە ها-ف موریس و جون لوج. لا اصدقاء سوى الجبال، ترجمة راج آل محمد. مراجعة وتقديم هادي العلوي لبنان، ص ١٦٢.

بە پێویستی دەزانین لە شوێنی بایەخدان بە فێربوونی زانست و زانیاری و ئەو گفت و بڕیارانەی لەسەکۆ نێو دەوڵەتییەکاندا لەمەڕ کورد دراون، لە بری کردنەوەی قوتابخانە و فێربوونی زمانی کوردی ئەم وێنە دڵتەزێنە بخەینە ڕوو، ئینجا دەزانین گەلی کورد چتۆ گەلێکی غەدر لێ کراوە و غەدرەکەش پلە بە پلە فرەو توندتر بووە.

بە بیانووی بەرپا بوونی شۆڕشی ئاگری داخ ژمارەی (٣٢٠) گوندیان کاول کردو دانیشتووانی ئەم گوندانەشیان کە ژمارەیان (١٠٠٠٠) کەس بوون هەموویان پیرو منداڵ و ئافرەت بوون، لە دۆڵی (زیلان)دا کۆ کردنەوەو بە فرۆکە ئاگر بارانیان کردن بە ناشیرنترین شێوە هەموویان لەناوبردن. زیاتر لە (١٠٠) رووناکبیری نیشتمانپەروەری کوردیان گرت و هەر بە زیندوویەتی خستنیانە زەریاچەی (وان)ەوە.

لە دەوروبەری جۆلە مێرگ مەڵبەندی هەکاری (٣٠٠) گوندیان سووتاندو زیاتر لە (٥٠٠) ئافرەت و منداڵی ئەو ناوەیان بە دڕندانەترین شێوە کوشت. لە نزیك هەردوو چیای ئاگری داخ و تەندرك (٤٠٠) گوندیان کاول کرد. لە ناوچەکانی بەرەو چاڵدێران (٨٣) گوندیان کاول کرد و (٥٩٠) کەسیشیان کوشت. لە پارێزگای هەکاری بەرەو بیت الشبابیش نزیکەی (١٢٠) گوند و کێڵگە سووتێندران و کاول کران[٤٧].

هەروەها ئورلینی زاگوردوف-ی بولگاری لەمەڕ تراژیدیای کورد لە بوارەکانی ڕۆشنبیری و فێرکردن و تەندروستی لە کوردستاندا ئەمەی نووسیوە: ٣٣٦ پۆلیسخانە و پاسگەی جەندرمە لە نۆ ویلایەتی لە تێکڕای هەژدە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا هەن، کە زۆربەی دانیشتووانیان کوردن کەچی تەنیا ٥٠ مامۆستا و ٢٠ پزیشك و ٦ دەرمانخانەیان هەیە، لە وڵاتدا کوردستان لە بارەی منداڵ مردنەوە لە پلەی یەکەمدایە[٤٨].

ئەم باسەمان بۆ ئەوە خستووەتە بەرچاو کە بزانین کورد چەند زوڵمی لێ کراوە، لە بری زانست و خوێندن هەموو توانایەك بۆ پڕ چەککردن و بڵاوکردنەوەی سەرباز و سەربازگە و پۆلیس دراوە، کە لە بری ئەوە دەتوانرێت توانا مادییەکان بۆ پەرەپێدانی ڕۆشنبیری و سەقامگیر کردنی ئەم نەتەوە دێرینە خەرج بکرێ.

لە تازەترین وێنەی قەدەغەکردنی زمانی کوردی لە سەرەتای هەشتاکاندا ڕێك لە ١٥-

---

(٤٧) هەمان سەرچاوە، ل ٩٥

(٤٨) هەمان سەرچاوە، ل ٧٤.

١٩ی حوزەیرانی ١٩٨١، نووسەری دیاری کورد محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان لە کۆنگرەی یەکێتیی نووسەرە نێودەوڵەتییەکاندا لە شاری (لاتی)، فینلەندا بەسترا، وەها گوتاری داو سەرنجی ئامادەبووانی بۆ وێنە دڵتەزێنەکانی چەوسانەوەی کورد ڕاکێشا و گوتی:

تکا دەکەم ئایا دەتوانن بیخەنە بەرچاوتان کە زمانێك هەیە و ناتوانی پێی بنووسرێت؟ ئایا دەتوانن بیخەنە بەرچاوتان کە ئەدەبێك هەیە و ڕێ نادرێت بنووسرێت یان بخوێندرێت؟ ئایا دەتوانن بیخەنە بەرچاوتان کە گەلێك هەیە ژمارەی لە دە ملیۆنە ڕێی پێ نادرێت کە زمان و ئەدەبەکەی خۆی بەکاربهێنێ؟

ئایا دەتوانن بێننە بەرچاوتان کە ڕۆشنبیرێك هەیە گەفی نەمانی لێ دەکرێت؟ ئایا دەتوانن بیخەنە بەرچاوتان کە بەملیۆن منداڵ هەن ڕێیان پێ نادرێ کە بەزمانی دایکیی خۆیان بخوێنن و ڕێیان پێ نادرێ جگە لەوە کە زمانێکی بێگانە بەکاربهێنن؟ ئایا دەتوانن بیخەنە بەرچاوتان کە دەوڵەتێك هەیە مۆری لەسەر ئەو یاسا و پەیمانە دەوڵەتییانە کردووە کە پەیوەندییان بە مافەکانی مرۆڤەوە هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەیەوێت ڕۆشنبیری و وێژەی گەلەکانی لەناو ببات، زمانیان بەرامبەر بەگەلەکانی تری جیهان قەدەغە بکات کە پڕن لە ڕێکخراوی مافی مرۆڤ[٤٩].

ئەمە لە نوێترین سەردەمدا دەبینرێت، لە عێراقیشدا لە تەك بوونی کورد لە دەستووری عێراق و بڕیاری ئازاری ١٩٧٠ و پەرەسەندنی خوێندن و خوێندەواری بە زمانی کوردی و بوونی دەزگای ڕۆشنبیری و هتد، لە سەرەتای هەشتاکان بڕیاری قەدەغەکردن و گۆڕینی خوێندنیان دا، بەڵام ڕووبەڕووی هەڵمەتی مانگرتن و خۆپیشاندانی قوتابیان بوونەوە و نەیانتوانی ئەم بڕیارە جێبەجێ بکەن. کە دەزانین لە سەد ساڵی ڕابردوودا لەتەك پەرۆشی ڕۆشنبیرانیی کورد بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندن و فێربوون بە زمانی کوردی و سوود وەرگرتن لە زانستەکانی سەردەم، بە سەدان قوتابخانەش داخراون و یا تێکدراون لە گوند و شارۆچکەکان.

لە وێنەیەکی تری بچووکی مەسەلەی خوێندەواری لە شارێکی کوردستاندا (دیاربەکر) بەم جۆرە باسی خوێندن دەکرێت، ئەم باسە دوایین ساڵەکانی سەدەی بیستەمی مەبەستە: بارودۆخی خوێندن لە دیاربەکر زۆر دژوارە، چونکە دەوڵەتی تورکیا لەسەر

(٤٩) ڕێگای ئاشتیی، سۆسیالیزم، ژمارە (١٩)ی ئابی ١٩٨٩ ل ٧٥.

سیستمێکی سەرمایەداری دواکەوتوو دەڕوات و کەرەستەی قوتابخانە وەك قەڵەم و دەفتەر و شتی وا بە پارەیە و کەم کەس دەتوانێت خوێندن تەواو بکات و بگاتە کۆلێژەکان بۆیە چینی فەرمانبەران ژمارەی زۆر کەمە و (١٠٪)ی خەڵکی بەڕێکوپێکی خوێندن تەواو دەکەن.

بەڵام چینی خوێندەوار بەتایبەتی قوتابیانی زانکۆ و زانکۆی دیجلە لە دیاربەکر هەیە و چینێکی زۆر شۆڕشگێڕ و پێشکەوتخوازە و بیروباوەڕی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لەناو خەڵکدا بڵاو دەکەنەوە و تەنانەت جار ناجار دژی دەوڵەت خۆپشاندانیش سازدەکەن و زۆر بە پەرۆشەوە بەشداری لە بۆنە نەتەواتییەکاندا دەکەن وەك جەژنی نەورۆز و هتد. بەدڕندانەترین شێوەش حکوومەت هەوڵ دەدات، هەستی رزگاریخوازیی قوتابییان و زەحمەتکێشان کپ بکاتەوە(٥٠).

لەم وێنەیەدا، دەگەینە وێنەیەکی تری پەرەسەندنی مەسەلەی بایەخدان بە زمان و خوێندنی کوردی لە کوردستاندا. زانکۆی سەلاحەدین و سلێمانی و دهۆك و ژمارەیەکی زۆری پەیمانگاو سەدان قوتابخانەی هونەری و پیشەیی و ئامادەیی و ناوەندی و سەرەتایی بە زمانی کوردی لە کوردستاندا – (باشوور) هەن، بڵاوکراوەی کوردی و پەخشی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی کوردی هەیە لە ئێران. لە تورکیاش لەم دوو ساڵەدا باسی دانی مافی ڕۆشنبیرانی کوردان هاتووەتە پێشەوە و باس لە ڕێگە دانی پەخشی کوردی کەناڵی ئاسمانیی تەلەفزیۆن و خوێندن بە کوردی دەکرێ و ئەم مەسەلەیەش گرێ دراوە بە دواڕۆژی تورکیا لە چوونە ناو بازاڕی ئەورووپای هاویەش. ڕاستە کورد وەکو نەتەوەیەکی دێرین نەیتوانیوە وەکو گەلێکی ئازاد و سەربەخۆ سوود لە تەواوی مافی

(٥٠) (رزگاری، دیاربەکر مەڵبەندی چەوسانەوە و ئەڤین ژ (٧) ٣/٤/١٩٩٤. ل ٤

کۆچی ناوخۆیی کوردان لە تورکیا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە دواکەوتنی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتدا هانی زۆر لاوی کوڕ و هەندێك کچی زیرەکی دا بچنە شارە تورکییەکان لە پێناو فێربوون. لەنێو ئەو کەسانەدا کوڕ و کچی ئاغای دەوڵەمەند بوون پارەی زۆریان خەرج دەکرد. لە قوتابخانە و زانکۆکان ئازادی و پێشکەوتنی ئابوورییان لە شارە تورکییەکاندا دەگەڵ دواکەوتن و هەژاری سەرکوتی ناوچە کوردییەکان بەراوردیان دەکرد، زۆربەیان بەرەو فکری چەپی تورکی چوون، بەلایەنی کەمەوە ئەو کوردانە کە بۆ گوندەکانیان وەکو مامۆستا و مووچەخۆر گەڕانەوە، بۆ نەوەی نوێ ئەو شتانەیان دەگوازنەوە، کە بینیبوویان.

بڕوانە، ها–ف موریس و جون بلوج، ترجمة راج آل حمد ل ١٦٥

لا أصدقاء سوى الجبال.

مرۆڤانی و نەتەوەییەکانی وەرگرێ و لەم بارەشەوە چۆن وەکو مرۆڤ و خاك جینۆساید دەکرێ، لەمەڕ خوێندن و فێربوونیش لەبەردەم شالاوی جینۆسایدی شێواندن و قەدەغەکردنی زمان و بلاوکردنەوەیە.

باشترین ئاماژەیەك لەم باسەدا ئەوەیە کە کلنتۆنی سەرۆکی ئەمریکا لە ڕۆژی ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩٩ پێشکەشی پەرلەمانی تورکی کردو لەمەڕ خوێندن بە زمانی زگماکی کوردی گوتی: «لە ئەمریکاش کە زمانی هیندییە سوورەکان لە قوتابخانە کە دووچاری باری دەروونی و نالەبار هاتن تا گەیشتنە ئەوەی لەم ترسەی لە ئەنجامی بەکارهێنانی زمانی زگماکی لە ئەمریکا دووچاری هاتبوون، مەرگیان پێ خۆشتر بوو. کوردەکانی تورکیاش لە بەرکارهێنانی زمانی کوردی لە قوتابخانە ناوخۆییەکان وان. بەکارهێنانی زمانی دایك لە قوتابخانەکانی کوردستان و شوێنەکانی تر نەك هەر قەدەغەیە بەڵکە لە ئاکامدا دووچاری ئەشکەنجە و لێدانیش دەبنەوە. پێویستە فێرکردنی شوێنی ترس بگرێتەوە. کورد و تورك دراوسێ و هاوبەشن لە بازرگانی و پەرەپێدانی سیاسەتی پەروەردەیی. کە ئەمەش پێویستی بە شێوەیەکی سیاسی لەبار هەیە بۆ ڕێزگرتنی مافی کۆمەڵگای کوردی لە فێربوون و خوێندن بەزمانی کوردی، لەگەڵ هاندانی منداڵانی تورکیا بۆ قسەکردن بە هەردوو زمان. ئەمە قسەکانی سەرۆکی ئەمریکایە. کە کورد خۆشی لەمە زیاتری لە ئەستۆیە بۆ فێربوون و بلاوکردنەوەی خوێندنی کوردی(٥١).

---

(٥١) (سەرنووسەری گۆڤاری WAR سەعید فەرۆژ لە دیاربەکر دەڵێت: ٦ پەرتووکی منداڵانمان دەرکرد، (١٠) دانەمان دایە نووسینگەی گۆڤاری (ڕۆژا تازە) بۆ فرۆشتنی. کە پۆلیس دەستی بەساردا گرت ئەو (١٠) پەرتووکەشی بردبوون گوتبوویان: «ئێوە بەو پەرتووکە مێشکی منداڵان دەشێوێنن، زمانی کوردی هەر نییە، ئێوە کێ فێری زمانی کوردی دەکەن، هەروەها دەڵێن هەزاران خوێندەوار لە کوردستاندا هەن، زانکۆ هەیە «راية الحرية، خطاب الرئيس الامريكي (بيل كلنتون) في الجمعية الوطنية، تركية العظمى (البرلمان) بتأريخ ١٥ تشرين الثاني ١٩٩٩، ترجمه عن الانترنت د. سعدي البرزنجي، رئيس جامعة صلاح الدين العدد (٩) ١/٢/٢٠٠٠ ل ٤» هەموویان خوێندن و نووسینی لاتینی دەزانن، کەچی ڕێژەی فرۆشتنی هەموو بلاوکراوە کوردییەکان زۆر کەمە. ئێمە (١٠٠٠) دانە لە WAR چاپ دەکەین و تەنیا (٥٠٠) دانەی لێ دەفرۆشرێ. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە هەست و بیری نەتەوەیی لەنێوماندا دروست نەبووە بە شێوەیەکی گەلێری و جەماوەری بلاو نەبۆتەوە.

بڕوانە میدیا. دیدارێك لەگەڵ سەعید فەرۆژ سەرنووسەری وار– ژ (٧٨) ١/١١/٢٠٠٠ ل ٤.

# هەنگاویك بۆ پەرەپێدانی خوێندەواری
# لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا

کوردیش بەهۆی گۆڕانکارییە گەرماو گەرمە گەورەکانی ناوچەکە دووچاری گەلێك کێشەو ئاستەنگ هاتووە، لەتەك بە پیلەوە چوونی ڕووداوەکان، هەمیشەش باجی قورسی داوە. لەمەڕ مەسەلەی خوێندەواری و خوێندنیش هەروا بووە. کوردستانی باشوور دوای شەڕی قورسی یەکەمی جیهانی کەوتە ژێر ڕکێفی ئینگلیزەکان. ویلایەتی مووسڵ و ئەو سیستەم و ئیدارەی هەبوو نەما، کورد کرایە قوربانیی ئەو نەتەوەی هەبوو، سیڤەر خرایە دواوە و بەرژەوەندە نێو دەوڵەتییەکان لەمەڕ کورد بە لۆزان کۆتاییان هات.. ئەمەش ڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر دواڕۆژی خوێندن و باری ڕۆشنبیری جێ هێشتووە.

ڕەفیق حیلمی لە وێنەکێشانی باسی سەردەمەکە گوتیەتی: «لە تەمەنی پانزدەساڵیدا، کە هێشتا لە قوتابخانەی ناوەندی دەمخوێند، دەسم دابووە شیعر وتن، بەڵام ئەوساکە خوێندن لە وڵاتەکەماندا و لە هەموو عیراقدا بە (تورکی) بوو، بۆیە منیش بە تورکی شیعرم دەهۆنییەوە، چونکە دەبێ ڕاست بڕۆین کە هێشتا بیری نیشتمانی و میللەت لەوێ بمێنێ، تەنانەت باسی هەرچی شتێك کە ببێتە هۆی ڕووناکیی مێشکمان لەم لایەنەوە، ڕێی بەبیری ئێمەدا هاتنی نەزانیبوو و نەیدۆزیبۆوە.

ئینجا دیارە کە ئەو شیعرانەی دەوری منداڵیم بریتی بوو لە لاساییکردنەوەیەکی ئەو شاعیرە تورکانە کە لەو سەردەمەدا ناوێکیان هەبوو، لەو گۆڤارو نامیلکەکانی ئەو ڕۆژانەدا بەرچاومان دەکەوتن و دەمانخوێندەوە. نەك من وەیا ئەوانەی کە ئەو ڕۆژە لە تەمەنی منا بوون، تەنانەت شاعیری بەرزو ناوداری کورد، عورفی بەگی (دیاربەکری) کە یەکێ بوو لە نیشتمانپەروەرەکانی کورد، و خلووصی بتلیسی، (مودەعی عموومی)، یەکێ لە کوردە ناودارەکانی بتلیس، هەر بە تورکی دەیاننووسی و شیعریان دادەنا». ئینجا دەڵێت: «چ من و چ خوێنەرە کوردەکانی تری ئەم ڕۆژگارە هەر بە تورکی لەسەر نووسین و شیعر وتنەوە ڕۆیشتین»(٥٢).

---

(٥٢) ڕۆشنبیری نوێ، گەشتی ڕەفیق حیلمی و قەڵەم، پرۆفیسۆر د. عزەدین مستەفا ڕەسول ژ (١٠٨). کانوونی یەکەمی ١٩٨٣، ل ١٤٣.

ئەمە وێنەیەکی کتومتی سەردەمانی دەسەڵاتی عوسمانییە، ئەو سەردەمانەی خوێندن بە تورکی زاڵ بووە، تەنیا لە کوردستاندا بە هۆی هەلومەرجی سیاسی. کۆمەڵایەتی خوێندن بە تورکیش زۆر بڵاو نەبووەتەوە، ژمارەیەکی کەم قوتابخانە کراونەتەوە، هەر تەنیا «حوجرە» پێگە و بنکەی فێربوون بووە، لەمەش خراپتر لەناوچوونی ئیمارەتەکانی کورد (بابان، سۆران، بۆتان، بادینان، ئەردەڵان..) بووە. سەرباری ئەوەش خوێندن لەو کاتدا گرفتی زۆری لەبەردەم بووە. گرفتەکانیش تەنیا هۆکاری سیاسی نەبوون، بەڵکە پەیوەست بوون بە کۆمەڵێك کێشەی تر، کە ئەم کۆسپ و کێشانەش کاریگەرییان لەسەر ڕەوشی خوێندن لە کوردستان هەبووە و پرۆسەکەیان سست کردووە. لەو هۆکارانە کەمیی ژمارەی مامۆستایان و بەتایبەتی زۆربەی مامۆستایانی سەردەمی عوسمانی ئەفسەر بوون، لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا چوونەوە ریزی سوپا، سەرباری کەمیی بینایەی قوتابخانە لەلایەن سوپای عوسمانییەوە بۆ مەبەستی شەڕیش بەکاردەهێنران، خاڵێکی تر کەمیی میزانیەی خوێندن بووکە (٤,٠٪) کە دەیکردە (٦٥٠٠) ڕوپیە بۆ مەعاریف تەرخان کرابوو، ڕەنگە گرفتی تری هەرە گەورەشی، سیستەمی خوێندن بوو بێ"(٥٣).

د. عزەدین مستەفا ڕەسوول لەمەڕ هەلومەرجی سەردەمی کۆن لە کوردستاندا وەها باسی سەردەمەکە دەکات: موڵکی بابان کەوتبووە چنگی ڕۆم، نالی بە ئاوارەیی سەری نایەوە، سالم هەر بەدەردی میحنەتی شارو غەریبی مرد. لە شوێنی مەشخەڵی شیعری بابان و دەرسی کوردی، شێخی نۆدێ و حاجی قادر وتەنی هەر کاك ئەحمەد مابوو بە کوردێ دەرسی شەرعی دەوتەوە. لە نەمانی میرنیشنی بابانەوە تا حوکمڕانیی شێخ مەحموودی حەفید، نەخشەی وشەی کوردی بەو چەشنە بوو. کە هەر ترووسکەیەك لە مزگەوتا مابوو، مەحوی و شێخ ڕەزا و خاکی و موخلیس و هەندێکی تر دەیانویست، مەشخەڵەکەی نالی و سالم و کوردی نەکوژێتەوە بەڵام لە لایەکی ترەوە "ڕوشدی عەسکەری" لاوانی لە مزگەوت دادەبڕی و بەرەو ئەستەنبولی دەبردن و دەیویست هێزی مێشك و بازوویان بۆ خزمەتی سوپای عوسمانی بەکاربێنێ. ئەوە بوو لەوێ دەبوون بە ئەفسەر کە دەستیان دەدایە قەڵەم بە تورکی دەیاننووسی، ئەگەر بۆ کوردیشیان بنووسیایە ئەوا ڕەفیق حیلمی لە هەمووان ڕاستگۆیانەتر وتی: بەڵێ شیعرەکان بە تورکی بوون، بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم قسە دەکەم، ئەو شیعرانەی کە بە تورکی دامدەنا

(٥٣) حنان يحيى الجبوري، مشكلات ادارة المدرسة الثانوية في العراق، بغداد، ١٩٧٠، ل٩٠.

هەمووی بۆ کورد بوو، وەیا فریادی کوردستانی تیا دەبیسترا لێرە لای مەلا شاعیر و خوێندەوارەکانمان هاوکێشێك لە نێوان بە کوردی و بە زمانی تر نووسین هەبوو، بەڵام زۆر بە قورسی بەلای کوردیدا دادەشکا: وەلێ لە ئەستەنبول لەگەڵ هەڵهاتنی گزنگی ڕۆژنامەی «کوردستان» دەرچوونی کۆمەڵێ گۆڤاری وەك «ڕۆژی کورد» و «ژین»دا دیسان هاوکێشێك لەنێوان بە تورکی و کوردی نووسیندا هەبوو و زۆرتر فریادی کوردستانە کە بە تورکی دەبیسترا.

ئەم هاوکێشە لە بەرهەمی زۆربەی شاعیرو نووسەرانی ئەو سەردەمدا دەبینرێ و لای هەریەکەیان بە جۆرێکە. ڕۆژگار زۆر ناخایانێ، جەنگی یەکەمی جیهانی بەرپابوو، ئەو دەوڵەتە مەزنەی پێی دەوترا «پیاوی نەخۆش، یا زەلامی نەخۆش» وەك لاڵ لەبەر دەستی دوژمنانیا کەوت و ئەو خاکەی لە خەڵکی داگیر کردبوو سەرلەنوێ لە نێوان ئەواندا دابەش کرا، خاکی کوردیش بەشی ئەوە بوو کە دەیزانین. بەڵام لە نێوان دابەشکردنەوەو جەنگدا چەند ساڵێکی هەژاندن و ڕاپەرین هەیە، کە لە مێژووی کورددا ڕەفیق حیلمی خۆی لە (یادداشت)ە بەنرخەکانیدا سەرناوی (کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی) بۆ هەڵبژاردووە. تاك تاك و پۆل پۆل ئەو خوێندەوارانە لە ئەستەنبۆلەوە دەهاتنەوەو هەریەکە بەچەشنێك قۆڵی لێ هەڵدەکرد(٥٤).

ساڵی ١٩١٣ ئیبراهیم حیلمی لە وتارێکی کە لە گۆڤاری (لغة العرب) جزمی چوارەمی بڵاوکردووەتەوە وەها وەسفی سلێمانی دەکات: دانیشتووانی لیوای سلێمانی دەگاتە (٥١,٦٠٠) کەس و بەسەر (٥) قەزاو (٣٥٣) دێ دابەش بووە. شارەکە (٥) هەزار ماڵ دەگرێتەوە خۆی، زیاتر لە (٥٠٠) دوکان و (٧) گەرماو چەند جێگایەکی بۆ پێستە خۆشکردن تێدایە. هەروەها زیاتر لە (٢٠) قوتابخانەی سەرەتایی هەیە، دوو قوتابخانەی ئامادەییشی لێیە، یەکێکیان مولکییە و ئەوەکەی دیکەیان سەربازییە. لەو سەردەمی دوایيدا میری هەردووکیانی دروست کرد، کە سوورە لەسەر ئەوەی دانیشتووانەکەی خوێندەوارو پێشکەوتووبن. ئەوانەی تاکو ئێستاش لە دەوری نەزانین دان، دیان و جوولەکانیشی هیچ قوتابخانەیەکیان نییە. (٤٠) مزگەوت و کەنیسەیەکی بچووکی تێدایە. هەروە کلێسایەکی بچووکی جوولەکەکانیشی لێیە.

لەبارەی زمانەوەش دەڵێت: ئەو زمانەی تێیدا بەکاردێت کوردییە، هەرچەندە ئەوە زمانی دانیشتووانەکەیە، بەڵام عارەبیش دەزانن، زۆربەشیان شارەزایی تەواویان تێیدا

---

(٥٤) ڕۆشنبیری نوێ، ژ(١٠٨).

هەیە، تەنانەت زانایانی بەنێوبانگ و نووسەران و شاعیران و زمانەوان و مەلای زۆری تێدا هەڵکەوتووە، لەوانەش هەندێکیان لە خزمەتکردنی حکوومەتدا پێشکەوتن و پلە و پایەی بەرزیان دەستگیر بووە. هەندێکیشیان بەهرەی نووسین و رەوانبێژی و زمان پاراوییان بەدەست هێناوە و بەچەند زمانێکی وەکو فەرەنسایی و فارسی و تورکی قسە دەکەن. زمانی تورکیش فەرمانبەرانی میری و هەموو خاوەن دیوەخانەکان قسەی پێ دەکەن، بەڵام لەپاش زمانی تورکی زمانی عارەبی لە هەموو زمانەکان باوو بڵاوترە(٥٥).

هاتنی ئینگلیز گۆڕانێکی سیاسیی دروست کرد، کاریگەریی لەسەر زۆر بوار جێ هێشت، کورد ئەگەر بەرەنگاری ئینگلیزیش بووبێتەوە، بەڵام لە ئاکامی هەلومەرجی تازەدا حکوومەتی کوردستانی خواروو دروست بوو، خوێندنی قوتابخانەکان لە فرەبوون دابووە، زمانی کوردی خەریك بوو بچەسپێت و ببێتە زمانی خوێندن و کورد بەرە بەرە پەرەی بە بووژانەوە و سەرهەڵدانی هوشیاریی نەتەوەییی خۆی دەدا، نوێنەرە کوردەکان لە پەرلەمانی عێراقیدا داوای مافەکانیان لە ڕووی (خوێندن بە کوردی و پەرەپێدانی ڕۆشنبیری) بە ڕوونی دەکرد.

دوای هاتنی ئینگلیزو ویلایەتی مووسڵ(٥٦) گوڕا، تەنیا مووسڵ خۆی دەگرتەوە، ناوچە

---

(٥٥) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، لیوای سلێمانی، ئازاد عەبدولواحید کردوویە بەکوردی، ژ (١١٦) کانونی یەکەمی ١٩٨٨ ل ٦٢.

(٥٦) مووسڵ شارێکی وازلێهێنراوی کوردییە، بوونی ویلایەتی مووسڵ بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ کوردی بوونی ئەم شارە لەدێر زەمانەوە زۆر لە گەڕیدە و جوگرافی ناسەکان دوای رووخانی نەینەوا ساڵی ٦١٢ پێش زایین دەڵێن، ئەم شارە لەسەر بەشی ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە هەڵکەوتووە لەبەشی ڕۆژهەڵاتی، نووسینەکانی (ئەلئەزەری ساڵی ٩٤٥ز) مردووە و ئەلمەسعوودی ساڵی ٩٥٦ز مردووە و ئیبن حوقل ساڵی ٩٧٧ز مردووە و ئەلئەنساری کە ساڵی ١٣٢٦ مردووە دەڵێن، کورد لە مووسڵ لە زەمانی کۆنەوە جێگیر بووە. لەناو شارەکە و دەرەوەیدا گەڕەکیان هەبووە. باشترین بەڵگەش ئەم وتەیەی جەنەراڵ (ساندرس)ە کە لە کردنەوەی پردی نوێ کە مووسڵ بە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە دەبەستێتەوە کە وتوویەتی و لە ژمارە (٣٥١)ی ڕۆژنامەی (الموصل) کە لە ڕۆژی ٢٢ ئازاری ١٩٢١ دەرچووە، بڵاوکراوەتەوە و دەڵێت: «ناشاردرێتەوە کە دەسکەوتی ئەم پردە دەبێتە ئەڵقەیەکی گرینگ لە ئەڵقەکانی گواستنەوە کە وڵاتی کوردستان بە عێراق دەبەستێتەوە...». لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتیش کە لە کێشەی مووسڵیان کۆڵیوەتەوە ئاماژەیان کردووە کە «ئەو کۆمەڵە بەیەك بەستراوەی کە لە ناوچەیەکی فراوان دانیشتووە، کورد و عەرەبن، ئەو هێڵەی ئەم دوو نەژادە لێك دەکاتەوە ڕووباری دیجلەیە». بڕوانە د. عبدالفتاح علي بوتانی، مدرسة ١١ آذار اول مدرسة ص (١٤-١٥).

کوردییەکان وەکو چوارەم ناوچە هاتە ئاراوە کە شارەکانی کوردستانی دەگرتەوە، هەروەها هەر لەو دەمدا حکوومەتی کوردستانی خواروو بەرێبەرایەتیی شێخ مەحموود وەکو ناوچەیەکی دەسەڵاتی سەربەخۆ دەست بەکار بوو. پشکنەر بەرپرسی کاروبارەکانی مەعاریفی کوردستانی دەکرد و ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە مەعاریفی گشتی لە بەغدا هەبوو. لەبەرئەوەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ، ڕەگو ڕیشەی کۆنی بەکوردەوە وابەستە و ناوچەیەکی زۆری کوردنشینی لە مووسڵ هەن و بەشێك لە گەڕەکەکان کوردی تێدا دەژین و ئەم ویلایەتە مانای کوردستان و ناوچە کوردنشینەکانی گەیاندووە، بەکردەوەش شارێکە ئێمە پشتگوێمان خستووە. بۆیە لەم باسەدا دەبێت ئاماژەی پێ بکەین و بایەخی پێ بدەین.

دوای هاتنی ئینگلیز لە ساڵی ١٩١٨ بۆ مووسڵ. کابتن (ئەدورد بیز) کە سەرپەرشتیاریی مەعاریفی مووسڵی دەکرد، دەگەڵ کۆلۆنێل (لچمان) بەیەکەوە زنجیرەیەك سەردانی قوتابخانەکانی ئەم شارەیان کرد، زۆربەی قوتابخانەکانیان لەبەر کەمیی مامۆستا داخست. بەڵام داوایان لە قوتابییەکانی ئامادەیی کرد، دەوام بکەن. یەکەم دواناوەندیی رەسمی ساڵی ١٩١٩ لە مووسڵ کرایەوە.(٥٧) لەوکاتدا (٦) قوتابخانەی سەرەتاییی کوڕان و سێ قوتابخانەی سەرەتاییی کچان و قوتابخانەی ئامادەیی و پیشەسازی و خانەی مامۆستایان و ژمارەیەك قوتابخانەی مەسیحی و جووەکان هەبووە. لە کانوونی یەکەمی ١٩١٨ بەدەستپێشخەریی (بیز) هەموو قوتابخانەکانی عوسمانی داخران تەنیا (مدرسة الوطن) نەبێت.(٥٨)

پێچەوانەی زانیارییەکانی پێشوو د. عەبدولفەتاح علی بۆتانی دەڵێت، ئامادەییش داخراو قوتابییەکانی بەسەر قوتابخانەی (الوطن) و (الخضرية) دابەش کران و قوتابخانەیەکی تازەی سەرەتایی بەناوی (الخزرجية) و دوو قوتابخانەی کچانی لە ساڵی ١٩١٩ بەناوی «حديقة المعرفة» و «الخزاميه» کردەوە بەدوای ئامادەکردنی مامۆستایانی پێویست بین، هەندێك قوتابخانەی کردنەوە کە پێشتر لە مووسڵ دای خستبوون، یا لە ناوچەکانی سەر بەم هەرێمە وەکو دهۆك و ئاکرێ و زاخۆ.(٥٩)

ئەو کاتە ئارامی نەچەسپا بوو، کوردستان بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری بابەتی و خودی

---

(٥٧) حنان عيسى الجبوري، ل٩٦.

(٥٨) د. عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١ آذار ل٣١.

(٥٩) هەمان سەرچاوە ل٣١.

وەزعی هێندە باش نەبوو، تا بە سەرسامییەوە باسی بکرێت، هەرچەندە هاتنی ئینگلیز زۆرشتی گۆڕی، پێشکەوتن و مەدەنیەت و بەرنامە و سیستەمی خوێندن کاریگەریی زۆریان هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا مەینەتییەکان لەوە زۆرتر بوون بەچەند هەنگاوێکی بچووك سارێژ بکرێنەوە. ئەگەر ئینگلیز بۆ نەتەوەی عەرەب بووە خۆشی و دامەزراندنی کیانی عێراق، بەڵام بۆ کورد وەها نەهاتەوە.

نوێنەرانی ئینگلیز کە مەعاریفیان بەڕێوە دەبرد، بەشێوەیەکی گشتی هەموویان ئەو ڕێچکەیان دەگرت کە لەسەرەتاوە دایان نابوو، دوای مێجەر (بوومن)یش لەسەر هەمان ڕێگە ڕۆیشتن، ناوەندی پیشەسازی لە بەغدا و بەسرە کرانەوە، دواناوەندیی کەرکووك و سلێمانی کرانەوە(٦٠).

نەتەوەی کورد نەیتوانی وەکو عەرەب سوود لە هەلومەرجی تازە وەربگرێ، نائارامی و شۆڕش و پەلاماری عەسکەری دژی کوردستان درێژەی هەبوو. بەریتانییەکان بۆ یەکەم جار لە کوردستاندا قوتابخانەیان بە زمانی کوردی کردەوە، کە ئەو کاتە لە عێراقدا ساڵی ١٩١٩ (٧٥) قوتابخانەی سەرەتایی هەبوون، پتر بەزمانی عەرەبی دەخوێندرا کە ژمارەیان (٥٦) قوتابخانە و بە تورکی (١١) و (٧) قوتابخانەش بە زمانی کوردی تێیدا دەخوێندرا، لەناویاندا قوتابخانەی کوردی گوندی (ئەلگو گجلی) شەبەکان بوو. عبدالرزاق ئەلهلالی دەڵێت لەم قوتابخانەیەدا بە زاری (شەبەك)ی کوردی دەرس دەگوتراوە کە هەندێك گوندی دەورو پشتی مووسڵ قسەی پێ دەکەن(٦١).

بە پێی سەرژمێریی ساڵی ٢٠-١٩٢١ ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکانی عێراق (٨٨) قوتابخانە و ژمارەی مامۆستایانی (٤٨٦) و ژمارەی قوتابییەکانیشی (٨٠٠١) بووە.

---

(٦٠) حنان عيسى الجبوري، ل ٩٨.

(٦١) د. عبدالفتاح علي بوتاني، ل ٣١

بۆ نموونە وەها باسی خوێندن و قوتابخانە لەو سەردەمەدا لە هەڵەبجە کراوە: تەنیا قوتابخانەیەکی سەرەتایی بەناوی (قوتابخانەی یەکەمی سەرەتایی) لە هەڵەبجە هەبووە کە ئەوکات بینایەی حکومی بۆ قوتابخانە نەبووە. لە ماڵە کۆنەکانی (کەریم بەگی داود بەگ)دا دەخوێندرا. ئەویش دەکەوتە بەشی خۆرئاوای شارەوە. ئێستا کارگەی پاکژکردنەوەی تووتنە. قوتابخانەیەکی ناوەندییش هەبووە. ئەویش لە خانووی خەڵك لە پشت (سەرا)کەوە بوو. زۆربەی منداڵان لە (حوجرە و مزگەوت و تەکیە) دەیانخوێند.

بڕوانە: گۆڤاری خەرمانە، کەشکۆڵ، هەڵەبجە لە هەڵدێری مێژوودا، ژ (٨) ساڵی ١٩٩٣ ل ٤.

سەرباری ئەوانەش سێ قوتابخانەی دواناوەندی لە مووسڵ و بەغداو بەسرە هەبوونە و ژمارەی مامۆستاکانیان (٣٢) و (١١٠) قوتابیشیان هەبووە.[٦٢]

بەپێی ڕاپۆرتەکەی (ساطع الحصری) کە لە بیرەوەرییەکانی لەمەڕ خوێندنی ئامادەییی ساڵی ٢٢-١٩٢٣ بڵاوی کردۆتەوە دەڵێت ئەوساڵ لە بەغداو مووسڵ واتە ساڵی یەکەمی خوێندن (شەش) قوتابی دەرچوون و دووەم ساڵ (٥) قوتابی. بەڵام لە قوتابخانەی دواناوەندی بەسرەو کەرکووك وەکو دوو قوتابخانەی پێشوو نەبوون، لەسەر بنچینەیەکی بەهێز دانەمەزرابوون، ژمارەیەکی کەم قوتابی تێیاندا دەوامیان دەکرد[٦٣].

ساڵی ٢٥-١٩٢٦ قوتابخانەی تازەی دواناوەندی لە شارەکانی عێراقدا دەکرانەوە، لە کوردستانیشدا هەمان ساڵ لە هەولێر و سلێمانی قوتابخانەی دوا ناوەندی کرانەوە، دوای ئەوەی ژمارەیەکی کەم قوتابییان بۆ پەیدا کرا. ژمارەی قوتابییانی دواناوەندیی کەرکووك (١٩) قوتابی بووە[٦٤].

لە ساڵی خوێندنی ٢٧-١٩٢٨دا لە ناوەندی هەولێر تەنیا (١٥) قوتابیی دەوامیان کردووە. کە ئەو کاتە سەرجەم قوتابییانی عێراق ژمارەیان (١٠٥٨) بووە و لە (١١) قوتابخانە لە شارە جیاکان دەیانخوێند. ساڵی ١٩٢٩ ژمارەیان گەیشتە (١٥) قوتابخانەی ناوەندی و (١٣٠٩) قوتابییانیش ناویان بۆ خوێندن تۆمارکراوە و ژمارەی مامۆستایانیش (١٣٠) بووە[٦٥].

کۆسپ لەبەردەم بەردەوامبوون لە خوێندن و تەواوکردنی پلەکانی خوێندن سەبارەت بە قوتابیی کورد لەم ڕۆژگارەدا زەحمەت بووە. چونکە قوتابییانی کورد لەوان ساڵاندا دەبووایە ڕوو لە کەرکووك و مووسڵ و بەغدا بکەن، ئەمەش ڕێگر بووە لەبەردەم تەواوکردنی خوێندن و بەدەستهێنانی بڕوانامە و پێگەیاندنی کادری پسپۆڕ بۆ پڕکردنەوەی ئەو پێداویستییانەی لە قوتابخانەکان دروست دەبوون، لەوکاتدا زۆربەی مامۆستایانی پیاو و ئافرەت لە مووسڵدا دەهێنرانە هەولێر و شارەکانی تر بۆ ئەوەی

---

(٦٢) حنان عیسی الجبوري، ل ٩٩.

(٦٣) هەمان سەرچاوە ل١١٣.

(٦٤) هەمان سەرچاوە ل١١٧.

(٦٥) هەمان سەرچاوە ل١١٨.

دەرس بڵێنەوە و منداڵی کورد فێری خوێندن بکەن. بۆ پتر خستنە ڕووی باری پەروەردە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠. ١٩٤٥ لەم خشتەیە بنۆڕن، ئەم خشتەیە سەرجەم عێراق دەگرێتەوە کە ڕێژەی کوردستان تێیدا زۆر کەمە.

**خشتەی ژمارە (١)**(٦٦)

| ساڵ | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی | ژمارەی مامۆستا |
|---|---|---|---|
| ١٩٢٠ | ١٩ | ٢٠٨٢ | ١٢٩ |
| ١٩٣٠ | ١٦ کوڕان ٣ کچان | ١٩٠٦ کوڕان ١٧٦ کچ | ١٢٧ پیاو ٢٢ کچان |
| ١٩٤٠ | ٦٠ | ١٣٩٥٩ | ٤٩٥ |
| ١٩٤٥ | ٧١ | ١١٣٠٩ | ٥٣٩ |

سەبارەت بە بایەخدان بە خوێندن لە کوردستاندا، دواکەوتن باڵا بوو. ناوچەکانی کوردستان بەدەست نەزانین و نەخوێندەوارییەوە دەیانناڵاند بەتایبەتیش کە هێشتا خوێندنی کوردی باو نەبوو. سەرەتای ساڵی ١٩٢٤ بایەخدان بە شارە کوردییەکان لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی عێراقی سەرنجی وەزارەتی مەعاریف ڕادەکێشێت. لێژنەی نێودەوڵەتی تایبەت بە کێشەی مووسڵ ڕاسپاردەی داوە کە خوێندن بەکوردی بڵاوبکرێتەوە، کۆمەڵەی گەلان لە ١٦ کانونی یەکەمی ١٩٢٥ بڕیارێکی لەم بارەوە وەرگرت و هەمان شتی بە نوێنەرانی بەریتانی لە بەغدا ڕاگەیاندووە. دیسان لە ساڵی ١٩٢٦ وەزارەتی ناوخۆ داوای کردووە بایەخی پتر بە فێرکردن و بڵاوکردنەوەی زمانی کوردی لە هەرێمی کوردستان بدەن. سیاسەتی وەزارەتی مەعاریف لەمەڕ بڵاوکردنەوەی فێرکردن لە کوردستان بەتوندی لەلایەن نوێنەرو کەسایەتییە کوردەکانەوە ڕەخنەی لێ گیرا.(٦٧)

باسی خوێندن و هەوڵەکانی چەسپاندنی زمانی کوردی لە بڵاوکردنەوەی فێرکردن و خوێندەواری کوردستاندا باسێکی سەربەخۆ و درێژە، ژمارەیەك نوێنەرو لایەن و کەسێتیی ڕۆشنبیرو کۆمەڵایەتی کورد کەوتنە خۆو بەدەنگێکی بەرز ناڕەزاییان لەمەڕ سیاسەتی دواخستن و پشتگوێ خستنی خوێندن لە کوردستان دەربڕیوە.

---

(٦٦) هەمان سەرچاوە ل١٢٥.

(٦٧) د. عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١ آذار ص٣٢.

سەرۆك وەزیرانی عێراق لە ساڵی ١٩٢٦دا سیاسەتی حکوومەتەکەی بەرامبەر کورد ڕوون کردەوە و هەموو وەزیرەکانی ئاگادار کردەوە لەوەی کە سیاسەتی عێراق بریتییە لەوەی فەرمانبەرانی ناوچە کوردییەکان لە کورد دابنرێن و زمانی کوردییش لە کاروباری ڕۆژانەدا بەکاربهێنرێ.(٦٨)

دیارە ئەمە لە ئەنجامی ئەو هەلومەرجە تازەیە هاتووە کە ئینگلیز ویستوویەتی لە عێراقدا بیخولقێنێ، کورد لە دوو لایەنەوە دەیتوانی فشار دروست بکات. شۆڕشی شێخ مەحموود هەرچەندە ئەوکاتە لە نسکۆو سستی بوو، دووەمیان بەهۆی ئەو هەلومەرجەی بۆ نوێنەرە کوردەکان هاتبووە پێشەوە. دەتوانرا ململانێی نێو خۆی عێراقی لەناو لایەنەکان، مەزهەبەکان، هەروەها ستراتیژو بەرژەوەندی ئینگلیز و شێوازی شارستانییانەی ئەم وڵاتە سوود لێ وەرگرن. ڕاستە ئەوکاتە شۆڕش و ڕۆڵی شێخ مەحموود ڕوو لە کزی بوو، بەڵام پاشماوە و ئەو کەشەی لە سایەی جووڵانەوەی ئەو هاتە کایەوە، کاریگەریی زۆری لە ڕووی میللی دروست کرد و تا ئەمڕۆش کورد لە بیریان نەکردووە لە گۆرانی و دانیشتن و کۆڕی سیاسی و میللی باسی لێوە دەکەن و ئاهی بۆ هەڵدەکێشن.

بەپێی دۆکیومەنتی ژمارە C.O-730-103 لە ڕاپۆرتی (٤)یدا کە لە ١٩٢٦/٢/١٨ ئامادە کراوە کە لە برگەی (١٠٨)یدا وەها لەمەڕ نوێنەرێکی کورد و خواستەکانیان دەئاخڤێت.(٦٩)

«محەمەد حەبیب تالەبانی کە نائبێکی کوردی شاری کەرکووکە لە بەغدا کۆبوونەتەوە و لە ناوخۆیاندا گفتوگۆیان کرد دەربارەی ئەوەی بەیانێك لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە دەربچێت کە بریتی بێت لە مانەی خوارەوە:

١- ئیعتراف بکرێت بە زمانی کوردی وەکو زمانێکی رەسمی لە پەرلەماندا و نائبی کورد بۆی هەبێت لە کۆبوونەوەکانی پەرلەماندا بە کوردی بیرورا و بۆچوونی خۆی دەرببڕێت.

---

(٦٨) م. ر. هاوار بەرگی دووەم، ل ٦٠٦.

(٦٩) هەمان سەرچاوە، ل ٦٠٥

مامۆستا هادی العلوی دەڵێت: دان بەکورد وەکو نەتەوە نرا، لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیی عێراقی، قوتابخانە لە کوردستانی عێراق بۆ خوێندنی زمانی کوردی شان بەشانی عەرەبی کرایەوە، ئەوە لە ڕۆشنبیری کوردی عێراق دروست بوون. بڕوانە ها-ف موریس و جون بلوج. لا اصدقاء سوی الجبال، راج آل محمد، مراجعة وتقديم هادي العلوي. ل ٦٩.

٢– پێویستە هەموو یاساو بڕیارە ڕەسمییەکانی حکوومەت شان بەشانی زمانی عەرەبی بەزمانی کوردیش بڵاو بکرێنەوە.

٣– ئەم داخوازییە بخرێتە بەرچاوی دەزگاکانی ناوچە کوردییەکان.

٤– داوا بکرێ سێیەکی فەرمانبەران و ئەنجومەنی وەزیران کورد بن».

لە درێژەی هاتنە گۆڕێی بە ڕەسمی ناسینی زمانی کوردی لە دام و دەزگاکان و خوێندن و بەکارهێنانی، شتی تازە هاتنە ئاراوە. نوێنەرە کوردەکان چوست و بەتاو کەوتنەکار کردن و داوای جێبەجێ کردنی ئەم قسانەی سەرۆك وەزیرانی عیراقی ئەو کاتیان دەکرد، هەروەها لە زۆر شوێن داوای چاککردنی باری خوێندن و قوتابخانەکان و تەندروستی و... هتد دەکەن.

لەم بارەوە سکرتێری ئەنجومەنی وەزیران لە ٢٢–١٩٢٦/١/٢٣ نامەیەکی دەربارەی ئەو وتارەی سەرۆك وەزیران کە لە پێشتر باس کرا بۆ هەموو وەزیرەکان ناردووە و وتوویەتی:

بۆ هەموو وەزیرەکان:

«بێگومان سیادەتتان ئەو وتارەتان بیست کە سەرۆکی وەزیران لە مەجلیسی نوابدا (جاران پێی دەوترا مەجلسی مبعوثان) وتبووی و ڕۆژنامەکانیش بڵاویان کردەوە. ئەو وتارە بریتییە لە سیاسەتی حکوومەت کە دەیەوێت روونی بکاتەوە کە پێویستە فەرمانبەران لە ناوچە کوردییەکاندا هەموو کورد بن و زمانی کوردی زمانێکی ڕەسمی بێت. بۆیە سیادەتی سەرۆك وەزیران داوای کرد کە تکاتان لێ بکەم ئەم سیاسەتە بخرێتە بەرچاو و بەجێ بهێنرێت لەهەر کاروبارێکدا کە پەیوەندیی بەناوچە کوردییەکانەوە هەبێ»(٧٠).

ئەم هەلومەرجە دەرفەتی زۆری بۆ بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردی و خوێندن بە کوردی لە کوردستانی باشوور ڕەخساند، ئەگەر بە قسەش بێت باس لە کورد و مەسەلەی بڵاوکردنەوەی فێرکردن و خوێندن بە کوردی دەکرا، بۆ ئەوەی زمانەکەی بەڕەسمی و لە شوێنە ڕەسمییەکان بەکاربهێنرێ. م. ر. هاوار لە چوارچێوەی ئەو کتێبەی دەربارەی شۆڕشی شێخ مەحموودی نووسیوە، لە باسی زمانی کوردی وەهامان بۆ دەگێڕێتەوە: لەڕاستیدا وەك سەرۆك وەزیران (عەبدولموحسین ئەلسەعدون)، تەنیا شتێکی ڕواڵەت بووە

---

(٧٠) هەمان سەرچاوە، ل ٦٠٧.

و قسەو نووسینی سەرکاغەز بووە، چونکە بەپێی یاسای هەمیشەییی عێراق (القانون الاساسي) کە لە ئازاری ساڵی ١٩٢٥دا دەرچوو بوو لە ماددەی (٧)یدا دەڵێت: «زمانی عەرەبی زمانی ڕەسمیی ئەم وڵاتە –عێراق– دەبێت، بەڵام بەپێی یاسایەکی تری تایبەتی دەتوانرێت زمانی تریش بکرێت بەڕەسمی». بێگومان لە ساڵی ١٩٢٦دا کە عەبدولموحسین ئەلسەعدون ئەو وتارەی لە پەرلەماندا وتووە بەپێی یاسایەك نەبووە بەڵکو هەر قسەی خۆی بووە و ئەو یاسایە هەروەکو خۆی مایەوە تا لە ساڵی ١٩٣١دا ئەوسا یاسای زمانە ناوچەییەکان ژمارە (٧٤) دەرچوو کە لەو یاسایەدا بەپێی ئەم بەڵێنەی کە لەژمارە (٧)ی یاسای هەمیشەییی عێراقدا بەڵێن درابوو لەکۆمەڵەی گەلان بەو پێیە زمانی کوردییش کرا بە زمانێکی ڕەسمی لەو شوێنانەی کە زۆربەی دانیشتووانی کورد زیانن و زمانی کوردی بەپێی ئەوە کرا بەزمانی ڕەسمی لەناوچە کوردییەکاندا[٧١].

ئەو نوێنەرە کوردانەی لەوکاتەدا قسەیان دەکرد و ناڕازییی بوون، نموونە عەلی کەمال بەگ کە داوای گرتنەوەی ناوچەی بادینان بۆ زمانی کوردی کردو مەعروف جیاووك کە لە ئەنجومەنی نوێنەرایەتی هێرشی کردە سەر (ساطع الحصری) و داوای کرد لە عێراق دەربکرێت، هەروەها وەزیرو مێژوونووسی کورد محەمەدەمین زەکی (١٨٨٠–١٩٤٨) کتێبێکی بەناوی (دوو تەقەلای بێ سوور) ساڵی ١٩٣٥ بڵاوکردەوە، کە کتێبەکە بریتی بوو لە دوو نامەی نووسەر کە ئاراستەی مەلیك فەیسەڵ و نوێنەری بەریتانی لە عێراق کراون[٧٢].

کە باسی خوێندن بکەین، بە هیچ شێوەیەك ناتوانین کۆششەکانی ئەم کەسایەتی و ناودارانە لەبیر بکرێت، کە کۆششی بەسوودیان بۆ چەسپاندنی زمانی کوردی لە قوتابخانەکان بەشێوەیەکی دەستووری و ڕەسمی داوە.

لە نامەکەی محەمەد ئەمین زەکی بەگ هاتووە کە لە ساڵی ١٩٢٦ بیست و پێنج

---

(٧١) هەمان سەرچاوە، ل ٦٠٧.

(٧٢) د. عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسە ١١ آزار، ل ٣٣، لەوەش زیاتر بە پێی نووسینەکانی منذر الموصلي کە لە «ساطع الحصري»ی وەرگرتووە دوو ئەفسەری کورد تەوفیق وەهبی و ئەمین زەکی بەگ داوای وەرگێڕانی هەموو کتێبەکانی خوێندنیان بۆ زمانی کوردی کردووە. تا ئەوەی دەڵێت ئەمین زەکی بەگ داوای خوێندنی زمانی کوردیی لە کۆلێژی جەنگیش کردووە.

بڕوانە گولان العربي ژ(٥٤) تد ٢٠٠٠ محمد عەبدوڵڵا، کاکە سوور.

قوتابخانه له ناوچه کوردییەکان هەبووە و (٥)یان بە کلدانی و عەرەبی و (١٦)یان بە تەنیا بە زمانی کوردی بوون و (٤)ەکەی تریش لە ڕووی زمانەوە تێکەڵ بوون. هەروەها لەمەڕ سیاسەتی نەژادپەرستانەی حکوومەت دژی کورد، بواری خوێندن لە نامەی دووەمیدا وەها لە باسی ساڵی ١٩٢٧ قسە دەکات کە دەڵێن لە ناوچە کوردییەکان (٢٧) قوتابخانەی کوردی هەبووە، بەشی میزانییەکەی لە مەعاریفی عێراق (٤٪) بووە و هەمان ساڵ تەنیا (١٪)ی داهاتی سلێمانی و (٢,٥٪) داهاتی هەولێر بۆ کاروباری فێرکردن لە هەردوو پارێزگا تەرخان کراوە. کە لە هەمان ماوەدا (٣٨٪) داهاتی بەغداو (٢٢,٨٪) داهاتی مووسڵ و (١٨٪)ی داهاتی کەربەلاو (٢١٪) داهاتی بەسرە بۆ پەروەردەی ئەم پارێزگایانە تەرخان کراوە[٧٣].

مێژوو نووسی کورد لەمەڕ خوێندن لە کوردستاندا لە ساڵی ١٩٣٠ بەم جۆرە ئاماژەی بەباری فێرکردن کردووە:

١- لە پارێزگای سلێمانی خوێندن لە قوتابخانەی سەرەتایی بەزمانی کوردی بووە.

٢- لە پارێزگای کەرکووك هەرچەندە زۆربەی کوردن، لێرەدا تەنیا سێ قوتابخانەی کوردی لە کۆی (٢٤) قوتابخانە هەیە. کە پێویستە پتر لە نیوەی قوتابخانەکان بە کوردی بن بە پێی سەرژمێری دانیشتووان و دابەشکردنی نەتەوەیی.

٣- لە پارێزگای مووسڵ هیچ قوتابخانەیەکی کوردی نییە هەتا لە قەزا کوردییەکانی وەکو (دهۆك و ئاکرێ و زاخۆ و ئامێدی و شێخان). بەڵام د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی لە ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی مێژوویی دەڵێت: ساڵی ١٩٢٧ (١٣) قوتابخانەی کوردی لەم قەزایانە هەبووە، لەم هەڵەیە محەمەد ئەمین زەکی بەگ پشتی بە کیتابی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی ناوچەی مووسڵ ژمارە (١-٣٥) بەستووە کە ئەو کات بۆ وەزارەتی مەعاریفی ناردووە[٧٤].

بەپێی ئەو بڕیارانەی ئەوکات دەرچوونە، دەبووایە زمانی کوردی بە ڕەسمی بخوێندرێ، بەڵام بەهۆی سیاسەتی نەژادپەرستانە و هەلومەرجی سەختی ئابووری - کۆمەڵایەتی و بەدوا کەوتوو مانەوەی ناوچەکە، کورد نەیتوانیوە بە تەواوی سوود لەم بڕیار و ڕاسپاردانە وەرگرێت کە حکوومەتی عێراقی کە لە نیسانی ١٩٣٠ دەربارەی زمانە ناوخۆییەکان و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان دەریان کردوون.

---

(٧٣) هەمان سەرچاوە، ل ٣٤.

(٧٤) هەمان سەرچاوە، ل ٣٦.

لەمەڕ ڕێگە خۆشکردن بۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی بەڕەسمی نوێنەری باوەڕپێکراوی بەریتانی لە ڕاپۆرتێکی لە ساڵی ۱۹۳۰ بۆ کۆمەڵەی گەلان بەرزی کردووەتەوە بیروڕاکانی وەها چڕ کردووەتەوە: (دەرکەوت کە کوردەکان ئەگەر لە پەیمانەکە هیچ بەندێك بۆ مانەوەی مافەکانیان نەبێ، ترسیان زیاد دەکات، باشترین ڕێگە بۆ مانەوەی بڕواو متمانەیان، ئەوەیە حکوومەتی عێراق هەندێك چارەسەری ئیداری و داڕشتن و تەشریعی بکات، تا ئەم بارودۆخە لە کوردستان لەسەر بنچینەیەکی هەمیشەیی بێت و نوێنەری بەریتانیا ئەم کێشەیەی لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ و سەرۆك وەزیران و ڕاوێژکاران باس کردووە، لەگەڵیان هەوڵی شتە پێویستەکانیانم داوە کە کورد بانگەشەی بۆ دەکەن. یەکەم هەنگاو دانانی یاسای بەکارهێنانی زمانی کوردییە، ئینجا دامەزراندنی مەکتەبی وەرگێڕان لە وەزارەتی ناوخۆ لە بەغدا بۆ وەرگێڕانی یاسا و ڕێسا و فەرمانەکانی بە زمانی کوردی بە کۆکردنەوەی قوتابخانە کوردییەکانی هەولێر و کەرکووك و سلێمانی لە ژێر ئیدارەی یەك پشکنەر و دامەزراندنی جێگری بەڕێوەبەری ناوخۆی گشتیی کوردی، ئەمانە هەموویان پێش کۆتاییی ساڵی ۱۹۳۰ بکرێ).(۷۵)

هەر بەم بۆنەوە و لەژێر ڕۆشنایی ئەو، هەر کاتەی کورد لەناوخۆ و نوێنەرانی ئینگلیز و ڕاسپاردەکانی کۆمەڵەی گەلان جەختی لەسەر دەکردەوە وەزارەتی ناوخۆ بەیانێکی لەمەڕ بەکارهێنانی زمانی کوردی لە ۱۰ی نیسانی ۱۹۳۰ بڵاوکردەوە: «وەزارەت وای بینی دوای کارگرتنە دەست، دەبینێت ئەوەی گرینگە و جێی متمانە و دڵنیایی خواستەکانی گەلە، لەوانە هەندێك مەسەلە تایبەتە بە بەشێکی دانیشتوانی لیوایەکانی باکوور و بڕیاری داوە بەرنامەیەکی یاسایی ئامادە بکات و دەیخاتە بەردەم ئەنجومەنی میللەت لە کۆبوونەوەی داهاتوویدا تا زمانی کوردی ببێتە زمانێکی ڕەسمی لە ناوچە کوردییەکان، بە پاڵپشتی مادەی حەڤدەهەمی یاسای هەمیشەیی و حکوومەت سوور دەبێت لەسەر ئەو ڕێگەیەی ئەو گفتانەی پێشتر لە عێراق بە کورد دراون».(۷٦)

---

(۷٥) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، مطبعة دار الكتب، بغداد، ۱۹۷٤ ل ۱۱
– ئەم بەیانە لە ژمارە (۱۲۸)ی ۱۰ی نیسانی ۱۹۳۰ی ڕۆژنامەی (البلاد) بڵاوکراوەتەوە.

(۷٦) هەمان سەرچاوە، ل ۱۲

ساڵی ۱۹٤٦ لە سلێمانی ۷٦۰ قوتابی کچ و کوڕ لە (٥) قوتابخانەی سەرەتایی بوون (۱٦۱۰) قوتابی کوڕیش لە (۸) قوتابخانەی سەرەتایی و (۱۰۰) کچیش لە (۱) قوتابخانەی ناوەندی و (۳۲۰) کوڕیش لە دواناوەندی بوون. بڕوانە هاوڕێ نامە، ل ۲۱۲. شاری سلێمانی ل٤٥۸.

لەم بارەوە دەست بەکارکرا، ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی لەکۆبوونەوەی ٥ی ئابی ١٩٣٠ بڕیاری دا وەکیلی سەرۆك ئەنجومەنی وەزیران و وەزیری ناوخۆ و داد سەردانی کوردستان بکەن لە ٨ی ئابی ١٩٣٠ هاتنە کەرکووك و لە ٩ی هەمان مانگ هاتنە هەولێر و وەکیلی سەرۆکی وەزیران لە بەشێکی وتارەکەی لەم سەردانەیدا ئەم قسانەی کرد: «ئاشکرایە کە ئێمە بەرپرسێتیی کارەکانمان لە ئەستۆیە، بەیانێکمان بڵاوکردەوە و تیایدا دەرمان خستووە کە ئامادەین بەرنامەیەکی یاسایی لەمەڕ زمانی کوردی لەو شوێنانەی کە زۆرینەی کوردی تێدا نیشتەجێیە، لە ڕاستیدا بەرنامەکە ئامادە کراوە و دەخرێتە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەرایەتی لە کۆبوونەوەی داهاتوودا، هەرچۆنێکە تا ئەمە دەبێ. فەرمانمان دەرکردووە کە دائیرە تایبەتمەندییەکان کاریان بڕوات بە پێی توانا، تا دەگوازرێنەوە و ڕێگەی ئاسایی دەگرن. ئەو کارانەی دادوەری و ئیدارە و مەعاریف دەگرێتەوە. حکوومەت پشکنەرێکی مەعاریف بۆ پشکنین بە وێنەیەکی گشتی لە قوتابخانەکانی لیوای سلێمانی و لیوای هەولێر و کەرکووك، حکوومەت خەریکی دەست بەکاربوونە بۆ ئامادەکردنی مفەوەزو ئەفسەر و پۆلیس و مووچەخۆران کە زمانی کوردی دەزانن تا لە ناوچە کوردییەکان بەکاریان بهێنن(٧٧).

هەر لەو بۆنەیەدا و لەم سەفەرە، نوێنەری ئینگلیز لە وتارێکیدا لەم بارەوە ئەم قسانەی کرد، کە ئەم بەشێکیەتی:

تێ دەگەن جەنابی پایە بەرز وەکیلی سەرۆك وەزیران چی پێ گوتن، حکوومەتی عێراقی توانای ئەوەی هەیە کە ئەوەی لەسەریەتی ڕای گەیەنێت، حکوومەتی ڕۆشنگەر دەتوانێ دان بەو هەقیقەتەدا بنێ کە زمانی کوردی وەکو زمانی عەرەبی زمانێکی نەتەوەییە لە بەشێکی گرنگی عێراقدا، نایەوێت منداڵانی کورد بێختە ژێر ئەوبارەی کە زمانی عەرەبی وەك زمانێکی نەتەوەیی خۆی بخوێنێ. زۆر لە هیچ کوردێك ناکات کە بە زمانێك داکۆکی لە خۆی بکات یا دادگایی بکرێ بەزمانێك کە تێی ناگات، ئەمەش ئەوە دەسەپێنێت کە دەبێت مووچەخۆری وا دابمەزرێنن کە کوردی بزانن لە هەموو جۆرە لق و ئیدارە و ناوەندەکان و ناوچە کوردییەکان(٧٨).

هەرچەندە نەگەیشتنە ئەو ئاستەی بەتەواوی کەلك لە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە

---

(٧٧) هەمان سەرچاوە، ل ٦١.

(٧٨) هەمان سەرچاوە، ل ٦٢.

خوێندن و فێرکردن وەربگرن، کۆسپی زۆر لەبەردەم پەرەسەندنی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن بە گشتی هەبوون، بەڵام لە ماوەی ئینتیدابی بەریتانی (٢٤-١٩٣٢) لەمەڕ سیاسەتی فێرکردن لە کوردستانی باشووردا کاری ئیجابی کرا، بەلای کەمەوە دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە بنچینەی سیستەم و پرۆگرامی خوێندنی کوردی دارێشترا، کە پێشتر کوردستان بەخۆیەوە نەیدیوە هەرچەندە گلەیی لەدەست کەمیی ژمارەی قوتابخانەکانیش هەبووە، تا شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ تەنیا (٢٣٠)ی قوتابخانەی سەرەتایی لە کوردستانی باشوور هەبوون، لە ماوەی ٣٠ ساڵدا لە کۆی هەزار منداڵی کوردی تەنیا (١٣) منداڵ دەیانتوانی بچنە بەر خوێندن لە قۆناغی سەرەتایی(٧٩).

شاراوە نییە کە قۆناغەکانی خوێندن دووچاری ئاستەنگ و کێشەی زۆر هاتوون، تا ئەمڕۆکە خوێندن و پرۆسەی پەروەردە بەشێوەی سروشتی بەڕێوە نەچووە. هەرچەندە زمانی کوردی لە نامە ناردن و فێربوون بۆ هەوڵی فەرمانبەرانی بەریتانی دەگەڕێتەوە، بەڵام حکوومەتی مەلەکی دوای ساڵی ١٩٣٢ لە پاشەکشە بوون بەرامبەر مافەکانی گەل و مەسەلەی فێربوون بە زمانی کوردی، کە تەنیا لە سلێمانی و هەولێر بە زمانی کوردی قوتابخانە مابووەوە، تا شۆڕشی ١٤ی تەمموز بەرپابوو(٨٠).

ئەمەی باسمان کرد بەشێکە لەو بارە گشتییەی لە سەرەتای بیستەکانی ئەم سەدەیە و

---

(٧٩) د. عبدالفتاح علي بوتاني، ل ٣٨، لە هاوڕێ نامەدا دەڵێت ساڵی ١٩٥٢ ژمارەی خوێندکارانی کچ لە شاری هەولێر گەیشتە ٧٥٩ کەس و لە سلێمانی ١١٣٢ و مامۆستایانی ناوەندی لە هەولێر (٣٩) و لە سلێمانی (٤٩) بوون. هاوڕێ نامە ل ٢١٩.

(٨٠) د. عبدالفتاح علي بوتاني، ل ٣٩

ژمارەی قوتابخانە کوردییەکان ساڵی ١٩٣١ گەیشتە ٤١ قوتابخانە و زۆربەی مامۆستاکان کورد بوون. بۆ پڕکردنەوەی پرۆگرام و کتێبی قوتابخانە دەست کرا بەوەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی.

کاپتن (جیروم فاری) یارمەتیدەری مەعاریفی گشتی لە بەغدا لەگەڵ حاکمی سیاسیی سلێمانی میجەر سۆن ساڵی ١٩١٩ هەوڵی دانانی ڕێزمانی سانا و نووسینیان بۆ زمانی کوردی. کە گەڕاوە بەغدا وە کتابێکی تایبەتی بۆ خوێنەری کوردی بە تایبەتی دانا. خوێندنی بە کوردی بەڕێوە دەچوو. لە شەش قوتابخانە لە ساڵی ١٩١٩ بە کوردی دەخوێندرا لەگەڵ یەك قوتابخانە بە زاری شەبەك (نزیك مووسڵ).

بڕوانە: بیری نوێ، سلام ابراهیم كبة، الحاسوب و اللغة الكردية، ژ (٢٥، ٢٦) آذار و حزيران ٥٥ ج ص ١٨٢.

پاش هاتنی ئینگلیز بۆ عێراق و پاشگەز بوونەوەی دەوڵەتە مەزنەکان لە پەیمانی سیڤەر و گۆڕینی بە لۆزان و بێ ئومێد و لەت و پەت بوونی نەتەوەی کورد کۆتایی هات و، کورد کە بووەتە قوربانیی گەمە نێو دەوڵەتییەکان، لە هەمان کاتیشدا نەیهێشتووە سوود لە زمان و کەلتوور و فەرهەنگی ڕەسەنی خۆی وەربگرێ و هەمیشە زمانی دەسەڵاتدارانی بەسەردا سەپێنراوە و بەزۆری زۆردارەکانی هەوڵ دراوە زمانی زگماکیی خۆی لەبیر بەرێتەوە، بەو هۆیەی کە نەهێڵدراوە بە زمانی خۆی فێر ببێ و بخوێنێ.

لە ڕێپۆرتاژێکی ڕۆژنامەی (ژین) کە لە ژمارە (٢٥٧)ی ١٤ ئابی ١٩٣٠ بڵاوکراوە لە هەواڵی ئەم سەردانەی بەرپرسانی حکوومەتی عێراق و مەندووبی سامیی بەریتانی، لەمەڕ هەڵوێستی ڕۆشنبیری ناوداری کورد مەعرووف جیاووک لەبەردەم وەفدەکە و لە قسەکانی بۆ وەفدەکە، ئەم قسانە تۆمار کراون بەم جۆرە:

موقەڕەراتی عوسبەتولئومەم چنە؟

١- لوغەتی کوردی ڕەسمی بێ.

٢- دەبێ مەئمورەکانی کوردستان لە عونصوری کوردی بن، لە درێژەی ڕێپۆرتاژەکەدا هاتووە.. لەو ئەسنایەدا موفەتیشی ئیداری گەڕایەوە و موقەرەراتی عوسبەتولئومەمی تەسلیمی جێگری مەندووبی سامی کرد.

ئەویش فەرمووی ئەمە موقەڕەراتی عوسبەتولئومەمە. مولاحەزە: (جەعفەر پاشا موصیر بوو ئەیگوت نابێ مەئمورەکانی کورد لە عونصوری کورد بن، دەبێ هەر کوردی بزانن!) جێگری مەندووبی سامی خوێندییەوە و تەرجومە کراو مەعلووم بوو کە دەڵێ: «ئەبێ مەئموورەکان لە عونصوری کورد بن». ئینجا مامۆستا جیاووک پتر لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی: «وا ئەزانم فەقەرەی ئەخیرەی قەراری عوسبەتولئومەم ئەڵێ: « ئەگەر تەبدیلێك لە حکوومەتی عێراقدا بوو، ئەبێ حوکمێکی زاتی بەگوێرەی ڕەغائیبات بدرێ بە کوردەکان». مەندووبی سامی گوتی: دوێنێ ئەم قسەیەم لە کەرکووکیش بیست. ماددەیەکی وا نییە!!». جیاووک جوابی دایەوە گوتی: «لە سەتری ئەخیریا ئەم ماددەیە هەیە».

لە دوای ئەمە مامۆستا جیاووک هاتەوە سەر ئەصلی مەوزووع و گوتی:

وەکو عەرزم کردن بەیانەکەی جەعفەر پاشا دوو شتی تیایە: ئیتحادی کورد و عەرەب. جەعفەر پاشا چاك دەزانێ ئێمە لەگەڵ عەرەبا مومکین نییە بە صورەتی تەوحید بژین.

بەڵام بەصوورەتێکی وەکو ئاویستریا (نەمسا) و مەجەرستان قابیلە (واتە فیدرالی) ئینجا گوتی: میللەت لە حاڵی ئینتباهدایە. لە پاش ئەمەش جەریدەکانی بەغدا هاوار دەکەن ئێمە عەرەبین و حکومەتمان عەرەبیە، ئەبێ کوردەکان وەکو ئەرمەنییەکان لێ بکەن! ئیتر مومکین نییە پێکەوە بژین».

لەسەر ئەمە جەعفەر پاشا بە تەهەوورەوە گوتی: «من قسەت نادەمێ و حەقت نییە ناوی عەرەب بێنی». مامۆستا جیاووك گوتی: من قسەم لە بەڕێز جێگری مەندووبی سامی وەرگرتووە: بەندەش بەقەدەر تۆ ڕێز لە عەرەب دەنێم، بەڵام کوردم و کورد حەقی خۆی ئەوێ، ئینجا فەرمووی:

«بێینەوە سەر ماددەی دووەم: تەناقوزێکی زاهیری لە قسەکانی جەعفەر پاشادا هەیە، چونکە لە جیهەتێکەوە ئەفەرمووێ حکومەت مەشغوڵی قانوونێکە بۆ تەئمینی حقووقی کوردان، لە جیهەتێکی دیکەوە ئەڵێ: بۆ ئەم حقووقە موغایری ئووصولە ماددەیەك داخیلی موعاهەدەکە بکرێت. بەندە ئەڵێم بە نەزەرێکی حقووقی مومکینە ماددەیەك داخیلی موعاهەدەکە بکرێ کە ئەو ماددەیە بە قانوونێکی خاص حقووقی کوردەکان تەئمین بکات، لەمەدا مانع چییە؟ خولاصە هەموو کوردێك مونتەزیری تەتبیقی قەراری عوسبەتولئومەمە».(٨١)

---

(٨١) گۆڤاری هەولێر، مافپەروەری کارگێڕو نووسەرو کورد پەروەر مەعروف جیاووك، کەریم شارەزا، ژ (٢) ساڵی ١٩٩٩، ل ١٨٣

بەپێی سەرچاوەکان: ژمارەیەك نوێنەرانی کورد لە شوبات و ئازاری ساڵی ١٩٣١ یادداشتێکیان پێشکەشی مەندووبی سامی و سەرۆك وەزیرانی عێراق کردووە، داوای پارێزگای دهۆك و پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتییەکی مەعاریفی گشتی تایبەت بە شارەکانی کوردستان دەکەن کە بەڕێوەبەرەکەی کورد بێت و بنکەکەی لە یەکێك لە شارەکانی کوردستان بێت، زمانی کوردی زمانی ڕەسمیی کوردستانی عێراق بێت و یەکسانی لەمەسەلەی سەرفکردنی میزانیە لە نێوان ناوچە کوردییەکان و ناوچەکانی تر هەبێ. ئەم قسانە لە بەشی سێیەمی کتێبەکەی (عبدالرزاق حسني، تأريخ الوزارات العراقية ص ٦٥–٦٦، بغداد ١٩٨٨، ج ٣). هاتووە بڕوانە د. عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١ آذار ل ٦٩.

# خوێندنی کوردی

## لە کۆمارەوە.. بۆ شۆڕشی میللی ئەیلوول

دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ کەشێکی تری سیاسی و کۆمەلاّیەتی و ئابووری لە کوردستاندا هاتە ئاراوە. گەلی کورد بۆ یەکەمین جار لە دەستووری عێراقی وەکو شەریکێکی نەتەوەیی لە عێراقدا چەسپێنرا و مافەکانی بووە مافی یاسایی، ئەمە هەوەڵین دەسکەوتی سیاسی یاسایی کوردە. هەروەها دوای شۆڕش لە ئاکامی پتەو و فرەبوونی خەباتی سیاسی نەتەوەیی و بە کۆمەلاّیەتی بوونی سیاسەت لەناو ڕیزەکانی کورداو پەرەسەندنی هۆشیاری لای ڕۆڵەکانی کورد و بایەخی ڕۆشنبیری و خوێندەواریش لە جاران زۆرتر بوو. لە ئاکامی چاکسازیی کشتوکاڵییش بەشی هەرە زۆری ڕۆڵەکانی گەل دەرفەتی چاکتریان بۆ هاتە پێش بۆ ئەوەی سوود لە قوتابخانە و بلاّوبوونەوەی خوێندەواری وەربگرن.

بەپێی (ماددەی ٣)ی دەستووری عێراق کە لە ٢٧ تەممووزی ١٩٥٨ یەکسانیی نێوان کورد و عەرەب لە حقووق و هاوبەشییان لە نیشتمان. لەمەڕ خوێندنیش بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەت لە وەزارەتی مەعاریف بۆ پەرەپێدانی فێرکردن لە کوردستانی باشوور پێك هات(٨٢).

ڕێکخستنی سیاسی و جەماوەریی کوردیی ئاشکرا، هاتنە مەیدانەوە، ژمارەیەك بلاّوکراوە دەرکەوتن تا لە ساڵی ١٩٦١ لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی میللی و چەکدارانەی ئەیلوول کەوتنەوە ژێر فشارو پەلاماردان و شۆڤینیەت و دیکتاتۆریەت ڕووی لە عێراق

---

(٨٢) عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١ آذار ل ٤٠

هەر لە ساڵەکانی (٦١-١٩٦٩) باری تەندروستی و خوێندن بەرەو خراپی بوو، زۆربەی قوتابخانەکانی حکوومەت لە گوندەکانی کوردستان بەهۆی شەڕەوە یا ڕووخێندران و کاول کران یا لەلایەن حکوومەتەوە داخران. نەخوێندەواری بەشێوەیەکی فرە بلاّو بووەوە. سیاسەتی دەسەلاّتدارانی عێراق دوای هەڵگیرسانی شۆڕش، سیاسەتی ڕێگە گرتن بوو لە بلاّوبوونەوەی خوێندەواری لە کوردستاندا. هەرچەندە توانای شۆڕش لاوازیش بوو، بەلاّم لەم ماوەیە قوتابخانەی سەرەتایی و قوتابخانەیەکی ناوەندی کردەوە. بڕوانە آ. پ. عن التعليم في كردستان العراق، مطبعة خەبات ١٩٨٦ ل ١٩.

کردەوە و گەلی کوردستانیش دووچاری بارێکی سەختی ژیان هات.

دەرفەتێکی باش دوای گۆڕانی شێوەی حوکم لە دوای شۆڕشی چواردەی تەمووز بۆ منداڵانی کورد هاتە ئاراوە، تا بە زمانی زگماکی خۆیان بخوێنن. لە کۆنگرەی سێیەمی قوتابییانی عێراق (یەکێتیی گشتیی قوتابییان لە کۆماری عێراقدا) کە لە کانونی دووەمی ١٩٦٠ لە بەغدا بەسترا لەمەڕ کوردستان ئەم ڕاسپاردانە هاتوون:

١- خوێندنی مێژووی گەلی کورد لە قوتابخانە کوردییەکان بەتایبەتی و عێراق بەگشتی.

٢- زمانی کوردی زمانێکی ڕەسمیی هەموو قوتابخانەکانی کوردستانی عێراق بێ و لە خوێندنی ساڵی ١٩٦٠-١٩٦١ دەست بەجێبەجێ بوونی بکرێ.

٣- کردنەوەی ئامۆژگای باڵا لە کوردستان.

٤- دانانی پلانێکی گشتی بۆ کردنەوەی زانکۆی کوردی و دەستکردن بە ئامادەکردنی پێویستییەکانی بۆ لە دایك بوونی.

٥- زیادکردنی ژمارەی قوتابییە کوردەکان لەو وەفدانەی بۆ خوێندن دەنێردرێن لەلایەن حکوومەتەوە و بەڕێوەبەرایەتیی مەعاریف خوێندنی کوردیش سەرپەرشتیی ئەمە بکات.

٦- خوێندنی دەقی وەرگێڕدراوی ئەدەبی کوردی لە قوتابخانەکانی عێراقدا لە چوارچێوەی پرۆگرامی خوێندنەوەی ئەدەبیدا.(٨٣)

لە کۆنگرەی یەکەمی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە. کە ١١-١٣ ئەیلولی ١٩٥٩ لە شەقڵاوە بەسترا، (٣٠٠) کەس تێیدا بەشداربوون، دوای وتاردان شەش لێژنە بۆ زمان و مێژوو، وەرگێڕان و دانان و بڵاوکردنەوە، پرۆگرام، ئیدارە، نەهێشتنی نەخوێنداری پێك هات. ئەم کۆنگرەیە ئەم بڕیارانەی دەرکرد:

١- دامەزراندنی کۆڕی زمانەوانیی کورد، بۆ دانانی فەرهەنگێکی یەکگرتووی زمانی کورد.

٢- خوێندنی مێژووی نەتەوەیی کورد لە هەموو قوتابخانەکانی کوردستان و عێراق.

٣- دەبێ خوێندنی قوتابی کوردی لە قۆناغی سەرەتایی بە زمانی کوردی بێ و لە پۆلی سێشەوە زمانی عەرەبی بخوێندرێت.

---

(٨٣) هەمان سەرچاوە، ل٤١.

٤- دانانی ڕێزمانی کوردی لەلایەن لێژنەیەکی زمانەوانی پسپۆڕەوە.

٥- دەبێت دەرسەکانی پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتاییی کوردی یەکسان بێ لەگەڵ عەرەبی.

٦- کردنەوەی بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی بەغدا.

٧- خوێندنی زمانی کوردی بەشێوەی ڕەسمی لە قوتابخانەکانی ناوەندی و دواناوەندی و خانەی مامۆستایان.

٨- دەبێ خوێندن لە باخچەی منداڵان لە کوردستاندا تەنیا بە زمانی کوردی بێ.

٩- پێویستە هەر کتابێکی کوردی وشەکانی لە هەموو شێوەزارەکان پێك بێن.

١٠- ناردنی قوتابییە زیرەك و داهێنەرەکان بۆ دەرەوەی عێراق بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا.

١١- چاپکردنی کتێبی کوردی، بەچاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە ئەدەبییەکان.

١٢- دامەزراندنی چاپخانەی هەمەجۆر و هاندانی بزافی ڕۆژنامەگەری لە کوردستاندا.

ئەم زانیارانە لە وتارەکەی د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی لە ژمارە (٩٩٤)ی ٢٢/٩/٢٠٠٠ ڕۆژنامەی خەبات وەرگیراون کە لەمەڕ کۆنگرەی یەکەمی مامۆستایان بڵاوی کردۆتەوە. بەبۆنەی بەستنی کۆنفرانسی پەروەدەیی لە هەولێر دوای تێپەڕینی (٤١) ساڵ بەسەر کۆنفڕانسی یەکەمی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە.

نابێ ئەوە لەبیر بکەین، ئەم کۆنگرەیە کاریگەرییەکی مێژوویی زۆری لەسەر پرۆسەی خوێندنی کوردی هەیە و تا ئەمڕۆش ناتوانرێ بایەخی ئەم کۆبوونەیەوە پشتگوێ بخرێ کە یەکەمین هەوڵی کوردە، دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بەم جۆرە بۆ پەرەپێدانی خوێندنی کوردی کاری بۆ بکرێ و ببێتە جێ بایەخی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە عێراقدا بۆ یەکەمجار بەشی کوردی لە زانکۆی بەغدا دوای ساڵی ١٩٥٨ کرایەوە. ئەم بەشە ڕۆڵێکی گرینگی لە پێگەیاندنی مامۆستا و ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد بینی و هەر لەم ڕێگەیەشەوە زمانی کوردی چوار چێوەیەکی زانستیی وەرگرت و پەرەی پێ درا.

ئەم پێشنیارانە ڕاستەوخۆ خزمەت بە پەرەسەندنی پرۆگرامی خوێندن دەکات و گیانی تەبایی و هاوبەشی لە ڕووی دەستووری و دەروونی لە نێوان نەتەوەی کورد و عەرەب دروست دەکات، بەڵام بەداخەوە ئەم وەزعە لەبەر گرتنەبەری ڕێبازی توندڕەوی شۆڤینی

و ڕەگەزپەرستی نەتوانرا بکرێتە بەردی بناغەی دوارۆژێکی گەشەسەندووی بەختەوەر. ئەمەش بووە هۆی بەرە بەرە وەستان و سستبوونی پرۆسەی خوێندن لە کوردستاندا، لە سالانی ٦٠-١٩٦١ دەبووایە (٢٧٠) هەزار منداڵ لە تەمەنی خوێندن بنێردرێنە بەر خوێندن کەچی تەنیا (١٣٦) هەزار منداڵ چوونە قوتابخانە واتە (٣٤٪) مندالانی کوردستان لە خوێندن بێبەش بوون، ئەم ڕێژەیەش لە سالانی شۆڕشی کوردی کە لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ هەڵگیرسا، پتر بوو.[٨٤]

پرۆسەی خوێندن ئیتر تووشی تەنگژەو ئاستەنگ هات، زۆربەی قوتابخانەی ناوچە ئازادکراوەکان خوێندنیان تێدا ڕاوەستا. یا بەر ئاوربارانی دوژمن کەوتن. لە سایەی شۆڕشدا هەوڵێکی زۆر بۆ بەردەوامبوونی خوێندن درا. حکوومەتی مەرکەزی عێراق لە کاتی ئاساییدا نەیویستووە شارستانییانە خوێندن لە قازانجی بەرەو پێشەوە چوونی کەسێتی منداڵ و نەوەی کورد بەڕێوە بچێ، جا لە کاتێکدا شۆڕشی میللی و بەرفرەی ئەیلوول دەستی پێ کرد، ئەوە بە سروشتی نەیویستووە ئاست و ڕێژەی قوتابییانی کوردستان لە ئاستی شارەکانی تر بێت، هەروەها ئەو کات لە بری خەرجی بۆ پەرەپێدانی قوتابخانەکان، هەموو توانای بۆ شەڕ لە کوردستاندا بە فیڕۆ دەدا.

بە پێی سەرژمێرییەکانی شەستەکان ژمارەی قوتابییان وا بووە: ژمارەی قوتابییانی قوتابخانە سەرەتاییەکانی دەوڵەت لە (٧٤٢,٥٩٦) قوتابیی کوڕ و کچ لە ساڵی خوێندنی ١٩٦٠-١٩٦١ گەیشتە (١,٠١٤٨٢٩) قوتابی لە ساڵی خوێندنی ١٩٦٩-١٩٧٠. کەچی ژمارەی قوتابییان لەچاو ڕێژەی گەشەکردن و زۆر بوونی ژمارەی دانیشتووان کورتی هێناوە، لە ساڵی خوێندنی ٩٦٠-١٩٦١ لە کۆی هەزار کەس تەنیا ١١٢ قوتابی سەرەتایی هەبووە، کەچی لە ساڵی خوێندنی ٩٦٩-١٩٧٠ لە کۆی هەزار ١٠٩ قوتابی خوێندوویانە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە ئەم خشتەیەی خوارەوە کە ڕێژەی چوونە قوتابخانەی هەر ساڵێك لە کۆی هەزار منداڵ کە هەقی چوونە قوتابخانەی لە تەمەنی (٦-٧) ساڵی هەیە دەردەخات.

---

(٨٤) هەمان سەرچاوە، ل٤١ هەروەها آ. پ. ئاماژەی کردووە کە (٢٠٧) هەزار منداڵ لە تەمەنی چوونە قوتابخانە بوونە کەچی لە سەرچاوەی یەکەم هاتووە (٢٧٠) هەزار منداڵ. یەکەم مافیش بۆ کوردان لەو کاتدا ئازادیی ڕۆژنامەگەری و خوێندن بوو، کە لە دوو ساڵ پتر درێژەی نەکێشا. بڕوانە آ. پ. عن التعليم في كردستان العراق مطبعة خەبات ١٩٨٦ ل ١٨.

### خشتەی ژمارە (٢) (٨٥)

ژمارەی قوتابییانی سەرەتایی تەمەن (٦-٧) ساڵ لە قۆناغی سەرەتایی لە ساڵی خوێندنی ٩٦٩-١٩٧٠.

| شار | ڕێژەی چوونە قوتابخانە کە هەزار کەس/ بەپێی ژمارەی دانیشتوان |
| --- | --- |
| بەغدا | ١٣١ |
| دیالە | ١٢٢ |
| بەسرە | ١٢٠ |
| هەولێر | ٧٠ |
| سلێمانی | ٦٩ |
| زیقار | ٨١ |

لەم خشتەیەدا دیار دەکەوێ ڕێژەی خوێندنی منداڵانی کورد لە شارەکانی هەولێرو سلێمانی لەچاو هەموو شارەکانی تر زۆر کەمترە، ئەمەش هۆکاری سیاسی و ئیداری و هونەریی خۆی هەیە و بایەخدانی کەمتر بەشارەکانی کوردستان دەگرێتەوە وەکو چۆن لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٠دا ڕۆشنبیرو نوێنەرە کوردەکان داوایان کردووە پتر بایەخ بە مەسەلەی خوێندن بدرێت، دوای پتر لە (٣٠) ساڵ ئەم مەسەلەیە هەروەکو خۆی ماوەتەوە. هەر بەم پێیەش ڕێژەی دەرچووانی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی کەم بۆوە. لە هەزار کەس تەنیا (١١٠) قوتابی دەرچوون. لەجیاتی تەواوکردنی قۆناغەکان بە (٦) ساڵ بە (١١) ساڵ تەواویان کردووە. بەپێی سەرژمێرییەکان هەر قوتابییەك لە ساڵی خوێندنی ٩٦٠-١٩٦١ (١٨,٧) دیناری لێ سەرف کراوە، کەچی ڕێژەکەی لە ساڵی خوێندنی ٩٦٩-١٩٧٠ گەیشتووەتە (٣٦,٥) دینار(٨٦).

بڕیارو ڕاسپاردەکانی (یەکێتیی مامۆستایانی کۆماری عێراق) کە ئەوپەڕی توندی و پاشگەز بوونەوەی تێدایە بەرامبەر مافە سروشتییە ڕۆشنبیرییەکانی فێربوون و خوێندن

(٨٥) گۆڤاری پەروەردە و زانست، ژمارە (٢)، ساڵی (١) ل ٦٣.

(٨٦) هەمان سەرچاوە

بێگومان گوتمان ئیتر لەم ساڵەدا واتە ١٩٦١ بەدواوە، دەست بە پاشەکشەکرا، ئەم پاشەکشە ئاستە جیاکانی گرتەوە لە کۆنگرەی چوارەمی سەندیکای مامۆستایانی عێراقدا کە لە شوباتی ١٩٦٢ بەسترا ئەم هەنگاوانە بەرەو دواوە پێشنیار کرا:

١- یەکخستنی پرۆگرامی خوێندن لە هەموو عێراق بەزمانی عەرەبی.

٢- گۆڕینی وشەی (کوردستان) بە (ناوچەی باکوور) لە کتێب و پرۆگرامەکان. =

لە کوردستاندا، لەتەك پەرەسەندنی شۆڕشی کوردستان، ئاستی خوێندن لە پاشا گەردانیدا بوو بە جۆرێك کە ڕێژەی نەخوێندەواری لە پەرەسەندنی بوو تاوەکو گەیشتە ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٩ ڕێژەی نەخوێندەواری گەیشتە (٨٠٪). لەتەك دامەزراندنی یەکێتیی قوتابییانی کوردستان، لە ڕەنگدانەوەی ئەو پاشگەز بوونەوە گشتییە بوو دەرهەق بە قوتابی و مەسەلەی پەروەردە و فێرکردن لە کوردستاندا، لە ئاکامی هەڵوێستی نەژادپەرستانی (سەندیکای مامۆستایان لە کۆماری عێراقدا) و ئەو کۆنگرەی لە ساڵی ١٩٦٢ بەستیان، لە ئاکامی ئەو بۆچوونانەی کە داوای نەهێشتنی زمانی کوردی لە خوێندن و سزادانی مامۆستایانی بەشدار لە شۆڕشی ئەیلوول دەکەن لە ١٦ ئایاری ١٩٦٢ مامۆستایانی کوردستان «یەکێتی مامۆستایانی کوردستانیان» دوای بەستنی کۆنگرە ڕاگەیاند.

گرفتەکان زۆرن، گرتنەبەری سیاسەتی نەژادپەرستی و ڕێبازی شۆڤینیی نەتەوەیی لە دوای شەستەکان و کەمکردنەوەی ڕێژەی قوتابخانەکان و کەمیی ژمارەی مامۆستا و کێشەی شۆڕش و پشتگوێخستنی پەروەردە لە کوردستان و دووریی واقیعی پرۆگرامی خوێندن لە خواست و ئاواتەکانی قوتابییانی کوردستان، بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری لە کوردستان بەتایبەتی لە ناو ئافرەتان، نەبوونی کۆلێژ و خانەی پێگەیاندنی مامۆستایان و پیشەیی و پسپۆڕ لە بواری پەروەردە، ڕێژەی دواکەوتنی پرۆسەی پەروەردەیان پتر کرد. بەپێی سەرژمێریی وەزارەتی پەروەردەی عێراق لە ساڵی خوێندنی ٩٥٩-١٩٦٠. ژمارەی قوتابخانە پیشەییەکان لە عێراقدا بەم شێوەیە بووە: کشتوکاڵ (١٠) و (١١) پیشەسازی و

---

= ٣- دامەزراندنی کتێبخانەی عەرەبی لە ناوچە کوردییەکاندا.

٤- خوێندنی زمانی عەرەبی بەشێوەیەکی هونەری تایبەت لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن لە (باکور).

٥- هاندانی نووسەرو دانەرانی کورد بۆ نووسین بەعارەبی.

٦- لابردنی بڕیارەکانی لیژنەی دیراساتی کوردی لە کۆنگرەی سێیەم بۆ دامەزراندنی کۆلێژی پەروەردە لە کوردستاندا.

٧- سڕینەوەی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی گشتیی خوێندنی کوردی.

٨- سڕینەوەی بەستنی کۆنگرەی تایبەت بە مامۆستایانی کورد، لەبەرئەوە سەندیکا نوێنەرایەتیی هەمووان دەکات.

٩ - دانەمەزراندنی کۆڕی زانیاریی کوردی.

١٠- توندترین سزا بدرێتە ئەو مامۆستایانەی لە بزووتنەوەی جوداخوازیی کۆنەپەرستی لە باکوری کۆماری عێراق بەشداربوون. بڕوانە عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١ آذار، ل ٤٢.

(١٤) هونەری ماڵی کە کۆی گشتییان تێکڕا (٣٥) قوتابخانەی پیشەیی بووە. لەم ساڵی خوێندندا (٦٣٢٩) قوتابی خوێندوویانە و لەناوچەکانی کوردستاندا (٢٣٥٤) قوتابی کچ و کوڕ هەبوون ژمارەی قوتابخانە پیشەییەکانی کوردستان بەم جۆرە بووە: کشتوکاڵی (٣) و (٤) پیشەسازی و هونەری ماڵ (٤) کە تێکڕا (١١) قوتابخانەی پیشەیی بوون. بێگومان قوتابخانەی کچان لە کوردستاندا زۆر پشتگوێ خراوە، ژمارەیەکی ئێجگار کەم قوتابخانەی کچان کراوەتەوە، بەتایبەتی لە گوندان، کە ئەمەش وای کردووە ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان نەتوانن بچنە بەر خوێندن و شون پەنجە لەسەر ڕەوشی شارستانی و مەدەنی و ڕۆشنبیریی کوردستان لە سەرەتا و ساڵانی دیماهیی سەدەی بیستەم وەکو پێویست دابنێن و تا ئەمڕۆش ئافرەتانی دیار بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن و مەگەر لەم بیست ساڵەی دوایی ئافرەتان پتر هاتبنە کۆڕی خوێندنەوە. لە سییەکاندا لە شارێکی وەکو هەولێر تەنیا یەك مامۆستای ئافرەت هەبووە و مامۆستایانی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی کچان (قەڵات) هەر شەشیان هەر ساڵەی یەکێك لە مووسڵڕا هێنراونە هەولێر بۆ دەرس گوتنەوە. بەپێی سەرچاوەکانی مەعاریفی عێراقی ساڵی ١٩٤٢-١٩٤٤ ژمارەی قوتابخانەی کچان لە شارەکانی کوردستاندا (٤٥) قوتابخانە بووە لە کۆی (١١٢) قوتابخانەی سەرەتایی. کە لە ناویاندا تەنیا (١) یەك قوتابخانەی کچان لە دێهات بەڕەسمی هەبووە و لەوە زیاتر لە هیچ دێهاتێکی تر قوتابخانەی کچان لەم دەرو ساڵانەدا نەکراوەتەوە.

### خشتەی ژمارە (٣)

### ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکان لە هەندێك ناوچەی کوردستان و خواروو ناوەڕاستی عێراقدا لە ساڵی ١٩٤٢-١٩٤٤

| شوێن | ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکان |
|---|---|
| باکور (کوردستان) | ١١٢ (٤٥)ی هی کچانە |
| ناوەڕاست | ١٥٧ |
| لە گوندەکانی باکوری کوردستان | ١١٨تەنیا یەکیان هی ئافرەتانە |
| خواروو | ١٤٣ (٧) یان بۆ کچان بوو. |
| لە گوندەکانی ناوەڕاست | ١٤٦ (١٤) یان بۆ کچان بووە. |
| نەهێشتنی نەخوێندەواری لە باکوری کوردستان | ٤١ تەنیا بۆ پیاوان بووە |
| نەهێشتنی نەخوێندەواری لە ناوەڕاست | ١٤٨ تەنیا بۆ کوڕان |
| نەهێشتنی نەخوێندەواری خواروو | ٧٧ تەنیا کوڕان و یەکێکیان بۆ ئافرەتان بووە. |

**خشتەی ژمارە (٤)**

ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوردستان لە ساڵی خوێندنی ٩٥٠-١٩٥١

| شوێن | ژمارەی قوتابخانە | کوڕان | کچان |
| --- | --- | --- | --- |
| شار | ٢٣٩ | ١٤١ | ٤٨ |
| گوند | ١١٥ | ١١٢ | ٣ |

بەپێی سەرژمێرییەکانی ئەو کات ڕێژەی نەخوێندەواری لە کوردستاندا (٦٧,١٥٪) بووە و ئافرەتانی نەخوێندەوار (٨٧,٠٢٪) بووە و ژمارەی نەخوێندەواریی لە لادێیەکان گەیشتووەتە (٨٠,٨٪)[٨٦].

ئەمە دەری دەخات کە تا ئاستێکی بەرز لەو ساڵانەدا کورد لەچاو تەواوی عێراقدا دواکەوتووە.

لێرەدا پێویستە بە خێرایی چاو بەسەر پەرەسەندنی شێوازی پرۆسەی پەروەردە لە کوردستان بخشێنین، بەتایبەت دوای ئەوەی پاش شۆڕشی ١٤ تەمووز خوێندن و پەروەردە چووە پلەیەکی لەبارترو زمانی کوردی بە شێوەیەکی یاسایی کەوتە ژێر ڕۆشنایی بایەخ پێدانەوە، وەکو یەکەم هەنگاو ساڵی ١٩٥٩ دەزگایەك بەناوی (بەڕێوەبەرێتیی زانیاریی گشتیی کوردییەوە - المديرية العامة للمعارف الكردية) دامەزرا. سەرەتا کادر کەم بوو و مەودای خوێندنی کوردیش تەنیا لە قوتابخانە سەرەتاییەکان و لە هەموو ناوچە کوردییەکانیش نەبوو.

ساڵی ١٩٦٧ بەپێی یاسای ژمارە (١٧) ئەم بەڕێوەبەراتییە ناوی گۆڕا بۆ بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەروەردەی کورد (المديرية العامة للدراسات الكردية)، هەرچەندە دیسان مەودای خوێندنی کوردی سنووردار بوو. گەورەترین و فراوانترین هەنگاو ئەوەبوو کە لە دوای ڕێککەوتنی ئازاری ١٩٧٠ هاویشترا، خوێندنی زمانی کوردی بایەخێکی تایبەتی پێ دراو یەکێك بوو لە خاڵە سەرەکییەکانی ئەم ڕێککەوتنە مێژووییەی لە ئاکامی شۆڕشی میللی ئەیلوولی ١٩٦١ بەدەست هات. ئەوەبوو لە ساڵی

---

(٨٦) گۆڤاری گولان العربي، مشاكل التعليم في كردستان، هیاس کاکەیی، ژ(٨)٢٥/١/١٩٩٧، ص ٥٨ لە ١١/١١/١٩٥٢ قوتابخانەی پیشەسازی لە سلێمانی کرایەوەو هەر لەهەمان شاردا ساڵی ١٩٥٦ خانەی مامۆستایان، بۆ کوڕان و کچان کرایەوە. بڕوانە هاوڕێ نامە.

١٩٧٢ بەپێی یاسای ژمارە (٢٢) ئەم وەختە قەوارەیەکی گەشەدار و تایبەتی بۆ بەڕێوەبەراتییەکە دامەزرا، ئەم بەڕێوەبەرایەتییە لە هەشت بەشی سەرەکی پەیدا بووە: (بەڕێوەبەرایەتیی سەرپەرشتیی پەروەردەیی، بەڕێوەبەرایەتیی سەرژمێری و (احصاء)، بەڕێوەبەرایەتیی ژمێریاری). ئەگەر دیقەت بدەین لە ساڵی ١٩٥٠–١٩٥٩ تەنیا (١٠) کتێب لە بواری پەروەردە چاپ کراون، کەچی لە ساڵی ١٩٧٢ ئەم ژمارەیە گەیشتووەتە (٨٦) کتێب و لە ساڵی ١٩٦٩–١٩٧٠ بەڕێوەبەرایەتیی گشتی خوێندنی کوردی تێکڕا (٢٨) کتێبی چاپ کردووە کە ژمارەیان (٢٤٥٠٠٠) دانەیە، لە کاتێکدا ساڵی ١٩٧٤–١٩٧٥ گەیشتە (٨٠) کتێب و ژمارەیان (٨٣٨,٠٠٠) دانە بووە و ساڵی ٧٨–١٩٧٩ ئەم بەڕێوەبەرایەتییە (١,٢٥٣,٠٠٠) دانە کتێبی چاپ کردووە.(٨٧)

ئەمە بەری خەبتینی ئەو ڕۆشنبیرو دڵسۆزانەیە کە بەردی بناغەی یەکەمین قوتابخانەی کوردییان دامەزراند، یا لە سییەکاندا ویستیان لە ڕێگەی بەڕەسمی ناسینی زمانی کوردی لە خوێندنی قوتابخانەکاندا بەشی تایبەتیش بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری فێرکردن و پەروەردە لە وەزارەتی مەعاریفی عێراق دروست بکرێ و دوای ١٩٥٨ مەسەلە چووە قۆناغێکی پێشکەوتووتر و بەڕێوەبەرایەتیی تایبەتی بۆ خوێندنی کوردی دامەزراند و زانکۆی سلێمانی دواتر دامەزرا، ئینجا کۆڕی زانیاری و بەشی کوردی لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا و پاشتر گواستنەوەی بۆ کۆلێژی پەروەردە و دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دامەزرا. ئەمڕۆش لە کوردستانی دوای ڕاپەڕین مەسەلەی پەروەردە و فێرکردن بەجۆرێك گەشەی سەندووە، کە بە هیچ شێوەیەك بەراورد ناکرێ بە قۆناغەکانی تری مێژووی خوێندەواری نە لە کوردستانی باشوور و نە لەگەڵ بەشەکانی تری کوردستاندا.

بۆ بەرچاو خستنی پەرەسەندنی باری ڕۆشنبیری و خوێندەواری، ئەم خشتەیە دەخەینە بەرچاو کە ڕێژەی بوونی دکتۆر لە تەواوی شارەکانی عێراقدا پیشان دەدات، دەبینن شارەکانی کوردستان بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی شارەکانی تر، چەند لەدواوەیە.

---

(٨٧) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، خوێندنی کوردی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی، د. احسان فؤاد، ژ (٩٩) ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٣، ل ٢٩.

### خشتەی ژمارە (٥)[٨٨]

خشتەی بوونی دکتۆر لە شارەکانی عێراق و کوردستان لە ساڵی ١٩٦١

| یەکەی ئیداری | ژمارەی دکتۆری پیاو و ئافرەت لە بواری ددان و سەیدەلیە | ژمارەی نەخۆشخانە | عیادەی دەرەکی |
|---|---|---|---|
| مووسڵ | ١٠١ | ١٠٠ | ٩ |
| هەولێر | ٣٢ | ٤٢ | ٣ |
| سلێمانی | ٤٧ | ٨٦ | ٧ |
| کەرکووک | ٨٦ | ٤٢ | ٦ |
| دیالا | ٤٥ | ٤٤ | ٥ |
| بەغدا | ١١٥٩ | ١١٦ | ٢٠ |
| رومادی | ٦١ | ٥٢ | ٦ |
| کەربەلا | ٧٤ | ٣٤ | ٥ |
| حلە | ٧٦ | ٥٠ | ١١ |
| دیوانیە | ٤٨ | ٣٣ | ٤ |
| کووت | ٢١ | ٢٠ | ٨ |
| ناسریە | ٢٣ | ٢٢ | ٨ |
| عمارە | ٢٨ | ١٩ | ٤ |
| بەسرە | ١٦٨ | ٤٥ | ٢٠ |
| کۆی گشتی | ١٩٦٩ | ٧٠٥ | ١١٦ |

بۆمان دەردەکەوێ لە ساڵی ١٩٦١ لە کۆی ١٩٦٩ دکتۆر لە شارەکانی مووسڵ و هەولێر و سلێمانی و کەرکووک تێکڕا (٢٦٦) دکتۆر هەبووە، لە کۆی (٧٠٥) نەخۆشخانەش (٢٧٠) نەخۆشخانە لەم چوار شارە دروست کراون. بێگومان بەشی هەرە زۆریشی کەوتووەتە پارێزگای مووسڵ، یانی شارەکانی تر لەو ئاستە نەبوونە. ئەم نموونەیە بۆ ئەوەیە تا توێژەری ئەمڕۆ بە دروستی بزانێ کوردستان لە ئاکامی ئەم وەزعە گشتییە ڕووبەڕووی بووە، نەیتوانیوە بەتەواوی سوود لە هەلومەرجی گشتی وەربگرێ.

لە خشتەیەکی تردا کە تایبەتە بە خوێندنی ساڵی (٩٦١-١٩٦٢) بەراوردێکی ترمان لەمەڕ ئاستی ژمارەی قوتابخانە و مامۆستایان و قوتابیانی کوڕو کچ لە تەواوی شارەکانی کوردستان چنگ دەکەوێ، هەروەها لە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تر بۆمان

(٨٨) القضية الكردية والقومية العربية في العراق، ل ١٤٣.

دەردەکەوێ کە جیاوازییەکی زۆر لە بایەخدان بە پرۆسەی خوێندن لە نێوان تەواوی شارەکان هەیە و نەژادپەرستی و بەرچاو تەنگیی نەتەوەیی و هەتا مەزهەبییش.

خشتەی ژمارە (٦) (٨٩)

ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکان و ژمارەی مامۆستا و قوتابییەکانیان لە ساڵی خوێندنی ١٩٦١-١٩٦٢

لە ڕۆژانی خوێندنی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ لە کۆی (٣٨٠٣) قوتابخانە

| یەکەی ئیداری | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی مامۆستا و ئەوانەی دەرس دەڵێنەوە | ژمارەی قوتابیانی کوڕ | ژمارەی قوتابیانی کچ |
|---|---|---|---|---|
| مووسڵ | ٤٧١ | ٣٢٤١ | ٦٣٩٤٣ | ٢٢٧٧٥ |
| هەولێر | ٢٣٦ | ١٠٩٢ | ١٩٣٣٥ | ٦٢٠٨ |
| سلێمانی | ٢٢٩ | ٩٧٥ | ١٨٤٩٨ | ٦١٨٩ |
| کەرکووک | ٣٣٢ | ١٥٠٠ | ٣٣٧١٢ | ١٢٣٢١ |
| دیالا | ٢٦٥ | ١٦٨٠ | ٣٣٩١٨ | ١٠٩٠٥ |
| بەغدا | ٧٤٠ | ٧٥١٤ | ١٣٢٧٢٧ | ٧٥٥٢٣ |
| رومادی | ٢٠٣ | ١٣٢٠ | ٢٦٤٢٦ | ٦٢٩٩ |
| کەربەلا | ٩٧ | ٨٦٦ | ١٩٩٧٣ | ٩٨٧٢ |
| حلە | ٢٠٠ | ١٤٧٨ | ٣٣٨٥٨ | ٩١٥١ |
| کوت | ١٩١ | ١٠٤٣ | ٢١٣٨١ | ٦٦٩٧ |
| عمارە | ١٧١ | ١١٢٤ | ٢٤٣١١ | ٧٣٨٨ |
| ناسریە | ١٩٤ | ١٤٣٨ | ٣٧٧٦٧ | ٨٧٩٠ |
| دیوانیە | ٢١٣ | ١٤٧٩ | ١١٢٣١ | ٣٧٩٢ |
| بەسرە | ٢٦١ | ٢٣٤٥ | ٥٤٦٢٤ | ٢٤٣٢٢ |
| کۆی گشتی | ٣٨٠٣ | ٢٧٠٩٥ | ٥٣١٧٠٤ | ٢٠١٢٣٢ |

لە تەواوی عێراق لە هەر چوار شاری کوردستاندا (مووسڵ، هەولێر، سلێمانی) کەرکووک، (١٢٦٨) قوتابخانە هەبووە کە (٤٧١)ی لە مووسڵ بووە و لە کۆی (٢٧٠٩٥) مامۆستاشدا لەهەر چوار شاردا (٦٨٠٨) مامۆستایە دەرسیان گوتووەتەوە. کە نزیکەی نیوەی بەتەنیا لە مووسڵ بووە و ژمارەی مامۆستایانی مووسڵ (٣٢٤١) مامۆستا بووە، لە کۆی (٧٣ ،٩٣٦)

(٨٩) هەمان سەرچاوە، ل ١٤٤.

قوتابی کە (٥٣١٧٠٤)ی کوڕ و (٢٠١٢٣٢)ی کچە. لە هەر چوار شاردا کە کوردستان پێك دەهێنن (١٨٢٩٨١) قوتابییە لە ساڵی خوێندنی ٩٦١-١٩٦٢ دەرسیان خوێندووە و (١٣٥٤٨٨) کوڕ و (٤٧٤٩٣) کچ بوون. تەنیا لە شاری مووسڵدا کۆی گشتیی قوتابییەکانی کوردستان. (٨٦٧١٨) قوتابی چوونەتە بەرخوێندن. یا نزیکەی نیوەی ژمارەی تەواوی قوتابییانی (هەولێر و سلێمانی و کەرکووك) دەگرێتەوە، ئەم ژمارەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لە ساڵەکانی شۆڕشدا کەمتر توانراوە قوتابییانی کورد بە ئاسوودەیی بچنە بەرخوێندن.

خشتەی ژمارە (٧) [٩٠]

خشتەی قوتابخانە ناوەندییەکان و خانەی مامۆستایان و ژمارەی قوتابییەکانیان لە ساڵی خوێندنی ٩٦١-١٩٦٢

| شار | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی کچ و کوڕ | خانەی مامۆستایان: ژمارەی قوتابخانە | خانەی مامۆستایان: ژمارەی قوتابی |
|---|---|---|---|---|
| مووسڵ | ٣٦ | ١٤٨٠٨ | ٢ | ٨٥٣ |
| هەولێر | ١٠ | ٢٩٤٠ | ٢ | ٣٩٢ |
| سلێمانی | ١٠ | ٣٠٥٥ | ٢ | ٢٧٤ |
| کەرکووك | ١٥ | ٥٥٣٧ | ٢ | ٤٨٤ |
| دیالا | ١٩ | ٦١٠٠ | ٢ | ٧٦٠ |
| بەغدا | ١٠٠ | ٤١٩٨٨ | ٢ | ١٠٢٧ |
| رومادی | ١٧ | ٥٦٨٠ | ٢ | ٣٩١ |
| کەربەلا | ١٢ | ٥٦٣٣ | ٢ | ٣٣١ |
| حلە | ٢٠ | ٧٣١٨ | ٢ | ٤٨٣ |
| کوت | ١٦ | ٤١٠٥ | ٢ | ٤٧٢ |
| عمارە | ١١ | ٤٣٢٥ | ٢ | ٤٣٨ |
| ناسریە | ١٢ | ٤٩٨١ | ٢ | ٤٨٦ |
| دیوانیە | ١٥ | ٥٠٣٨ | ٢ | ٥٧٥ |
| بەسرە | ٢٣ | ١١٧٨٦ | ٢ | ٥١٥ |
|  | ٣١٦ | ١٢٣٢٩٤ | ٢٨ | ٧٤٨٤ |

(٩٠) هەمان سەرچاوە، ل١٤٥.

لەمەڕ خوێندنی قۆناغی ئامادەیی لە کۆی (٣١٦) قوتابخانە لەسەر عیراقدا لە چوار شاری کوردستاندا (مووسڵ و هەولێر و سلێمانی و کەرکوك) (٧١) قوتابخانە هەنە، کە (٣٦) بەتەنیا لە مووسڵە و هەروەها لە کۆی (١٢٣٢٩٤) قوتابیش لەم چوار شارەدا (٢٦٣٤٠) قوتابی دەوامیان کردووە لە خوێندنی ساڵی ٦١-١٩٦٢ و لەهەر چوار شاریشدا (٨) قوتابخانەی خانەی مامۆستایان هەبووە و لە کۆی (٧٤٨٤) قوتابیشدا (٢٠٠٣) قوتابی لە هەر چوار شار دەوامیان کردووە و (٨٥٣) بەتەنیا لە مووسڵ بوونە.

لە سەرجەم سەرژمێرییەکاندا دەردەکەوێت کە لە سێ شاری کوردستاندا و هەندێك شاری خوارووی عیراقدا، کە بەر رقی مەزهەبی کەوتوون، ئاستی خوێندن وەکو پێویست نییە و ژمارەی قوتابخانە و قوتابی و مامۆستاکانیان کەمە، ئەمەش بۆ سیاسەتی نەژاد پەرستیی شۆڤنییانە و مەزهەبی دەگەڕێتەوە کە دژی کورد و موسڵمانە شیعەکانی خوارووی عیراق پەیڕەوکراوە.

کە مەسەلەی خوێندن و منداڵ ناردنە بەرخوێندن پێوەندیی ڕاستەوخۆشی بەباری ئابووری و بژێوی خێزان و هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگاشەوە هەبووە. واتە سەرباری بارودۆخی سیاسی و شۆڕش لەلایەن و سیاسەتی ڕەگەزپەرستی دژی کوردان لە لایەکی تر، نەریت و بیروڕای باوی کۆمەڵیش لە ململانێیەکی سەختدا بووە بۆ شکاندنی تۆقی بارە کۆمەڵایەتییەکە تا منداڵ لە قوتابخانە فێری زانست بێت و چاوی بکرێتەوە، ئەمەش بەفیتی دەست ڕۆیشتوانی چینی باڵای کۆمەڵ دەکرا، هەروەها ئاستی ژیان لە کوردستانی عیراقدا زۆر نزم بوو، ڕێژەی گشتیی کرێی مانگانەی کارگەرێکی بیناسازی لە دەزگا دەوڵەتییەکاندا (٤٨) دینار و لە کەرتی تایبەتیشدا (١٥) دینار بوو. لەبارودۆخێکی وادا کارگەران لە کوردستاندا ژیانێکی کولەمەرگییان دەبردە سەر و خۆیان و خێزانەکانیان هەمیشە لە ژێر تەوژم و هەڕەشەی برسێتی و نەخۆشی و نەخوێندەواری و بێکاریدا بوون، خزمەتگوزارییە تەندروستی و خوێندن و پەروەردەییەکانی کوردستان لە ئاستێکی زۆر نزمدا بوون، بۆ ٤٦ هەزار کەس تەنیا یەك قوتابخانە و بۆ (١٥) هەزار کەسیش تەنیا یەك پزیشك هەبوو لە کوردستاندا[٩١].

کەچی لەو سەردەمەدا لەتەك هەژاری و نەداریی خەڵکەکە، حکومەتی عیراق ساڵی ١٩٦١ (١٠،٣) ملیۆن دیناری لە (٤١،٦) هەزار مرۆڤ لە بواری دامو دەزگاکانی

(٩١) گۆڤاری سەنتەری برایەتی، پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کوردستانی عیراق لە ساڵانی شەستەکاندا، د.دلێر ئیسماعیل شاوەیس، ژمارە (١٣) ئەیلولی ١٩٩٩، ل١٧٠.

وەزارەتی ناوخۆ و پارەیەکی زۆریش لەشەڕ سەرف کرد. میزانەی سوپا و پۆلیسیش ساڵی ١٩٦٣، ٣٧.٧٪ میزانیەی گشتی داگرتبوو، بەپێی هەندێك سەرچاوەی نارەسمی حکوومەت ڕۆژانە (٥٠٠) هەزار دیناری تەرخان کردبوو بۆ شەڕ و ئیدارەی کاروباری سەربازی لە کوردستانا و تا ساڵی ١٩٧٠ش لەسەر ئەم ڕێڕەوە ڕۆیشت. لە ساڵەکانی ٧٦-٩٨٦، ١٩٩١یش ئەو پارەی لە شەڕ دژی گەلی کورد خەرج کراوە زۆر زۆر لەوە پترە و دووقاتی ئەوە دەبێت، لە ٣ی نیسانی ١٩٦٥ حکوومەتی عارف شەڕێکی سەرتاسەری دژی کورد لە زاخۆ تا خانەقین بەدرێژاییی ٥٠٠کم دەست پێ کرد کە (٥٠) هەزار کەسی تێدا بەکار هێنابوو. ئەم زانیارییانە و زیاتریش لە کتێبەکەی (آ.پ) بەناوی (عن التعليم في كردستان العراق) دەخوێندرێتەوە، کە ڕۆڵی راستی سیاسەتی دەسەڵاتدارانی عیراق دەردەخات.

کەچی ئامادە نەبوون قوتابخانە دروست بکەن و هەزارەها کەسی ئاوارە لە جێگە و ڕێگەی خۆی ڕێگەی ژیانی ئاسایی لێ نەگرن و باری تەندروستی چاك بکەنەوە، بەڕادەیەك وای لێ هات لە ئاکامی سیاسەتی نەژادپەرستانەیان لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٩ نزیکەی (٨٠٪) کورد نەخوێندەوار مانەوە و (٣٤٪) منداڵی تەمەنی خوێندن نەیانتوانی بخوێنن، لەهەمان کاتیشدا ئەم پارە زۆر و زەبەندەیان لەشەڕ سەرف کرد.

# ڕێککەوتنی ١١ی ئازار و بایەخدان بەخوێندنی کوردی

دوای ئەوەی شۆڕشی ئەیلوول دە ساڵی ڕەبەق خەبات لە پێناو ڕزگاریی کورد درێژە پێ دا، لەتەك بایەخدان بەمەسەلەی خوێندەواری و کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچە ئازاد کراوەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی و کردنەوەی بەشی خوێندەواری و لەش ساغی کە سەر بەئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش بوو، هەروەها پێگەیاندنی مامۆستا بۆ دەرس وتنەوە لە ئەکادیمیای سەربەشۆڕش... چارەسەری کێشەی کورد هەوەڵ هەنگاو و داوای لە ڕێگە دۆزینەوە بۆ خوێندن بەزمانی کوردی و کردنەوەی قوتابخانە لە گوند و شارەکانی کوردستان بوو، ئەمەش ڕێگەی دەسەڵاتی شۆڕشی کورد و دەزگا و بنکە پیشەیی و زانستی و ڕۆشنبیرییەکانی کورد و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بانگەشەی بۆ دەکرا و کۆششی زۆری لە پێناو خەرج دەکرا، چونکە دەزانرێ خوێندن سەرچاوە و هێزی زانستە و زانستیش لە تاریکی و دواکەوتن بەرەو پێشکەوتنمان دەبات.

بایەخی خوێندن و گرینگیی داواکردنی کردنەوەی قوتابخانە و دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوە و چاپ و زمانزانی لێرەڕا جەختی لەسەر کرایەوە و بەدیاردەکەوێ کە سەرۆکی ئەو کاتی عیراق شەوی ١١-٣-١٩٧٠ لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنی عیراق بەرەسمی چۆن بەندەکانی بەیاننامەی ١١ی ئازاری مێژوویی خوێندنەوە و لە چەند شوێنێکدا بەڕوونی ئەو مەسەلەیە دەخاتە ڕوو، وەکو لە دەقی خوێندنەوەکەی (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر) دا هاتووە:

٣- بەهۆی ئەو دواکەوتنەوە کە لەمەوپێش تووشی نەتەوەی کورد بووە لە بارەی ڕۆشنبیری و پەروەردەکردنەوە، نەخشەیەك دادەنرێ بۆ چارکردنی ئەم دواکەوتووییە، ئەوەش لەم ڕێگایانەی خوارەوە:

ا- پەلەپەل کردن بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش لەبارەی زمان و مافە ڕۆشنبیرییەکانی گەلی کوردەوە، و پێوەندکردنی پرۆگرامە تایبەتییەکانی کاروباری نەتەوەیی کورد لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا بەبەڕێوەبەراتیی گشتیی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی کوردییەوە.

ب- گێڕانەوەی ئەو قوتابییانەی کە دەرکراون یا خۆیان ناچار بوون واز لە خوێندن بێنن بەهۆی ڕۆژانی شەڕوشۆڕی ناوچەی کوردەوارییەوە، بۆ قوتابخانەکانیان بەبێ گوێدانە تەمەنیان.

ج- کردنەوەی قوتابخانەی زۆر لە ناوچەی کوردەواریداو، بەرزکردنەوەی پلەی پەروەردەکرن و فێرکردن و، وەرگرتنی قوتابییان لە زانکۆ و کۆلیژە سوپاییەکان و، لەناو ئەو قوتابییانەدا کە دەنێردرێن بۆ دەرەوە بۆ خوێندن بەبەعسە و زەمالە، بەپێی نیسبەتێکی ڕاست و بەجێ[٩٢].

ڕێککەوتنی ١١ی ئازار هەلو مەرجێکی لەباری بۆ بەرەسمی تر داننان بەمافەکانی کورد و لە ناویاندا گەشەکردنی زمان و خوێندنی کوردی پێك هێنا. سەردەمێکی زێڕین و کەشێکی لەبارتر لە سالانی پێشوو بۆ پەرەپێدانی خوێندن و فێربوون ڕەخسێنرا، بەتایبەتی کە لە سەرەتادا تین و هێزی شۆڕش بەهێزبوو، گەلی کورد بەتوندی خۆی بەچارەنووسی شۆڕش و سەرکردایەتییەکەیەوە بەستابۆوە، حکوومەتیش بۆ کەمکردنەوەی ئەم تین و تاوە و دامرکاندنەوەی نەتەوەی کورد بەخێرایی دەستی کرد بەبلاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری لە کوردستاندا.

پێویستە لەم بارەوە ئاماژە بەراسپاردەکانی سێیەمین کۆنگرەی مامۆستایانی کوردستان بکەین کەلە ٥ ی ئابی ١٩٧٠ لە ژێر دروشمی (ئاشتی، زانست، برایەتی) لە ناوپردان بەسترا (٢١٠) ئەندام لە ماوەی سێ ڕۆژ لە ژێر چاودێریی بارزانیی نەمر تێیدا بەشداربوون. لە (١٢) خالدا ڕاسپاردەکانیان ڕاگەیاند. کە دەکرێت وەکو بەرنامەیەکی گشتی ڕێباز و داواکانی پەروەردە و فێرکردن لە کوردستانی هەوەلین مانگەکانی دوای دەستپێکردنی قۆناغی تازەی پاش ١١ی ئازاری ١٩٧٠ باسی لێوە بکەین و ،لایەنی پرۆگرام و پێداویستییەکانی خوێندنیش بەگشتی دەخاتە ڕوو، کە ئەمانە بوون:[٩٣]

١- کتێبی خوێندن لە قوتابخانەکانی کوردستان بەجۆرێك بێت لەگەڵ پێویستیی گەلی کورد و ئامانج و ئاواتەکانی بگونجێت. جوغرافیا و مێژووی کوردستان لە هەموو قوتابخانەکانی عیراقدا بگوترێتەوە.

٢- زوویەزوو یاسای کۆڕی زمانەوانیی کوردی دابنرێ و کاری بۆ ئامادەبکرێت.

٣- لە ناوچەکانی کوردەواریدا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی بەکوردی بێ.

٤- زوویەزوو یاسای بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی کوردی دابنرێ و میلاکی بۆ ڕێکخرێ.

---

(٩٢) گۆڤاری برایەتی ژ (١) سالی (١) خولی دووەم ٦/١ /١٩٧٠.ل.٦.

(٩٣) گۆڤاری برایەتی ژ (٤) سالی (١) خولی دووەم سەرەتای ئەیلوولی ١٩٧٠.ل.١٥.

٥- قوتابخانەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بکرێن بەقوتابخانەی ڕەسمی لە سەری ساڵەوە و کەرەستەیان بۆ ئامادە بکرێ.

٦- قوتابخانە داخراوەکان بکرێنەوە. تەنیا ناوچەی دهۆك (٨٧) قوتابخانە داخراوە.

٧- میری چارە بدۆزێتەوە بۆ کارگێڕی بەشی خوێندەواری و لەش ساغی سەر بەپارتی دیموکراتی کوردستان.

٨- بەشێوەیەکی بێ لایەن چاری مەسەلەی مامۆستایان و قوتابخانەکانی کوردستان بکرێ و، نوێنەری هەبێ لە لێژنەکانی گواستنەوەی مامۆستایان و رێکخستنی کادردا لە مەرکەزی هەموو ناوچەکانی کوردستاندا.

٩- دوو یارمەتیدەر دابنرێن بۆ بەڕێوەبەریی پەروەردە و فێرکردنی دیالە و نەینەوا بۆ سەرپەرشتیی جێبەجێ کردنی پرۆژەی دەرس وتنەوە بەکوردی.

١٠- دەفتەری بەکەلۆری لە یەکێك لە مەرکەزەکانی ناوچەکانی کوردستاندا تەماشا بکرێن.

١١- گۆشەیەك بدرێ بە (ی.م.ت) لە تەلەفزیۆنی کەرکووك و مووسڵدا.

١٢- داوا لە نەقابەی مەرکەزی بۆ نەکردنی ئەو کۆبوونەوەیە کە ناوی لێ نراوە کۆبوونەوەی مامۆستایانی کوردستان.

زانست باشترین چەکی ڕزگارییە

وتاری یەکەمی کۆنگرەی سێیەمی یەکێتیی مامۆستایانی کورد، گوتارێکی سەرۆکی نەتەوەی کورد بارزانیی نەمر بوو، کە کۆنگرەکە پێشکەشی کردووە و بایەخ بەپێگەیاندنی منداڵان و زانست و زانیاری دەدات و زانست بەباشترین چەکی رزگاری دەزانێت. لەبەر ئەوەی ئەم گوتارە وەکو گوتارێکی رەسمی تۆمار کراوی سەرکردەی ناوداری کوردە و لە قۆناغێکی مێژوویی وەکو ١١ی ئازار و لە کۆنگرەی مامۆستایان پێشکەش کراوە، پەیوەستە بەڕەوشی خوێندن و مەسەلەی خوێندەواری لە کوردستاندا، وەکو خۆی لێرەدا دەینووسینەوە:

خوشکان! برایان!

خۆش هاتنێکی گەرمی خۆتان و، پیرۆزبایی کۆنگرەکەتان لێ ئەکەم و، داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم لە تەقەلاتاندا لە پێناوی نیشتیمان و پێگەیاندنیا وەبۆ دەرس

وتنەوە بۆ منداڵانی کوردستان و زانست و زانیاری فێرکردن. هیوام وایە خۆمان لەناوخۆمانا یاریدەی یەکتر بدەین و هاوکاریش لەگەڵ حکومەتی نیشتیمان پەروەر بکەین بۆ جێگیر کردنی بناغەی ئاشتییەکی پایەدار و هاریکاری نیشتیمانی لەناو هەموانا و، بۆ یەکیەتی نیشتیمان.

زانست باشترین چەکێکە گەلانی پێ رزگار ببن لە تاریکی و بچنە ناو جیهانی روناکییەوە. لەبەر ئەوەی داواتان لێ دەکەم بەباشترین شێوە چەکی زانست بخەنە کار، بەجۆرێکی وا کە لەگەڵ باری وڵاتەکەمانا بگونجێ و بەپێی پێویستییەکانی پێشکەوتنی بێ، شتی گرنگ ئەوەیە هەرچی دەکەین لە چوار چێوەی هاوکاریی هەموو رۆڵەکانی گەلی عیراقدا بێ و لەگەڵ حکومەتدا بیکەین بۆ ئەوەی هەرا و ئاژاوە نەهێڵین و رێگای پەیدا بوونی تەنگ و چەڵەمەی نەدەین و مەودای شتی وانەدەین کە زیانی بۆ سوودی گشتی هەبێ دیسان بەخێر هاتنتان لێ دەکەمەوە هەر خۆش بن[٩٤].

لە درێژەی رۆڵی مامۆستایان لە نێو شۆڕشی ئەیلوولی میللیدا، کە تازەترین ئەزموونی کوردە لە ژێر دەسەڵاتی شۆڕش و لە هەلومەرجێکی زۆر سەختدا، لەتەك شەڕی بەرگری لە مان و نەمان بتوانێت لەتەك دامەزراندنی رادیۆی شۆڕش و دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤاری پێشمەرگە و بوارەکانی تری رۆشنبیری بایەخ بەخوێندەواری و رۆشنبیران و مامۆستایان و زانایانی ئاینی و زانست پەروەران بدا و شوێنی شیاویان لە نێو جەرگەی شۆڕشدا بۆ دیاری بکا. بەڵگەی بایەخدان بەکردنەوەی قوتابخانە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش و هەلومەرجی دژواری خوێندن لە کوردستان و کۆششەکانی بۆ پێگەیاندنی منداڵی کورد و خوێندنی زمانی کوردی لەم وتارە دەردەکەوێ کە سەعید ناکام بەناوی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە سێیەم کۆنگرەی مامۆستایان پێشکەشی کردووە، لەبەر وابەستەیی بە باسەکەمان دەقی وتارەکەی رەش نووس دەکەینەوە:

**سەرۆکی خۆشەویست کاك مستەفا بارزانی**

**میوانە بەرێزەکان**

مامۆستایانی خۆشەویست... ئەندامانی سێیەمین کۆنگرەی مامۆستایانی کوردستان جێی دڵشادیمە کە بەناوی یەکێتیی نوسەرانی کوردەوە، پیرۆزبایی کۆنگرەتان بکەم، کۆنگرەی ئاشتی و زانیاری و برایەتی و ئاواتی سەرکەوتنتان بۆ بخوازم.

---

(٩٤) گۆڤاری برایەتی ژ (٤) ساڵی (١) خولی دووەم سەرەتای ئەیلوول ١٩٧٠، ل١٤.

لەسایەی شۆڕشی کوردستان و ئەنجامە سەرکەوتووانەکەیەوە، لە پاشی یانزەی ئازارەوە تا ئێستا ئەمە سێیەمین کۆنگرەی کوردییە لەم شوێنەدا دەبەسترێت و ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بەهەموو ئازادی و سەربەستییەوە لە دەوری یەکتر کۆ دەبنەوە و لە بارەی پەرەپێدانی داخوازییە پیشەیییەکانی خۆیانەوە دەدوێن و ڕێگای چارەسەر کردن و باشتر بوونیان بۆ دەدۆزنەوە.

یەکێتیی نووسەرانی کورد کە شانازیی بانگکران و بەشدار بوونی کردنەوەی کۆنگرەتانی دراوەتێ یەکێکە لەو بەرهەمە پیرۆزانەی بەهۆی ڕەنج و تەقەلای مامۆستایانەوە پێك هاتوە و پاداشتێکی بچووکە و بۆ ئەرکی پڕ لە پیت و ماندوو بوونی مامۆستایان نەك تەنیا ئەدیب و نووسەر و شاعیر بەڵکو تەواوی هونەرمەند و ئەندازیار و پسپۆڕ و فەیلەسووف و گشت لقێك لە لقەکانی تری زانیاری لە جیهاندا، لە یەکەم دەرسەوە تا دەگاتە دوا پلەی فێربوون لەسایەی مامۆستایانەوە.

چاکەی مامۆستا لەسەر گەل و چینی جۆربەجۆرەکانی لە ژمارە نایەت و وەکو پێشینان و تووویانە پێویستە مامۆستا بگەیەنرێتە ڕادەی پەرستن و کڕنۆش بۆ بردن. بەڵام لە هەمان کاتا مامۆستاکانیش دەبێ فەرمانە پیرۆزەکەیان بە لەخۆبردوویی بەجێ بنێن و بەتایبەتی ئێوە مامۆستایانی کوردستان ئەرکێکی گرانتان کەوتووەتە سەرشان.

نیشتیمانەکەمان ماوەی دە ساڵ لە ژێر ئاگر و ئاسن ژیاوە و لە هەمو بەرەوبوومی ژیان و پێگەیشتن بەشبڕاو بووە. قوتابخانەکان بەبۆمبا رووخاوە، کتێب و دەفتەری قوتابی سووتاوە، ئەو ساوایانەی لە سەرەتای شۆڕشی کوردستانا لە پۆلەکانی سەرەتاییدا بوون دەستیان لە خوێندن هەڵگرت و ئەوەی دەیانزانی لە بیریان چووە، ئەو چینە کۆرپانەی لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا پێ دەگەیشتن نەك قوتابخانەیان نەدەدی بەڵکو ناوی کتێب و دەرس و خوێندنیان بەرگوێ نەدەکەوت.

دە ساڵی ڕەبەق تیپ تیپ منداڵی کۆرپەی کورد گەیشتنە تەمەنی خوێندن و بازی بەسەردا، قوتابخانەی نەبینی و بەنەخوێندەواری مایەوە... لە مەیدانی زانست دە ساڵ پاش کەوتین و لە کۆڕی پێشکەوتنی گەلانا بەدەیان ساڵ.

جا ئەرکی سەرشانی ئێوە مامۆستا بەڕێزەکانی کوردستان دووقات خۆماندوو کردن و ڕەنج کێشانە، چونکە هەر ئێوە دەتوانن تۆڵەی دە ساڵی لەدەسچوو بۆ ڕۆڵەکانمان بکەینەوە.

دەرس بەساوایان بلێن، بەربەرەکانێی نەخوێندەواری بکەن، تۆوی کوردایەتی و کوردستان پەروەری لە شار و لادێکانا بچێنن و خۆتان بگەیەننە ڕادەی ئەو ئەرکە قورسەی پێتان سپێردراوە.

براکانم شۆڕشی دە ساڵەی کورد هەر چەندە زۆرانبازیی مان و نەمان بوو، هەموو توانایەك لە پێناوی (کوردستان یان نەمان)دا بەخت دەکرا، هەرچەندە بەدەرامەتێکی کەم و سامانێکی هێجگار لاوازەوە دەبووایە بەرەو پیری هەزاران جۆرە پێداویستی و کەموکوڕی بچێ بۆ بەڕێوە بردنێکی کولەمەرگی، پێشمەرگە قارەمانەکانی و لە هۆیی موبی بکاتەوە تا بتوانێ ئاشی بەسامی شەڕی خوێناوی بەسەرا سەپاوی ڕزگاریی لە خول نەکەوێ... لەگەڵ ئەوەشا لایەنی زانست و زانیاری نەخستبوە لاوە. بەشی زانست و لەش ساغی لە مەکتەبی تەنفیزی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش لەگەرمەی شەڕ لە ناوچە ڕزگارکراوەکاندا گەلێك قوتابخانەی کردەوە، منالە ساواکان تەنەکەی خاڵییان کرد بەرەحلە و دیواریان ڕەش کرد لە جیاتی سەبوورە و بەچوار پێنج منال لە کۆنە کتێبێکا خوێندیان، ئاوایان دەس پێ کرد بەڵام نەوەستان و درێژەیان پێ دا، سێ دەورەی دوا بەدوای یەك لە ئەکادیمی پێگەیاندنی مامۆستایانی کوردستان دەرچوون و بەسەر لادێکانا دابەش کران، سەرکەوتنی شۆڕش و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری شان بەشانی یەکتر بەرز بوونەوەو پێشکەوتن. مامۆستاکانمان قەڵەم بەدەست و تفەنگ لە شانا دەرسیان ئەوتەوە، بێگومان ئەگەر شەڕ درێژەی بکێشایە، تێری ناوخۆ (اکتفای زاتی) مان لە بارەی خوێندنەوە پێك هێنابوو، ئەشکەوتەکان جگە لە بنکەی پێشمەرگە جێگای مابوو ببێ بەقوتابخانەی ساوایانیش.

مامۆستا خۆشەویستەکان لەم کۆنگرەیەتانا کە بەوپەڕی ئازادییەوە لە گیروگرفتەکانی پیشەیی خۆتان دەکۆڵنەوە و نەخشەی پێشخستنی زانستی کوردستان دەکێشن... ئەمە یەکێکە لە بەرهەمەکانی یانزەی ئازار و ئەویش ئەنجامێکی گومان لێ نەکراوی شۆڕشی دە ساڵەمان و بەنرخی خوێنی ئەو شەهیدانە کراوە کە خۆیان کردە پرد بۆ پەڕینەوەی میللەتی کورد لە لافاوی هەڕەشەی دوژمن بەرەو یەکەم قۆناخی ڕزگاری.

جا هەر دەرگایەکی خۆشیمان لێ بکرێتەوە، هەر شنە بایەکی ئازادی و بووژاندنەوە لە کوردستانا بشنێتەوە، هەر جۆرە جیاوازییەك لە نێوانی ژێر دەستی و سەربەخۆییدا هەست بکرێ، هەر کۆبوونەوە و کۆنگرەیەکی سەربەستانە بگیرێ، هۆی ئاشکرا و

پێکهێنەری بناغەییەکەی هێزی کۆڵنەدەری پێشمەرگەی کوردستانە و بەخوێنی ئاڵی شەهیدانمان سەنراوە.

با ئەم دوو ناوە، ناوی هێزی پێشمەرگە و گیانی شەهیدان هەمیشە لەبەر چاومان بن و لە گوێچکەمانا بزرنگێنەوە و هەتا هەتایە لە پەڕەکەی دڵمانا جێیان بکەینەوە و مێشکی کۆرپەکانمانیان پێ ئاو بدەین... با سەری ریز و قەدر زانین لە ئاستیان دانەوێنین و دڵنیابین کە ئەم چیایانە بێ خاوەن نین و بێگانە تیایانا ناژی. تەجروبەی یەکەمجار هەرچەندە گران و بەئێش بێ، دووپاتکردنەوەی ئاسانترە.

ئیتر هیوادارم کۆنگرەکەتان سەرکەوتوو بێ و باشترین ڕێگا بدۆزنەوە بۆ خزمەت و پێشخستنی زانست و زانیاری لە کوردستانا»(٩٥).

لە ڕۆژی ٢٧ی ئەیلوول ١٩٧٠دا ڕۆژنامەی (التآخی) وتارێکی لەمەڕ کێشەی خوێندەواری و دواکەوتنی کردنەوەی قوتابخانە و بێ کار بوونی دەرچوانی خانەی مامۆستایان و بێ بەش بوونی هەزارەها منداڵی کورد لە خوێندن و هاندانی کاربەدەستانی عێراق بۆ بەخۆکەوتن لە جێبەجێ کردنی ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بەتایبەتی لە بواری پەروەردەو کردنەوەی قوتابخانە لە کوردستاندا، لەم بارەوە نامەیەکی کراوەی لقی نەینەوای یەکێتیی مامۆستایانی کوردستانی بڵاوکردووەتەوە، بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەم باسە ئێمە کە پەیوەستە بەسیاسەتی دەوڵەتەکانی کوردستانیان پێوە لکێندراوە و بواری خوێندن و خوێندەواری لەو ماوەی گرینگە مێژووییەی کە وەرچەرخانێکی دیاری لە کاروانی خوێندنی زمانی کوردی و خوێندەواری و قوتابخانە لە مێژووی سیاسی و ڕۆشنبیری تۆمار کردووە، دەنووسینەوە کە دەڵێت: لەم ڕۆژانەدا نامەیەکی سەرکراوەی لقی نەینەوای یەکێتیی مامۆستایانی کوردستانمان بڵاوکردەوە، لە بارەی ئەوەوە کە هێشتا (سەدو دە) قوتابخانەی ناوچە کوردەکانی پارێزگاری نەینەوا هەر داخراون، چونکە هەندێکیان هێشتا مامۆستایان بۆ دانەنراوە و، هەندێکیشیان کەلاوەشیان نەماوە!

ئەگەر بێت و بڵێین هەر کام لەم قوتابخانانە یەکی پەنجا قوتابیان تێدا بووە، ئەوە وادەگەیەنێ پتر لە (٥) هەزار کوڕ و کچی کورد ئەمساڵ بێبەش دەبن لە خێر و بەرەکەتی خوێندەواری، ئەمەش تەنیا لەم ناوچەیەدا، جا ئاخۆ باری ناوچەکانی تری کوردستان

---

(٩٥) هەمان سەرچاوە، ل١٧.

چۆن بێت کە کەمتریان لەم ناوچەیە تووش نەبووە لە وێرانی و بێکەسی و گوێ پێنەدان. ئەم بانگەوازەی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان لە نەینەوا مانایەکی ئێجگار قووڵی هەیە. چونکە کۆمەڵانی خەڵکی ئەو ناوچە بێکەسە دەیانەوێ منداڵەکانیان بخوێنن، لەو باوەڕەدا بوون مادەم بەیانی یانزەی مارت بەئاشکرا باسی ئەم مەسەلەیەی کردووە، زۆری پێ ناچێ قوتابخانەکانیان ئاوەدان دەکرێنەوە و مامۆستایان بۆ دادەنرێن. کەچی وا شەش مانگ بەسەر ئەم بەیانەدا تێپەڕی و ئەو شەش مانگە بەس بوو بۆ ئەوە کە لە هەر گوندێکدا ماڵێك بکرێتەوە و لە جیاتی شێلمان بەدار و پەردوو سەری بگیرێ و، لە جیاتی رەحلە تەختە حەسیری تیاداخرێت بۆ ئەوەی منداڵەکان بێبەش نەبن لە خوێندن و، ئەمەش پارەیەکی وای تێ نەدەچوو، هەرچەند هەرچەندیشی تێ چووایە قەیدی نەدەکرد و، پێویست بوو.. لەگەڵ ئەوەشا هیچ دیار نییە و بایەك بەلای گوێی کەسدا تێ نەپەڕیوە.

هەزاران دەرچووی مامۆستا بێ ئیش بەسەر جادەکاندا دەسووڕێنەوە، پێویستیان بەئیشێکە پێی بژین. لادێیە کوردەکانیش بەوپەڕی سۆزەوە دەیانەوێت منداڵەکانیان بخەنەبەر خوێندن، دە بۆچی ئەوانە ناکەن بەمامۆستا و خوێندن بۆ ئەم منداڵە کوردانەش دابین و مسۆگەر ناکەن؟نەکردنەوەی ئەو قوتابخانانەی بەهیچ جۆرێك لەگەڵ شۆڕش و شۆڕشگێڕی رێك ناکەوێ و، لەگەڵ رێبازی هیچ حکومەتێکی نیشتیمانپەروەردا ناگونجێت. دڵسۆزی بۆ گەلی کورد و بژاردنەوەی دواکەوتن ئەم چەند ساڵەش هەرگیز بەوە نابێ کە ئەو قوتابخانە بەداخراوی بمێنێتەوە.

بیانووی داهاتنی ساڵی نوێ و، نەبوونی پارە و شتی وا ناچێ بەگوێی کەسدا، چونکە هیچ حوکمێکی نیشتیمانپەروەر و شۆڕشگێڕ باوەڕی بەم جۆرە بیانووانە نییە. بەرهەم و دەسکەوتی هەر دەوڵەتێکی پێشکەوتنخواز دەبێ بۆ ئەم جۆرە بابەتانە تەرخان بکرێ و، دەبێ خوێندن ئامانجی یەکەم و تەندروستی ئامانجی دووەم بێت. کەواتە ئەرکی یەکەمی سەرشانی کار بەدەستان کردنەوەی قوتابخانە وێران کراوەکانی کوردستانە و، داواکەی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان لە نەینەوا دەبێ بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان تەماشا بکرێ.

جێبەجێ نەکردنی ئەم داوایە دەبێ بەهۆی بێ باوەڕی و، ئێمەش نامانەوێت بێ باوەڕی بڵاو ببێتەوە و، هیچ کون و کەلەبەرێك بکەوێتە هاوکاری و ئاشتی و

دۆستایەتیی نێوان ئێمە و میرییەوە و، کردنەوەی قوتابخانەکانی کوردستان بەکۆڵی شێرەوە نییە[٩٦].

نووسەرانی کورد پێشەنگایەتییەکی دیاریان لەم بارودۆخە نوێیە دەکرد، باری ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی خوێندن بەگەرمی کەوتنەکار بۆ بووژانەوەی کەسێتیی کورد، ئامانجی کارەکانی ڕۆشنبیران و نووسەران بوو.

### بڕیارەکانی کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد

لە خاڵی (١٤)ی بڕیارەکانیاندا هاتووە.

«دوای دامەزراندنی مەڵبەندێکی لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی لە لایەن میرییەوە بەو مەرجە کە خزمەتی بیری پێشکەوتووی کوردی و جیهانی بکات و داوای ماوە پەیدا کردن بۆ نووسەران و ئەدیبانی کورد کە بەرهەمیان لە چاپ بدەن و بڵاوی بکەنەوە».

خاڵی (١٥) دەڵێت: «داوای دانانی قانوونی خۆتەرخان کردن بۆ ڕۆشنبیرانی کورد بۆ ئەوەی لێهاتووەکانیان دەسیان ببی بۆ خەریکبوونی ژیاندنەوە و بووژاندوەی ئەدەبی کوردی».

لە خاڵی (١٦،١٧)شدا داوا دەکەن «داوای دەسویرد کردن بۆ خستنە کاری بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی کورد و فەراهەمکردنی هەموو دەسەڵاتێك بۆ ئەوەی بتوانێت خزمەتی بیری پێشکەوتووی کوردی بکا.

داوای جێبەجێ کردنی پڕۆژەی بڵاوکردنەوەی خوێندن بەکوردی لە هەموو لایەکی کوردستاندا و، لابردنی تەگەرە لە ڕێیدا، نەخوازەڵا لەو ناوچانەی کە کۆنەپەرستان بەدەس و دەم خەریکن کۆسپی دەخەنە بەر».

لە دواین خاڵیدا کە (١٨)ەیە دەڵێن: «داوای کردنەوەی کۆلیژێکی ئەدەبی لە زانکۆی سلێمانی لەیەکێ لە موحافەزەکان کوردستاندا»[٩٧].

لە دوای ساڵی ١٩٧٠ پرۆسەی خوێندنی کوردی و بەڕەسمی کردنی خوێندنی بەزمانی کوردی هەنگاوی مەزنی بۆ پێشەوە نا، لەماوەی نێوان ١٩٧٠-١٩٧٤ کە گفتوگۆ هەبوو،

---

(٩٦) گۆڤاری برایەتی ژمارە (٧) ساڵی (١) خولی دووەم ناوەراستی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ل٥.

(٩٧) گۆڤاری برایەتی ژمارە (٢) ساڵی (١) خولی دووەم تەمووزی ١٩٧٠ل٥٠.

زانکۆی سلێمانی گەشەی کرد بەشێوەی کوردستانی و ئامۆژگای مامۆستایانی مەڵبەندی لە هەولێر کرایەوە، زمانی کوردی بووە زمانی فێرکردنی رەسمی لە قوتابخانەکانی کوردستان و زمانی کوردی سەرباری ئەوەش لە هەموو پارێزگاکانی عیراق بووە دەرسی خوێندن(٩٨).

دوای رێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی مێژوویی بۆ یەکەم جار لە مێژوودا کورد توانیی وەکو لایەنێکی سەرەکی لە رێگەی گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەت و لە چوارچێوەی دەستوور و یاسادا بێتە خاوەنی خودموختاری دامو دەزگای بەرێوەبردنی هەبێ. بۆ یەکەم جاریش خوێندنی کوردی گەیشتە ئەم ئاستە بەرز و بەرفراوانە و وەکو یەکێك لە دەسکەوتەکانی ئەم قۆناغە دەست کرا بەگۆرانکاری و دانانی بەرنامەی تازە و کردنەوەی قوتابخانە و دامەزراندنەوەی قوتابخانەکان و هاتنە کاری یەکێتیی نووسەرانی کورد و دامەزراندنی کۆری زانیاریی کورد و دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی و کۆمەڵەی رۆشنبیریی کورد و بەرێوەبەرایەتیی رۆشنبیری گشتی کوردی و دەرچوونی بریاری بەیاننامەی ئازار و ...هتد. هەروەها دەرچوونی ژمارەیەك رۆژنامە و گۆڤاری کوردی وەکو (التآخی) و برایەتی، رۆژی کوردستان، گۆڤاری برایەتی، هاوکاری، بەیان، رۆشنبیری نوێ، کادر، پەروەردە و زانست و هتد.

لە سەرەتای حەفتاکاندا دەست کرا بەجێبەجێ بوونی مەسەلەی پەروەردە و فێرکردن لە نەینەوا. قوتابخانە سەرەتاییەکانی شێخان و ئاکرێ دەستیان بەخوێندنی کوردی کرد و قوتابخانە کوردییەکانی شەنگاریش نوێ کرانەوە. لە کەرکوك نزیکەی ١٨٥ قوتابخانەی سەرەتایی و (١٨) فێرگەی ناوەندی و ئامادەیی کوران و کچان جوێ کرانەوە و هەرچی خانەقین و جەلەولا و سەعیدیەشن پتر لە (٥٠) قوتابخانەی سەرەتایی و نزیکەی (١٠) فێرگەی ناوەندیی کوران و کچان گەیشتوونەتە دوا قۆناغەکانی دەست بەکاربوونەوە.

لە بارەی کتێبەوە وەزیری ئەو کاتی کاروباری ژووروو دەڵێ: لەبارەی کتێب و چاپەمنیی کوردیشەوە، جارێ لەبەرەوە، کتێبە عەرەبییەکانی پۆلی یەکەمی ناوەندی هەموو کراون، بەکوردی و زۆربەیان لەچاپ دراون. هەروەها چوار پێنج کتێبی سەرەتاییی تازە دانراوی ئەمساڵ بەکوردی و لەگەڵ چەند کتێبی تردا لەچاپ دراون.

---

(٩٨) رۆژنامەی خەبات، التربیة والتعلیم في کوردستان ١٩٩١–١٩٩٨ بحث قام به شمال رمضان (١) العدد ٨٧٣ الجمعة ١٩٩٨/٥/٨.ل٥.

حەوت کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی ناوەندی و ئامادەییەکان دانراون و زۆربەیان لەچاپ دران. ئەم کتێبانە شەشیان بۆ ناوچەی کوردەواری و یەکێکیان بۆ پۆلی شەشی ناوچە عەرەبییەکان دانراوە.

جگە لەمەش ئەلف و بێیەکی بژار کراوی ئاشنا بەهەردوو شێوە کوردییەکە لەچاپ دراوە. مێژووی گەلی کورد لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییەوە تا شەشی ئامادەیی لە سەرانسەری هەموو عیراقدا دەخوێندرێ. لە کەرکووك و دهۆك و ئامێدی و زاخۆ و نەینەوا و شەنگار و شێخان و خانەقین و سەر و دەورەی فێرکردنی زمانی کوردییان تیا کراوەتەوە(٩٩).

---

(٩٩) گۆڤاری پەروەردە و زانست، ژمارە (١) سالّی (١) ل٥ مێژووی دەرچوونی بەسەرەوە نییە. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوە زانستی و مێژووییە د.عبدالفتاح علی بۆتانی لەمەڕ خوێندن لە مووسڵ و کردنەوەی یەکەمین قوتابخانەی کوردی لە شاری مووسڵ کردوویەتی. بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی کوردی گشتی بەهاریکاری و هەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی پارێزگای نەینەوا، بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەی خوێندنی کوردی لەناو شارەکە و لە گەڕەکەکانی کوردی تێدا دەژین. بۆ دیاریکردنی ئەو ناوچانەی لەم پارێزگایە خوێندنی کوردی دەیانگرێتەوە لە نیسانی ١٩٧٠ لیژنەیەك بەسەرۆکایەتی حوسێن عەزیز ڕەشوانی (سەرپەرشتکاری تایبەتمەند) و ئەندامیەتیی د.رەزا دامرجی (بەڕێوەبەری گشتی لە دیوانی وەزارەتیی کاروباری باکور–نوێنەری تورکمان) و د.کاوس قەفتان و شەماڵ عارف (نوێنەری بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی) و حەقی ئیسماعیل ئەلفەحام چووە پاڵ لیژنەیەکە کە جێگری بەڕێوەبەری پەروەردەی پارێزگای نەینەوا بوو. لیژنەکە سەردانێکی فراوانی بۆ شەنگار و ئاکرێ و تەلەعفەر و شێخان و عەینزالە و زمار و بەعشیقە و تەلکیف و ئەلقوش کرد. لە ئاکرێ و هەموو قوتابخانەکانی شەنگار و شێخان و بەعشیقە و عەینزالە و ئاکرێ و زمار خوێندن بەزمانی کوردی گرنیوە. لە تەلەعفەریش پۆلێك بۆ خوێندنی کوردی لە قوتابخانەی ئەلسەعدیەی سەرەتاییی کوڕان کرایەوە، دواتر بووە دوو پۆل و مامۆستا محەمەدەمین محەمەد ئەرکی ئیدارەی هەردوو پۆلی لە ئەستۆ گرتبوو. لە قوتابخانەکانی شەنگار و عەینزالەش لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن پۆل بۆ قوتابییە عەرەبەکان کرایەوە. سەرەتا بڕیار درا دوو قوتابخانەی (١٢) پۆلی لەناو مووسڵ بۆ کوڕان و کچان بکرێنەوە. بۆ جێبەجێ بوونی بڕیار و کە لەمەڕ پرۆژەی خوێندنی کوردی لەم شارەدا، مامۆستا مستەفا مەحموود عەقراوی (کە دەرچووی بەشی زمانی کوردی) بوو، کرایە جێگری بەڕێوەبەری پەروەردەی پارێزگای مووسڵ بۆ کاروباری خوێندنی کوردی، ئیسماعیل عەبدولعەزیز ئەلداودی کە (دەرچووی بەشی کوردی) کرایە بەرپرسی پرۆگرام و کتێبی کوردی و عەبدولجەبار حامد (مامۆستا) لە بەڕێوەبەرایەتیی چالاکیی قوتابخانەکان و =

پێویستە ئاماژە بەکۆشش و کارە دروستەکانی (بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی) لە بەغدا بکەین کە لە سەرەتای جێبەجێ کردنی ڕێککەوتنامەی (١١)ی ئازاری ١٩٧٠ کەوتەخۆ و چالاکییەکی بەرفراوان، جێ ئومێدی بۆ پەرەپێدانی خوێندنی کوردی و زمان و مێژووی کوری هێنانە ئاراوە. ئەمەش هەر بۆ مێژوو بەشێکە لە بیبلوگرافیای هەندێك لە کارەکانی ئەم بەڕێوەبەرایەتییە و چۆنیەتیی بایەخدان بەزمان و خوێندنی کوردی، کە تا ئەو کاتە بەم جۆرە فراوان و ڕەسمییە کارەکان بەجوولە و بەرهەم نەکەوتبوون.

یەکەم: چاپکردنی کتێبی قوتابخانەکان

١- ٢٩٥،٠٠٠ دانە کتێبی قوتابخانە سەرەتاییەکان.

٢- بۆ یەکەم جار ٤٣،٠٠٠ دانە کتێب بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندییەکان.

٣- بۆ یەکەم جار ٢٦،٠٠٠ دانە کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) بۆ قوناغی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لە پۆلی یەکەمەوە تا شەشەم.

٤- بۆ یەکەم جار لە مێژووی عیراقدا زمانی کوردی لە پۆلی شەشەمی ئامادەییدا خوێندرا، بۆ ئەم مەبەستە ١٩،٠٠٠ دانە کتێب بە ناوی (خوێندنەوەی کوردی)یەوە چاپ کرا. کە ئەو ساڵە ٣٨٣،٥٠٠ دانە کتێب چاپ کرا.

---

= فوئاد عەبدولوەهاب (مامۆستا) لەبەشی هۆبەی چالاکیی وەرزشی و دوو مامۆستاش کەمالەدین عیزەدین بریفکانی و حەسەن عەلی بنگلی کرانە سەرپەرشتکاری پەروەردەیی. هەروەها سەرپەرشتکاری پێشووش (محەمەد سالح کەریم خان عەقراوی)یان بۆ کار لەگەڵ دانرا. ئەمانە دەستەیەکی بچووکی کاروباری خوێندنی کوردییان لەم شارە پێك دەهێنا.

بڕوانە د.عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١اذار، ل٤٦-٤٧.

بەپێی هەواڵێکی ڕۆژنامەی ژین ژمارە (٦)ی ١٤/١/١٩٧١ لاپەرە (٣) لە ١١ی ئازارەوە تاکو ١/١/١٩٧١ ئەم قوتابخانانە لە پارێزگای سلێمانی دروست کراون: قوتابخانەیەکی سەرەتایی ٦ پۆلی لە سەرچنار قوتابخانەیەکی سەرەتایی لە ئابلاغ،٥ قوتابخانەی سەرەتایی لەناو سلێمانی، یەك قوتابخانە لە بەکرەجۆ و یەکێك لە سەرچنار. قوتابخانەیەکی ئامادەیی لە سلێمانی و ٣ قوتابخانەی ناوەندی لە سلێمانی و قوتابخانەیەکی تری ١٢پۆلی لە سلێمانی، ئینجا لەم گوندانەش یەك و قوتابخانەیان تیادا دروست کراوە: ژاڵە، ئاشتی، بارام، باریَ گەورە، سەرکان، باوە کۆچەك، کەلکە سماق، دوکان. لەگەڵ قوتابخانەیەکی ناوەندی لە قەڵادزێ و کرانەوەی قوتابخانەی گوندی گەزمك. بڕوانە ژین ژ (٦) لە ١٤/١/١٩٧١.

دووەم: یارمەتیی نووسەر و دانەرەکان

۱۵۰۰دینار تەرخان کرا و لیژنەیەك لە دکتۆر عیزەدین مستەفا و مامۆستایان مەلا شکور و جەمیل بەهادین و عەبدولرەزاق بیمار و نوری عەلی ئەمین پێك هێنرا. یارمەتیی (۱٦) نووسەر و دانەریان بەپارە دا کە کتێبەکانیان بریتی بوون لە:

۱- چیرۆك و شانۆیی ٤ کتێب.

۲- فۆلکلۆر ۳ کتێب.

۳- زانیاری و مێژوو ۳ کتێب.

٤- لێکۆڵینەوەی وێژە ۲ کتێب

٥- ئاین ۱ کتێب

سێیەم: دەورەی راهێنان

بۆ ڕاهێنانی ئەو مامۆستایانە کە تا ئێستا بەزمانی کوردی دەرسیان بەقوتابیان نەداوە و پاش ئەوەی کە خوێندن لە هەموو شارەکانی کوردستاندا کرا بەکوردی، گورج بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی گشتیی کوردی بەهاریکاریی وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن کەوتەخۆ بۆ کردنەوەی چەند خولێکی فێرکردن و ڕاهێنانی دەرس گوتنەوە بەزمانی کوردی بەم جۆرە و لەم شوێنانە دەورە کرایەوە:

۱ - لە دهۆك ۱۲۲ مامۆستای کوڕ و کچ هی سەرەتای و ئامادەیی تیا بەشدار بوون.

۲- لە کەرکووك ۸۰ مامۆستای کوڕ و کچ هی سەرەتایی و ئامادەیی تیا بەشدار بوون.

۳- لە خانەقین ۸۰ مامۆستای کوڕ و کچ هی سەرەتایی و ئامادەیی تیا بەشدار بوون.

هەروەها سێ خولی تر لە قەزاکانی ئاکرێ و شەنگار و شێخان کرانەوە و بەنیازی ئەوەش کاریان کردووە کە خولی لەم جۆرە لە هەموو شارەکانی کوردستان بکەنەوە.

چوارەم: بەرنامەی خوێندنی مێژوو و ئەدەبی کوردی.

بڕیاردرا مێژووی نەتەوەی کوردیش لە هەموو قوتابخانەکانی عیراقدا بخوێندرێ، بەڕێوەبەرایەتی بەراوێژ کردن لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی هەولێر و سلێمانی و بەرنامەی دەرسەکانی مێژووی کوردی نووسی و بەشێوەی نامیلکە چاپ کراوە بەسەر هەموو پۆلی قوتابخانەکاندا دابەش کرا.

بۆ زمان و ئەدەبی کوردی بەهەمان شێوە، بەرنامەی دەرسی دانراو (٦) لێژنە لە مامۆستا و نووسەر و وێژە پەروەران دروست کرا، بۆ دانانی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ هەر شەش پۆلی ناوەندی و ئامادەیی.

**پێنجەم: جێگیرکردن و جێبەجێ کردنی خوێندن بەزمانی کوردی:**

ئەم لێژنانە بۆ هێنانەدیی بەرنامەی کارەکان چوونە شارەکانی کوردستان و دەست بەکار بوون:

١- لیژنەیەك لە مامۆستا حوسێن ڕەشوانی و عوسمان عەلی قادر پێك هات و چوونە پارێزگاکانی دیالە و کەرکووك و نەینەوا بۆ دیاریکردنی قوتابخانە کوردییەکان و ناو گۆڕینیان و دانانی بەڕێوەبەرە کوردەکان تێیاندا و زانینی پێویستییان.

٢- لیژنەیەکی تر لە مامۆستایان شکور مستەفا و جەمیل بەهادین بۆ دیاریکردن و چەسپاندنی قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییەکانی کەرکووك و خانەقین و مەندەلی و بۆ سەرژمێری مامۆستا و قوتابییە کوردەکان و ژمارەی کتێبی پێویستییان و پشکنینەوەی (دەورەی ڕاهێنان)ەکان.

٣- دوای لیژنەیەکی بالا لە بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی کوردی و وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن لەم مامۆستایانە پێکهاتن (عەبدوڵلا شالی بەڕێوەبەری گشتی، شکور مستەفا، فائق ئەلعبیدی پشیکنەری ئیداری لە وەزارەتی پەروەردە، بەدر فارس ئەلسەعد پشکنەری ئیداری لە وەزارەتی پەروەردە). ئەم لیژنەیە لە کوردستان گەڕا بۆ چەسپاندنی قوتابخانە کوردییەکان لەو ناوچانەی خوێندنی کوردی دەیانگرێتەوە و لێکۆڵینەوە لە گیروگرفتەکانی ئاگادار بوون لە پێویستییەکانی و دەرس کردنی خوێندنی کوردی لە چاو هەموو عیراقدا[١٠٠].

ئەم هەنگاوانەی بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی گشتیی کوردی لە ساڵی ٧٠-١٩٧١ ناویەتی بۆ کردنەوەی قوتابخانەکان و دەرس گوتنەوەی بەزمانی کوردی و خوێندنی زمان و ئەدەبی کوردی و مێژووی کورد لە قوتابخانەکان و سەرتاسەری عیراقدا، خەونێکی گەورەی کوردێنی بوو، سەرەتایەکی زێڕین لە بواری ڕۆشنبیری و هوشیاری و گەشاندنەوەی فکری و کەسێتیی ڕۆڵەی کورد دەستی پێ کرد. لەم ساڵەدا ئەم کارانەشی کردووە.

---

(١٠٠) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ (١)، ساڵی (١) ل١٠٠ لەمەڕ لیژنەکەی نەینەوا و کارەکانی بڕوانە پەراوێزی ژمارە-٩٦.

١- دامەزراندنی کتێبخانەیەك کە ژمارەیەك کتێبی باش و سەرچاوەی مێژوو و ئەدەب و زانیاریی کوردی تێدابووە.

٢- داوای دامەزراندنی چاپخانەیەکی کوردیی کرد، بۆ ئەوەی بەسەر گیروگرفتی چاپکردنی کتێبی کوردیدا زاڵ بێ.

٣- کارکردن بۆ وەرگێڕان و دۆزینەوەی زاراوەی زانستی و وێژەیی و جێگیرکردنیان لە کتێبە کوردییەکاندا. جگە لە دروستکردنی نەخشە و نیگاری ڕوونکردنەوەی بۆ قوتابییان.

٤- بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری لە کوردستاندا تێ کۆشاوە.

٥- بۆ یەکەم جار زمانی کوردی کەوتە ناو تاقیکردنەوەی گشتی، کە لە ساڵی ١٩٧٢-٩٧١ خوێندنەوە دەست پێ دەکات.

٦- هەر لەو میانەشدا، گۆڤاری پەروەردە و زانستیان لە ساڵی ١٩٧١ دا چاپ و بڵاوکردەوە.

لەو ماوەیەدا ئەگەر کاروبارەکان وەکو خۆیان بەڕێوە نەچووبن و کۆسپ و کێشەش لە ڕێگەدا مابن، وەلێ زەمینە مێژووییەکە و دڵسۆزی کارگەران بۆ چەسپاندنیان دەسکەوتەکانی ئەم قۆناغە و پەرۆشییان بۆ پەرەپێدانی خوێندنی کوردی وای کردبوو، کە پەلە لە کارەکانی بکەن و لەلایەن دەسەڵاتدارانی کورد و شۆڕشەوە بەوردی چاودێریی هاتنەدیی بەرنامەکان دەکراو بەتایبەتیش لە بواری پەروەردە... ئەمەش وای کرد ئەمە لە ئایندەشدا ببێتە شتێکی جێگیر و بەشێکی سەرەکی لە خواستی جەماوەری کوردستان و بە هۆشیاریی زۆرەوە خەڵك بۆ بەردەوامبوونیان لەسەر فێربوون و خوێندن وای کرد، دەسەڵاتدارانی بەغدا نەتوانن خوێندن بەزمانی کوردی بەتەواوی بنەبڕ بکەن و نەیهێڵن. هەر چەندە هەوڵی زۆریان دا قەدەغەکردن و نەهێشتنی خوێندن بەزمانی کوردی بەتایبەتی لە نێوان (١٩٨٠-١٩٩٠)، بەڵام ڕووبەڕووی نارەزایی و خۆپیشاندان و ڕابوونی قوتابییانی نیشتیمانپەروەر هاتن، چونکە ئەم مەسەلەیە (زمانی کوردی) بووە بەشێك لە تێکۆشانی نیشتمانی و رزگاری و هوشیاریی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کورد.

چونکە باسی ئێمە مەسەلەی خوێندەواری و پەرەسەندنی خوێندن و فێرکردنە لە کوردستاندا دەبێ دیسان ئاماژە بەکارەکانی ئەم بەڕێوەبەرایەتییە بکەین کە لەم

ماوەیەدا بۆ گەشەکردنی خوێندنی کوردی لە کوردستانی باشوور داویتی:

لە ڕۆژانی ٤-٥ تاکو ١٩٧١/٥/١١ سێیەمین کۆڕی پیلاندانانی خوێندنی گشتی ئەنجام درا، عەبدوڵلا شالی بەڕێوەبەری گشتیی خوێندنی باڵا و نوێنەری وەزارەتی کاروباری ژووروو لەم کۆڕەدا دەربارەی خوێندنی کوردی یاداشتێکی پێشکەش بە سەرۆکی کۆڕەکە کرد. بۆ کردنەوەی کۆلیجی پەروەردە لە زانکۆی سلێمانی تا مامۆستایانی کورد پێ بگەیەنن.

لە ساڵی ١٩٧١دا ئەم بەڕێوەبەرایەتییە کەوتە خۆ بۆ دانانی کۆمەڵە کتێبێك لە بارەی ڕێزمان و ئەدەبی کوردییەوە و وەرگێڕانی کتێبەکانی پلەی خوێندنی ناوەندی بۆ سەر زمانی کوردی جگە لەو کتێبانەی وەرگێڕدرانە سەر زمانی کوردی و (٧) کتێبیش دانران. ساڵی ١٩٧١یش (٢٠) کتێب وەرگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی.

کتێبە دانراوەکانیش ئەمانەن:

١- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی.

٢- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی.

٣- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی.

٤- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی سانەوی و پیشەیی.

٥- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی سانەوی.

٦- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی سانەوی.

٧- خوێندنەوەی کوردی بۆ قوتابییانی پۆلی شەشەمی سانەوی (ئەوانەی کورد نین).

وەرگێڕدراو بۆ:

پۆلی یەکەمی ناوەندی (ساڵی ١٩٧١ - ١٩٧٢)

١- مێژووی چاخە کۆنەکان.

٢- جوگرافیای گشتی.

٣- ماتماتیك.

٤- پەروەردەی ئاینی.

٥- پەروەردەی نیشتیمانی و کۆمەڵایەتی.

٦- سەرەتای زانیاریی گشتی.

قوتابخانە سەرەتاییەکان ساڵی (١٩٧١ - ١٩٧٢)

٧- مێژووی عەرەب و ئیسلام بۆ پۆلی پێنجەم.

٨- مێژووی عیراق بۆ پۆلی شەشەم.

٩- پەروەردەی کۆمەڵایەتی بۆ پۆلی چوارەم.

١٠- جوگرافیای عەرەبستان بۆ پۆلی شەشەم.

١١- خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی چوارەم.

پۆلی دووەمی ناوەندی ساڵی (١٩٧٢-١٩٧٣)

١٢- پەروەردەی ئاینی.

١٣- سەرەتای ئەندازە.

١٤- جەبری ناوەندی

١٥-جوگرافیای عەرەبستان.

١٦-مێژووی عەرەب و ئیسلام.

١٧- کیمیا.

١٨- پەروەردەی کۆمەڵایەتی.

١٩-بایۆلۆژی و تەندروستی.

قوتابخانە سەرەتاییەکانی ساڵی (١٩٧٢-١٩٧٣)

٢٠- زانیاری و پەروەردەی تەندروستی بۆ پۆلی چوارەم.

٢١- زانیاری و پەروەردەی تەندروستی بۆ پۆلی پێنجەم.

٢٢- زانیاریی تەندروستی بۆ پۆلی شەشەم

٢٣- پەروەردەی نیشتمانی بۆ پۆلی پێنجەم.

٢٤- پەروەردەی نیشتمانی بۆ پۆلی شەشەم.

٢٥- جوگرافیا بۆ پۆلی پێنجەم.

٢٦- خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی پێنجەم.

٢٧- خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی شەشەم.

٢٨- ماتماتیکی نوێ بۆ پۆلی یەکەم.

پۆلی یەکەمی ناوەندی ساڵی (١٩٧٢-١٩٧٣)

٢٩- سەرەتای زانیاریی گشتی.

٣٠- جوگرافیای گشتی.

٣١- پەروەردەی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی(١٠١).

دەبێت لە کردەوە دیارەکانی ئەم قۆناغە ئەوە لە بیر نەکەین کە نووسەر و ڕۆشنبیر و زانایانی کورد کەوتنە خۆ و کارێکی زۆریان لە بواری ڕۆشنبیری و کەلتووری و زمانەوانی بۆ پێشەوەبردنی خوێندن و پەرەپێدانی خوێندەواری بینیوە، نەوەیەکی تازە لە ڕۆشنبیران لەم ماوەیەدا بەگیان و بیرکردنەوەی تازە هاتنە مەیدان و گەشەکردنێکی بەرچاو لە بواری ڕۆژنامەگەری و شیعر و ئەدەبیاتی کوردی سەری هەڵدا، قەڵەم و بیرکردنەوە بۆ زانست و پێشکەوتن تەرخان کرا. ژمارەیەکی دیار هاریکاریی سەرکەوتنی پرۆسەی خوێندن و خوێندەوارییان لە ساڵی **١٩٧١** لە بواری پەروەردە و فێرکردن لە دانان و وەرگێڕانی کتێب پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتیی گشتی خوێندنی کوردی کردووە. ئەم نووسەر و ئەدیب و زمانەوان و ڕۆشنبیر و پسپۆڕانەش ئەمانەن، کە نابێت شوێنیان لە پتەوکردنی سەرەتاکانی ئەم قوتابخانەی خوێندن و فێرکردنی کوردی کوێر بکرێتەوە.

**بەغدا:**

دکتور کەمال مەزهەر، عەلائەدین سەجادی، عەبدورەحمانی هەژار، شێخ محەمەدی خاڵ، دکتۆر ئیحسان فوئاد، د. عیزەدین مستەفا، د. مارف خەزنەدار، د. نەسرین فەخری، عەبدولقادر قەزاز، سەعید ناکام، محەمەدی مەلا کەریم، شکور مستەفا، جەمال بابان، نوری عەلی ئەمین، سادق بەهائەدین، عەبدولرەزاق بیمار، محەمەد ئەمین عوسمان، فەرەیدون عەلی ئەمین، کەمال مەحمود فەرەج، ئەحمەد غەفور، د. ئەحمەد عوسمان، کامل بەسیر، عومەر کەریم، حافز مستەفا قازی، ڕەفیق چالاك، مستەفا نەریمان، دکتۆر عەبدورەحمان نورجان، موحەمەد ڕەسوول هاوار، حسێن عەقراوی، عەزیز ئیسماعیل شوان، خەلیل عەبدوڵلا، هادی ئیسماعیل، فازل شەوکەت.

---

(١٠١) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(٢) ساڵی (١) ل٨٥.

سلێمانی:

شاکر فەتاح، عەبدوللا میدیا، مستەفا سالح کەریم، ئەحمەد هەردی، کەمال جەلال غەریب، حەمە سالح سەعید، کامەران موکری، عەلی شەونم، ئەبوبەکر هەوری، محەمەد مستەفا کوردی، عومەر عەبدورەحیم، موحەرەم محەمەد ئەمین، موحەمەد حەوێز، دارا عومەر، فایق عارف، فەرەیدون محەمەد فەرەج.

هەولێر:

حسێن ڕەشوانی، کەمال غەمبار، محەمەد کەریم هەورامی، کەریم شارەزا، مەجید ئاسنگەر، ئەمین محەمەد، عەلی عەبدوڵڵا هەژار، محەمەد مەلا قادر، مەسعوود عەبدولقادر، عەبدوڵلا ئیسماعیل، محەمەد ئیسماعیل.

کەرکووك:

عەبدولجەبار جەباری، تاهیر سادق، لەتیف بەرزنجی، فاتح محەمەد ئەمین، سوبحی داودی، مستەفا وەیسی، ئیبراهیم سەعید، خەزعەل ڕەشید،

هەروەها ئەم مامۆستایانەش بەشدار بوون:

کەریم دەولەت، دکتۆر ئەمین عەلی سەعید، دکتۆر عەزیز ئەحمەد، گیوی موکریانی.

دەردەکەوێت (٧٢) کەس لە شارەزا و نووسەران هاریکاریی پێشخستنی خوێندنی زمانی کوردی بوون و بەپێی توانا بەشدارییان لەم ئەرکە مێژووییەدا کردووە، بەڵام جێی سەرسوڕمانە کە لە (نەینەوا و دهۆك) هیچ کەسێك ناوی بەپێی شارەکان نەهاتووە وەکو ئەوەی لە بەغدا و کەرکووك و هەولێر و سلێمانی دیار دەکەوێ. (٣٣) کەس لە بەغدا و (١٦) لە سلێمانی و (١١) لە هەولێر و (٨) کەسیش لە کەرکووك و (٤) کەسیش بەگشتی هاریکاری کردوون.

هەروەها دەبێت ئاماژە بەژمارەیەك ناوی تریش بکەین کە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ ڕۆڵیان هەبووە لە نووسینی کتێبی قوتابخانەکان، یا وەرگێڕان لە پرۆگرامی خوێندن وەکو:

تۆفیق وەهبی، سەعید سدقی، عەبدولواحد نووری، ڕەشید نەجیب، فایق بێکەس، د. عەبدوڵڵا نەقشبەندی، عەزیز محەمەد قادر، ڕەمزی قەزاز، عەبدوڵڵا گۆران، ئیبراهیم ئەمین باڵدار، عەلائەدین سەجادی، د. عەزیز ئەحمەد ئەمین، د. جوامێر مەجید سەلیم، د. دارا ڕەشید جەودەت، د. حکمەت توفیق، د. نەجدەت بەدیع محەمەد، د. عەلی توفیق قادر،

د. کەمال خۆشناو، مەسعوود محەمەد، عەلی ئیحسان سابر حەکیم، مووسا عەبدولسەمەد، محەمەد عەلی مەحموود، مەلا عەبدولکەریم، عوسمان عەلی قادر، ئەبوو زەید سندی، جەلیل بەهائەدین، عەزیز رەحیم، جەمال مەحموود فەرەج، محەمەد عارف رەئوف، عومەر کەریم مامە، شەمال عارف، محێدین بەرزنجی، عوسمان عەلی شێخ، سەعید فەهیم، بورهان نەقشبەندی، محەمەد عەلی عەبدوللا شەونم، مەجید ئەحمەد حەداد، حەیدەر هەمزە، ئەنوەر سلێمان، خدر حوسێن، نەجیب عەبدورەحمان، فەیسەل مستەفا ئەلحاج، عومەر شێخ عەبدوڵلا، محەمەد ئەحمەد، ئەمین محەمەد مەحمود، حسێن ڕەشوانی، عەبدوڵلا زێباری، نوری عەبدوڵلا، محەمەد رەشید مەلا عەلی، جەمال غەفوور، عەبدولکەریم محەمەد باراوی، ڕەئوف شێخ سالح، ئەنوەر فەخری، فوئاد عزەت، توفیق شەفیق، جەمال عەبدول، شێروان عەلی ئەمین، نوری عارف، محەمەد ئەمین حەسەن، عەبدولوەهاب سیراج، عومەر عارف محەمەد[١٠٢].

بەو پێیە دەردەکەوێت (٥٧) کەس لە بەغدا و (٢٠) لە هەولێر و (٨) کەس لە کەرکووك و (٣٨)یشیان لە سلێمانی بەشدارییان لەم پرۆژەیە کردووە کە پەیوەستە بەپەرەپێدانی خوێندن و زمانی کوردی.

لە چوارچێوەی ئەو زەمینەی هاتە ئاراوە، لە لایەن کوردەوە پەلەی زۆر لە کردنەوەی قوتابخانە و پڕکردنەوەی پێویستییەکان و چاکردنەوەی قوتابخانە داخراوەکان دەکرا. بەپێی هەواڵەکانی ئەوان سەردەمان کە لە (بڵاوکراوەی دەنگوباس) پەروەردەی دهۆك کە پێ دەچێت لە کۆتاییی مانگی ١٠ و سەرەتای مانگی ١١ی ١٩٧١ بڵاوبکرێتەوە ئەم هەواڵانەی تێدایە: بۆ بڵاوکردنەوەی پەروەردە و زانیاری لە بامەڕنی قوتابخانەیەکی ناوەندی یەك پۆلی کرایەوە. هەروەها بۆ یەکەم جار (٥٣) قوتابخانەی سەرەتایی لە دهۆك و گوندەکانی پارێزگای دهۆك کراونەتەوە بەپێی بەیانی بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی دهۆك کە لە ١٩٧١/٩/٩ بڵاوکراوەتەوە، جگە لەوانەش (١٠) قوتابخانەی داخراو سەرلەنوێ کراونەتەوە. لە خولەکانی بەهێزکردن و فێرکردنی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ مامۆستایان بەم شێوەیە کارکراوە:

١- لە ئامێدی (٥٢) مامۆستای کوڕ و کچ بەشداری خولەکە بوون.

٢- لە بامەڕنی (٤٢) مامۆستای کوڕ و کچ بەشداری خولەکە بوون.

---

(١٠٢) هەمان سەرچاوە ل٧ و ژمارە(٤) ساڵی (١) هاوینی ١٩٧٢.

٣- لە شاری دهۆکدا لە (٤) خول، (١٤٢) مامۆستای کوڕ و کچ بەشدار بوون.

٤- لە زاخۆ (٣) خولی ڕاهێنان کرایەوە (١٣٠) مامۆستای کوڕ و کچ تێدا بەشدار بوون.

٥- لە ئاکرێ (٢٩) مامۆستای کوڕ و کچ بەشداری خولەکە بوون.

٦- لە بەرواری بالا (٣٨) مامۆستای کوڕ و کچ بەشداری خولەکە بوون.

لە چوارچێوەی هەواڵەکان لە تاقیکردنەوەی گشتی، خوێندنی سەرەتایی لە دهۆکدا (٧٩.١٨٪) قوتابییان لە تاقیکردنەوە دەرچوون[١٠٣].

لە ئاکامی بەرفرەبوون و بەکارهاتنی بواری پەروەردە هەر لە ساڵی ١٩٧١دا بەڕێوەبەریی گشتیی خوێندنی کوردی بەهاریکاریی وەزارەتی پەروەردە ئەم چالاکییانەی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی خوێندن و پەرەپێدانی فێرکردن لە کوردستان ئەنجام داوە: لە شەنگار خولێکی فێرکردن و بەهێزکردنی مامۆستایان کرایەوە (٥٤) مامۆستای کوڕ و کچ تێیدا بەشدار بوون، لە شێخانیش دوو خولی (٥٤) مامۆستای کوڕ کچ تێیدا بەشدار بوون، هەروەها لە هەردوو خولی مووسڵ (٩٥) مامۆستای کوڕ و کچ بەشدارییان کرد و لە کەرکووکیش (٨٢) مامۆستای کوڕ و کچ لە دوو خول بەشدار بوون و لە خانەقین لە چوار خولدا (١١٢) مامۆستای کوڕ و کچ بەشدارییان هەبووە و لە خولی بەعشیقەشدا (٣٦) مامۆستای کوڕ و کچ ئامادە بوون و لە ئەلقووشیش خولێکی فێرکردن و ڕاهێنان کراوەتەوە.

دەبێت بڵێین کە لە پەروەردەی سلێمانیش خولێکی هەشت هەفتەیی بۆ (٦٩) ڕابەر (مرشد) بۆ فێرکردن و دەرس وتنەوە بەپوختی کرایەوە[١٠٤].

لە ساڵی ١٩٧٢شدا بەم شێوەیە هەندێك خولی ڕاهێنان و فێرکردن کرایەوە

---

(١٠٣) هەمان سەرچاوە. بەپێی زانیارییەکان هەر لەوکاتدا لە زانکۆی سلێمانی لە مەڕ دەرچووانی یەکەم خولی زانکۆی سلێمانی ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامەی ژین بڵاوکراوەتەوە کە لە کۆلێژی کشتوکاڵی لە کۆی (٧٢) کەس (٦١)یان دەرچوونە و لە کۆلێژی زانستی لە کۆی (١٢٧) قوتابی (٧٣)یان دەرچوون.

بڕوانە ڕۆژنامەی (ژین) ژ(٧٤) لە ١٩٧٢/٦/٢٩.ل ٢

(١٠٤) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(٢) ساڵی (١) ل٨٨.

### خشتەی ژمارە (٨) (١٠٥)

خولەکانی فێرکردن و ڕاهێنانی زمانی کوردی لە قۆناغی سەرەتایی ساڵی ١٩٧٢

| شوێن | | ژمارەی مامۆستایانی بەشدار کوڕ و کچ | ژمارەی خولەکان |
|---|---|---|---|
| پارێزگای دهوك | دهوك | ١٤٢ | ٣ |
| | زاخۆ | ١٥٥ | ٣ |
| | ئامێدی | ٤٥ | ١ |
| پارێزگای نەینەوا | مووسڵ | ٩١ | ٢ |
| | شێخان | ٥٣ | ٢ |
| | شەنگار | ١٨ | ١ |
| پارێزگای کەرکووك | | ٨٠ | ٢ |
| پارێزگای دیاله | خانەقین | ٨٤ | ٢ |
| | جەلەولا | ٣٥ | ١ |

هەروەسا لە ئامارێکی تردا لە پتەوکردن و ڕاهێنانی مامۆستایان و پێگەیاندنیان لە قۆناغی ئامادەیی لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٢دا، بەم جۆرە ژماریەك مامۆستا چوونەتە خولەکانەوە.

### خشتەی ژمارە (٩) (١٠٦)

خولی فێرکردن و ڕاهێنانی مامۆستایانی قۆناغی ئامادەیی ساڵی ١٩٧٢

| شوێن | ژمارەی مامۆستایانی بەشدار کوڕ و کچ | ژمارەی خولەکان |
|---|---|---|
| کەرکوك | ٢٩ | ٣ |
| سلێمانی | ٣٢ | ٣ |
| بەغدا | ٨ ئەمانە لە شارەکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێر و دیاله بوون | ٣ |

(١٠٥) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(٥) ساڵی (٣) بەهاری ١٩٨٣، ل٧٥

لە دوو ساڵی یەکەمی ڕێککەوتنی ئازار خوێندنی کوردی باش بووژایەوە لە ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٤ نزیکەی ٦٠٠ قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی و ئامۆژگاری لە کوردستان و زانکۆی سلێمانی کرایەوە، بروانە آ.ب. عن تعلیم فی کوردستان العراق، ل٢٣.

(١٠٦) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(٥) ساڵی (٣) بەهاری ١٩٧٣ ل٧٣.

بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕاگەیاندن و پەروەردەشەوە دەرس ئامادەکردن بۆ تەلەفزیۆنی پەروەردەیی لە لایەن کوردان و بەزمانی کوردی ئەو هەوڵە بوو کە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی گشتی خوێندنی کوردی دراوە لە تۆمارکردنی (٢١) دەرس بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لە ١٩٧٣/٢/١٠ تا ١٩٧٣/٢/٢٠، بۆ ئەوەی لە مانگی نیسانی ١٩٧٣ لە تەلەفزیۆنی کەرکووك بڵاویکرێنەوە.

لە دووەم هەوڵدا ئەم هەواڵەش لەم بارەوە دەخوێندرێتەوە

بەپێی نووسراوی ژمارە (٢٥٤) ڕۆژی ١٩٧٣/٢/١٧ بەشی هۆڵی فێرکردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی لە بەغدا چوار فیلمی منالآن و شریتێکی تۆمارکراوی نارد بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی کەرکووك (خوێندنی کوردی) تا لە تەلەفزیۆنی کەرکووکەوە بۆ منالە خۆشەویستەکانمان بڵاویکەنەوە.[١٠٧]

ئەمەش لایەنێکی تری هۆکارەکانی پەروەردەیە، قوتابییانی کورد دەتوانن باشتر بەزمانی زگماکی خۆیان سوود لە دەرسە تۆمارکراوەکان وەربگرن و لە ڕووی دەروونیشەوە هەنگاوێکی یەکەمە بۆ چەسپاندنی توانای سەرخستنی تەواوی فێرکردن بەزمانی کوردی و سوود وەرگرتن لە ئامراز و کەرەستە تازەکانی پەروەردە.

یەکێك لە پێویستییەکانی خوێندن کتێبە، بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بۆشاییە ژمارەیەکی زۆر کتێب چاپ کرا، لەم خشتەیەدا ڕێژەی ئەو کتێبانەمان بۆ تۆمارکراوە کە لە خوێندنی ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ چاپ کراون و دواتر نێردراون بۆ قوتابخانەکان، یا ماونەتەوە، و لە خشتەی ژمارە (١١)ش ڕێژەی کتێبە چاپکراوەکانی ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ دەردەکەوێ.

(١٠٧) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(٥) ساڵی (٣) بەهاری ١٩٧٣ ل٧٣-٧٤.

**خشتەی ژمارە(١٠)**

ژمارەی ئەو کتێبە کوردییانەی لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٤-١٩٧٥دا چاپ کراون

| کتێبەکان | هاتوو لە چاپخانە | نێر دراو بۆ قوتابخانەکان | ئەوەی ماوەتەوە |
| --- | --- | --- | --- |
| کتێبی قوناغی سەرەتایی | ١،٥٣١،٩٨٢ | ١،٤٢٢،٣٦١ | ١٠٩،٦٢١ |
| کتێبی قوناغی ناوەندی | ٤٤٠،٩٢٤ | ٣٨٧،١٨٠ | ٥٣،٧٤٤ |
| تێبی قوناغی ئامادەیی | ٢١٠،٤٣٨ | ١٤٦،٠٥٨ | ٦٤،٣٨٠ |
| کتێبخانەکان | ١٥،٢١١ | ١٥،١٥٨ | ٥٣ |
| کەرەستەکانی فێرکردن | ١٨،٣٠٩ | ١٨،١٤٨ | ٢٤١ |

**خشتەی ژمارە (١١)** (١٠٨)

کتێبە چاپکراوەکانی ساڵی خوێندنی ١٩٧٥- ١٩٧٦

| قوناغی خوێندن | ژمارەی خوێندن | رێژەی چاپی کتێب |
| --- | --- | --- |
| سەرەتایی | ٢٧ | ٥٤٥/٠٠٠ دانە |
| ناوەندی و ئامادەیی | ٦ | ٢٤٨/٠٠٠ دانە |

هەروەها (١٣) کتێبش وەرگێڕدراونە سەر زمانی کوردی، بەم شێوەیە

بیرکاری پۆلی پێنجەمی سەرەتایی

ئابووری پۆلی پێنجەمی ئەدەبی ئامادەیی

ئابووری پۆلی شەشەمی ئەدەبی ئامادەیی

پەروەردەی ئاین پۆلی شەشەمی ئامادەیی (ئەدەبی و زانستی)

بیرکاریی گشتی، پۆلی شەشەمی ئامادەیی- ئەدەبی

مێژووی شارستانی عەرەبی و ئیسلامی شەشەمی ئامادەیی-ئەدەبی

(١٠٨) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژمارە (١٠) ساڵی (٥) زستانی ١٩٧٦، ل١٢٥-١٢٨.

| | |
|---|---|
| کیمیا | شەشی ئامادەیی زانستی |
| جوگرافیا | شەشی ئامادەیی – ئەدەبی |
| ئەندازە | شەشی ئامادەیی –زانستی |
| فیزیاء | شەشی ئامادەیی –زانستی |
| گیانەوەرزانی | شەشی ئامادەیی –زانستی. |

هەروەها (٦) کتێبی تر بەناوی (زمان ر ئەدەبی کوردی) بۆ قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی دانراون.

## چاپخانەی هەولێر

بەهۆی هەلومەرجی تازەی کوردستان پێیدا تێدەپەڕی، خوێندن باش بووژایەوە، خەڵك رووی لە خوێندن کرد هاندانێکی لەبار بۆ پەرەسەندنی چوونە قوتابخانە هاتە ئاراوە، سالآنە ژمارەیەکی زۆری کتێب چاپ دەکران، تا ساڵی ١٩٧١ تەنیا کتێبی قۆناغی سەرەتایی بەکوردی سەدان هەزاری لێ چاپ دەکرا، دوای رێککەوتنی ساڵی ١٩٧٠ لە قۆناغەکانی تریشدا (ئامادەیی ناوەندی) خوێندن و کتێب بووە کوردی، گرفتی ئەم پرۆسەیە چاپکردنی کتێب بوو، چاپخانەی تایبەت بۆ چاپکردنی کتێبی کوردی نەبوو، کاغەز بەدەست نەدەکەوت بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی داوای دامەزراندنی چاپخانەیەکی دەکرد، چونکە دوای ١٩٧٠ رێژە و ژمارەی چاپکردنی کتێب زۆر بوو، خۆی لە (٨٠٠) هەزار و هەندێك جاریش یەك ملیۆن دەدا و، سالآنە (٩٠) کتێب دەبووایە چاپ بکرێ بۆ قۆناغەکانی خوێندن لەگەڵ ژمارەیەك نامیلکە و سەرچاوە و ئامرازی پەروەردەیی چاپکراو.

لە شاری هەولێر ساڵی ١٩٧٤ بڕیاری دامەزراندنی ئەم چاپخانەیە درا و لەگەڵ کۆمپانیای لاینوتایبەری ئینگلیزی رێك کەوتن بۆ دانانی سێ مەکینەی لتر بریسی چاپ ئەمە گەورەترین چاپخانەیە و زۆرترین ژمارەی کتێب چاپ دەکا. بڕیاردرا کە ئەم پرۆژەیە پەیوەست بکرێ بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی کە لە ئەنجامی رێککەوتنی ١٩٧٠ ئەم بایەخەی پێ درا و داوای دانانی چاپخانەی دەکرد، ئەمەش بەبڕیاری ژمارە ٤٣٧٨٣ی ١٩٧٧/١/٢٧ ئەم چاپخانەیە خرایە سەر بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کاروباری ئیداری و دارایی وەزارەتی پەروەردە و ناونرا (چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ژمارە–٢).

بۆ پتر خستنەڕووی هەلومەرجی خوێندن لە ساڵی ١٩٧٥دا، دەبێ بۆ ئەو سەرچاوانە بگەڕێینەوە کە بەژمارە باس لە پەرەسەندنی خوێندنی کوردی دەکەن، ئەگەر جارێکی تر شەڕ بەسەر کورد و شۆڕش و ئەزموونی ئەو چوار ساڵەی لە ماوەیەی ڕابردوو نەسەپێندرایەوە، بێ گومان دەتوانرێ ئاستی خوێندن و خوێندەواری زۆر لەوە چاکتر بکرابایە کە لە دوایین مانگەکانی پێکەوە ژیانی شۆڕشی کورد و دەسەڵاتی ناوەندی لە بەغدا پێدا تێدەپەڕین، خۆ ئەگەر پیلانی شوومی جەزائیریش وەك نەخشەیەکی نێودەوڵەتی دژی شۆڕشی کوردستان و دەسکەوتەکانی شۆڕشی ئەیلوول نەهاتبایە ئاراوە، خوێندن زۆر لەمە فراوانتر و کاریگەرتر دەبوو.

وەرگیرانی قوتابییانی تازە لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٥-١٩٧٦ لە قۆناغی سەرەتایی (١.٩٣.٣) بووە. خۆڕایی بوونی خوێندن هاندەرێکی لەبار بوو بۆ ئەوەی منداڵانی کورد بچنە بەر خوێندن و سوود لە بەرنامەی فێرکردن وەربگرن. ئەمە بەرزترین ژمارەی چوونە قوتابخانەی قوتابییانی کورد لە بەرایی مێژوو تا ئەو ڕۆژە دەگرێتەوە، سەردەمی بووژانەوەی چوار ساڵەی ڕۆشنبیری و خوێندن و خوێندەواری کوردی بووە بەردی بناغەیەکی پتەو بۆ فرەبوون و بەمیللی بوونی چوونە قوتابخانە و خوێندن و جێ هێشتنی تاریکی. بۆ ئەم مەبەستە سەیری خشتەی ژمارە (١٢،١٣،١٤)[١٠٩] بکە، کە تایبەتە بەڕێژەی دەرچووانی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و وەرگیرانی قوتابییان لە قۆناغی ناوەندی و قوتابخانە پیشەییەکان و خانەی مامۆستایان و هونەرە جوانەکان.

**خشتەی ژمارە(١٢)**

ژمارەی وەرگیراوانی قوتابییانی وەرگیراوی سەرەتایی و ناوەندی ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦

| پلەی خوێندن | دەرچووانی نێر | دەرچووانی مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| سەرەتایی | ٨٧٣٩٥ | ٣٥٧٨٢ | ١٢٣١٧٩ |
| ناوەندیی | ٣٥٩٥٥ | ١٦٩٣٤ | ٥٢٨٨٩ |

(١٠٩) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(١٥) بەهاری ١٩٧٩، تەگەرەکانی سەرڕێ کرداری پەروەردە و پێشنیار بۆ تەخت کردنیان،ل١٢.

### خشتەی ژمارە (١٣)

وەرگیرانی قوتابییان لە پۆلی یەکەمی ناوەندی

| چەشن | یەکی ناوەندی | ڕێژەی وەرگیرانەکە لە پلەی ناوەندی |
|---|---|---|
| نێرینە | ٨٦٨٠٥ | ٪٩٩،٣ |
| مێینە | ٣٥٤٥٧ | ٪٩١،١ |
| کۆی گشتی | ١٢٢ ٢٦٢ | ٪٩٣،٣ |

### خشتەی ژمارە (١٤)

قوتابییانی وەرگیراو لە ئامادەییە پیشەییەکان و خانەی مامۆستایان و هونەرە جوانەکان ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦

| چەشن | کشتوکاڵ | پیشەسازی | بازرگانی | چوارەمی گشتی | خانەی مامۆستایان | هونەرەجوانەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نێرینە | ١٤٢٥ | ٣٢٥٢ | ١٤٠٧ | ٢٧١٠٣ | ٢١٥٧ | ٢٦٠ |
| مێینە | – | ٢٦٠ | ١٣١٩ | ١٠٣٢٨ | ٤٨٤٨ | ٧٠ |
| کۆی گشتی | ١٤٢٥ل | ٣٥١٢ | ٢٧٩٨ | ٣٧٤٣١ | ٧٠٠٥ | ٣٣٠ |
| نێرینە | ٪٤ | ٪٩ | ٪٤ | ٪٧٥،٤ | ٪٦ | ٪٠،٧ |
| مێینە | – | ٪١،٥ | ٨ | ٦١ | ٢٨،٦ | ٠،٤ |
| کۆی گشتی | ٪ ٢،٧ | ٪٦،٦ | ٥،٣ | ٧٠،٨ | ١٣ | ٠،٦ |

بەمە دەردەکەوێ ئەو ڕێژەی چوونەتە قوتابخانە پیشەییەکانی لە چاو ناوەندییەکان (١٤.٦٪)یە. هەروەها ڕێژەی ئەوانەی چوونەتە پۆلی چوارەمی ئامادەیی لە چاو دەرچووانی ناوەندی (٧٠.٨ ٪)ە. ڕێژەی ئەوانەی لە خانەی مامۆستایان وەرگیراون لە چاو سەرجەم دەرچووانی ناوەندی (١٣٪)ە بووە. ڕێژەی وەرگیرانی دەرچووانی ناوەندی لە قوتابخانەی هونەرە جوانەکان (٠.٦٪)ە. ئەم ڕێژەیە هەوەڵین ساڵی نسکۆی شۆڕشی ١٩٧٥ دەگرێتەوە. کە کارەساتێکی گەورە لەم ساڵەدا بەسەر گەلی کوردستان و دوارۆژی هات و لە ئەنجامی نسکۆی شۆڕش هەزارەها خێزان ئاوارەی دەرەوە و خواروو و

ناوەڕاستی عێراق بوون. ژمارەیەکی یەکجار زۆری مامۆستا و فەرمانبەر ڕاگوێزرانەوە، یا لە پیشەی مامۆستایەتی دوور خرانەوە.

بۆ زیاتر بەرچاوخستنی چۆنییەتیی بەڕێوەچوونی پرۆسەی پەروەردە و بایەخدان بەچاپکردنی کتێبی قوتابخانەکان لە کوردستاندا، ئەو کتێبانەی بەکوردی چاپ کراون لە نێوان سالآنی ١٩٦٠-١٩٧٣ ئەم خشتەیە ژمارەیەکی وردی هەموو ئەو سالآنە و ڕێژە و ژمارەی دانە چاپکراوەکانی کتێبی کوردیمان لە قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی پیشان دەدات.

### خشتەی ژمارە (١٥) [١١٠]

ژمارەی ئەو کتێبە کوردییانەی بۆ قوتابخانەکانی کوردستان لە نێوان ساڵی ١٩٦٠ -١٩٧٣ چاپ کراون

| پلەی خوێندن | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ساڵ | ژمارەی کتێب | سەرەتایی | ناوەندی | ئامادەیی | دانە |
| ١٩٦٠-١٩٦١ | ٢٣ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٣٣٩/٥٠٠ |
| ١٩٦١-١٩٦٢ | ٢٨ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٤٤٧/٠٠ |
| ١٩٦٢-١٩٦٣ | ٣٠ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٢٠١/٥٠ |
| ١٩٦٣-١٩٦٤ | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٠٠٠ |
| ١٩٦٤-١٩٦٥ | ١٨ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ١٥١/٠٠٠ |
| ١٩٦٥-١٩٦٦ | ٢٧ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٢١٦/٠٠٠ |
| ١٩٦٦-١٩٦٧ | ٢٥ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٢٣٥/٠٠٠ |
| ١٩٦٧-١٩٦٨ | ٢٧ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٢٧٠،٠٠٠ |
| ١٩٦٨-١٩٦٩ | ٢٥ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ١٨٣،٠٠٠ |
| ١٩٦٩-١٩٧٠ | ٢٨ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٢٤٥،٠٠٠ |
| ١٩٧٠-١٩٧١ | ٢٨ | سەرەتایی | ٠٠٠ | ٠٠٠ | ٢٩٧،٠٠٠ |

(١١٠) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژمارە (٥) ساڵی (٣) بەهاری ١٩٧٣ ل٧٩.

| ١٩٧١- ١٩٧٠ | ٩ | ••• | ناوەندی | ••• | ٦٠،٠٠٠ |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١٩٧١- ١٩٧٠ | ٣ | ••• | ••• | ئامادەیی | ٢٦،٠٠٠ |
| ١٩٧٢- ١٩٧١ | ٢٧ | سەرەتایی | ••• | ••• | ٥٨١،٠٠٠ |
| ١٩٧٢- ١٩٧١ | ١٥ | ••• | ناوەندی | ••• | ١٩٤،٠٠٠ |
| ١٩٧٢- ١٩٧١ | ٣ | ••• | ••• | ئامادەیی | ٢٨،٠٠٠ |
| ١٩٧٣- ١٩٧٢ | ٢٨ | سەرەتایی | ••• | ••• | ٦٢٩،٠٠٠ |
| ١٩٧٣- ١٩٧٢ | ١٨ | ••• | ناوەندی | ••• | ١٦٨،٥٠٠ |
| ١٩٧٣- ١٩٧٢ | ٥ | ••• | ••• | ئامادەیی | ٤٥،٠٠٠ |

خوێندنی كوردی بەتایبەتی و خوێندن بەگشتی لە كوردستاندا بە زۆر قۆناغدا تێ پەڕیوە، لە سەرەتای ئەم سەدەیە بۆ سەردەمی پاشایەتی لە عێراق و دواتر بۆ سەردەمی شۆڕشی ١٤ تەمموز و ئینجا شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ و تاكو ڕێككەوتنی ئازاری ١٩٧٠ و جارێكی تر هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی كوردستان، تا ساڵی ١٩٧٠ خوێندنی كوردی تەنیا لە شاری سلێمانی و هەولێر هەبوو، هیچ قوتابخانەیەكی كوردی لە كەركووك تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ و لە ناوچەكانی بادینانیش تا ساڵی ١٩٧٠ هیچ قوتابخانەیەك بۆ خوێندنی كوردی نەبووە[١١١].

تا ساڵی حەفتاش تەنیا لە قۆناغی سەرەتایی خوێندن بەكوردی هەبووە و لەم ساڵەدا خوێندن بەكوردی لە قۆناغی ئامادەیی و ناوەندی دەستی پێ كرد، ئینجا دواتر بەشی كوردی لە زانكۆی سلێمانی و كۆلێژی ئەدەبیاتی زانكۆی بەغداش كرایەوە. كە ژمارەیەكی زۆر ئەدیب و نووسەر و شاعیری كوردی ئەم سەردەمە دەرچووی ئەم زانكۆیانەن. لەوەش گرینگتر بۆ یەكەم جار لە شاری مووسڵدا بڕیاری خوێندنی كوردی درا و قوتابخانەیەك بەناوی (١١)ی ئازار كرایەوە. باسی ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی ١٩٧١-١٩٧٥، تا كاتی تێكچوونی شۆڕش، باسێكی تایبەتە و هێژا د.عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی لێكۆڵینەوەی تایبەتی لە مەڕ كردووە و بڵاوی كردووەتەوە[١١٢].

---

(١١١) «عبدالفتاح علی بوتانی، مدرسة» آذار، ل٣٩.

(١١٢) هەمان سەرچاوە ل٤٤

ئەم قوتابخانە كوردییە كە بەناوی ١١ی ئازاری سەرەتاییی كوڕانە لە ٥ی تشرینی یەكەمی =

## گرفتەکانی خوێندنی ئەو سەردەمە

کۆسپ و کێشەی زۆر لە ڕێگەی فێربوون و خوێندن لە کوردستاندا هەبووە. کۆسپی هونەری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و تا دەگاتە سیاسی، کە هیچ جێگەی گفتوگۆ و شاراوەش نییە، باری سیاسی و ئەو ڕێباز و سیاسەتی لە سەرتاپای وڵات لە شەستەکان و حەفتاکان پیادە کراوە و دواتر لە شێوازی تر ڕەنگی پێ دراوەتەوە، کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر ڕەوشی خوێندن و ئایندەی ئەم پرۆسە شارستانی و گرینگە داناوە.

لەوانە دەکرێ ئاماژە بەهۆکاری هونەری بکەین.

١- داخران و نەمانی گەلێك قوتابخانە و پۆل کە ڕاستەوخۆ زیانی بەژمارەیەك قوتابی گەیاندووە.

٢- هەندێك مامۆستا لەبەر کەمیی مامۆستا دەرسی تەواوی قۆناغ و پۆلەکانیان، دەگوتەوە بێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکرێ کە تایبەتمەند نییە لە دەرسەکانی، جاری

---

= ١٩٧١ لە قوتابخانەی تەتبیقاتی خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە گەڕەکی نەبی یونس کە زۆربەی دانیشتووانەکەی کوردن، کراوەتەوە. ژمارەی قوتابییەکانی لە کرانەوەی (٢٧٥) کەس بووە،ساڵی خوێندنی (١٩٧٢-١٩٧٣) ژمارەی قوتابییەکانی گەیشتۆتە (٣٧٧) و ساڵی (١٩٧٣-١٩٧٤) ئەم قوتابخانەیە پێشوازیی لە دەیان قوتابیی کوڕ و کچ کرد کە لە ناوچەکانی ئاکرێ و شێخان بەزمانی کوردی دەیانخوێند و لە ئاکامی هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە کوردستاندا لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤ قوتابخانەکانیان جێهێشت. لە ئاکامی نسکۆی شۆڕشی کوردستان لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥ ئەم قوتابخانەیەش لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٤-١٩٧٥ داخرا و ساڵی خوێندنی ١٩٧٥-١٩٧٦ زۆربەی مامۆستاکانی گواسترانەوە قوتابخانەکانی تر ساڵی ١٩٨٢ بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە قوتابخانەی لە کوڕان بۆ کچان گۆڕی. ژمارەی مامۆستاکانی سەرەتا (١١) مامۆستا و دواتر بوونە (١٤) مامۆستا. بەیانی هەموو ڕۆژێك سروودی (ئەی ڕەقیب) لە گۆڕەپانی قوتابخانەکە دەخوێندراوە وەکو تەواوی قوتابخانە کوردییەکانی تر. لە ئازادی و جەژنی نەورۆزی ١٩٧٢ قوتابیانی ئەم قوتابخانەیە سروودی (ئەی ڕەقیب)یان لەگەڵ ژمارەیەك سروودی تر بۆ کەناڵی تەلەفزیۆنی مووسڵ تۆمار کرد. لە ئاهەنگی بەهاری ١٩٧٣ بەهاریکاریی قوتابخانەی خەنساء ئۆپەرێتی (نان چێکرن)یان پێشکەش کرد و لە کەناڵی تەلەفزیۆنیش تۆمارکرا، بڕوانە هەمان سەرچاوە. بۆ زانیاریی زیاتر و ژمارەی قوتابی و دەرسەکان و شێوەی خوێندن و ناوی مامۆستاکان.

واهەبووە مامۆستایێك بەڕێوەبەر و مامۆستا و پاككەرەوەی قوتابخانەكەش بووە.

٣- نەبوونی كەرەستە و پێداویستیی پەروەردەیی لە قوتابخانەكان لە (رحلە و تەختەڕەشە و هۆكار و كەرەستەكانی تری یارمەتیدەر بۆ ڕوونكردنەوە و پێگەیاندن و ڕاهێنانی قوتابییان و سوود وەرنەگرتن لە ئامێرە پێشكەوتووەكانی پەروەردە.

٤- كەمیی خولی ڕاهێنان و پێگەیاندنی مامۆستایان و دابەزینی ئاستی خوێندن.

٥- بۆشایی لە قوتابخانەكان و نەبوونی مامۆستا، بووەتە مایەی ئاژاوە و گرفت لە بەڕێوەبردن و خوێندندا. ئەگەر بەنموونە باسی بۆشایی و نەبوونی مامۆستا لە ساڵی ١٩٧٢ -١٩٧٣ بەپێی ڕاپۆرتی یەكێتیی مامۆستایانی كوردستان بكەین بۆمان دەردەكەوێ كە: (٢٩٧) بۆشایی لە قوتابخانە سەرەتاییەكانی كوڕان هەیە و (١٢٠) مامۆستاش زمانی كوردییان نەزانیوە و لەبەر ئەوەی خوێندن بەزمانی كوردییە ئەوە وای كردووە بەم هۆیەوە ڕێژەی بۆشایی و نەبوونی مامۆستا بگاتە (٤٣٠) هەر لەم ڕاپۆرتەدا كە ساڵی ١٩٧٣ بڵاویان كردۆتەوە، وای ڕەچاو دەكەن كە لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٣-١٩٧٤ ئەم بۆشاییە بگاتە (٢٠٠٠).

هەروەها بۆشاییی قۆناغی ناوەندی و ئامادەیش لەمە كەمتر نییە، كە هەمان ڕاپۆرت بەم شێوەیە ئاماژەی پێكردووە بۆ دەرسی ماتماتیك (١١٠) بۆشایی لە سلێمانی و هەولێرە. لە سلێمانی تەنیا بیركاری (١٨) بۆشاییی هەیە، لە ناوچەكانی كوردستان (٢٣) بۆشاییی فیزیا و بیركاری، (٤٠) كیمیا و (٢٣) زانستی و ژیان، (٣٠) مێژوو و (١٠) جوگرافیا و (١٠) هونەر و (٥) زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و كوردیش لە بنەڕەتا هیچی بۆدیاری نەكراوە و پێویستی بەمە زۆر هەیە[١١٣].

هەروەها بەپێی ئەو بنەما زانستی و پەروەردەییەی لە خوێندن دانراوە، لەگەڵ ژمارە و ڕێژەی مامۆستایان ناگونجێ و ئەو پەرەسەندن و زۆر بوونەی لە ژمارەی قوتابییان هەیە لەگەڵ ژمارەی مامۆستایان هاوكێشی نابێت و لە حەفتاكان ئەگەر هەر مامۆستایەك ٢٢ قوتابیی بەركەوتبێ و جاری واهەیە (١٦)ی بەردەكەوێت. ئێستا زۆر لەوە زیاترە، خولەكانی شۆڕش و ئابلوقە دانی گوندەكان و مەسەلەی بەسەربازیی گرتنی مامۆستا و ڕاونانی بۆ (جەیشی شەعبی) و سووتاندن و تەختكردنی پتر لە (٤٠٠٠)

---

(١١٣) گۆڤاری گولان العربی، مشاكل التعلیم فی كوردستان، هیاس كاكایی، العدد (٨) ٢٥/١/١٩٩٧ ص٥٨.

گوند، گرفتەکە لەم بارەوە گەورەتر بوو. تەنیا لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی بیستدا لەبەر کەمیی مامۆستا وای لێ هات مامۆستای عەرەب لە مووسڵ و شوێنەکانی تر بێنن و بەزمانی عەرەبی دەرس بڵێنەوە و ئەم بۆشاییە پڕبکەنەوە بەدوو ئامانج.

یەکەم: پڕکردنەوەی بۆشاییەکان ئەگەرنا مامۆستایێك بەماندوویەتی ڕۆژانە لە موسل ڕا چۆن دەتوانێت بێت لە هەولێر دەرس بڵێتەوە و بگەڕێتەوە، دەبێت چۆن هێز و توانا و سەلیقەی پێگەیاندنی پترلە (٣٠ – ٤٠) قوتابیی لەیەك هۆل دەبێت.

دووەم: ئامانجی سەرەکی ئەوەبوو سەرەتایەك بخولقێنن بۆ ڕاهێنانی قوتابییانی کورد لەسەر زمانی عەرەبی، تا لە کاتی گۆڕین و قەدەغەکردنی خوێندن بەزمانی کوردی و پاشگەز بوونەوە لە بەندەکانی ڕێککەوتنامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، وەکو لە سەرەتای هەشتاکان ئەم هەنگاوەیان ناو، دووچاری فەشەل هات و ڕووبەڕووی خۆ پیشاندان و ناڕەزایی سەرتاسەری لە کوردستان هاتن و ئاستی نیشتمانپەروەری و کاریگەریی شۆڕشی چەکداری لەوە پتر و بەهێزتر بوو، دەسەڵاتدارانی عێراقی بتوانن ئەو ئامانجە بەسانایی و بێ ڕووبەڕوو بوونەوە و کێشە بپێکن.

٦– بەهۆی کەمیی قوتابخانە سەرەتا لەناو شارەکاندا خانووی ئەهلی بەکرێ دەگیرا و دەکرایە قوتابخانە و دواتر لەبەر زۆریی ژمارەی قوتابییان ئەو قوتابخانانەی دروست کرابوون، دوو دەوام جاری وا هەبووە سێ دەوامیان لە ڕۆژێکدا لێ کراوە، هەر دەوامەش قوتابخانەیەکی سەربەخۆ بووە. خۆ لە گوندەکان بینای تایبەتی بۆ قوتابخانە هەر زۆر دەگمەن بووە.

نابێت ئەوە وەشێرین کە ژمارەیەك ئاستەنگی تر هەبوونە لەوانە:

– کەلوپەلی سەرەکیی قوتابخانە

– لاوازیی ڕۆڵی سەرپەشتیارانی پەروەردەیی.

– لاوازیی بوونی پێگەی مامۆستا بەتایبەتی دوای هەشتاکان و کە تا ئەمڕۆش لە لاواز بوونی زیاترە... سەرەتا لە ڕاونان و خۆشاردنەوە و ڕاکردن لەبەر (جەیشی شەعبی) و دوای ڕاپەڕینیش بەهۆی نەبوونی و کەم داهاتی و لاوازی باریی دارایی کە مامۆستا پەنای وەبەر کار و پەیداکردنی نان لەسەر شۆستە برد، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کەسایەتی لاواز دەبێت لە بەرچاوی قوتابییەکانی.

- نەمانی وانەی مێژوو جوگرافیای کوردستان لە بەرنامەکانی خوێندن و زالبوونی عەرەبچیەتی و بەرنامەی نیشتمانی عەرەبی لەسەر خوێندن و نەگونجانی پرۆگرامەکانی خوێندن لەگەڵ توانای قوتابییان.
- لاوازیی ڕۆشنبیری و پەروەردەیی مامۆستا.
- تەواونەبوون و لاوازی پرۆگرامەکانی ڕاهێنان.
- لاوازی ئیداریی قوتابخانە لەسەر بنچینەیەکی حزبی، نەك پەروەردەیی.
- بێ هێزیی دەسەڵاتی دەزگای پشکنین.

خاڵێکی تر کێشەکانی سەرەتای ساڵی ١٩٧٢ لە مەسەلەی چاپکردنی کتێبی کوردی خوێندن و دەزگا بەرپرسەکانی تایبەتی بەخوێندنی کوردی کە لەسەر بنچینە جێبەجێ کردنی ڕێککەوتنامەی ١١ی ئازار دەست بەکاربوون، لە بچووکترین گرفتیدا بۆ چاپکردنی کتێبە کوردییەکانی قوتابخانە ئەوها دەست پێ دەکات:

تاوتوێکردن و گۆڕینی بەرنامەی، خوێندن و لەنگەر نەگرتنی کە وەزارەتی پەروەردەی عێراقی هەمیشە ساڵ بەساڵ دەستی تێدایە و خەریکی دانانی شتی تازە و بژارکردنە هۆیەکی گەورەی دواکەوتنی کتێبە. ئینجا گرفتەکانی تر لەم خاڵانە دوای هۆکارە سەرەکی و گەورەکە دێنە پێش؛ دەست نەکەوتنی کاغەز و بەش نەکردنی بۆ لە چاپدانی کتێبی کوردییش و عەرەبیش هۆیەکی ترە و ئەویش بەدەست دەزگای گشتیی ڕۆژنامەگەری و چاپکارییە و لەم و لەم بەولاوە هیچ لایەکی تر ناتوانێت کاغەز بەچاپخانەکان بدات. شاگردی کورد لە چاپخانەکانی ناو بازاڕ کەمن و هەروەها لە چاپدانی کتێبی کوردی تێیاندا شتێکی ئاسان نییە. بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردییش ڕەخنە لە خۆیان دەگرێ و کەم دەسەڵاتی و ڕۆتینیەتی کارەکانی بەهۆکارێکی تری دواکەوتن و گرفتەکان دەزانێ. دەڵێن زۆربەی کارەکان بەڕیزە ڕۆتینێکی دوور و درێژ و پێچاوپێچدا دەڕۆن و تا دوا بایی خۆی دەگرێت ماوەیەکی زۆری دەوێ. ئەویش بۆ چاپکردنی کتێبێك ئەم قۆناغانە دەبێت ببڕن:

١- لێژنەی وەرگێڕان سێ مانگی بەلای کەمەوە دەوێ.

٢- خوێندنەوەی لانیکەمی پسپۆڕێك دوو هەفتەی گەرەکە.

٣- کارەکە دەچێتە وەزارەتی پەروەردە و دواتر ئەنجومەنی پەروەردە، ئەمەش چەند هەفتەیەکی پێویستە.

٤- دوای ئەوە دەدرێتە دەزگای گشتیی ڕۆژنامەگەری و چاپکاری. ئەویش چەند ڕۆژێکی دەوێت. تا دەیداتە (مناقصه) کە ئەویش دوو یا سێ هەفتەی بەلای کەمەوە دەوێ.

٥- ئینجا چاپخانە لە سێ مانگ کەمتر لێ نابێتەوە.

٦- دۆزینەوەی پسپۆری سەرپەرشتی کاری چاپیش کاتێکی دەوێ.

٧- دوای چاپ شارەزایەکی تر پێیدا دەچێتەوە تا تەدقیقی بکاتەوە و پێیدا بچێتەوە.

٨- گەیشتنەوە بۆی کتێبی ماوەیەکی گەرەکە ئینجا کارەکانی بەڕێوەبەرایەتیی شارەکانیش بوەستێ(١١٤).

لەم خشتەیەدا کێشەی بینانەی قوتابخانەکان و ژمارەی زۆری قوتابییان لە قوتابخانەکان و ئەو قوتابخانانەی پتر لە یەك دەوامیان تیا دەکرێ و بینایەکان حکوومی یا ئەهلین. بنۆڕە خشتەی ژمارە (١٦)

**خشتەی ژمارە (١٦) (١١٥)**

خشتەی قوتابخانەکانی کوردستان لە خوێندنی ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦

بەپێی چاکی و خراپییان و ڕێژەی دەوام تێداکردنیان و خاوەنداریێتیان.

---

(١١٤) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(٣) ساڵی (٢) بەهاری ١٩٧٢ ل١٠٨.

(١١٥) گۆڤاری پەروەردە و زانست ژ(٥) ل٢٠

لەمەڕ هەولەکانی تری نەهێشتنی نەخوێندەواری ئەم هەواڵەمان لە تەك پرۆسەی خوێندن لەشاری هەولێر سوودبەخش دەبی، کە دەڵێت ١/٥/١٩٧٠ بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی هەولێر (هۆبەی نەهێشتنی نەخوێندەواری) کردووەتەوە لە ١/٧/١٩٧٠ش یەکێیی مامۆستایانی کوردستان-لقی هەولێر (٧) بنکەی بۆ ئەم مەبەستەی سەرەوە کردۆتەوە. لە ١/٥/١٩٧٠ تا ١٨/٩/١٩٧١ (١٠٧) بنکەی پیاوان لە گوندەکان دامەزراوە و لە دوای ٨/٩/١٩٧١یش (٢١) بنکەی تر کراونەتەوە. (١٦) بنکەی تایبەتی بۆ ئافرەتانیش لە دێهاتەکان کراونەتەوە. (٧٦٧) پیاو و (١٨٧٤) ئافرەتیش لەم بنکانە فێری خوێندن دەکرێن. جگە لە بوونی (١٧) بنکەی پیاوان و (٢٠)ی ئافرەتان لەناو شاری هەولێر.

بڕوانە ڕۆژنامەی ژین، نەخوێندەواری و ڕۆیشتنێکی بێ نەهاتنەوە، عبدالغنی علی یحیی ژ(٥٧) ساڵی(٢) ١٧/٢/١٩٧٢ ل١.

بڕوانە ڕۆژنامەی ژین (١٤٦) لە ٧/٢/١٩٧٤ وتووێژێك لەگەڵ مامۆستا سامی حسێن نازم بەڕێوەبەری پەروەردەی سلێمانی لە شێوەی پرسیار و وەڵام. ل٢.

| پلەی خوێندنی چاك | چۆنییەتیی خانووەکان | | چەند قوتابخانە لە یە یەك خانوودا هەن | | | خاوەن خانوو | | | کۆی گشتی قوتابخانەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | دەستکاری و چاکردنەوە | دەست نادەن | یەك قوتابخانە | دوو قوتابخانە | سێ قوتابخانە | حکومی | کرێ | خەڵات | |
| سەرەتایی ٢٧ ٤٤ | ١٩٣٣ | ١١٦٩ | ٣١٩٤ | ١٦٣٧ | ٢٩٥ | ٤٦٧٧ | ٦٢٣ | ٥٤٦ | ٥٨٤٦ |
| ئامادەیی ٤٣٧ | ٢١٧ | ٤٤ | ٤٨٢ | ١٧٣ | ٤٣ | ٥٨٧ | ١٩ | ٩٢ | ٦٩٨ |

بێ گومان لەتەك ئەم هۆکارانەی باس کران، هۆکاری تریش زۆرن، وەکو پێشتر ئاماژەمان کرد، نیازی نەژاد پەرستانەی دەسەلاتداران بەرامبەر وەزعی گەشەسەندنی کوردستان لە هەموویان پتر بوو بەجۆرێك کە هەر لە سەرەتای دەست پێکردنەوەی شۆڕش لە ئازاری ١٩٧٤ و دواتر لە ناوبردنی شۆڕشەکە لە پیلانێکی گەلە کۆمەکیی دەولی لە شەشی ئازاری ١٩٧٥، کوردیان کردە بەقوربانی بەرژەوەندییە چەتنەکانیان، کە دواتر مەترسیدارترین شەڕیان لە هەشتاکان لەسەر کەلاکی ئەم گەلە کۆمەکییە بەرپاکردەوە کە ناوچەکەی دووچاری مەترسیدارترین کێشە کردەوە و سەدەها هەزار مرۆڤیش بوونە سووتەمەنی شەڕەکە. هەمسیان کورد لەم ناوە زیانی گەورەی بەرکەوتووەتەوە.

لەم ماوەیەدا لە ١٩٧٠-١٩٧٤ لەبەر سیاسەتی نەژادپەرستانە، ئەم تەنگەژە و جیاوازییانەش بەردەوام بوون.

- ڕێژەی قوتابییانی پارێزگاکانی سلێمانی و دهۆك و هەولێر لەچاو کۆی دانیشتووان، کەمتر بوو لە ڕێژەی تەواوی شارەکانی تر.
- هیچ قوتابییەکی کورد لە کۆلێژ هێزی ئاسمانی لە نێوان (١٩٦٤-١٩٧٤) قبووڵ نەکرا.
- ڕێژەی قوتابییە وەرگیراوەکانی کورد لە کۆلێژی سەربازی و پۆلیس لە نێوان (٢-٥٪) بوو لە ساڵەکانی ١٩٧٠-١٩٧٤.
- زۆر بەدەگمەن قوتابیی کورد لە کۆلێژی ئەرکانی سەربازی وەردەگیران.
- ڕێژەی قوتابییە کوردەکان دەرفەتی خوێندنیان لە دیراساتی باڵا زۆر کەم بوو لە نێوان ساڵی ١٩٦١-١٩٧٤ لە (٣-٤٪) تێ نەپەڕاندبوو کە بۆ زەمالات و ناردنە دەرەوە.
- میزانیەکی نەگۆڕ یا دیاریکراو بۆ فێرکردن لە کوردستان نەبووە.

- زۆر کەمیش قوتابی کورد لە کۆلێژی ئەندازیاری و پزیشکی و پزیشکیی ددان وەردەگیران بەهەنجەتی نزمیی پلەکانی دەرچوونیان.(١١٦)

هەروەها بارودۆخی خوێندن لە شاری سلێمانی بەم جۆرە بووە:

| قوناغەکان | قوتابیی کوڕ | قوتابیی کچ | قوتابخانەی کوڕن | قوتابخانەی کچان | ژ. ما. پیاو | ژ. ما. ئافرەت | ناو شاری سلێمانی قوتابخانەی سەرەتایی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەرەتایی | ٤٠٢٧٢ | ١٢١٦٦ | ٤٣٠ | ١٥٣ | ١٦٠٩ | ٥٤٩ | لەم ساڵەدا ٤٠ قوتابخانەی کوڕان و ٣٢ قوتابخانەی کچان کراوەتەوە |
| کۆی گشتی | ٥٢٤٣٨ | | ٩٨٣ | | ٢٥٥٨ | | |
| ناوەندی | ٦٧١٥ | ٢٣٦٥ | ٣١ | ١٠ | ٢٢٨ | ١١٣ | |
| کۆی گشتی | ٩٠٨٠ | | ٤١ | | ٣٤١ | | |
| ئامادەیی | ٦٠٥ | ٤٢٥ | ١ | ١ | ٢٢ | ٢٣ | |
| کۆی گشتی | ١٠٣٠ | | ٢ | | ٤٥ | | |
| باخچەی ساوایان سەرەتایی و ئەهلی | | | ٣<br>٢ | | | | |
| هونەری ماڵی | – | ٣٩ | | | – | ٥ | لە ساڵەدا ٧٠ قوتابخانە کراوەتەوە ٥ ی کوڕان و ٢ کچان ٦٤ ی تێکەڵاو |
| کۆی گشتی | ٣٩ | | | | ٥ | | |
| بازرگانی | ١١٨ | ١٠٣ | | | ٧ | ٢ | |
| کۆی گشتی | ٢٥٣ | | | | ٩ | | |
| پیشەسازی | ٢٥٣ | – | | | ٢٩ | – | |
| کۆی گشتی | ٢٥٣ | | | | ٢٩ | | |
| کشتوکاڵ | ٢٦٢ | – | | | ٢٤ | – | |
| کۆی گشتی | ٢٦٢ | | | | ٢٤ | | |

(١١٦) أ. پ عن التعليم في كردستان العراق، آيار ١٩٨٦ مطبعة خەبات. ل٢٧

ئەم کتێبە کە نرخێکی مێژوویی هەیە و زانستییانە و وریایانە لە ساڵی ١٩٨٦ لە ناوجەرگەی شۆڕش نووسراوە، هی نووسەر و ڕۆژنامەنووسی ناودار (فەلەکەدین کاکەیی)ە. بەناوی (أ. پ) نووسیویەتی گەلێك ژمارە و مێژووی لەمەڕ خوێندن لە کوردستانی عێراق تێدایە، بەتایبەتی هی ئەم بیست ساڵەی دوایی و ساڵەکانی شۆڕشی تازەی گەلی کوردستان و ناوچە خاپوورکراوەکان و ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش.

بەهۆی سیاسەتی ڕاگواستن لە ناوچەگەلی کوردیدا بەمەبەستی بەعەرەبکردن، بەتایبەتیش ئەو ڕاگواستنە نەخشە بۆ دارێژراوەی لە دوای ناوەڕاستی حەفتاکان دەستی پێ کرد، نەك هەر بووە هۆی داخرانی قوتابخانەکان و ڕاپێچکردنی لاوانی کورد بۆ سەربازی و بێکارکردنیان، بەڵکو بەشی زۆری گوندەکانی کوردستان تەخت کران تا بەهەندێك شارۆچکەش دەگا.

لە بەعەرەبکردنی زانکۆی سلێمانی دوای نسکۆی شۆڕش دەست بەپاشەکشە و سڕینەوەی سیمای کوردی و کوردستانی لە خوێندن کرا، هەستی شۆڤینیی کاربەدەستان، ئەوەشی پێ هەزم نەدەکرا ناوی کوردستان و نەتەوەی کورد لە پرۆگرامەکانی خوێندن بێت. وەکو چۆن پێشتر نەقابەی مامۆستایانی کۆماری عێراقی داوایان کردبوو. ئەوەبوو لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ حکوومەت دەستی بەکەمکردنەوەی خوێندنی کوردی کرد بەتایبەتی لە کاتی جێبەجێ کردنی سیاسەتی بەعەرەبکردنی و گۆڕینی شوناسی نەتەوەیی و مێژوویی چەند ناوچەیەکی فراوانی کوردستان وەکو کەرکووك و خانەقین و شەنگار، و هتد. دەسەڵات دژایەتیی خوێندنی کوردیی کرد و ناوی قوتابخانە کوردی و، دائیرە و گەڕەکە کوردییەکانی بۆ ناوی دوور لە کوردی گۆڕی. دەستی بەگواستنەوەی مامۆستایانی کورد کرد بۆ پووچەڵکردنەوە و هەرەس پێهێنانی خوێندنی کوردی تیایاندا(١١٧).

بۆ پاشگەزیی تەواو و بناغەدانان لە ڕووی یاساییەوە بۆ ئەو گەشەکردنەی گەلی کورد لە ماوەی چەند ساڵێکدا بەخۆیەوەی دی، حکوومەت هەوڵی دا شێوە دارشتنی خۆی بۆ ڕێککەوتنی یانزەی ئازار فەرز بکات، بۆ ئەم ئامانجە لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤ یاسایەکی تایبەتی بەحکومی زاتی دەرکرد، کە دەربارەی خوێندن لە کوردستاندا بەم جۆرە بایان داوەتەوە و دەڵێن:

أ- زمانی کوردی زمانی ڕەسمی دەبێت لەتەك زمانی عەرەبی لە ناوچەکە.

ب- زمانی کوردی دەبێتە زمانی فێرکردنی کوردان لە ناوچەکە، دەبێ لە خوێندن زمانی عەرەبی لە هەموو قۆناغەکانی فێرکردن و کارەکان ئیلزامی بێ.

ج- شوێنی خوێندن لە ناوچەکە بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەی عەرەبی دروست دەکرێت و دەبێت خوێندن تێیدا بەزمانی عەرەبی بێت و خوێندنی زمانی کوردی ئیلزامییە.

---

(١١٧) أ. پ. عن التعليم في كردستان العراق، ل٢٤.

د- ڕۆڵەکانی ناوچەکە تێکڕا مافیان هەیە قوتابخانە بەئارەزووی خۆیان بۆ خوێندن هەڵبژێرن بێ لە بەرچاوگرتنی زمانی دایك.

هـ- خوێندن لە هەموو قۆناغەکانی لە ناوچەکە دەخرێتە ژێر سیاسەتی پەروەردە و فێرکردنی گشتیی دەوڵەت(١١٨).

ئەم سیاسەتی پاشگەز بوونەوەیە لە کۆتاییی هەفتاکاندا زۆر زەقتر بەدیارکەوت، ئەوکاتەی مەسەلەی ڕاگواستنی بەشی زۆری گوندەکانی سەرسنوور جێبەجێ کران، لەساڵی خوێندنی ١٩٧٧-١٩٧٨ حکوومەت پڕۆگرامی ئیجتماعیاتی لەخوێندن بۆ عەرەبی گۆڕی، ئەمەش وەکو سەرەتایەك بۆ گۆڕینی تەواوی خوێندن بۆ عەرەبی، سەرباری گۆڕینی تەواوی ناوەڕۆکی بەرنامەکانی خوێندن و دوورکەوتنەوەی لە واقیعی مێژوویی و ڕۆشنبیری و کەسێتیی کورد و خاڵی بوون لە باس و ئامانجەکانی مرۆڤایەتی و پەروەردەی زانستییانەی.

لەم دوو خشتەی خوارەوەدا ژمارە (١٧ و ١٨) باس لە بەراوردی کوردستان و ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق کراوە، دیراسەیەکی ڕاستەوخۆیە باس لە پێویستیی زیادبوونی قوتابی و مامۆستا لە قوتابخانەکان دەکا. لە خشتەکەدا کە باس لە خوێندنی سەرەتایی دەکا، دەردەکەوێ کە ڕێژەی قوتابی لە قوتابخانە لە ٢٤٤ بۆ ٢٧٧ زیادی کردووە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە دوای دەرچوونی بڕیاری خوێندنی بەزۆری لە قۆناغی سەرەتاییدا، ئەم ڕێژەیە زیادی کردووە. وەلێ ئەگەر لە خشتەی تایبەت بەدابەشی هەرێمی قوتابخانە سەرەتاییەکان بنۆڕین، دەردەکەوێ ژمارەی قوتابیان بۆ هەر مامۆستایەك لە ناوچەکانی ناوەڕاست و خواروو لە دابەزینە کەچی لە کوردستان (ناوچەی باکور) (مووسڵ و هەولێر و دهۆك و سلێمانی و کەرکووك) وەکو خۆی ماوەتەوە هەر (٢٤) قوتابی لە ساڵی ١٩٧٧ یەك مامۆستای بەرکەوتووە و لە ساڵی خوێندنی ١٩٨٤-١٩٨٥ بەهەمان شێوە ماوەتەوە. کەچی لە ناوەڕاست و خواروو گۆڕاوە لە (٢٦) قوتابی بۆ یەك مامۆستا لە ناوەڕاست دابەزیوە بۆ (٢٣) و لە خوارووش لە (٣٠) قوتابی بۆ مامۆستایەك دابەزیوە بۆ (٢٥) قوتابی.

---

(١١٨) هەمان سەرچاوە، ل٢٤-٢٥

بۆ پتر دەرکەوتنی بایەخنەدان بەخوێندەواری لە کوردستاندا لە ساڵی ١٩٧٨ بەنموونە دەهێنینەوە کە لە شاری دهۆکدا (٢٤٥٦٢) نێر و (٣٦٧٥٥) مێ نەخوێندەوار بوون بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری پێویستییان بە (٩٠٥) مامۆستای پیاو و (١٣٤٨) مامۆستای ئافرەت دەبی. کە تەنیا لەم ساڵەدا (٤٦) مەڵبەندیان بۆ کراوەتەوە و (١٥٥٧) کەس تێیدا دەخوێنن.

### خشتەی ژمارە (١٧)(١١٩)

دابەشکردنی هەرێمی لەمەڕ فێرکردنی قۆناغی سەرەتایی ساڵی خوێندنی

١٩٧٧–١٩٧٨

| هەرێم | قوتابخانە | قوتابی | مامۆستا | قوتابی– قوتابخانە | قوتابی– مامۆستا |
|---|---|---|---|---|---|
| باکور | ٢٨٧٤ | ٤٦٤٩١٥ | ١٩٤٤٠ | ١٦٢ | ٢٤ |
| ناوەڕاست | ٣٩٥٢ | ١١٤٠٣٥٨ | ٤٣٧٠١ | ٢٨٩ | ٢٦ |
| خواروو | ١٥٦١ | ٤٤٣٢٩٣ | ١٤٩١٩ | ٢٨٤ | ٣٠ |
| تێکڕا | ٨٣٨٧ | ٢،٠٤٨،٥٥٦ | ٧٨٠٦٠ | ٢٤٤ | ٢٦ |

### خشتەی ژمارە (١٨) (١٢٠)

دابەشکردنی هەرێمی لەمەڕ فێرکردنی قۆناغی سەرەتایی ساڵی خوێندنی

١٩٨٤–١٩٨٥

| هەرێم | قوتابخانە | قوتابی | مامۆستا | قوتابی– قوتابخانە | قوتابی –مامۆستا |
|---|---|---|---|---|---|
| باکور | ٣٥٦٠ | ٦٦٦،٨٣٨ | ٢٧،٣١١ | ١٨٧ | ٢٤ |
| ناوەڕاست | ٤٤٤٤ | ١،٥٠٥،٧٠٤ | ٦٤،٨٧٩ | ٣٣٩ | ٢٣ |
| خواروو | ١٩١٠ | ٥٧٣،٧٥٥ | ٢٣،٢٠٩ | ٣٠٠ | ٢٥ |
| تێکڕا | ٩٩١٤ | ٢،٧٤٦،٢٩٧ | ١١٥،٣٩٩ | ٢٧٧ | ٢٤ |

بەڵگەی ئەوەیە لە هەشتاکان و لە دوای دەستپێکردنەوەی شۆڕشی کوردستانی باشوور و فرەبوون و کاریگەرتر بوونی سیاسەتی ڕاگواستن و تەختکردنی گوندان، بەتایبەتی کەرکووك و هەولێر و سلێمانی و دهۆك و بەشێکی مووسڵ، نەویستراوە گۆڕانی ئیجابیی بەرچاو لە خزمەتی قوتابخانە سەرەتاییەکانی بکرێ ژمارەیەکی ئێجگار زۆری مامۆستا بەهۆی ڕاکردن لە سەربازی و یا هۆکاری سیاسی دەستیان لە دەرس گوتنەوە هەڵگرتووە، دەرچووانی تازەش بەهەمان شێوە نەیانتوانیوە ئەم بۆشاییە پڕ بکەنەوە. سەرباری ڕاگواستن و داخستنی قوتابخانەکان و تێکدانیان.

---

(١١٩) مجلة دارسات للاجيال، التغير الكمى والنوعي للخدمات التعليمية فى العراق، د. فاضل عباس السعدى، العدد (١) شباط ١٩٩٠

(١٢٠) هەمان سەرچاوە.

لە پارێزگای هەولێردا لە خوێندنی ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ (٤١٠) بۆشایی مامۆستا لە خوێندنی سەرەتایی و (٢١٠) بۆشایی لە خوێندنی دواناوەندی هەبووە و دوای کۆششیان (١٠٥) مامۆستایان بەرامبەر زیادبوونی (١٣٣١٦) قوتابی زیاد کردووە بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکە لەگەڵ (٤٧) قوتابخانەی نوێ واتە (١٢٧) قوتابیی نوێ یەك مامۆستای بەردەکەوی[١٢١].

ئەم دوو خشتەیەی خوارەوەش دابەشکردنی پەرەسەندنی خوێندنی ساڵەکانی ١٩٧٧-١٩٧٨ و ١٩٨٤-١٩٨٥ دەگرێتەوە لە قۆناغی دواناوەندی و بەراوردی هەرسێ ناوچەکە دەکات. بێگومان کە دیقەتی خشتەی ژمارە (١٩ و ٢٠) دەدەین دەبینین ڕێژەی قوتابییانی کوردستان لە (٣٠) بۆ (٣٣) بۆ هەر مامۆستایەك لە نێوان ساڵانی ١٩٧٧-١٩٧٨ و ١٩٨٤-١٩٨٥ بەرز بۆتەوە پێچەوانەی ناوچەی ناوەڕاستە و لە هی خوارەوەش پترە.

---

(١٢١) مجله الثقافة الجديدة، تطور التعليم في محافظة اربيل، العدد ٨٧ تشرين الثاني. ١٩٧٦ ل ٥٩.
بەپێی هەواڵی ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە ٨١٧ ٥/١٢/١٩٨٥ لە چوارقورنە (٣٠١٢) قوتابی هەن و تەنیا (٢٤) مامۆستاشیان هەیە. ئاماژەش دەکات کە قوتابخانەی وا هەیە (٤٨٧) قوتابیی تێدایە و تەنیا یەك مامۆستایان هەیە. بەم شێوەیەش ئاماژە بەم کێشەیە دەکەن، بڕوانە آ.پ. عن التعليم في كوردستان العراق، ل٥٤.

| ناوی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی | ژمارەی مامۆستا |
| --- | --- | --- |
| ئامادەیی چوارقورنەی تێکەڵاو | ٥٥١ | ٦ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |
| چوارقورنەی سەرەتایی کوڕان | ٤٨٧ | ١ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |
| ئالان و چۆمانی تێکەڵاو | ٥٢٢ | ٤ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |
| تارای تێکەڵاو | ٢٢٠ | ١ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |
| کارۆخی تێکەڵاو | ٢٥٢ | ١ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |
| سانکۆ تێکەڵاو | ٣٢٧ | ١ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |
| کاوەی کوڕان | ٣٣٥ | ٣ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |
| چوارقورنەی کچان | ٣١٨ | ٧ مامۆستا لەگەڵ بەڕێوەبەر |

**خشتەی ژمارە (١٩)** (١٢٢)

دابەشکردنی هەرێمی بۆ خزمەتی فێرکردن لە قۆناغی دواناوەندی لە ماوەی

**١٩٧٨-١٩٧٧**

| هەرێم | قوتابخانە | قوتابی | مامۆستا | قوتابی قوتابخانە | قوتابی مامۆستا |
|---|---|---|---|---|---|
| باکور | ٣١٢ | ١٢٥،٩٠٢ | ٤٢٤٠ | ٣٩٧ | ٣٠ |
| ناوەڕاست | ٧٩١ | ٤٢١،٣٧٤ | ١٣،٥١٢ | ٥٣٣ | ٣١ |
| خواروو | ٢٧٦ | ١١٧،٠٢١ | ٣٥٠٤ | ٤٢٤ | ٣٣ |
| تێکڕا | ١٣٨٤ | ٦٦٤،٢٩٧ | ٢١،٢٥٦ | ٤٨٠ | ٣١ |

**خشتەی ژمارە (٢٠)** (١٢٣)

دابەشکردنی هەرێمی بۆ خزمەتی فێرکردن لە قۆناغی دواناوەندی لە ماوەی

**١٩٨٥-١٩٨٤**

| هەرێم | قوتابخانە | قوتابی | مامۆستا | قوتابی- قوتابخانە | قوتابی -مامۆستا |
|---|---|---|---|---|---|
| باکور | ٥٢٠ | ٢٠٧/٢٢٦ | ٦٣٢٥ | ٣٩٩ | ٣٣ |
| ناوەڕاست | ١١٨١ | ٥٨٧/٤٣١ | ٢١/٥٢٨ | ٤٩٧ | ٢٧ |
| خواروو | ٤٠٨ | ٢٠١/٩٦٥ | ٥٦٠٣ | ٤٩٥ | ٣٦ |
| تێکڕا | ٢١٠٩ | ٩٩٦/٦٢٢ | ٣٣/٤٦٦ | ٤٧٣ | ٣٠ |

بەپێی ئەژمارەکان ساڵی ١٩٨٤-١٩٨٥ ژمارەی قوتابییانی زانکۆ و ئامۆژگا هونەرییەکان لە هەموو پۆلەکان گەیشتە ١٧٩-١١٦ قوتابی کوڕ و کچ. کە تێیدا ٢٦،١٣٥ وازیان لە خوێندن هێناوە و دابڕاون کە تێیدا (١٨٪) ئافرەتن، کە دەکاتە (٢٢.٥٪)ی ژمارەی تێکڕای قوتابییانی ئەو ساڵە لە خوێندن دابڕاون و تەواویان نەکردووە.(١٢٤)

---

(١٢٢) هەمان سەرچاوە.

(١٢٣) هەمان سەرچاوە.

(١٢٤) هەمان سەرچاوە.

لەم خشتەیەشدا کە لە خوارەوە هاتووە ژمارە (٢١ و ٢٢) باس لە فێربوونی باڵا و پەرەسەندنەکانی دەکات.

**خشتەی ژمارە (٢١)** (١٢٥)

پەرەسەندنی خزمەتی فێربوونی باڵا ١٩٧٧-١٩٧٨

| ساڵ | کوڕ | کچ | تێکڕا |
|---|---|---|---|
| ١٩٧٧-١٩٧٨ | ٥٤/٨٤٨ | ٢٥/٤٩٧ | ٨٠/٣٤٥ |
| ١٩٨٤-١٩٨٥ | ٧٨/٦٧٦ | ٣٧/٥٠٣ | ١١٦/١٧٩ |

**خشتەی ژمارە (٢٢)** (١٢٦)

پەرەسەندنی خزمەتی فێربوونی باڵا لە ماوەی ١٩٨٤-١٩٨٥

| ساڵ | نێر | مێ | تێکڕا | قوتابی- مامۆستا |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٧٧-١٩٧٨ | ٢٩٠٣ | ٦٢١ | ٣٥٢٤ | ٢٣ |
| ١٩٨٤-١٩٨٥ | ٥٦١٠ | ١٣٤٨ | ٦٩٥٨ | ١٧ |

---

(١٢٥) هەمان سەرچاوە، ل٢١٨.

(١٢٦) هەمان سەرچاوە، ل٢١٨.

# قوتابخانە و خوێندنی کوردی لە سلێمانی

بۆ ئەوەی هەندێك بگەڕێینەوە سەر باری خوێندنی کوردی و کرانەوەی قوتابخانە لە شارەکانی کوردستاندا، دەبێت بۆ وێنەکێشانەوەی واقیعی خوێندەواری هەندێك بۆ دواوە بگەڕێینەوە، هەرچەندە بەپێی سەرچاوەکانی بەردەست تەمەنی کرانەوەی قوتابخانە بەزمانی جیاکان لە کوردستاندا تەمەنی زۆر کۆن نییە، لەگەڵ ئەوەشدا پێنگاڤی هەوراز و نشێوی بڕیوە، ئاسوودەیی ڕووی لە ڕۆشنگەران و دڵتەنگیش دوژمنانی داگرتووە، لەوەی بینیویانە ژمارەیەکی یەکجار کەمی ڕۆڵەکانی کورد لە سایەی خوێندن دەبووژێنەوە و دواڕۆژ بەڕۆشنی و بەعەقڵ و چاوی خۆیان دەبینن.

کورد بەپێی بەندەکانی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ی پەیماننامەی (سیڤەر – ئابی ١٩٢٠) دەبووایە لە تورکیا و کوردستانی باشوور بووبوونایە خاوەن ماف و کیانی خۆیان، هەروەها بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گەلانیش ساڵی ١٩٢٥ دان بەمافە نەتەوەیی و بەکارهێنانی ڕەسمی زمانی کوردی درا. لە ڕاپۆرتی لێژنەی لێکۆڵینەوەی مەسەلەی ویلایەتی مووسڵ بەڕاشکاوی هاتووە «دامەزراندنی مووچەخۆرەکان لە باری ئیداری و دادوەری و فێرکردنی کوردی بن و زمانی کوردی ببێتە زمانێکی ڕەسمی لە ئیدارە و خزمەتگوزاریدا».

لە سییەکان مێژوونووس ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠–١٩٤٨)[١٢٧] مەسەلەی خوێندنی لە کتێبێك بەوردی خستۆتە ڕوو، جیاوازی و بۆچوونی ڕەگەزپەرستانەی دەسەڵاتداران دەرهەق بە مافی کورد، لە نامەی یەکەمی کە لە ٢٤ی شوباتی ١٩٢٦ بۆ مەلیك فەیسەلی یەکەمی ناردووە، وەها باسی وەزعی خوێندن لە کوردستان دەکا: لە ناوچە کوردییەکاندا ساڵی ١٩٢٦ (٢٥) قوتابخانە هەبووە و (٥) بەزمانی کلدانی و عەرەبی و

---

(١٢٧) ئەم کتێبە ساڵی ١٩٣٥ بەناوی (محاولتان غیر مجدتیین). لە چاپخانەی مەریوانی لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە. چاپی لەگەڵ پێشەکی و پێداچوونەوە و بژارکردنی بەزمانی کوردی لە لایەن سەباحی غالب ساڵی ١٩٨٤ لە لەندەن چاپ کراوەتەوە.

٤٪ی میزانییەیان بۆ کوردستان تەرخان کردووە و ساڵی ١٩٢١–١٩٢٢ تەنیا ٣.٣٪ی میزانیەیان بۆ مەعاریف داناوە و ساڵی ١٩٢٨–١٩٢٩ش گەیشتووەتە ٥.٥٪.

بڕوانە أ. پ عن التعلیم في کردستان العراق ص٧.

(١٦)یان بەزمانی کوردی و (٤)ەکەی تریان بەزمانی تێکەڵ بوون. ژمارەی مامۆستاکانیان (٥٢) مامۆستا بووە و زۆربەیان کورد بوون تەنیا هەشتیان نەبێت، بەڵام کوردییان دەزانی. ئینجا باسی نەژادپەرستی دژی باری خوێندنی کوردی لە شارەکانی کوردستان دەکا، کە چۆن میزانیەی جودا و نا یەکسانیان بۆ دیاری کردوون.

لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ لە هەزار کەسی عێراقی تەنیا (٨) کەس لە قۆناغی سەرەتایی دەخوێنن. بەرامبەر (١٥٧) لە هەزار کەسی بەریتانی و (١٤٤) فەرەنسی و (١٥٣) ئیسپانی و (٩٦) بلغاری و (٨٨)ی یۆنانی، ئەمە پێش شەڕی یەکەمی جیهانییە. سەرباری (٣٪) ڕێژەی کوردان لە خوێندنی بالا، ئەم مێژوونووسە دەڵێت ڕێژەی مووچەخۆری کوردی لە لیواکانی دەرەوەی لیوا کوردەکان ٥٪ پتر نییە، کەچی لە شارێکی کوردی وەکو سلێمانی ٢٦٪ مووچەخۆرەکانی کورد نین، کە دەبێت ٩٩٪ی مووچەخۆرەکان کورد بوونایە. لەمەڕ ساڵی ١٩٣٠ دەڵێ:

– لە لیوای سلێمانی خوێندنی قوتابخانە سەرەتاییەکان کوردییە.

– لە لیوای هەولێریش خوێندن لە زۆربەی قوتابخانەکان بەکوردییە.

– لە لیوای کەرکووک (هەرچەندە زۆربەیان کوردن) تەنیا (٣) قوتابخانەی کوردی لە تێکڕای ٢٤ قوتابخانە هەیە، کە دەبووایە بەپێی سەرژمێری دانیشتووان نیوەی پتری قوتابخانەکان کوردی بوونایە(١٢٨).

ئەمە کورتە باسێکی خێرای ئەو باردۆخە سەرەتاییە یەکە لە کوردستانی باشووردا لەمەڕ خوێندنی کوردی و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری هاتووەتە ئاراوە. ڕاستە نەژادپەرستەکان بەتوندی دەیانویست کورد لە مافەکانی بێ بەش بکەن، سادەترین ماف بەکارهێنانی زمان و خوێندنە بەکوردی، دووچاری پلار و گرفتیان دەکرد. لەم بارەوە هەندێك دەیانگوت زمانی کوردی دەرەقەتی فێرکردن لە قوتابخانەکان نایە، لەو بیانووەی کە:

---

(١٢٨) أ. پ. عن التعليم في كردستان العراق. ل٩–١٠

زیاتری ئەم زانیارییانەش لە کتێبەکەی «عبدالفتاح علی بۆتانی کە ساڵی ١٩٩٩ لە هەولێر چاپ کراوە دوویات کراوەتەوە و ڕاستی ئەم بۆچوونانە دەسەلمێنن کە هەردوو کتێب و کاتی خۆی مێژوونووسی دیار محەمەد ئەمین زەکی بەگ نووسیویەتی.. بڕوانە د. عبدالفتاح علی بوتانی، مدرسة ١١ آذار. ل٣٤.

١- ناتوانێت زمانی خوێندن و نووسین بێ..

٢- کتێبی خوێندنی کوردی نییە.

٣- پێویستە فێری زمانی عەرەبی بین، بەکەڵکی قوتابیانی کورد لە خوێندنی پسپۆری و پلەی فەرمانبەری حکوومەت دێت.

لەم بارەشەوە محەمەد ئەمین زەگی بەگ ڕاشکاوانە لەم کتابەیدا وەڵامی ئەم بۆچوونە نەژادپەرستانەیەی داوەتەوە دەڵێ:

١- زمانی کوردی بێ توانا و دەسەڵات نییە، سەرچاوەی ئەدەبی و دینی بە کوردی هەیە و لیستێك لە ناوی شاعیر و زانایانی گەورەی کوردی خستووەتە بەرچاو.

٢- نەبوونی کتێبی قوتابخانەی کوردی لە بنچینەدا بۆ فرەنەکردنی بوار لە بەردەم مامۆستا و ڕۆشنبیرانی کورد دەگەڕێتەوە. هەروەها نەبوونی میزانیەی پێویست بۆ دانانی وەها کتێبێك، ژمارە و سەرژمێری لەمەڕ جوداوازیی نەتەوەیی لە بەشی فێرکردن ناودەهێنێت.

٣- لەمەڕ پێویستیی فێربوونی زمانی عەرەبی دەڵێت ئەگەر مەبەست لەمە زانستی و ئیدارییە و سیاسی نییە، دەتوانرێت چەند سەعاتێك زیاد بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی لە لایەن قوتابی کوردەوە تەرخان بکرێ.(١٢٩)

سلێمانی شوێنێکی گرینگ لە بواری خوێندەواری و ڕۆشنبیریی کوردی لە کوردستان دەگرێ، لە زەمانێکی زووەوە بایەخ بەخوێندەواری و شیعر و ئەدەبیات بەزمانی کوردی و باسی دینی و شیکردنەوەی قورئان بەزمانی کوردی(١٣٠) و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بەزمانی کوردی و ڕۆژنامە و نووسین بەکوردی دراوە.

د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول لە بارەی ئەم شارەوە دەڵێ: یەکەم چاپخانە کە لە کوردستاندا کەوتبێتە کار، لە شاری سلێمانی بووە. یەکەم ڕۆژنامەی کوردی کە لەناو کوردستاندا دەرچووبێ لە شاری سلێمانی بووە. یەکەم جار لە مێژووی کورددا لە شاری

(١٢٩) أ. پ. عن التعليم فی کردستان العراق. ل١١-١٢

(١٣٠) لە وێنەی کاك ئەحمەدی شێخ کە بەکوردی دەرسی دینیی گوتووەتەوە و کەوتووەتە بەر ڕەخنە و گلەیی نەخوێندەواران و حاجی قادری کۆییش لەمبارەوە شیعری گوتووە و کەیف خۆشیی بەم ڕەوتەی کاك ئەحمەدی شێخ دەردەبڕی.

سلێمـانـی خـوێنـدن بـەکـوردی دەستـی پـێ کردووە. یـەکـەم سروودی کوردی لـە شاری سلێمانییەوە بەرزبووەتەوە و یەکەم تۆماری قەوانی کوردی بەدەنگی هونەرمەندێکی ئەم شارە بووە. زانستی کوردی یەکەم هەوڵدانی نەهێشتنی نەخوێندەوارییە و لەم شارەدا سەری هەڵداوە[١٣١]

ئەگەر ئەم قسانە پرسیار و وەڵامیش هەڵدەگرن، بەڵام هیچ گومانی تێدا نییە شاری سلێمانی بەهۆی تازەیی شارەکە و مانەوەی کاریگەریی تام و بۆنی دەسەڵاتی کوردیی بابانەکان و مانەوەی دەسەڵاتی شیعری و ئەدەبی ئەوان سەردەمی بابانەکان و تین و تاوی ڕۆشنبیری و کوردێنی بەسەر سلێمانیدا زاڵبووە و لە ڕووی هوشیارییەوە لەچەند لایـەنـێکـەوە دەست سووکـی و هـەنگـاوی خێرایـان نـاوە، بەتـایبـەتـی لـە بـواری خـوێنـدن بەکوردی و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری چ جای ئەو گۆڕان و ڕووداوانەی لە بیستەکاندا ڕوویان دا و حکوومەتی خوارووی کوردستان بەسەرۆکایەتی مەلیك مەحموود دامەزرا و بـووە بـەردێکـی پتـەوی بنـاغـەی کـار و کـۆششی بـۆ بـڵاوکردنـەوەی خـوێندەواری و کردنـەوەی قوتـابـخـانـە و دواتر پـەرەگرتـنـی ڕۆشنـبـیری و بـایـەخدان بـەزمـانـی کورد و نووسین بەزمانی کوردی، کە ئەمەش بەشێکی بۆ ڕۆلی ئەو خوێندەوارانە دەگەڕێتەوە کە لە ئەستەمبول مێشکیان و ئاسۆی بیرکردنەوەیان کرابووەوە و جێی پەنجەیان لەسەر ڕووداوەکانی سلێمانی بەزەقی دیارە.

قوتـابخـانـە کـە بـاسی سـەرەکیی ئێمـەیە، لـە سلێمـانی لـە زەمـانێکی زوودا کراوەتەوە، بەپێی قسەکانی ناو کتێبی (شاری سلێمانی) قوتابخانەی تازە بابەت بۆ دروستکردنی کادیر بۆ کاری میری لە سەردەمی تورکدا لە سلێمانی دامەزراوە، بەڵام تا سەردەمێکی دوور نەیتوانی جێی مزگەوت چۆڵ بکات. هەرچی کوردی خوێندنیشە لەم قوتابخانانەدا ئەوە لە سەردەمی شێخ مەحموودەوە دەست پێ دەکات و تا ئێستاش قوتابخانەکانی سلێمانی و دەوروبەری بەکوردی دەخوێنن. لە زەمانی عوسمانیاندا ئەم قوتابخانانە هەبوون. سەرنجی خشتەی ژمارەی (٢٣) بدە.

---

(١٣١) ئەکرەمی مەحموودی سالحی ڕەشە، شاری سلێمانی، بەرگی یەکەم، ١٩٨٧، ل١٠.

## خشتەی ژمارە (٢٣) (١٣٢)

### ناوی قوتابخانەکانی پارێزگای سلێمانی لە ساڵی ١٨٩٢ بەدواوە

| | ناوی قوتابخانە | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی ماموستا | ژمارەی قوتابی | ساڵی دامەزراندنی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕوشدیەی عەسکەری | ١ | ١٣ | ١٠٦ | ١٨٩٢ |
| ٢ | سەرەتاییی کوڕان | ١ | – | – | ١٨٩٩ |
| ٣ | کلدانی سەرەتایی | ١ | – | ١٣ | ١٨١٥ |
| ٤ | جوولەکەی سەرەتایی | ١ | – | ٢٥ | – |
| ٥ | ئەعدادیەی موڵکی | ١ | ٧ | ٧٠ | ١٨٦٨ |
| ٦ | سەرەتایی مناڵان(الابتدائیه للاحداث) | ١ | ٤ | ١٠٠ | |
| ٧ | سەرەتاییی دووەم (الابتدائیه الثانیه) | ١ | ٢ | ٥٠ | |
| ٨ | سەرەتاییی یەکەم لە سیتەك | ١ | ١ | ٢٧ | |
| ٩ | سەرەتاییی یەکەم لە هەڵەبجە | ١ | ١ | ٣٠ | |
| ١٠ | سەرەتاییی یەکەم لە چەمچەماڵ | ١ | ١ | ٣٠ | |
| ١١ | سەرەتاییی یەکەم لە پێنجوێن | ١ | ١ | ٢٥ | |
| ١٢ | سەرەتاییی یەکەم بە ئاغەجلەر | ١ | ١ | ١٧ | |
| ١٣ | سەرەتاییی یەکەم لە پشدەر | ١ | ١ | ٩١ | |

هەر لەم بارەوە ئەکرەمی مەحمودی ساڵحی ڕەشە لە کتێبەکەیدا بەم جۆرە باسی کرانەوەی قوتابخانەکان و گەشەسەندنیانی کردووە. قوتابخانەی ئەعدادیەی موڵکی لە ساڵی ١٩٠٨ لەسەر فەرمانی سەفوەت بەگ کە لەو کاتدا قائدی عەسکەری سلێمانی بوو ٥٠٠ لیرەی بەپیتاك لەناو ساماندارەکانی شارەکەدا کۆکردەوە و ئەو بینایەی پێ کرد. ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی ١٩٠٨–١٩١٤ز لە شوێنی قوتابخانەی فەیسەلییەی جاران بوو، کە ئێستا بازاڕی (عصریه)ە پاشان گوێزرایەوە بۆ ماڵی حاجی حەسەنە فەندی سەرووسەرا لەبەر ئەوەی لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بوو بەشوێنی سەرکردایەتیی سوپای عوسمانی. مودیرەکان پیاوێکی تورك بووە، بەناوی (فایەق وەیسەل). هەروەها

(١٣٢) شاری سلێمانی، ل٤٤٥، بۆ پتر زانیاری، بڕوانە ئەمین زەگی بەگ، مێژووی سلێمانی. ساڵی ١٨٩٣ قوتابخانەی ڕوشدیەی سەربازی لە شاری سلێمانی لە لایەن سەعید پاشای خەندان کراوەتەوە. هاوڕێ نامە، ل١١٣.

قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری شوێنەکەی جارانی خستەخانەی خوارەوە، کە تا ساڵی ١٩١٤ جەنگی یەکەمی جیهانی دەوامی کردووە. مودیرەکەیان (ڕەشید زەکی کابان) بووە. پاشان ئەم قوتابخانەیە لەساڵی ١٩١٥ بوو بەقوتابخانەی سەرەتایی بەناوی قوتابخانەی (تشویقیە) پاشان ساڵی ١٩١٦ گواستییەوە بۆ ماڵی قادر ئەفەندی گەورە لە گەڕکی دەرگەزێن. مودیر و مامۆستاکانی ئەمانە بوون (زێوەر ئەفەندی مودیر، مەلا سەعید ئەفەندیی و شێخ عەبدولڕەحمان ئەفەندی و شێخ مەحموود ئەفەندی و عەلی ئەفەندیی دیاریەکری و جەبار ئەفەندی مامۆستا بوون). ساڵی ١٩١٦ ئەم قوتابخانەیەش بووە بەخەستەخانەی تورکەکان و ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بووە خەستەخانەی مولکی. هەروەها قوتابخانەیەکی سەرەتاییی کوڕان کە شەش پۆلی هەبوو ناوی (برهان الترقی) بوو، شوێنەکەی لە خوار قوتابخانەی گوێژەی کوڕان لای بازاڕی شووشە و مودیرەکەیان (سەید ئەحمەدی مەرەخەس) بوو. قوتابخانەیەکی سەرەتاییی کچان هەبوو شوێنەکەی پشتی سەرا لای کارێزی ئەحمەد زەنگەنە و مودیرەکەیان ناوی (مەلیحەی شێخ سەلام) ژنی مامۆستا (عەبدوڵڵا نووری) خوشکی شەمسەدین سەلام (حەسەن فەلاح) بوو، ساڵی ١٩١٥ ئەم قوتابخانەیە بەردەوام بوو تا هاتنی ئینگلیز لە ساڵی ١٩١٨ (١٣٣).

---

(١٣٣) هەمان سەرچاوە، ل٤٧٧.

بۆ ئەوەی وردتر لە مەسەلەی پەرەسەندن و دروستبوونی قوتابخانەی سلێمانی بنۆڕین، هەر لەمەڕ ئەم قوتابخانانە کە ناویان لە سەرەتا (مەکتەبی یەکەم و مەکتەبی دووەم) بووە بەم جۆرە لە سەرچاوەیەکی باس لە دروست بوون و پەرەسەندنیان کراوە: لە سەرەتای دامەزراندنی حکوومەتی عێراق لە ١٩٢١ قوتابخانەی مەکتەبی یەکەم کرایەوە، هەر ئەوکاتە مەکتەبێکی تر لە خانەکەی سەعدی مارف لە مەیدانی ماستەکە لە شوێنێکی چەپەکدا کرایەوە، لە نزیك خانەقای مەحوی پێیان دەوت (مەکتەبی دووەم). ئەو سەردەمانە لە مەکتەبی یەکەمدا تەنیا تا پۆلی دووەمی ناوەندی دەخوێنرا، زیاتر کوڕی بنەماڵە ناسراو و دەست ڕۆیشتووەکان ڕوویان تێ دەکرد، لە مەکتەبی دووەمدا تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی هەبوو. بەپێی زانیارەکانی مامۆستا فوئاد ڕەشید بەگ کە ماوەیەك بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە بووە و هەروەها قسەی ئەندازیار (نوری کاکە حەمە) و (تۆفیقە فەنی ئاغا فەتحوڵڵا) کە قوتابیی ئەم قوتابخانەیە بوون، بەر لە بەرپابوونی شەڕی یەکەمی جیهانی ئەم خوێندنگایە بەباریووی کۆمەکی دانیشتووانی شار و بەهەماهەنگیی سەرۆکی شارەوانیی ئەو سەردەمە دروست کراوە، کە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بووە. دواتر ناونراوە (ئامادەییی مولکی)، هەرچەندە =

ئەو قوتابخانەیەی کە لە سەردەمی تورکەکاندا کرابوونەوە هیچیان نەمان، قوتابخانەیەك لەم سەردەمەدا کرایەوە، بەناوی (نموونەی سەعادەت) یەکەم جار لە ماڵی نەجیب ئەفەندی لە لای ماڵی حاجی قادری جەبار کرایەوە و لەوێوە گواستیانەوە بۆ شوێنی مەڵبەندی عەسکەری تورکەکان کە پێیان دەوت (قشلە) بەرامبەر مزگەوتی گەورە و تەنیشت باخی میللی، کە ئێستا خەستەخانەیە ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی ١٩١٩ تا ساڵی ١٩٢١ دەوامی کرد، مودیرەکەی عەبدوڵڵا نوری و دواتر رەشید زەکی کابان بووەتە مودیری. مامۆستاکانیش ئەمانە بوون (مەلا سەعید ئەفەندی، زێوەر ئەفەندی، عەبدوڵلا سەبری، محەمەد باشقە، ئەحمەد عزیز ئاغا، کاپتان هۆڵد کە ئەفسەرێکی ئینگلیزی بوو دەرسی ئینگلیزی دەگوتەوە). ئەم قوتابخانەیە دوو پۆلی ناوەندی لەگەڵدا کرایەوە(١٣٤).

باسی سەردەمی دەسەڵاتی شێخ مەحموود، دواتر باسی دەکەین، دوای نەمانی حکوومەتی خوارووی کوردستان، جارێکی دی قوتابخانەی تازە دەستی پێ کردەوە، ڕاستە ماوەی چەند ساڵ ئەگەر کەمیش بوو بێت، بووە یەکەمین ئەزموونی خۆ

---

= یەکەم جار ئەم قوتابخانەیە ناوی (ڕوشدیەی عەسکەری) بووە، لەناو بینای تیمارگەی ناو بازاڕدا بووە، دەرچووانی ئەم خوێندنگایە بۆ گەیشتن بەپلە و بایەی سوپا ڕوویان دەکردە (بەغدا و ئەستانە). ئەو سەردەمە (فایەق فەیسەل) بەڕێوەبەر بووە، لە ساڵی ١٩١٤ ئەم بینایە کرایە بارەگای فەرماندەییی سوپا، ناوبەناو دەکرا بەنیشگەی سیاسی، لە ساڵی ١٩١٦دا ئەم خوێندنگایە لەناو بارەگای تیمارگای ناو بازاڕە و بەناوی (تەشویقیە) وە کرایەوە، مامۆستاکانی بریتی بوون لە (زێوەر ئەفەنی، مەلا سەعید کابان، شێخ ئەورەحمانی نەسیب، عەلی ئەفەنی، خەڵکی کوردستانی باکور، عبدولجەبارە فەنی، شێخ مەحموود، حەمدیە فەنی، سەید ئەحمەدی بەرزنجی، لە ساڵی ١٩١٧ئەم شوێنە کرا بەبارەگای مەلیك مەحموود، لە ساڵی ١٩١٨ کە ئینگلیزەکان سلێمانییان داگیر کرد، ئەم بینایە کرا بەبارەگای سیاسیی مێجەر سۆن. بڕوانە ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژ (٣٩٠) ٢٠٠٠/١١/١٢ل٥، نیو سەدە مەکتەبی یەکەم و مەکتەبی دووەم و ڕۆڵی پەروەردەی مامۆستایان.

هەروەها ساڵی ١٩٢٨ یەکەمین پەرتووکی زمانی کوردی بۆ قوتابییانی کورد لە سلێمانی لە لایەن (مەلا سەعید کابان)ەوە بەنێوی (مختصری صرف نحوی کوردی) دانرا. بڕوانە هاوڕێ نامە، ل٧٧. ساڵی ١٩٢٩ (کتێبی ڕێزمانی کوردی) لە لایەن توفیق وەهبی نووسراوە.

بڕوانە هاوڕێ نامە، ل١٧٨، لە ساڵی ١٩٣٠ کتێبی (دەستووری زمانی کوردی)نووسیوە، بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل١٧٣.

(١٣٤) هەمان سەرچاوە، ل٤٤٩.

بەڕێوەبەریی کوردی و کردنەوەی قوتابخانە و خوێندن بەزمانی کوردی. تین و تاوی خەڵك ڕووپەرەکانی ڕۆژنامەکانی ئەوکات لە کۆکردنەوەی کۆمەکی بۆ خوێندن و بڵاو کردنەوەی خوێندەواری دەبیندرێ، بەڵگەیەکی زیندووە بۆ ئەوەی کە نەتەوەی کورد هەوڵی داوە سوودی تەواو لەو دەرفەتانە وەربگیرێ کە بۆی ڕەخساون و لەناو دەریای تاریکدا کۆششی کردووە و چرای زانست و خوێندەواری هەڵکا.

لە قۆناغی تازەدا، دوای ڕووخانی حکوومەتی خوارووی کوردستان، بەسەرۆکایەتیی شێخ مەحموودی نەمر، قوتابخانەکان بەم جۆرە دەستیان پێ کرایەوە.

**قوتابخانەی سەرەتاییی یەکەم:** (١٣٥)

لە پۆلی یەکی سەرەتایی تا دووەمی ناوەندی لە ماڵی بابا عەلی شێخ مەحموود بەرامبەر مزگەوتی گەورە و بەڕێوەبەرەکەی (سالح ئەفەندی قەفتان) بووە. دواتر گوازرایەوە بۆ شوێنی مەکتەبی سیاسیی مێجەرسۆن، شوێنی مەکتەبی فەیسەلیەی جاران.

**قوتابخانەی سەرەتاییی دووەم:**

تا پۆلی چوارەمی هەبووە، لە سابوونکەران لە ماڵی یەکتا بەگ و بەڕێوەبەرەکەی (توفیق فکرەت) بووە. بەرامبەر خانەی غەفوور شالی لە گەڕەکی دەرگەزێن، دواتر

---

(١٣٥) هەمان سەرچاوە، ل٤٦٥.

عەبدوڵلا کەریم مەحموود لەمەڕ ئەم قوتابخانەیە وتوویەتی لە ساڵی ١٩٢٠ خوێندنگای (تەشوقیە) گوێزرایەوە بۆ (قشلە)ی سەربازگەی جاران، دواتر ناوەکە گۆڕا بە (مەکتەبی یەکەم) لە خانووەکەی ئێستای شێخ بابە عەلی کوڕی شێخ مەحموود لە گەڕەکی کانێسکان بەرامبەر مزگەوتی گەورە تا ساڵی ١٩٢٤هەر بەو ناوە مامۆستا عەبدوڵلا عەزیز هەولێری مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوو، ئەلف و بای کوردی و دیدەوانیی دەوتەوە. لە ساڵی (١٩٢٨ –١٩٢٩) کرا بەدوو قوتابخانە و لە شوێنەکەی خۆی بینای سیاسی مایەوە، نهۆمی سەرەوە تا پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی تێدا بوو، لە نهۆمی خوارەوەشدا دوو پۆلی ناوەندیی تێدابوو، کە ئەو کاتە لە هەموو قۆناغی ناوەندیدا چوار قوتابی هەبوو. یەکێکیان ناوی (ئەحمەد رەفیق حاجی فەرەج) بوو.. بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە توفیق فکرەت عەبدورەحمان باوکی د. حکمەتی سەرۆکی زانکۆی سلێمانی بووە.

بڕوانە ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی ژ (٣٩٠) ٢٠٠٠/١١/١٢ ل٥.

گوێزرایەوە بۆ خانەکەی (سەعەی مارف)ی باوکی ڕەزا سەعید و مامۆستا حەمە عەلی بینـاکـە لـە خـوار مـەیدانـی مـاستـەکەوە بـوو، بـەڕێوەبـەرەکـانـی تریش ئـەمـانـە بـوون، عەبدوڕەحمان قەرەداغی باوکی د. حکمەت و عەلی ئاغا و شەوقی سەعید کە یەکێك لە پسپۆڕەکـانـی بـواری پـەروەردەیـیـی ئـەو سەردەمـە. لـە سـاڵـی ١٩٣٠ گـوێزرایـەوە بـۆ سابوونکەران بۆ خانی (یەکتا بەگ) بریتی بوو لە چوار پۆل، مامۆستاکانی ئەوکات (ڕەفعەتە فەنی، مەلا سەعید کابان، خالید ڕەشید، عەبدوللا، شاکر سەید حەکیم ناسراو بەشاگیرە ڕەش). ساڵی (١٩٣١-١٩٣٢) خوێندگاکە گوێزرایەوە بۆ خـانـەی (جـەمیل سائیب)ی باوکی شازاد سائیب (نزیك مزگەوتی گەورە لە تەنیشت خانووی شێخ قادری حـەفـیدو حـەپسەخـانـی نـەقـیب هـەرچـوار پـۆل بـوو و مـودیـرەکـەی تـۆفـیق فکرەت و مامۆستاکانیش نەزهەتە فەنی و فەتاح شەشی خانە، واحیدە فەنی، خالید عەبدوڵڵا سەعید بوونە (١٣٦).

**قوتابخانەی زانستیی شەو(*)**

ساڵی ١٩٢٦پاش داواکردنی چەند کەسێك توانییان ئەم قوتابخانەیە بکەنەوە بۆ ئەو قوتابییانەی بەڕۆژ ئیش و کاریان هەبووە و نەیانتوانیوە بچنە قوتابخانەی ڕۆژ. وەکو گوتراوە ئەم قوتابخانەیە لەلایەن ئەحمەد بەگی توفیق بەگ دامەزراوە.

**قوتابخانەی دووەمی ئیبتدائی:**

لـە مـاڵـی سەعـەی مـارف کـۆڵانـی بـەرامبـەر مـەیدانـی مـاستـەکە کرایـەوە، تـا شەشی

---

(١٣٦) ئاڵای ئازادی، ژ ٣٩٠ ١٢/١١/٢٠٠٠ ل٥. عەبدوڵڵا کەریم مەحموود.

لە درێژەی ئەم باسەدا وەها نووسراوە: ساڵی ١٩٣٣ کە لافاوە گەورەکە قەوما پاشکۆیەکی ئەم قوتابخانەیە کرایەوە بەناوی (شعبە) دواتر گوێزرایەوە بۆ خانی حاجی سالم قاسم ، کرێیەکەی (٥) دینار بووە. ئەم خانووە هی باوکی حاکم ئەحمەدی باپیری د.بەرهەم سالح بووە. ئێستا لە شوێنەکەی سینما دڵشادە. دواتر ناوەکەی بووە (خالیدیە).

هەروەها لەمەڕ قوتابخانەی زانستیی شەو، بڕوانە هاوڕێ نامە ل١٧٣.

(*) لەشاری سلێمانیدا (کۆمەڵەی زانستی) یش هەبووە، ئەفسەر و مامۆستا، ساڵح قەفتان بۆتە بەشێك لەدەستەی دەرس وتنەوەی ئەم کۆمەڵەیە لە سلێمانیدا. ئەم کۆمەڵەیە بۆ ئامانجی ئەدەب و پەروەردە لەسەرەتای بەهاری ١٩٢٦ دامەزراوە وا پێ دەچێ ئەم قوتابخانەیەش هەر لە ناوی کۆمەڵەکەیەوە هاتبێ. بڕوانە گولان العربی: ژ (٥٤) ٢٠٠٠ دور الضباط الکورد.

سەرەتایی تێدابوو، بەڕێوەبەرەکەی شێخ قادر نووری بوو لە ساڵی ١٩٢٨ دامەزرا [١٣٧].

**قوتابخانەی دواناوەندیی کوڕان:**

دوای ساڵی ١٩٣٠ کرایەوە، مەکتەبی یەکەم کە پۆلەکانی زیادی کرد، ناوەندییان لیّ جیاکرایەوە، چووە شوێنی مەکتەبی غازیی جاران کە ئێستا خەستەخانەی (جمهوری)ە دوایی بووە دواناوەندی و بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (ڕەشید زەکی کابان، عەبدوڵلا نووری مهندی- ١٩٣٥، ڕەفیق حیلمی، وەدیع فەتحوڵلا میرزا- ١٩٤٦).

**قوتابخانەی سەرەتایی فەیسەلییە:[١٣٨]**

دوای ساڵی ١٩٣٠ دامەزرا و لە یەکەوە تا شەش، شوێنی بازاڕی عەسری بوو کە ناوەندییان لیّ جیاکردەوە بووە، مەکتەبی سەرەتایی، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (عەلی شەوقی، فوئاد ڕەشید، جەلال محەمەد سەیفوڵلا).

---

(١٣٧) شاری سلێمانی -ل٤٥٣-٤٦٥.

(١٣٨) ساڵی ١٩٣٤ ناوی قوتابخانەکان گۆڕان، ناوی مەکتەبی یەکەم گۆڕا بەفەیسەلییە، بەناوی شا فەیسەلی یەکەم عێراقەوە. مامۆستا ساڵح قەفتان تا ساڵی ١٩٣٦ لەم مەکتەبە ماوەتەوە. دوای ساڵی ١٩٣٦ مامۆستا عەلی ئاغا شەوقی سەعید کرایە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە. دواتر مامۆستا فوئاد ڕەشید بووە بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە تا ١٩٦٦/٩/١٠، لەدوای شۆڕش ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ ناوی گۆڕا بۆ (العزە) پاش ماوەیەك ناوەکەی بووە سەرکەوتن. دوای ماڵئاوایی مامۆستا جەلال، مامۆستا بەهجەت مەلا سەعید کرایە بەڕێوەبەر و هەر هەمان ساڵ ناوەکەی گۆڕا بە (ڕاپەنگە - تطبیقات) دار المومین تا ساڵی (١٩٦٩-١٩٧٠) مامۆستا بەهجەت کابان کرا بەکارمەندی پەروەردەی یەکێتی ڕاهێنان، عەبدوڵلا ئەژدەر ڕەزا و ڕەشید بەرزنجی بوون بەبریکار و یارمەتیدەری. بەپێی فەرمانی پەروەردەی گشتی، ڕۆژی ١٩٧٠/٩/٢٩ ناوی قوتابخانەکە کرایە پێشکەوتن، بەڵام جارێکی تر دووبارە کرایەوە (ڕاهێنگەی نموونەیی)، دوای هەوڵ و کۆششی کەریم زەند ١٣×٤٣٦م٢ خرا سەر ڕووبەری قوتابخانەکە و فراوان کرا. مامۆستاکانی ئەمانە بوون (عەبدوڵلا شێخ خالید، ئەحمەد چاوشین، عوسمان شێخ مستەفا خاڵ، عومەر محەمەد قادر، کەمال عەزیز، ڕەشید هەورامی، جەبار شێخ غەفوور، حەمە عەزیز ئەمین، عیزەت عەزیز، عەلی ڕازی و چەند مامۆستایەکی تر لە ١٩٧٤/١٢/١٢ مامۆستا محەمەد عەلی حسێن کرایە بەڕێوەبەر و دوای ئەویش فایەق ئەحمەد بوو. ئینجا حەمە ڕەحیم ڕەمەزان کرایە بەڕێوەبەر.
بڕوانە ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژ (٣٩٠) ٢٠٠٠/١١/١٢ل٥.

**قوتابخانەی گۆیژە:**

دوای ساڵی ١٩٣٠ دامەزراوە، بەرامبەر سینەما گۆیژە بووە، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (عەزیز فەرەج سەلیم، عبدولغەفوور مەلا عەلی مەڵکەندی، ڕەئوف حاجی ئەمین).

**قوتابخانەی ئەیوبییە:**

دوای ساڵی ١٩٣٠ دامەزراوە، لە گەڕەکی چوارباغ لە ماڵی دارەگەڕە، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (عەلی شەوقی، عەزیز ساڵح گورون، جەمال مەجید سەلیم). ئەم قوتابخانەیە سەرەتا ناوی مەکتەبی دووەم بووە، دوای ناو گۆڕانی گوازراوەتەوە بۆ لای گومرگە سووتاوەکە بۆ خانەی حاجی محەمەدی لاوە.

**قوتابخانەی خالیدیە:**

دوای ساڵی ١٩٣٠ دامەزراوە لە دەرگەزێن، لە ماڵی حاجی ساڵح قاسم خوار سینەمای دڵشاد، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (عەبدولواحید نووری، مەجید عەلی، مستەفا بەهجەت مەولوود، یونس تۆفیق). بەپێی نووسینەکەی عەبدوڵڵا کەریم مەحموود ئەمە قوتابخانەی (شعبە) بووە ناوی گۆڕاوە بۆ ئەم ناوە تازە.

**قوتابخانەی کانێسکان:**

دوای ساڵی ١٩٣٠ دامەزراوە، لە گەڕەکی کانێسکان سەرووی مزگەوتی گەورە، شوێنی قوتابخانەی ڕێزانی کچان. بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (تۆفیق فکرەت، عەزیز فەرەج سەلیم، شێخ ئەبوبەکر «هەردی».

**قوتابخانەی ئەمیر عەبدولئیلا:**

دوای ساڵی ١٩٣٠ دامەزراوە، لە گەڕەکی دەرگەزێن، لە ماڵی عومەری سەلام ئاغا بووە، بەڕێوەبەرەکانی بریتی بوون لە (حسێن سالح ئاغا، عەلی موزەفەر).

**سانەویی کوڕان:**

ساڵی ١٩٤٧بیناکەی تەواو بوو لە پشت خەستەخانەی جمهووری، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (جەلال نهال ساڵی ١٩٤٧، مووسا سەمەد ١٩٤٩، سلێمان سلاح ساڵی ١٩٥٣، مەعروف دلی ساڵی ١٩٥٤).

قوتابخانەی غازی:

لە سەرەتا لە گەڕەکی جوولەکان بوو، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (مەلا محەمەد سەیفوڵلا، فەوزی ڕەشید، عەزیز فەرەج سەلیم، مەجید سەعید، عەلی محەمەد سەدیق، عەلی موزەفەر).

قوتابخانەی مەڵکەندی:

لە دوای ساڵی ۱۹۳۰ دامەزراوە، گەڕەکی مەڵکەندی لە ماڵی عەونی ئەفەندی حاجی گوروون بووە. (ڕەشید کەریم) بەڕێوەبەری بووە، دوای گواسترانەوەی بۆ گەڕەکی گاوران (عەزیز میرزا ساڵح) بووە بەڕێوەبەری. هەروەها ئەم قوتابخانانەش لە سلێمانی هەبوونە دوای ساڵی ۱۹۵۸ –۱۹٦۰ دامەزراون.

١– قوتابخانەی سەرکەوتن (فەیسەلی کۆن) بەڕێوەبەری جەلال محەمەد سەیفوڵلا

٢– قوتابخانەی وەتەن بەڕێوەبەری هاشم سەدیق

٣ – قوتابخانەی بێکەس بەڕێوەبەری تاهیر یەحیا

٤– قوتابخانەی زێوەر بەڕێوەبەری ئەحمەد سەعید مەولوود

٥– قوتابخانەی جمهووری بەڕێوەبەری حەبیبە شێخ ئەحمەد

٦– قوتابخانەی سەیوان بەڕێوەبەری عەزیز میرزا سالح

٧– قوتابخانەی دەرگەزێن بەڕێوەبەری ڕەئوف حاجی ئەمین

٨– قوتابخانەی بارزان (عەبدولئیلای کۆن) بەڕێوەبەری بەهجەت سەعید کابان

٩– قوتابخانەی سەرچنار لە سەرچنار بەڕێوەبەری محەمەد عارف عەبدولرەحمان

١٠– قوتابخانەی بەکرەجۆ لە بەکرەجۆ بەڕێوەبەری ئەنوەر کۆخی

١١– قوتابخانەی پیرەمەگرون (غازیی کۆن) بەڕێوەبەری عەبدولغەفوور مەلا عەلی

لە ساڵی ۱۹۵۰–۱۹۵۸یش ئەم قوتابخانانە کرانەوە

١– سەرەتاییی سەر شەقامی کوڕان بەڕێوەبەرەکەی محەمەد ڕەشید مەحموود

٢– سەرەتاییی سەلاحەدین بەڕێوەبەری محەمەد تۆفیق عەزیز

٣– سەرەتاییی (فەیسەلیە)ی شەو بەڕێوەبەرەکەی جەلال محەمەد سەیفوڵلا

٤- ناوەندیی کوڕان لە دەرگەزێن ساڵی ١٩٥٤کرایەوە لە ماڵی عومەر سام ئاغا بوو بەڕێوەبەرەکەی ئەحمەد ئیبراهیم فەتاح بوو.

٥- ناوەندیی پیشەسازی (صناعە). لە ١٩٥٤/١١/١١ کرایەوە هەر لە شوێنی ئێستا و بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (ناجی جەعفەر سندووق، عەبدولحەمید جاسم، عەزیز سەعید عەباس).

٦- خانەی مامۆستایان (دار المعلمین) لە گەڕەکی شۆڕش شوێنی قوتابخانەی یەکێتی ساڵی ١٩٥٦ دامەزراوە، بەڕێوەبەری (کەمال محەمەد ئەمین) بووە.

٧ - ناوەندیی کشتوکاڵی (زراعة) ساڵی ١٩٥٧ لە کانێسکان دامەزراوە، بەڕێوەبەرەکەی عەبدوڵڵا ئیبراهیم سەراج بووە.

## قوتابخانەی کچان لە سلێمانی

**قوتابخانەی سەرەتاییی کچان:** (١٣٩)

ساڵی ١٩٢٦ کراوەتەوە لە گەڕەکی سابوونکەران لە ماڵی عەلی بەگ فەتحوڵلا بەگ. بەڕێوەبەری (گوزیدە خانی ژنی عەزیز یامولکی بووە و ساڵی ١٩٢٨ گواسترایەوە بەرامبەر ماڵی شێخ قادری حەفید و ناونرا (زەهرا). دوایی قوتابخانەی (زەهرا) گواسترایەوە دەرگەزێن، لە سەر گۆڵ خوار ماڵی عزەت بەگی وەسمان پاشا لە ماڵی حاجی ئەحمەد پیرۆز. بەڕێوەبەرەکەی فاتیمەخانی محێدین ئەفەندی، ژنی ئەحمەد بەگی ساحێبقران (حەمدی)، شاعیر بووە. هەروەها مستەفا بەهجەت و فەخریەخانی هاوسەری کە هەولێری بوو، یەکەم کەس بوون کچەکەی خۆیان لە قوتابخانەی کوڕان داناوە. ئەمین زەکی بەگ ئەوکاتە وەزیری مەعارف بووە، بەردی بناغەی دروستکردنی بینایەی ئەم قوتابخانەی لە ساڵی ١٩٢٧ بەخۆی داناوە لەم ئاهەنگەشدا میجەر سۆن ئامادە بووە.

**قوتابخانەی سەرەتایی (صدیقە):**

بەرامبەر ماڵی شێخ قادری حەفید، بەڕێوەبەرەکەی زەهرا خانی کچی مستەفا پاشا، ژنی عزەت بەگی وەسمان پاشا بووە، ئەم قوتابخانەیە ساڵی ١٩٢٨دامەزراوە، ئەو کاتەی (زەهرا) گواسترایەوە دەرگەزێن.

---

(١٣٩) یەکەم ئاهەنگیش لەو قوتابخانەیەدا بەئامادەبوونی هاوڵاتیانی سلێمانی حەفسەت عیرفانی خوشکی جەمال عیرفانی ئەفسەر، وتاری تێدا خوێندۆتەوە. بڕوانە ، گولان العربی، محمد عبدالله کاسور ، الدور السیاسي والثقافي للضباط الکرد ژ (٥٤) ت، ٢٠٠٠ ل٩٠.

**قوتابخانەی سەرەتاییی گۆیژە:**

لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٨دامەزراوە، لەگەڕەکی گۆیژەی قەزازەکان، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (مەلیحەی شێخ سەلام ژنی مامۆستا عەبدوڵڵا نووری خوشکی شەمسەدین (حەسەن فەلاح)، زینە ئەحمەد موختار، ساڵی ١٩٢٨ دامەزراوە، ئامینە حەسەن)

**قوتابخانەی سەرەتاییی عیراقیە:**

لە کۆڵانی پشتی مزگەوتی گەورە لە ماڵی ئەحمەد بەگی متەسەریف دامەزراوە، بەڕێوەبەرەکانی بریتی بوون لە (زەکیە رزوقی قستۆ، پەروین مستەفا، سەبریە حسێن نازم).

**ناوەندیی کچان:**

ساڵی ١٩٣٨ بۆ یەکەم جار لە شوێنی سەرەتایی (صدیقە) کرایەوە و بەڕێوەبەرەکانی (زەهراخانی ژنی عزەت بەگی وەسمان پاشا، عەتیە گرابیت، بوون. ئەم قوتابخانەیە (صدیقە) کە بووە ناوەندی گواسترایەوە پشت ماڵی بابا عەلی شێخ مەحموود لە ماڵی فەرەج. بەڕێوەبەرەکەی (فاتیمەخانی سالحەفەندی قەفتان) بوو. دواتر گواسترایەوە ماڵی فەقێ ڕەشیدی قەشان و بەڕێوەبەرەکەی (شەفیقە سەعید-١٩٥٣).

**(الاحداث المختلطة):**

ساڵی١٩٤٠ قوتابخانەی منداڵانی تێکەڵاو (الاحداث المختلطة) بەرامبەر ماڵی حەمەی ئەورەحمان ئاغا کرایەوە، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (فاتیمە خانی محێدین ئەفەندی، وەهبیە غەفوور).

**سانەویی کچان:**

پاش ساڵی ١٩٤٧ سانەویی کچان لە شوێنی ناوەندییەکە کرایەوە، بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون (گولنار ئەحمەدموختار، نزیلە سەعید شێخ حسێن، نەسرین مستەفا مەزهەر-١٩٥٨). لە ساڵی ١٩٥٠-١٩٥٨یش ئەم قوتابخانانە کراونەوە

١- سەرەتاییی (ملکة عالیة) لە ئەسحابە سپی بەڕێوەبەری شەفیقە سەعید بووە.

٢- سەرەتاییی (تاج) لە ماڵی ڕەفیق حیلمی بەڕێوەبەرەکەی شەفیقە مەحموود بووە.

٣- سەرەتاییی مەڵکەندی لە مەڵکەندی پیرمەسوور بەڕێوەبەری ئەختەر سالح عەباس بووە.

٤- خانەی مامۆستایان (دار المعلمات)ی سەرەتایی کچان ساڵی ١٩٥٦ دامەزراوە لە

شەقامی مەولەوی لەماڵی نوری بەگی حەمەد بەگ بەرامبەر دووکانی (حەمە عەلی مەدهۆش) بەڕێوەبەری (غەنیە عەباس ئەلعەزاوی) بووە.

٥- قوتابخانەی تێکەڵاو پشتی باخی گشتی. بەڕێوەبەری (سعاد حەکیم).

٦- باخچەی منداڵان (روضة الاطفال) بەڕێوەبەری کافیە ڕەفعەت.

٧- قوتابخانەی هونەری ماڵداری ساڵی ١٩٥٧-١٩٥٨ دامەزراوە. لە پێشدا لە سانەویی کچان بەرامبەر ماڵی شێخ قادری حەفید بوو: بەڕێوەبەری نەسرین مستەفا مەزهەر- ١٩٥٨-١٩٥٩، گواستیانەوە، بەرامبەر مزگەوتی گەورە شوێنی مەخزەنی مەعاریف بەڕێوەبەری (گەلاوێژ عەزیز فەرەج) بوو.

لە ساڵی ١٩٥٨-١٩٦٠ یش ئەم قوتابخانانە دامەزراون.

قوتابخانەی نیشتمان: تەنیشت ماڵی فەقێ ڕەشیدی قشان (صدیقەی کۆن) بەڕێوەبەری شەفیقە سەعید. قوتابخانەی سەربەستی: لە خانووی ڕەفیق حیلمی (ملکە عالیەی کۆن) بەڕێوەبەری بەهیە فەتحوڵلا. قوتابخانەی گوڵاڵە: لە گەڕەکی گاوران (زەهرای کچان) بەڕێوەبەری مەعسوومە ساڵح. قوتابخانەی ڕووناکی: لە پشت یانەی فەرمانبەران بەڕێوەبەری ڕافدە نەشئەت ئەحمەد. قوتابخانەی خانزاد: لە سەرشەقام، شیوی قازی بەڕێوەبەری منیرە ساڵح قەفتان. قوتابخانەی خەبات لەلای ماڵی حەمەی ئاورەحمان ئاغا بەڕێوبەرەی لەتیفە نووری قەفتان. قوتابخانەی ئازادی (تاجی کۆن) تەنیشت قوتابخانەی ڕووناکی بەڕێوەبەری شەفیقە مەحموود. قوتابخانەی بڵێسە پشت یانەی فەرمانبەران لەگەڵ قوتابخانەی ڕووناکیدا جووت بوون بەڕێوەبەرەکەی بەدریە عەلی بوو. قوتابخانەی سەرچنار- لە سەرچنار بەڕێوەبەری سەبریە عوسمان پشدەری. قوتابخانەی ئازادیی ئێواران، بەرامبەر ئەسحابە سپی لە خانووی حاجی مەحموود سامی بەڕێوەبەری سەلیمە کەریم.

سلێمانی لە چاو شارەکانی تری کوردستاندا، چاکتر لەڕووی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و کردنەوەی قوتابخانەی کوردی پێ گەیشتووە، ئەگەر بەراوردێك لە نێوان کردنەوەی قوتابخانە لە شارەکانی تری کوردستان و بوونی قوتابخانەی کچان و مامۆستایانی ئافرەت بکەین، لە هەولێر و کۆیە زۆر لە مامۆستا ئافرەتەکان لەسەرەتا لە مووسڵ هێنراون بۆ دەرس گوتنەوە، کەچی لە سلێمانی زۆربەیان کچ و خێزانی پیاوانی دیار و کەسایەتی ناسراویی ناو شارن. ئەمەش وای کردووە ڕێگەی خوێندەواری لەبارتر و گونجاوتر بێت، لەچاو شوێن و شارەکانی دیدا.

بەپێی زانیارییەکان ژمارەی قوتابییانی ناوەندی[١٤٠] لە سلێمانی تا ساڵی ١٩١٤ (١٦٣) قوتابی بوونە و ساڵی ١٩١٥ش ڕێژەی قوتابییانی سلێمانی (١٠٪) هەموو قوتابییانی عیراق و باشووری کوردستانی پێك هێناوە.[١٤١]

هەروەها بەپێی زانیارییەکی نێو گۆڤاری (گەلاوێژ) کە لە ساڵی ١٩٤٧ بڵاوکراوەتەوە وەزعی خوێندن و ژمارەی قوتابی و قوتابخانەکانی ناو سلێمانی بەم شێوەیە بوو.

خشتەی ژمارە (٢٤) [١٤٢]

ژمارەی قوتابخانە و قوتابی و مامۆستایان لە شاری سلێمانی ساڵی ١٩٤٧.

| ناوی قوتابخانە | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی | ژمارەی مامۆستا |
|---|---|---|---|
| سانەویی کوڕان | ١ | ٣٢٠ | ١٤ |
| سانەویی کچان | ١ | ١٠٠ | ٣ |
| سەرەتایی کوڕان | ٨ | ١٦١٠ | ٥٣ |
| سەرەتایی کچان | ٥ | ٧٦٠ | ٣٩ |
| کۆی گشتی | ١٥ | ٢٧٩٠ | ١٠٩ |

(١٤٠) ئەم ژمارەیە بۆ ئەو وەختە زۆرە و ئەم ڕێژەیەش کە دانراوە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەمین زەکی بەگ دەردەخات، بۆیە پێویستی بەلێوردبوونەوە هەیە. نوری شاویس لەمەڕ خوێندن و کردنەوەی یەکەم قوتابخانەی ناوەندی لە سلێمانی دەڵێت: پۆلی سێی ناوەندی بۆیەکەم جار لە لیوای سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٤کرایەوە، کە ژمارەی مامۆستاکانی لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێ نەدەپەڕین بەو پێیە تا ناوەڕاستی سییەکان قوتابخانەی دواناوەندی لە ناوچە کوردییەکان نەبووە. سەیری پەراوێزی ژمارە ١٣٦بکەن

بڕوانە آ.ب. عن التعليم في كردستان العراق، ص١٣.

(١٤١) هاوڕێ باخەوان، هاوڕێ نامە، ل ١٣١–١٣٣.

(١٤٢) شاری سلێمانی، ل٤٥٨، هەروەها بڕوانە هاوڕێ نامە، ل٢١٩. بەم ژمارەیە دەردەکەوێ کە ١٠٪ ڕێژەی خوێندن لە عیراق و کوردستان پێك ناهێنێت، لە ساڵی ١٩٥٢ لە بەراوردێکی بچووکدا دەردەکەوێ لە هەولێر (٧٥٩)و قوتابی و سلێمانی(١١٣٢) و ژمارەی مامۆستایانیش بەم جۆرە بووە هەولێر (٣٩) و سلێمانی (٤٩). یانی لەجیاتی گەشەکردنی لە چاو ساڵی ١٩١٠–١٩١٥ کە ژمارەی دانیشتووان لە نیو سەدەدا زۆر لەوە پتر بوو، تا ئەم ژمارە کەمە بنێردرێنە بەرخوێندن. کە ئەمەش بەڵگەی بوونی نەژاد پەرستی و بایەخنەدانە بەخوێندنی کوردی و ناوچە کوردییەکان.

# خوێندن لە سەردەمی یەکەمی حکوومەتی کورددا

دەگەڵ ئـەوەڵین هـەنگـاوەکـانـی دروستـبـوونـی حـکـوومـەتـی خـوارووی کـوردسـتـان بەسەرۆکایەتیی شێخ مەحموود ئەو ڕۆشنبیرانەی لەوێ بوون، یا پێشتر گەلاڵەی کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بەدەستەوە بوو، زەمینەی لەبارتریان بۆ هەڵکەوت دەست بەکار بکەن، ڕۆژنامەکانی ئەو کات وتاری هەمە جۆریان لەمەڕ بایەخی خوێندن و خوێندەواری تێدایە، هانی خەڵك دەدەن بۆ فێربوون و گەیشتنە ئاستی گەلانی دونیا لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی مەعاریف و خوێندەواری و دەربازبوون لە کوێرەوەری.

بەپێی سەرچاوەکان لە سەردەمی دەسەڵاتی کوردی لە سلێمانی چوار قوتابخانە هەبووە و بەم شێوەیە و مامۆستاکانیشی ئەمانەن کە لە خوارەوە ناویان دەهێنین و دەبێت لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ لەسەر بڕیاری وەزارەتی مەعاریف کە یامولکی وەزیری بووە ڕێك خرابێت. لە یەکەم ئەزموونی دەسەڵات و ئیدارەی کوردییدا لەتەك پێکهێنانی وەزارەتەکان (وەزارەتی مەعاریف)یش دامەزراوە، ئەم وەزارەتە بەڵگەی بیرکردنەوە و کارکردن بووە بۆ پەرەپێدانی ڕۆشنبیریی کوردی و (موستەفا پاشا یامولکی) ڕۆشنبیر و ڕۆشنگەر وەزیری بووە. ئەم پیاوە لەم هەلومەرجەدا وەکو کەسێکی لێوەشاوە و ڕۆشنبیرێکی دووربین و گەرموگوڕ لە بەشداریی کار و ئەرکەکان ناوی دێت.

قوتابخانە و مامۆستاکان بەم شێوەیە بەپێی بڕیارێك دابەش کران.

**١ – قوتابخانەی ناوەندی– مەحموودی:**

ڕەفیق حیلمی بەڕێوەبەر و مامۆستاکانیش (سالح ڕەفعەت، خواجە ئەفەندی، سەعید سدقی، زێوەر ئەفەندی، سەعید ئەدیب قەزاز) بوون.

**٢– قوتابخانەی سەرەتاییی قادری:**

شێخ مەحموود زهدی بەڕێوەبەر و مامۆستاکانیش (سەعید زەکی، عەزیز ئەفەندی) بوون.

**٣– قوتابخانەی سەرەتاییی ڕەئوفی:**

سەعید عاکف بەڕێوەبەر و مامۆستاکانیشی (ئەحمەد ئەفەندی و محەمەد ڕەمزی ڕەحیم) بوون.

**٤- قوتابخانەی سەرەتایی لەتیفی:**

ئەحمەد حەمدی عزیز ئاغا بەڕێوەبەر و مامۆستاکانیش (فایق ئەفەندی و ئەحمەد حەمدی) بوون.

لە قوتابخانەکاندا دەرسەکان لەو سەردەمەدا بەگەرمی و بەڕێکوپێکی دەوتراوە، قوتابییەکانیش زۆر بەشەوق بوون و بەدڵ دەچوونە مەکتەب و لەدەوری حکوومەتی کوردا لە جاران زیاتر و گەلێك باشتر ڕوویان کردبووە قوتابخانەکان و سەریان کردبووە سەر خوێندن (١٤٣).

پێویستە ئاماژەیەك بەسەردەمی ئەوکاتی سلێمانی لەمەڕ خوێندن بکەین و یەکێکی وەکو ڕەشید زەکی بابان لەبیر نەکەین کە دەرسی گوتۆتەوە و شوێنی لە بواری فێرکردن دیارە. ئەو کات قوتابخانەی (نموونەییی سەعادەت) لە سلێمانی هەبووە لە ژمارە (١٨)ی ڕۆژی ٢٦ ئابی ١٩٢٠ بۆ وەرگرتنی قوتابی ئەم بانگەوازەی لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) بڵاو کردۆتەوە:

«مکتب نمونەء سعادت لە روژی ١٧ آب/١٩٢٠دا قوتابی قید و قبول ئەکا و لە یکم روژی ایلول ١٩٢٠ دست آکری بەخویندن. هرکس دیەوی مندالی خوی بنیری کە بەقد زانینی خوی لە صنفەکانا قید دکری. کتب، دفتر، قلم، کاغز، مرکب، تباشیر، هموی خوراییە و پارە ناسینریت» (١٤٤).

یانی بەپێی ئەم بانگەوازە لە هاوینی ١٩٢٠ دەبێ قوتابخانەکە کرابێتەوە و گرینکی لەوەیە خوێندن تێیدا خۆڕایی بووە، کە بۆ ئەو کات و سەردەم هەنگاوێکی باش بوو، هانی خەڵکی بدرێ بچنە بەر خوێندن و ترسی دابینکردنی پێویستییەکانی خوێندنیشیان نەبێ. کە لەوکاتەدا نەبوونی و کەم دەرامەتی هۆکارێکی ئابووریی بەهێزبوو لەبەردەم چوونە قوتابخانە، زۆربەی ئەوانەی دەیانخوێند منداڵی ئەفسەر و مووچەخۆرانی دەسەڵاتدارانی دەستە و دایەرەکانی دامو دەزگاکانی عوسمانی بوون، وەلێ، هاتنی ئینگلیزەکان هەندێك سووکە گۆڕانکاریی دروست کردووە، لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) کە ئەوان واتە ئینگلیزەکان دەریان دەکرد و لەژێر دەسەڵاتی ئەوان (خوێندن بەخۆڕایی) کراوە.

---

(١٤٣) م.ر.هاوار، بەرگی دووەم.ل٣٤١

(١٤٤) هەمان سەرچاوە، ل٣٦١.

پیرەمێردی زانا و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووس لەمەڕ ئەوان سەردەمی خوێندن و باری ڕۆشنبیریی سلێمانی وەها دەنووسێ: لە دەوری پێشوودا کە ڕۆژنامەیەکمان دەست دەکەوت هەرچی خوێندەوار بوو لێی گرد دەبوونەوە، وەکو هەنگوینیان لە کلۆرەی دارا دۆزیبێتەوە دەستاو دەستیان پێ دەکرد، هەرچەند باشیش تێ نەدەگەیشتن، چونکە بەتورکی بوو. زمانی تورکییش ئەوسا لەم شارەدا یەکێکی وەکو (ئەحمەد ئەفەندییە خڕە)ی ئەرز و حاڵچی و بەکر ئەفەندی کاتب دەیانزانی. کە لە ئەستەنبوڵەوە هاتمەوە بۆ سلێمانی شارێکی وێران کراو، قەومێکی سەرگەردان و پەرێشان «نەخەستەخانە، نەقوتابخانە، نەمامۆستا و نەهیچی تیادا بوو... زیوەر و مەلا سەعید کابان بێ پارە و پوول بوون، دە دوازدە منداڵیان کۆکردبووەوە دەرسیان پێ دەوتن. تەنیا لە گەرەمەی دەسەڵاتی شێخ مەحموود کە ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکردبوو، لەبەر کەم دەرامەتی و وزە و توانای جووڵانەوەی خوێندەواری هەر ئەوە بوو کە بتوانرێت چوار قوتابخانە هەبێت. بەلەناوچوونی فەرمانڕەوای شێخ مەحمود گوڕ و تەوژمی خەڵکی بۆ پەرەپێدانی خوێندەواری و گەشە کردن خاو بوونەوەو هاتنە کزی. چونکە زۆری خوێندەواران و ڕۆشنبیران چارەنووسی خۆیان بەشێخەوە بوو کە ناچار لەگەڵیا هەڵاتن و بەم لاو لای وڵاتدا بڵاوبوونەوە دیارە شێواندنی جووڵانەوەی نیشتیمانی بەدوای خۆیا باری چالاکی زۆر شتی تریشی بێ نازکردن(١٤٥).

ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەم گەلێك بابەتیان تێدا بڵاو کردۆتەوە، کە بۆ ئەمڕۆ و باسکردنی مەسەلەی خوێندن و خوێندەواری سەرچاوەی بەسوودن و زۆر مەسەلەی شاراوە ڕوون دەکەنەوە ... چ لە دانانی ئەو چوار قوتابخانەیەی لە سەردەمی دەسەڵاتی مەلیك مەحموود کراونەتەوە، چ لە بایەخدانی ئەم ئەزموونە کورتخایەنە بەمەسەلەی کردنەوەی قوتابخانە و فێربوون و بڵاو کردنەوەی خوێندەواری و چاپکردنی ڕۆژنامە و هاندانی خەڵك بۆ خوێندەواری. ناوەکان لە ژمارە (١٣)ی بانگی کوردستان ١٩٢٢/١١/٣ بەم شێوەیە دیاری کراوە:

«لەژێر ادارەی رفیق حلمی افندی کە حقیقتا لە آذ کیای شبان وطنە مکتبیکی اعدادی حوت صنفی (٣صنفی رشدیە) بەناو مبارك حضرت حکمدار، یعنی (اعدادی محمودی) و مکتب رشدیەیکی جوێ بەناوی جناب سپهسالار شیخ عبدالقادر افندیەوە یعنی (رشدیە،

(١٤٥) م. ر. هاوار بەرگی یەکەم، ل ٩٦.

قادریه)و دو مکتب ابتدائی بەناوب مخدومان حضرت حوکمدارەوه (رؤفیة) و (لطیفیه) تشکیل و بەو نەوعەیش بو ناونرانیان مساعده فرموا». [١٤٦]

مێجەرسۆن لەمەڕ قوتابخانه و ژمارەی قوتابییان لەو کاتدا نووسیویەتی: ژمارەی قوتابییانی سلێمانی (٩٠) قوتابی بوو کە بەزمانی کوردی دەخوێندرا، هەوڵدرا تیپێکی فتبۆڵ لە سلێمانیدا پێك بێت، بەڵام ئەو تەقەڵایە سەری نەگرت[١٤٧].

وەکو چۆن وەزعی سیاسی نەیتوانی ئارامی بەخۆیەوە ببینێت، باری ڕۆشنبیری و خوێندەواریش هەر وابوو. ڕاستە حکوومەتی خوارووی کوردستان، زوو کەوتە بایەخدان بەم بوارانە، لەتەك پێکهێنانی وەزارەتی مەعاریف و هاندانی مامۆستا ڕۆشنبیرەکان، ڕۆژنامەشی چاپ و بڵاو دەکردەوە و چوار قوتابخانەشی دامەزراند.

لەمەڕ پەرەسەندنی خوێندن لە شاری سلێمانی ئەم خشتەیە بارودۆخەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. کە باسی ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٦و ١٩٧٦- ١٩٧٧ دەکات.

---

(١٤٦) هەمان سەرچاوە بەرگی دووەم، ل٣٤٤.

(١٤٧) هەمان سەرچاوە ل١٣٧.

### خشتەی ژمارە (٢٥) (١٤٨)

## سەر ژمێریی دەربارەی چالاکی پەروەردەیی پارێزگای سلێمانی

| قۆناغی خوێندن | ژمارەی قوتابخانە | بینا دروست کراوەکان بۆ قوتابخانەکان ١٩٧٤-١٩٧٧ | ژمارەی قوتابخانەکان ئەوانەی تازە کراونەتەوە | ژمارەی قوتابیانی ساڵی خوێندنی ٧٦-١٩٧٧ | | ژمارەی ئەندامانی بنەماڵەی دەرس وتنەوە ٧٦-١٩٧٧ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | کوڕ | کچ | کوڕ | کچ |
| باخچەی ساوان | ١١ | – | ٣ | ٦٧٥ | ٢٧٩ | ٥٧٩ | ٣٢ |
| سەرەتایی | ٦٧٨ | ٣٧ | ٣١ | ٥٦٩٩٨ | ٢٣٩٨٠ | ١٨٤٢ | ٩٦٤ |
| ناوەندی و سانەوی و ئامادەیی | ٦٥ | ١٣ | ٦ | ١١٦٨٩ | ٤٥٩٦ | ٣٥٢ | ١٨٩ |
| ئامادەیی پیشەسازی | ١ | – | – | ٨٥١ | ١٠٦ | ٤٥ | ٧ |
| ئامادەیی کشتوکاڵ | ١ | – | – | ٣٧٠ | – | ٢٧ | – |
| ئامادەیی بازرگانی | ١ | – | – | ١٠٨ | ١١٠ | ٥ | ٦ |
| خانەی مامۆستایان | ١ | – | – | ٣٢٢ | – | ١٤ | ١٤ |
| خانەی مامۆستا کچەکان | ١ | – | – | – | ٥٢٥ | – | – |
| پەیمانگای مامۆستا کوڕ و کچەکان | – | – | – | – | – | – | – |
| پەیمانگای ئیسلامی | ١ | – | – | ٢٢٤ | – | ١٩ | – |

تێبینی: ١- ژمارەی ئەو قوتابخانانەی خۆراکیان تیادا دابەش دەکرێ (١٢٠) قوتابخانەیە.
٢- ژمارەی مەڵبەندی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری لە پارێزگاکە (٢٠٧) مەڵبەند و (٤٤٥٢) کەس تیایدا دەخوێنن.

---

(١٤٨) گۆڤاری ڕۆشنبیری. ژمارەی بەسەرەوە نەماوە.

ئەگەر بەکورتیش بێت، پێویستە ئاماژەیەك بە بەرابییە مێژووییەکانی ڕۆشنبیری و باری خوێندەواری هەولێر بکەین، ئەو هەولێرەی هەزارەها ساڵەی ژیانی تێدا بەردەوامە و تا ئەمڕۆش بێ شەڕ و تالآن کاولکاری نەبووە.

لە سەدەکانی زاین کە پاپای گەورە هاتە ئەم شارە، شەست قوتابخانەی تێدا دروست کرد و لە ناویاندا قوتابخانەی بەناوبانگی کفر عوزیل کە ١٦ کم لە خوارووی هەولێر بووە و (یاقووت حەمەوی) لە (معجم البلدان) ناوی دەهێنێت. سمعانی دەڵێ بولیس مامۆستای قوتابخانە بووە، نزیکەی سی ساڵ لە هەولێر و سرجیوس کە بە (ملفان خرە) ناسراوە بەهەمان شێوە لە قوتابخانەی) حەزە مامۆستا بووە. بەناوبانگترین قوتابخانەی ئەم شارە لە سەردەمی ئەتا بەگی بووە بەناوی قوتابخانەی ئەلعقلیە لە دروستکردنی عەباس خضر ابن نصر العقیلي. و دامەزراندنی قوتابخانەی قەلآت ساڵی ١١٣٨ز سەرباری قوتابخانەی الجماهریە و قوتابخانەی موزەفەرییە کە موزەفەرەدین کەوکەبەری دروستی کردووە. لەگەڵیشیدا (خانەی الحدیث موزەفەریەی) دروست کردووە، تا مەغۆلەکان تالآنیان کردووە لە ساڵی ١٢٣٧ز.

ژمارەیەکی ناسراوی گەورە و دیاری ئەو سەردەمە لە هەولێر ژیاون سەردانیان کردووە وەکو (ئیبن خەلەکان و ئیبن مستەوفی) و ئەمانەش سەردانیان کردووە (ئیبن حسین ئەلیلنسی ١٢٣٧ز) (شاعیری جوو یەحیا بن سلیمان)، (ئیبن مخوس ئیبن ئیبراهیم ئەلئومەوی کە زانای نەحو و حکمە و ئەلمنتیق) بووە. (شاعیر ابوموزەفەر جەمالەدین عەبدورەحمان ئیبن محەمەد) (ئەبوو بەرەکان کەمالەدین بن حەمدان) و گەلێکی تر... لە بێتواتەش گەلێك زانای گەورە لە سەدەی نۆزدەم لێ هەڵکەوتوون(١٤٩).

بۆ ئەم زانیارییانە و گەلێك باسی تر لەمەڕ هەولێر سەرچاوەی پڕ بایەخ هەن و گەلێك بواری گرینگی ئەم شارەش تا ئێستا بەتاریکی و پەردە پۆشی ماونەتەوە.

---

١٤٩- گۆڤاری پەیامی مامۆستا، مدارس اربیل القدیمة، نوري بطرس، ژمارە (١٦) کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ ل٩٨.

# گەشەکردنی خوێندن لە هەولێر

هەولێر و دەوروپشتی لە ماوەی دەسەڵاتی بەریتانییەکان لە نێوانی ساڵانی ١٩٢١ -١٩٣٢ هەندێك گەشەی کرد، ئەمەش بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە، پێش هەموویان نەمانی سیستەمی ئیداری دواکەوتووی عوسمانی کە ئیدارەیەکی لامەرکەزی پشتی بە باج دەبەست و، گواستنەوەی بۆ سیستەمی سەرمایەداریی پێشکەوتوو کە پشتی بەئیدارەی مەرکەزی لە فەرمانڕەوایی دەبەست، ئەمەش وای کرد بەشێوەیەکی گشتی هەندێك هۆکاری شارستانی نوێ بێنە ناوچەکەوە و، کاریگەری بکاتە سەر گەشەکردنی ڕێژەی لە بواری خوێندن و خزمەتی تەندروستی و چاککردنی باڵاخانەی حکوومی و دروستکردنی ڕێگاویان ڕێکخستنی هاتوچۆ و جگە لەوەش دیاردەی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەم بارەوە، لە یەکێك لەو ڕاپۆرتە بەردەوامانەی بۆ ناوەند بەرز دەکرانەوە لەمەڕ چۆنیەتیی بەڕێوەچوونی کارەکان، دەربارەی باری خوێندن و قوتابخانەکان لە ڕاپۆرتی تایبەتی، مانگی ئەیاری ١٩٢٥ بەم جۆرە باس کراوە:

«سوپاس بۆ خوا هەموو ئەو قوتابخانانەی لەم لیوایەدا (واتە هەولێر-غ) هەن بەرەو بەرزی و باشی، بەشێوەیەك کە شایستەی پیا هەڵدان و باسە دەچێت، هیوامان ئەوەیە کە بینایەی قوتابخانەیەکی تازەش لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٢٥ تەواو بێ»(١٥٠).

بەپێی ڕاپۆرتی ئیداریی مانگی مایسی ١٩٢٥ موتەسەریفی هەولێر، هەواڵی کردنەوەی قوتابخانە تازەیەکە تۆمار کراوە و تێیدا هاتووە:

«قوتابخانەیەکی تازە لە هەولێر لە٢١/٩/١٩٢٥ کرایەوە بەهەموو خۆشی و ڕێکییەکەوە قوتابیەکان بە«چاپوکی و زەوقێکی زۆرەوە» دەوامی تێدا دەکەن. نزیکەی ژمارەی قوتابیەکانی گەیشتۆتە (٣٠) کەس و بەڕێوەبەرەکەی ڕەشید ئەفەندییە و هەر لەم قوتابخانەیەدا لە مانگی شوباتی ١٩٣٠ شانۆگەری (سەلاحەدینی ئەیوبی) پێشکەش کرا»(١٥١).

---

(١٥٠) اسماعیل شکر ڕەسوول، اربیل دراسة تأریخیة في دورها الفکري والسیاسي (١٩٣٩-١٩٥٨) رسالة دکتورا ١٩٩٩، ص٢٥. ئەم زانیارییانە لە م. و.ر رقم الملف ٤٨/و/٤ موضوع الملف تقاریر شهریة لمتصرفیة اربیل، تقریر الاداری لشهر مایس ١٩٢٥، متصرفیة اربیل، العدد ٢٤، ١٧٣٤ سري، التاریخ ٤ حزیران١٩٢٥ ص٢ وەرگیراوە.

(١٥١) هەمان سەرچاوە، ص٢٦.

لەمەڕ پەرۆشی و لێخۆشهاتنی خوێندن و تامەزرۆیی خەڵکی هەولێر لە ڕاپۆرتی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥دا بەوردی ئاماژە بەحەز و ویستی شاری هەولێر بۆ کرانەوەی قوتابخانە و چوونە خوێندن و شێوازی لە خوێندن وا باس کراوە: دانیشتووانی ئارەزوومەندن، داوای زۆریان بۆ فێربوون نیشان دەدەن، مامۆستاکانیش هەوڵی چاك بۆ بەرز کردنەوەی کاروباری مەعاریف دەدەن».[١٥٢]

دوای ئەو گۆڕانکارییانەی لە ناوچە کە و عیراقدا ڕوویان دا و دەسەڵاتی عوسمانییەکان پیاوە نەخۆشەکە کز و سیس بوو، بزووتنەوەی سیاسی ڕۆشنبیریی کوردیش لە پەرەسەندن بوو، ڕاپەڕینەکان لەلایەك و گەڕانەوەی ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەستانەو هاتنەوەی سەربازە نیشتیمانپەروەرەکان و هاتنی ئینگلیزی ئەورووپایی بۆ عێراق و کوردستان و دامەزراندنی حکوومەتی خواروی کوردستان بەسەرۆکایەتیی مەلیك مەحموود و دەرچوونی ڕۆژنامە و گۆڤار بەزمانی کوردی و دەرچوونی بڕیاری خوێندن بەکوردی و داواکانی نوێنەرانی کورد لە ئەنجومەنی عیراقی لە بەغدا بۆ بایەخدان بەخوێندنی زمانی کوردی و پەرەپێدانی مەعاریف لە کوردستاندا، هەولێریش جۆرێکی لە بووژاندنەوەی لە باری خوێندەوارییەوە بەخۆوە بینی.

خوێندن لە هەولێر ساڵی ١٩٣٣ –١٩٣٤ گەشەکردنێکی بەخۆوە بینی و لەم ساڵەدا ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکانی لیوای هەولێریش بەگشتی (٢٢) قوتابخانە بووە، دوویان هی کچان و یەك قوتابخانەی ناوەندیش لەناو هەولێر هەبووە. لە نێو (١٣ ) باخچەی ساوایاندا، یەك باخچەی ساوایان لەناو هەولێر لە ساڵی ١٩٣٥ کراوەتەوە کە ژمارەی منداڵەکانی گەیشتۆتە (٣٠) منداڵ. هەر لە ساڵی ١٩٣٥دا دوو قوتابی هەڵبژێردراون تا بەشداریی یەکەم بەعسەی زانستیی ڕەسمیی عێراق بکەن کە بۆ خوێندن ڕەوانەی دەرەوەیان کردوون و ژمارەی تێکڕای ئەوانەی چوون (٤٦) قوتابی لە سەرتاسەری عێراق بوون.[١٥٣]

---

(١٥٢) هەمان سەرچاوە، ص٢٦.

(١٥٣) هەمان سەرچاوە ص٣٧ . ساڵی ١٩٢٥ تەنیا ٢٥ قوتابخانە لە ناوچەکانی کوردستان و ساڵی ١٩٢٧ گەیشتە (٢٧) قوتابخانە کە تەنیا (١٦) یان لە ساڵی ١٩٢٥ بەکوردی خوێندنیان تێدا بوو. لە ساڵی ١٩٣٠ تەنیا لە لیوای سلێمانی و هەولێر لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بەکوردی دەخوێندرا. آ.ب. عن تعلیم في کردستان العراق، ص٧.

یەکەم قوتابخانەی کچان:

لە باسوخواسی کرانەوەی یەکەم قوتابخانەی کچان و گەشەکردنی وەها باس کراوە ئەو قوتابخانەی بۆ یەکەم جار لە مێژووی هەولێر لە ئەیلوولی١٩٢٧ وەکو قوتابخانەیەکی سەرەتاییی کچان لە سەردەمی موتەسەریف (مەجید یەعقوبی) کرایەوە ئەم قوتابخانەیە لەناو قەڵات لە خانوویەکی بچووك بەرامبەر دەرگای ئەحمەدی دەستی پێ کرد و سەرەتا یەك پۆل بوو (٣٥) قوتابیی تێیاندا دەخوێند. مامۆستا و بەڕێوەبەریشیان (قەدریە حەسەن) بوو کە لە (مووسڵ)ڕا هێنرایە هەولێر. ساڵی (١٩٢٧-١٩٢٨) بەهەمان شێوە مامۆستایەکی تریان بەناوی (عەتیە ئەمین قازی) و ساڵی دواتر یەکێکی تریان بەناوی (ڕەفیقە ئەحمەد بەرزنجی) و ساڵی چوارەم مامۆستایەکی تریان بەناوی (ماری سادق زلو) و (کلولە ئەسطیفان) هەر هەموویان لە (مووسڵ)ڕا هێنان، چونکە هەر ساڵێك پۆلێکی تازەتریان دەکردەوە، ساڵی چوارەم قوتابخانەکەیان لەبەر بچووکی گواستەوە، خانوویەکی گەورەتر لە تەنیشت تەنکی ئاوی قەڵات و ساڵی پاشتر لەبەرامبەر دەرگای سەرەکیی قەڵات خانوویەکی حکوومەتیان بۆ تەرخان کرد. ساڵی ١٩٣٢-١٩٣٣ پۆلی شەشەمیش کرایەوە و ژمارەی قوتابییەکانی ئەم پۆلە تەنیا (١١) کەس بووە و (٣) کەسیان لە دەرەوەی هەولێر هاتوون. هەر لەم ساڵیدا ناوی قوتابخانەکە بۆ (قوتابخانەی ئەربیلی کچانی سەرەتایی) گۆڕا.

بۆ یەکەم جاریش بەشدارییان لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆری کرد و چوار قوتابی لە تاقیکردنەوە دەرچوون یەکێکیان لەناو هەولێر و دووەکەی تریش لە دەرەوەی هەولێر.

ئەو ئافرەتە هەولێرییەی لە تاقیکردنەوەی کەلۆریی سەرکەوت، چووە خانەی مامۆستایانی بەغدا و بووە یەکەم مامۆستای ئافرەتی هەولێر و هەنووکە خانەنشینە.

دوای پەرەسەندنی خوێندن لە هەولێر ئەم قوتابخانەیە کرایە دوو بەش، یەکەمیان (قوتابخانەی خانزادی کچان) لە گەڕەکی عەرەب و دووەمیان هەر لە قەڵات بەناوی (قوتابخانەی قەڵای کچانی سەرەتایی). پێش ئەوەش لە کۆتاییی چلەکاندا (قوتابخانەی یەکەمی کچان) لە گەڕەکی عەرەب کرایەوە کە لە چوار پۆل پێك هاتبوو، بەڕێوەبەرەکەشی خاتوو (بدور یەعقووب) بووە. دوای ئەوەی (قوتابخانەی ئەیوبییەی کچان) لە گەڕەکی عەرەبی نوێ لە نزیك بنکەی گەیاندن و تەلەفۆناتی ئێستا و پاشان

(قوتابخانەی خانەقای کچانی سەرەتایی) کرانەوە[١٥٤].

هەولێر لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا دەستی کردووە بە گۆڕان و فراوانبوون و گەشەکردن، لە ساڵی ١٩٢٦بەدواوە هەولێر وردە وردە دەستی بەگۆڕین کرد، تا ئەو کاتەی دانیشتووانی زۆریان لە قەڵات بوون، قەڵات (٣) گەڕەکی تێدا بوو کە بەگەڕەکی تۆپخانە و سەرا و تەکیە ناو دەبران.

بەپێی نووسینەکانی مامۆستا هادی ڕەشید چاوشلی لە بیستەکاندا تەنیا یەك قوتابخانە لەم شارەدا هەبووە لەسەر شەقامی سەلاحەدین بەرامبەر بازاڕی گەورە و لە ساڵی ١٩٢٥– ١٩٢٦ قوتابخانەی تازە دروست کراوە کە تا ئێستا جێگا کەی پارێزگای هەولێرە، جگە لەمەش لەوکاتدا قوتابخانەیەکی تر کرایەوە لە گەڕەکی تەعجیل و پاش ساڵی ١٩٣٠ سێیەم قوتابخانە لە سەر شەقامی موزەفەریە بەرامبەر قەڵات کرایەوە. ئەو قوتابخانەی کچان پاش ساڵی ١٩٣٦ لە قەڵات[١٥٥] دامەزراوە کە ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد ئەم قوتابخانەیە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٧ کراوەتەوە .

زۆر کەسی تر کە باسی مێژووی شاری هەولێر دەکات، ئاماژە تەنیا بەبوونی ئەم ژمارە قوتابخانەیە دەکەن بۆ بەدبەختی و کلۆڵیی کورد، زۆر درەنگ و بەکاوەخۆ خوێندن و خوێندەواری پەرەی سەندووە... (قوتابخانەی ئەربیل الاولی) کە یەکەم قوتابخانەی هەولێرە، سەرەتا لە شوێنی (مطعم تاجریان)ی ئێستا بووە، دواتر گوازراوەتەوە قوتابخانەی (ئیبن خەلەکان).

دووەم قوتابخانەش لە گەڕەکی عەرەبی نوێ بەرامە بەر مایکرۆفی هەنووکە بوو، بەڕێوەبەرەکەی عەبدورەحمان ئەلچەلەبی بوو، ساڵی ١٩٥٣براوەتە شوێنیی ئێستای پارێزگای هەولێر و ساڵی ١٩٤٨بەڕێوەبەرەکەی ئەحمەد ناجی بووە و هەر ئەوساڵە (٣٠) قوتابیی تێدا بووە و پاشان جومعە محەمەد ئەلسەغار بۆتە بەڕێوبەری[١٥٦].

---

(١٥٤) جريدة خەبات، العدد (٨٣٤) ١٩٩٧/٧/٢٥، احمد البياتي، قبل ٦٠ عاماً افتتحت اول مدرسة ابتدائية للبنات في اربيل. هەروەها لە ئاكامی ڕۆڵی سەربازە کوردەکان لە سلێمانی، ئەوهاش لە مەسەلەی هاندانی خوێندن ئەمین ڕواندزی ئەفسەرو ڕۆشنبیریش لە ڕواندز کچی خۆی (هێدی) ناردە بەرخوێندن لەشاردا. بڕوانە گولان العربي، دور الضباط الكرد، ژ. (٥٤) ت٣ ٢٠٠٠.

(١٥٥) هادی ڕەشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ کاروانی فەلەك، بەغدا، چاپخانەی الجاحظ، ١٩٨٧، ل١٣.

(١٥٦) جريدة خەبات، تعقيب حول موضوع ذكريات عن بدايات التعليم واوائل المعلمين في اربيل، صالح احمد البنا، العدد (٨٣٠) ١٩٩٧/٦/٢٠ ل١١.

ساڵی ١٩٣٢ قوتابخانەی موزەفەرییە لە هەولێر دامەزراوە و[١٥٧] ژمارەیەك ڕۆشنبیر و زانا و مامۆستای دیار سەرەتای خوێندنیان لەم قوتابخانەیە دەست پێ کردووە، دەبی سەرنج بۆ ئەوە ڕاکێشین کە لە یەکەم قوتابخانەی کوڕانی هەولێر، زمانی کوردی وەکو دەرسێکی قوتابخانەکە خوێندراوە.

لە باسەکەمان دوور ناکەوینەوە کە باسی قوتابخانەکانی ئەو مزگەوتانەش دەکەین لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە هەولێر شوێنێکی بەرزیان لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواریی و فێرکردنی خوێندن و پێگەیاندنی فەقێ و مەلا و قورئان خوێندا هەبووە، چونکە مزگەوت و حوجرە و مەلایەتی و فەقێتی پانتاییەکی فراوان و پێشەوەیی و تەنیا لە مەسەلەی بڵاو بوونەوەی فێربوونی خوێندن و قەڵەم گرتن و شاعیرێتی و خوێندەواریی و سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی شیعری و پەخشانی کوردی دەگرن.

لەبەر ئەوەی جێی خۆیەتی سەرەپەنجەی مێژوو بۆ قوتابخانەکانی ئەو مزگەوتانە و مامۆستایانە درێژ بکەین کە لەناو هەولێردا بوونەتە شوێنی فێربوونی خوێندنەوە و خوێندەواری:

١- مزگەوتی گەورەی قەڵات- قوتابخانەیەکی ئاینیی پێشکەوتوو بووە، ئەو مامۆستایانە (مەلا ئەبوو بەکری کوڕی عوسمان (بەمەلا ئەبوو بەکری یەکەم ناسراوە) و مەلا عومەرە فەندی کوڕی ئەبو بەکری یەکەم و مەلا ئەبوو بەکرئە فەندی کە بەمەلا گچکە ناودەبرا و کوڕی حاجی عومەرەفەندی و مەلا شێخ جەمیلە فەندی کوڕی عەلی و مەلا شێخ عەلی فەندی کوڕی ئەبو بەکرە فەندی و مەلا عوسمانە فەندی کوڕی ئەبوو بەکرە فەندی و حاجی عومەرە فەندی کوڕی مەلا ئەبوو بەکر ئەفەندی کە بە مەلا گچکە ناو دەبرا و مەلا بەکرە فەندی کوڕی حاجی عومەرە فەندی کە بەمەلا ئەفەندی ناسرابوو. عزەدین مەلا فەندی محەمەد ڕەشاد موفتی و چەند مامۆستایەکی تر دەرسیان تێدا گوتووەتەوە و خوێندەوارێکی زۆریان تێدا پێ گەیاندووە. ئەو مەلا ئەفەندییەی ڕابەریی ڕای گشتی لە هەولێر لە هەموو کەسێکی تر پتر دەکرد، هەر ئەو ئیجازەی پتر لە (١٠٠) قوتابی زانست دا و شیعری بە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی دەگوت.[١٥٨]

---

(١٥٧) جريده خەبات، العدسة تتذكر، طارق ابراهيم شريف، العدد (٨٦٤) ٢٧/٢/١٩٩٨.

(١٥٨) اسماعيل شكور، اربيل في دورها ص٧٧.

٢- قوتابخانەی مزگەوتی گچکەی قەڵات، ئەسعەدە فەندی مەلا ئیبراهیم دۆغرەمەچی دەرسی لێی وتۆتەوە، گەلێ مەلای گەورە و خوێندەواری پێ گەیاندووە.

٣- قوتابخانەی مزگەوتی گچکەی قەڵات قوتابخانەی ئەسعەدەفەندیی گڕاوی مەلا ئەحمەد مەلا ڕەسوول گڕاوی و مەلا سولەیمان مەلا ڕەسوول گڕاوی و مەلا عەبدولرەحمان مەلا ڕەسوول گڕاوی بووە و دەرسیان تێیدا داوە و سوختە و فەقێ و موستەعیدێکی باشیان پێ گەیاندووە.

٤- مزگەوت و قوتابخانەی خانەقا لە خوارەوە، مەلا ئەحمەد زەلام و شێخ مەلا هیدایەت نەقشبەندی و شێخ یەحیا نەقشبەندی و شێخ مەزهەری شێخ یەحیا نەقشبەندی و مەلا شەریفی بەشیریانی دەرسیان تێدا داوە.

٥- قوتابخانەی مزگەوتی شێخ ئەبوو بەکر- شێخ مەلا ئەبوو بەکر شێخ مەلا محەمەد هەرشەمی و شێخ عەبدولرەحمان شێخ ئەبوبەکر و شێخ عەبدوڵڵا ئەبوو بەکر و شێخ مستەفا شێخ ئەبووبەکر دەرسیان تێدا گوتۆتەوە.

٦- قوتابخانە و مزگەوتی دێرە برووشە- مەلا سلێمان مەلا عەبدوڵڵا و مەلا ساڵحی دێرە برووشە و حاجی مەلا عەبدوڵڵا دێرە برووشە دەرسیان لێ داوەتەوە.

٧- قوتابخانە و مزگەوتی ناو بازاڕی نەجاران - مەلا حسێن موفەسیر دەرسی لێ داوەتەوە.

٨- قوتابخانە و مزگەوتی شێخی چۆلی- مەلا تەها مەلا یونس و مەلا حاجی ئەلیاس ئەفەندی دەرسیان تێدا گوتۆتەوە.

٩ - لە قوتابخانەی مزگەوتی حەیدەری و مزگەوتی شێخ نوورەدین و مەحموود پاشا و مزگەوتی شێخ ئەحمەد ئەسعەد نەقشبەندی دەرسی ئاینی گوتراوەتەوە.

١٠- مەلا عەبدوڵڵا محەمەدەمین کە بە مەلا عەبدوڵڵای کونەفلووسە ناسراوە، لەگەڵ کوڕەکانی مەلا عەلی و مەلافائز لە مزگەوتی نێو بازاڕ دەرسیان داوەتەوە.

١١- مامۆستا مەلا سالح کۆزەپانکەیش لە مزگەوتی داودیە لە قەڵات دەرسی گوتۆتەوە و مەلایەکی پایە بەرز بووە. (١٥٩)

دیارە لەتەك ئەوانەشدا لە گەلێك گوند و شارۆچکەی تری هەولێر و کوردستان حوجرە

---

(١٥٩) مەولوود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە، بغداد، دار الشؤون الثقافة العامة، ١٩٩١، ل٧٠.

و مزگەوتەکان بۆ خوێندەواری شوێنی بەرزیان هەبووە، مەلاکان پێشەنگی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و دواتر هۆشیاریی سیاسی و نەتەوەیی بوون، هەر ئەوانیش بوونە پێشەنگی دامەزراندنی ئەدەبیاتی کلاسیکی کورد و هانی خوێندن و وریا بوونەوە و هۆشیارییان داوە و لە هەندێك سەردەم ڕابەرایەتی و تێکەڵاوییان لەگەڵ شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیش پەیدا کردووە.

لە زۆر شوێنیش (سوختەخانە) هەبووە، مەلا لە ماڵەوە لە چەشنی قوتابخانەیەکی بچووك دەرسیان فێری ساوایان کردووە، لە چەشنی قۆناغی سەرەتایی بووە و بەرەبەرە ئاستی فێر بوون و خوێندەواری منداڵیان بەرەو پێشەوە بردووە. سەید مەولوود بێخاڵی(١٦٠) لەبیرهاتنەکانی لەمەڕ هەولێر دەربارەی سوختەکان کە خۆشی سەرەتای فێربوونی لەوێ دەست پێ کردووە دەڵێت: خۆم یەکێك بووم لەو سوختانەی مامۆستا (مەلا حەکیم داود) کە ماڵەکەی لە گەڕەکی خانەقا لە کۆڵانی پشت مزگەوتی خانەقا بوو، سی پارە و جزوعەمە و تەبارەك و الزاریاتم خوێندووە، بەیانییان چێشتەنگاوێکی زوو ڕوومان دەکردە ماڵی مامۆستای نەمر. جا وانەبێ هەر ئەو مامۆستایە سوختەخانەی هەبووبێ، هەندێکی تریش لە نێو شاری هەولێر لە گەڕەکەکانی تر هەبوون. لە ماڵی مامۆستا بەرێز دادەنیشتین و ڕوومان لە دیوار دەکرد و پشتمان دەکەوتە مامۆستا، جا ئەگەر یەکێك سالوزی بکردبا. مامۆستا دار قەڵانگێکی شلکی درێژی لەتەك خۆی دادەنا لەوکاتەی دەرسی بەسوختەیەك دەدا بەدەستەکەی تریشی بەو دار شلکە بەئێشە ناو ملانی سوختە سالوزە تەوەزەلەکەی گەرم دەکردەوە، لەگەڵ تەپزیندار لەنێو ملانی هەڤاڵەکانی تری بەکاردەکەوتن لە خوێندن، خۆ ئەگەر یەکێك زیاتر ئاژاوەیان بنابایەوە یا لە ڕەوانکردنی چەند دەرسێك دوا بکەوتابا لە فەلاقە دەدرا، فەلاقە جۆرە سزایەکی تایبەتی سوختەیە، ئەو سوختەی سزا دەدرا بەفەلاقە هەردوو لاقیان لە گۆزینگەوە بەپەتێك یا والەیەکی قایم یا بەدەسماڵێ لەیەك دەبەست، بەدارێکی ڕێکی درێژی لە شێوەی (تیرۆك) پەتەکەیان هەڵدەوێزینیە ئالی یەك تا باش دەشەتا- توند- دەبوو. ئەوسا بەدوو سوختەی تر ئەوسەر و ئەوسەری دارەکەیان دەگرت و هەردوو قاچە بەستراوەکەی سوختە تاوانبارەکەیان بەرز دەکردەوە و مامۆستاش بەشوورکە دار هەنارێك یا کەوەتێك یا کنێر بەلاڵووکێك وەردەگەڕایە ژێر پێی بەژماردن دوو یان سێ یان پێنج یا دە داری لە ژێر پێی گیر دەکرد، جا بەو سزادانە گەلێ سوختەی بزێو و

(١٦٠) هەمان سەرچاوە، ل٧٠.

نارەحەت چاویان دەشکاو زیاتر خۆیان هان دەدا بۆ ڕەوشت باشی و دەرس ڕەوان کردن... بێ ئەوەی باوکی سوختە قەڵس بێت. مامۆستا فێرکردنی سوختەی بەئەرکێکی پێویست دەزانی، ئەو ئەرکەی خستبووە ئەستۆی خۆی و بەجێی بگەیەنێت. سەرەمانگیش هەریەك لە ئێمە چوار پەنجاییمان بۆ مامۆستا دەبرد، ناوە ناوە کەللە شەکرێکیش ئەو چوار پەنجا -ریال- بوو. ریالیش پارچە دراوێك بوو بەچوار پەنجایی دەچوو، سەرەڕای ئەو پارە و شەکرەش هەندێ ئایەت هەبوون کە سوختەی پێی دەگەیشت دەبووایە پاداشت بۆ مامۆستا بێنێ وەك ئایەتی (یمنعون الماعون) جلی مامۆستا دژوونە، بێنە قالبەك سابوونە. ان شانئك هو الابتر- بۆ مزگەوتی بێنە بەرە دارێکی تەڕ- واما بنعمة ربك فحدث- بۆ مامۆستا بێنە بەرخێکی بەگوریس- انە کان توابا- مریشکە رەشە لۆ مامۆستای کەبابە...هتد) پاش ختمکردنی قورئانی پیرۆز دەستمان دەکرد بە خوێندنی کتێبی ئەحمەدییە، پاش ئەو کتێبە سوختە دەچووە پلەی فەقێ، ئەو کاتە دەچووە لای مەلایەکی کە.

باسی مەلایەتی و چۆنیەتی پەرەسەندنی خوێندن و بڵاوبوونەوەی لە شار و دێهاتەکانی کوردستان باسێکی سەربەخۆیە و سەرباری ئەوەش ژیانی فەقێیەکان و چۆنییەتیی ئیجازە دان و ڕێوڕەسمی وەرگرتنی ئیجازەی قۆناغەکانی خوێندن و بیرەوەرییەکانی مەلا و مامۆستایانی ئاینی و خوێندەوارانی ئەو سەردەمە تەژییە لە بەسەرهات و پەند و نوکتەی خۆش و هەرچەندە لەچاو ژمارەی کوردان، ڕێژەیەکی ئێجگار کەم چوونەتە بەر خوێندن و خەڵکێکی زۆر کەم لەبەر زوڵمی کۆمەڵایەتی و زۆرداریی دوژمنانی نەتەوەی کورد و قورسیی باری ژیان، دەرفەتیان بۆ هەڵکەوتووە بخوێنن، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەك کەس سوودیان وەرگرتووە و بوونەتە سوختە و دوای بەکولە مەرگی شاروشار، دێ بەدێ و ناوچە بەناوچە گەڕاون هەزار هەنگاویان بۆ فێربوونی وشە و دێڕێکی تازەی خوێندن بڕیوە.

دەگەڕێینەوە سەرخوێندن لە سییەکانی سەدەی بیستەم لە هەولێر، ئەو سەدەی کە باری ڕۆشنبیری کوردی هەنگاوێکی باشی بۆ پێشەوە ناوە. خوێندەواری چووەتە پێش، بەڵام ئاستەنگی زۆر بوون و دژایەتی کراوە. قوتابیانی هەولێر لەو کاتەدا بەدەست کەمیی قوتابخانە و مامۆستا و شارەزای پەروەردەیی و نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی کچان و کوڕان دەیاننالاند، بۆیە ناچار بوون بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوو لە کەرکووك یا مووسڵ ، یاخود بەغدا بکەن.

## مانگرتنی قوتابییانی کۆیێ

لەو کاتدا بەهۆی پەرەسەندنی بزاڤی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و چاپبوونی ڕۆژنامە و گەشەکردنی خوێندن و فراوانبوونی خوێندەواری و نووسینەکانی سەر ڕۆژنامەکان بۆ هاندانی فێربوون و پەروەردە و مەعریفەت و زانست و کردنەوەی قوتابخانە و بایەخدان بەزمانی کوردی هاندەر بوون، قوتابییانی کورد بیر لە پێشەوەچوونی خوێندن و فێربوونی زمانی کوردی بکەنەوە.

ئەو کات قوتابخانەکانی هەولێر وەکو تێکڕای قوتابخانەکانی ناوچە کوردییەکانی تر بوون، لە قۆناغی تازە دا ڕەوتێکی مەترسیداری فشار لەسەر خوێندنی زمانی کوردی سەری هەڵدا کە سنوور بەزاندنێکی ڕوون بوو دژی یاسای زمانە ناوخۆییەکان(١٦١).

ئەم فشارانەی شۆڤینی وەکو (ساطع الحصرری) یان لە دواوەی بووە و ئەمەش بووە هۆی کاردانەوەیەکی توند لە ریزی ڕۆشنبیرانی کورد و لەو برووسکانە خۆی دەنواند کە وەکو نارەزایی لە هەولێر و دەوروپشتی دەگەیشتنە بەغدا، ئەمەش وای کرد قوتابییانی کۆیسنجق لەسەرەتای ساڵی ١٩٣٦ مانیان گرت، کە ئەمە یەکەمین مانگرتنە لە مێژووی بزاڤی قوتابییانی کورددا و ڕەنگە لە هی عیراقیش بێ و، نوێنەری سلێمانی عەلی کەمال بەحەماسەوە ئەم بابەتەی لەناو ئەنجومەنی نوێنەران تەقاندەوە(١٦٢).

بارودۆخی سیاسیی کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر بەرێوەچوونی هێواش و لەسەرەخۆی خوێندن لە کوردستان کردووە، بەتایبەتیش دەزانین لە سییەکان و چلەکانی ئەم قۆناغەدا تا دەهات ڕۆڵی ڕۆشنبیران و خوێندەواران پتر دەبوو، دەرچوونی گۆڤاری

---

(١٦١) اسماعیل شکر، اربیل دراسة تأريخية في دورها الفكري، ل٣٧. ئەم یاسایە لە ژێر نمرەی (٧٤) لە ساڵی ١٩٣١ دەرچووە بەپشت بەستن بەمادەی (٧) دەستووری هەمیشەیی عێراق دراوە، دان بەرەسمی بوونی زمانی کوردی لە بەکارهێنانی لە عیراق لە خوێندن و دائیرەکان و دادگانئنراوە. بڕوانە م. ر. هاوار. بەرگی یەکەم.

هەروەها بەپێی برگەی (٥)ی قسەکانی وەزیری مستەعمەراتی بەریتانیا لە وتارێکی لە ساڵی ١٩٢٦ دەردەکەوێ کە ئەو کاتە زمانی کوردی لە دادگا تەنیا لە سلێمانی و کۆیێ بەکارهێنراوە. ئەم زانیارییانەی لە نامەکەی مێژوونووس ئەمین زەکی بەگ کە ساڵی ١٩٣٥ بڵاوی کردۆتەوە لەمەڕ وەزعی خوێندن لە کوردستان و بەکارهێنانی زمانی کوردی.

بڕوانە آ.پ. عن تعليم في كردستان العراق، ل١١.

(١٦٢) هەمان سەرچاوە، ل ٣٨.

(ڕووناكی) لەو كاتەدا لە هەولێر و پێشتریش بوونی چاپخانەی زاری كرمانجی و دەرچوونی گۆڤاری زاری كرمانجی لە ڕواندز و چاپبوونی ژمارەیەك كتێب و سەرهەڵدانی بزووتنەوەی سیاسی و دامركاندنەوەی ژمارەیەك ڕاپەڕین و ڕووخاندنی حكوومەتی خوارووی كوردستان بەسەرۆكایەتیی شێخ مەحموود و دروستبوونی ڕێكخراوی سیاسی لە پاڵ كۆمەڵە و ڕێكخراو و گرووپە ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتییەكاندا، ڕۆڵی قوتابییان و خوێندەوارانی لەنێو كۆمەڵگای كوردەواری زۆر زیاتر كردووە، بەتایبەتی لە هەولێردا كە (حزبی هیوا) لە چلەكاندا چالاكترین و دیارترین حزبی سیاسی و ڕۆشنبیریی كورد بووە، لەلایەن ژمارەیەك خوێندەواری ڕۆشنبیر و قوتابیی كوردەوە لە هەولێر دروست بووە و پەرەی سەندووە لە ناویاندا.

لەبەر ئەوەی دەبێت ڕەچاوی ئەوە بكەین كە دوژمنانی پەرەسەندن و پێشكەوتنی كورد حەزیان نەكردووە كورد لە ڕێگەی خوێندن و كردنەوەی قوتابخانە وریا ببنەوە و لە تاریكییەوە بەرەو ڕووناكی بچن. ئەگەر سەرنجی پەرەسەندنی خوێندن لە شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٤٠ بەدواوە بدەین، بەم جۆرە دەردەكەوێ. ساڵی ١٩٤٠ تەنیا یەك قوتابخانەی ئامادەیی لە هەولێر لە كۆی ١٤قوتابخانە لە تێكڕای عیراق و هەروەها (٢) قوتابخانەی ناوەندی لە كۆی (٤٢) قوتابخانە بەگشتی لە عیراق هەبووە. ئەم واقیعەش لە ساڵانی ١٩٤١،١٩٤٢،١٩٤٣،١٩٤٤ هەروەكو خۆی مایەوە، كەچی لە عیراقدا ژمارەی قوتابخانە ئامادەییەكان لە ساڵی ١٩٤٢گەیشتە (١٥) و لە ساڵی ١٩٤٤، ١٩٤٣ بووە (٢٢) قوتابخانە و ساڵی ١٩٤٢-١٩٤٣ (٤٥) و ساڵی ١٩٤٤ بوونە (٤٩) قوتابخانە بڕوانە ئەم خشتەیە.

**خشتەی ژمارە (٢٦)** (١٦٣)

**ژمارەی قوتابییانی قوتابخانە ڕەسمییەكانی ناوەندی و ئامادەییی هەولێر لە ساڵانی ١٩٤٠، ١٩٤١، ١٩٤٢.**

| ساڵی | ژمارەی قوتابییانی قوتابخانەی ناوەندی هەولێر | ڕێژەی گشتیی لە ژمارەی قوتابییانی قوتابخانەی ناوەندی عیراق | ژمارەی قوتابییانی قوتابخانەی ئامادەیی لە هەولێر | ڕێژەی گشتیی ژمارەی قوتابییانی قوتابخانەی ئامادەیی لە عیراق |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٠ | ٣٤٠ | ١١،٨٦٣ | ٣٠ | ٢،١٠٠ |
| ١٩٤١ | ٣٠٠ | ١٠،٦٠٩ | ٥٨ | ٢،٣١٧ |
| ١٩٤٢ | ١٩٢ | ٨،٥٩٤ | ٣٨ | ٢،٧١٥ |

(١٦٣) هەمان سەرچاوە، ل٧١.

ئەگەر دیقەتی ئەم خشتەیە بدەین بۆمان دەردەکەوێ کە هەولێر لە چاو ژمارەی دانیشتووانی لە چ ئاستێکی نزمی خوێندن و دواکەوتن لە ڕووی پەروەردەیی دەژی و بێگومانیشە کە ئەمە لە سەرتاپای شارەکانی کوردستانی باشوور ڕەنگی داوەتەوە و لە بەشەکانی کوردستانیشدا وێڕای دواکەوتنی خوێندن زمانی کوردیش لە بنەڕەتەوە قەدەغەیە و بقە بووە و بەکارهێنانی بۆ ئاخاوتن لە دامو دەزگا رەسمییەکان سزای قورسی بەدواوە بووە.

لەم سالانەی لە خشتەی ژمارە (٢٦) دیاری کراوە، ڕێژەی قوتابیانی ئامادەیی لە کەمبوونەوە دایە. هەر لەهەمان ئەو سالانەدا هیچ قوتابخانەیەکی ناوەندی و ئامادەییی کچان نەبووە و کە ئەو کاتە لە تێکڕای عیراق (١٨) قوتابخانەی کچان هەبووە و سالی ١٩٤٠ ژمارەی قوتابییە کچەکان (٢،٤٦٩) قوتابی بووە، کەچی لە سلێمانی ژمارەی قوتابییە کچەکانی قۆناغی ناوەندی سالی ١٩٤٠ (٤١) قوتابی و سالی ١٩٤٤ گەیشتۆتە (٦١) قوتابی.

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژەی ئەوە دەکەن کە وەزعی خوێندن و ڕێژەی قوتابییانی سەرەتایی لەوە باشتر نەبووە، کە لەم سالانەدا قۆناغەکانی تری خوێندن پێیدا تێ پەڕیون[١٦٤].

ئیسماعیل شوکر لە نامەی دکتۆراکەی کە تایبەتە بەشاری هەولێر و باری ڕۆشنبیریی ئەوان سالان، ئەو سالانەی گۆڕانی گەورە لە جیهان چاوەڕوان دەکراو ڕۆژهەلات لە بووژانەوەیەك بوو، مەسەلەی فیکری پێشکەوتنخوازی کاریگەریی لەسەر خوێندن و هاندان بۆ کردنەوەی قوتابخانە و خوێندەواری هەبووە، دروشمی زانست و فێربوون بەرز بوون، بەم جۆرە باس لە کوێرەوەریی شارێکی کەونارا دەکا و ڕێژەی نەخوێندەوارمان بۆ دیاری دەکا کە ڕێژەکەی لە لیوای هەولێر گەیشتووەتە ٩٦٪ لە سالی ١٩٥٢، ئەم ڕێژەیە لە هەموو ڕێژەکانی شارەکانی عێراق بەرزترە و جگەلە ناسریە کەلە دوای هەولێر دێ.

**خشتەی ژمارە (٢٧) [١٦٥]**

| ژمارەی دانیشتوانی لیوای هەولێر | نەخوێندەوار | | | خوێندەوار | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ئافرەت | پیاو | تێکڕا | ئافرەت | پیاو | تێکڕا |
| ٢٣٩،٧٧٦ | ٧٨،٢٦٣ | ١٠٧،٩٤٠ | ١٨٦،٢٠٣ | ١،٠٠٩ | ٨،٤٠١ | ٩،٤١٠ |

(١٦٤) هەمان سەرچاوە، ل٧١.

(١٦٥) هەمان سەرچاوە ، ل٧٣.

## خشتەی ژمارە (٢٨) (١٦٦)

ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییە رەسمییەکانی لیوای هەولێر

لە ساڵانی ١٩٤٨- ١٩٥٢

| ساڵ | ئەحداث | کچان | کوڕان | تێکڕا |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٨- ١٩٤٩ | -- | ٦ | ٥٠ | ٥٦ |
| ١٩٤٩- ١٩٥٠ | -- | ٦ | ٤٥ | ٥١ |
| ١٩٥٠- ١٩٥١ | -- | ٦ | ٤٠ | ٤٦ |
| ١٩٥١- ١٩٥٢ | ١ | ٦ | ٤٠ | ٤٧ |

هەر بەپێی ئەو بەراوردەی لەمەڕ ڕێژەی قوتابییانی کورد لە هەولێر چ بەپێی سەرژمێریی دانیشتووانەکەی لەچاو هەندێك شاری تر و چ بەپێی بەراورد دەگەڵ سەرجەم قوتابییانی عێراق، ئەم ڕێژەی هەولێر بەکڵۆڵی و مەینەت بۆ شارەکە و بەدواکەوتوویی هێشتنەوەی باری ڕۆشنبیریی و خوێندەواریی شارەکە دەژمێردرێ. لە خوێندنی ساڵی ١٩٥١-١٩٥٢دا هەولێر لە دوای هەموو لیواکانی تری عیراق لە ژمارە کەمی قوتابییان دێت لەچاو (٢٥٣، ١٩٩) قوتابی لە تێکڕای عیراقدا. هەروەها ئەگەر بەراوردێکیش لەگەڵ (دلیم) بکەین ئەوە دەردەکەوێ زۆر لە (دلیم)یش کەمتر بایەخ بەژمارە و ڕێژەی قوتابییانی هەولێر دراوە.

هەروەها لە ساڵی ١٩٥١-١٩٥٢ (٥،١٦١) قوتابی لە ئامادەییی ئەهلی و بێگانە و خانەی مامۆستایان و خولە پەروەدەیییەکان و قوتابخانە پیشەیییەکانی عیراق خوێندوویانە، کەچی لە هەولێردا تەنیا (٢) قوتابی توانیویانە لەم شوێنانە بخوێنن(١٦٧).

ئەگەر ئەوە وەزعی قوتابخانەکان و ئاستی خوێندن و ڕێژەی قوتابییان بووبێ، لەچاو ڕێژەی گشتیی عیراقدا، گومانی تێدا نییە کە پێداویستییەکانی خوێندن گرفتی زۆری بۆ پەرەسەندنی خوێندن دروست کردووە، نەبوونی کەرەستە و پێداویستییەکان و کەمیی ڕێژەی مامۆستا و ئاستەنگەکانی بەردەم پێگەیاندنیان و نەبوونی قوتابخانە و بنکەی پێگەیاندنی مامۆستایان کێشەیەکی گەورەی ئەو سەردەمەی هەولێر و شارەکانی تری کوردستان بووە. ساڵی خوێندنی ١٩٤٣-١٩٤٤ ژمارەی مامۆستایانی پیاو (٥٦) بووە

---

(١٦٦) هەمان سەرچاوە، ل٧٣.

(١٦٧) هەمان سەرچاوە، ل٧٦.

و له تێکرای (١٨١٣) مامۆستای پیاو له عیراقدا و (٢١) مامۆستای ئافرەت له تێکرای (٩٤٩) مامۆستای ئافرەت له عیراقدا. له ساڵی خوێندنی ١٩٥١-١٩٥٢یشدا ڕێژەی سەرجەم مامۆستای پیاو له ژمارەی (٥،٠٥١) مامۆستا له عیراق و (٣٩) مامۆستای ئافرەت لەناو (٢،٣٣٧) مامۆستای ئافرەت له گشت عیراقدا. هەروەها وەزارەتی مەعاریفی عیراق ساڵی ١٩٤٧-١٩٤٨ خانەی مامۆستایانی له شەقلاوە کردووەتەوە، بەڵام زوو دەرگایان داخستووەتەوە و[١٦٨] نەیانهێشتووە ڕووناکی ببینێت.

## ئەوانەی دەخوێننەوە

دیاردەیەکی تری شارستانی پەرەگرتنی ڕێژەی خوێندەوارانیەتی. کورد له سەرتاسەری کوردستاندا دەرفەتی لەباری بۆ هەڵنەکەوتووە ڕێژەی خوێندەوارانی زیاد بکات و ئەوانەی دەتوانن بخوێننەوە و بنووسن بگەنە ئاستی گەلانی تر و ئەو وڵاتانەی بەسەریاندا دابەش کراون.

نزیکەی ٩٠٪ی کوردی سەدەی نۆزدەم نەخوێندەوار بوون و[١٦٩] لازاریف دەڵێ: بەدەگمەن یەکێکت دەست دەکەوێ لەناو کورد بتوانێ بخوێنێتەوە و بنووسێ. ئەوەی له حوجرەی مزگەوتانیش فێری خوێندنەوە بووە، نەیانتوانیوە له چەشنی خوێندەوارێکی مام ناوەندی، یا سادەی وەکو ئەمڕۆ خۆ بگەیێنێتە ئاستی خوێنەران و پەلوپۆ بۆ بەنێو دەریای زانستدا بهاوێژن... تەنیا وای لێ هات دروشمی یەکەم (ڕۆژنامەی کوردستان ٢٢نیسان ١٨٩٨) خوێندن و فێربوون بێت... (خانی و حاجی) دوو پێشەنگی شیعری و فکری نەتەوەیی بانگەوازی خوێندن و خوێندەواری بکەن و نەزانین بنەبڕ بکەن.. کۆمەڵە و گرووپە سیاسی-کۆمەڵایەتی- ڕۆشنبیرییەکان له سەرەتای سەدەی بیستەمدا بانگەوازی خوێندن و خوێندەواری و پەرەپێدانی مەعریفەت و ئاواکردنی زانست و بەرز کردنی زانیارییان کرد و هەوڵی کردنەوەی قوتابخانە و فێرکردن و خوێندنی زمانی کوردییان داوە... له (ئەستانە و خۆی)و یەریڤان و ئینجا هەوڵەکانی ڕۆشنبیرانی ڕەوشنگەرانی گەڕاوە له ئەستەنبوڵ بۆ سلێمانی و هەوڵەکانی کۆمەڵەی زانستی و پەیدا

---

(١٦٨) هەمان سەرچاوە، ل٧٦.

(١٦٩) کە تێنۆڕین له کوردستانی باشووردا له نێوان ساڵانی ١٩٦١- ١٩٧٠ ڕێژەی نەخوێندەواری لەناو کوردان گەیشتووەتە (٨٠٪). جا ئەمە بەراورد دەگەڵ سەدەی نۆزدەم یانی هەوڵ دراوە کورد زۆر لەوە بەدواکەوتووتر بمێنێتەوە کە بیری لێ دەکرێتەوە، بڕوانە. آ.پ. عن التعليم في كردستان، ل١٩.

بوونی قوتابخانەی ڕەسمی لە بیستەکان لە هەولێر و خوێندنی زمانی کوردی و کۆششە ڕۆشنبیرییەکانی کوردانی سووریا و خوێندن لە مالان و کردنەوەی قوتابخانە و چاپکردنی کتێبی ڕێزمانی کوردی لەلایەن جەلادەت بەدرخان و توفیق وەهبی و ئەوانی تر ئاسۆی خوێندەوارییان فراوانتر دەکرد.

لەگەڵ هەموو کۆسپەکان، قوتابخانەکان هاریکار و ڕێگە خۆشکەرێکی گرینك بوون بۆ پێشکەوتنی فکری و ڕۆشنبیری ڕوناکبیرانی کورد، ڕێژەی خوێندەواری لە زیادبووندا بووە و بەپێی سەرژمێرییە گشتییاکانی کراون، ساڵی ١٩٤٧ خوێندەواران ڕێژەیان گەیشتە ٥،٦٥٪و ساڵی ١٩٥٧ گەیشتە ٨،٥٪. لە نێو پیاواندا ڕێژەکە زۆرترە (١٣،١٨٪) لەچاو ژمارەی خوێندەواران لەناو ئافرەتاندا.

بەپێی سەرژمێریی ١٩٥٧ لەهەولێر (١،١٤٣) دەتوانن بخوێننەوە و خوێندەوارییان هەیە و ئەوانەی دەتوانن بنووسن و بخوێننەوە ژمارەیان (١،١١٦) کەس بووە، ژمارەی دەرچووانی قوتابخانەی سەرەتاییش لەهەمان ساڵدا (١،١١٦) کەس و (٣٢٩) کەسیش بڕوانامەی زانکۆیان هەبووە. (٢٤) کەسیش بڕوانامەیان لە دەرەوەی عیراق وەرگرتووە و (٥٢) کەسیش ئیجازەی خوێندنی ئاینیی ناوەندییان هەیە و (١٠) کەسیش ئیجازەی خوێندین ئاینیی بالایان هەبووە.

شاری هەولێر: (٤٧٨ ) کەس توانای خوێندنەوەیان هەبووە و (٦،٦٠٥) کەسیش دەنووسن و دەخوێننەوە و (٥٨٦) کەسیش دەرچووی سەرەتایین و (٥٣٨٧) کەس دەرچووی ناوەندی و ئامادەیین. (١٢٩) دەرچووی زانکۆن و (٢)یش لە سەرووی بەکەلوریوس و (٩)ش دەرەوەی عیراق و (١٦) ئیجازەی خوێندنی ئاینیی ناوەندی و (٣)ش خوێندنی ئاینی بالایان تەواو کردووە.

شاری کۆیە: (١٤٣) کەس توانای خوێندنەوەی هەبووە ، (١،٥٩٣) کەسیش دەنووسن و دەخوێننەوە. (٢٢٠) کەس دەرچووی سەرەتایین و (١٣٤) کەسیش دەرچووی ناوەندی و ئامادەیین و (٣٢)ش دەرچووی زانکۆن و (٥) کەسیشیان بڕوانامەی سەرووی بەکالۆریۆسیان هەیە و (٤) کەسیش ئیجازەی خوێندنی ئاینیی مام ناوەندی و (١)یش ئیجازەی خوێندنی بالایان هەبووە[١٧٠].

ئەم ڕێژەیەی لەبەر چاومانە، کوێرەوەری و دواکەوتنی نەتەوەی کورد لەباری ڕۆشنبیری

---

(١٧٠) هەمان سەرچاوە، ل٧٩.

و خوێندەواری دەگەیەنێ، ڕاستە لە ڕۆژهەڵاتدا (نەخوێندەواری و نەخۆشی) دوو پەتای قورس، بۆ کوردیش ئەم پەتایە بەدوو شێوە قورستر بووەتەوە. چ لەوەی نەتەوەکەی قەدەغە و لەتوپەتە و کیانی نییە، چ لەوەی زمانی زگماکیشی قەدەغەیە دابەشبوونی دانیشتووان بەپێی ئاستی خوێندەواری بەڵگەیەکی کۆمەڵایەتیی شارستانییە و ئەم دابەش بوونەش بەپێی بڕوانامە و ئاستی خوێندەوارییەکە جیاوازە، کرداری فێرکردنیش ڕێگایەکە بۆ بەردەوامبوونی ڕەوتی خوێندن و بەرز بوونەوەی پلەی زانیاری. لەم ڕوانگەیەوە سەرنج لە پەرەسەندنی ئاستی خوێندەواریی نێوان ساڵانی (١٩٥٧-١٩٨٧) لە شاری هەولێر دەدەین، بەتایبەتیش دوای زۆر بوونی ژمارەی دانیشتووانی شار بەهۆی کۆچکردن و زیاد بوونی ژمارەی منداڵبوون وەکو لەم خشتەیە بەدیار دەکەوێت.

**خشتەی ژمارە (٢٩)** [١٧١]

دانیشتووانی پارێزگای هەولێر بەپێی دابەشبوون

| ساڵ | دەشت٪ | شار٪ | شاری هەولێر٪ |
|---|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ٢٦،٧ | ٧٣،٢ | ١٤،٦ |
| ١٩٨٧ | ٧٧،٤ | ٢٢،٦ | ٥٧،٨ |

لە سەرژمێریی عیراقدا ساڵی ١٩٥٧ ڕێژەی دانیشتووانی شارو شارۆچکەکانی سەر بەلیوای هەولێر نزیکەی ٢٧٪ بوو لەچاو کۆی دانیشتووانی هەموو لیواکە ڕێژەی دانیشتووانی دەشت ٧٣٪ بوو ، شاری هەولێر بەتەنیا ١٥٪ی کۆی هەموو دانیشتووانی پارێزگاکە بوو، کەچی لەسەر ژمێری ١٩٨٧ ڕێژەی دانیشتووانی شار و شارۆچکەکان بووە نزیکەی ٧٧٪ و دانیشتووانی دێیەکان بووە ٢٣٪ و ڕێژەی شاری هەولێریش بەتەنیا بووە ٥٨٪ لەکۆی دانیشتووانی پارێزگاکە.

ئەگەر لەم خشتەیە بنۆڕین کە بۆ ڕێژەی خوێندەواری و نەخوێندەواریی شاری هەولێر دروست کراوە، بۆمان دەردەکەوێ بەپێی سەرژمێریی ١٩٥٧ لە پارێزگای هەولێر نزیکەی ٧٠٪ کۆی دانیشتووان نەخوێندەوار بووە. بەڵام لەسەرژمێری ١٩٨٧ دابەزیوە بۆ ڕێژەی ٣٩٪ کە لەماوەی سی ساڵدا (٣١٪)ی ڕێژەکە دابەزیوە.

(١٧١) گۆڤاری هەولێر، ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی زۆربوونی دانیشتووانی شاری هەولێر لە نێوان سەرژمێری ساڵانی ١٩٥٧-١٩٨٧، عبدالحمید غفور ابراهیم، ژ (١) نیسانی ١٩٩٩. ل١٦٣.

لەسەرەتای حەفتاکاندا گۆڕانێکی گەورە لە بواری فێرکردن و پەروەردە و پەرەسەندنی بواری ڕۆشنبیری و خوێندەواری هاتە ئاراوە. سەرباری هەوڵەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری ژمارەیەکی زۆر قوتابخانەی کوڕان و کچان و تێکەڵ لەشار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستان کرانەوە.

**خشتەی ژمارە (٣٠)** [١٧٣]

ڕێژەی نەخوێندەواری لەپارێزگای هەولێر ١٩٥٧-١٩٨٧

| ساڵ | |
| --- | --- |
| ١٩٥٧ | ٧٠،١ |
| ١٩٨٧ | ٣٩،١ |

بەهۆی ئەو هەلومەرجە سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیرییەی لە دوای ڕێککەوتنی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ دروست بوو، خوێندەوەاری لە زۆر ڕوی خوێندەواری کوردستان بەرەوپێشەوە هەنگاوی نا، هەولێریش گەلێك بەرەو پێشەوە چوونی لەم ڕووەوە بەخۆیەوە بینی، کەبووە هۆی ئەوەی نەك تەنیا (٣٠٪) ڕێژەی نەخوێندەواری کەم بێتەوە، بەڵکە ژمارەیەکی زۆر ڕۆشنبیر و نووسەر و پسپۆڕ و بڕوانامەی زانستی و ئەدیب و کەسانی خوێندەوار لە مەیدانەکە وەدیارکەوتن. ئەگەر لە ساڵی ١٩٤٧ ژمارەیەکی ئەکجار کەم خوێندەوار و کەسانی هەڵگری فکری ڕۆشنبیری و قەڵەم و ئەهلی کتێبمان هەبوو بێ، ئەوە دوای ئەو ساڵە وەکو تەقینەوەی کانیی بەهاران وەرچەرخان دروست بوو.

بەپێی سەر ژمێریی ١٩٥٧ خاوەن بڕوانامەکانی سەرەتایی (٦،٥٪)بوون و قۆناغی ناوەندی (١،٨٪) و دواناوەندی و پیشەیی و بەکەلۆریوس کەمتر لە (١) و ماستەر (٠،٠٠٧٪) بوون کەچی ساڵی ١٩٨٧ گۆڕانێکی دیار بوو. لە پارێزگای هەولێر و شاری هەولێر قۆناغی سەرەتایی (١٠،٥٪) و ناوەندی (٢،٦٪) و دواناوەندی (١،٥٪) و پیشەیی (١،٧٪) بەکالوریوس (١،٥٪) و ماستەر (٠،٠٣٪) و دکتۆرا (٠،٠١٪) گۆڕانی بەرەوپێشەوەی کردووە. وەکو لە خشتەی ژمارە (٣١)دا ڕوون دەبێتەوە.

---

(١٧٣) هەمان سەرچاوە.

### خشتەی ژمارە (٣١) (١٧٤)

### ڕێژەی خاوەن بڕوانامەکان لە پارێزگای هەولێر ١٩٥٧- ١٩٨٧

| بڕوانامە | ١٩٥٧ ٪ | ١٩٨٧ ٪ |
|---|---|---|
| سەرەتایی | ٦،٥ | ١٠،٥ |
| ناوەندی | ١،٨ | ٢،٦ |
| دواناوەندی | ٠،٨ | ١،٥ |
| پیشەیی | ٠،٦ | ١،٧ |
| بەکەلوریوس | ٠،٥ | ١،٥ |
| ماستەر | ٠،٠٠٧ | ٠،٠٣ |
| دکتورا | ٠،٠٠١ | ٠،٠١ |

لە خشتەیەکی تردا بەم جۆرە ژمارەکانی قوتابخانەی و قوتابییانمان لە نێوان ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٥ و ١٩٧٩-١٩٨٠ بۆ دەردەکەوێ. ئەو ساڵانەی لە دوای ڕووخانی شۆڕشی کورد لە دوای خیانەتی ٦ ی ئازاری١٩٧٥ لە کورد کرا، خوێندنیش گۆڕانی بەسەردا هات و بەبارێکی تایبەت و نائارامیدا تێ پەڕی. دەبینین لەڕووی ژمارەوە گۆڕانی زۆر لەو ماوەیەدا بووە، ژمارەی قوتابخانە و قوتابییەکان زۆر بووە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا لەو کاتەدا حکوومەت بڕیاری گۆڕینی خوێندنی بەزمانی کوردی دەرکرد پرۆگرامەکانی خوێندن لەسەر ئامانجەکانی خۆیان تەسك کرابووەوە.

### خشتەی ژمارە (٣٢) (١٧٥)

| قوتابخانە | ژمارەی قوتابخانەکان ١٩٧٤-١٩٧٥ | ژمارەی قوتابخانەکان ١٩٧٩-١٩٨٠ | ژمارەی قوتابییان ١٩٧٤-١٩٧٥ | ژمارەی قوتابیان ١٩٧٩-١٩٨٠ |
|---|---|---|---|---|
| باخچەی ساوایان | ٦ | ٣٦ | ٩٠٧ | ٤٧١٠ |
| سەرەتایی | ٥٥٣ | ٢٤٢٠ | ٨٦٥٩٨ | ٢٩٤٨١٦ |
| ناوەندی و ئامادەیی | ١١٨ | ٢٨١ | ٢١٦٤٧ | ٦٣٢٥٧ |
| قوتابخانە پیشەییەکان | ٧ | ١٧ | ١٦٥١ | ٨٢٠٥ |
| ئامۆژگا و دەزگای مامۆستایان | ٣ | ٧ | ٢٧٩٠ | ٢٩٨٤ |
| ئامۆژگای ئایینی سەرەتایی و ناوەندی | ٣ | ١٤(٧)سەرەتایی | ١٢٢ | ٢٨١٤ |
| قوتابخانەی تازە پێگەیشتووان | -- | ٦ | -- | ٨٢٥ |

(١٧٤) هەمان سەرچاوە.

(١٧٥) گۆڤاری ڕۆشنبیریی نوێ، ژ (٨٧) تەمموزی ١٩٨١، ل١٦.

لە خشتەیەکی تردا باری خوێندنی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦مان بۆ دەردەکەوێ هەرچەندە ئەو کات لە قەیرانی بارودۆخی نالەباری دوای نسکۆی شۆڕشی کوردە. باری خوێدن شلۆق و نالەباریشە.

لە خشتەیەکدا بارودۆخی ئەوکاتی خوێندن لە پارێزگای هەولێر دا سازێنراوە.

خشتەی ژمارە (٣٣) (١٧٦)

پەرەسەندنی واقیعی خوێندنی دواناوەندی ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦

| ساڵ | ژمارەی قوتابخانە | | | ژمارەی قوتابی | | | ژمارەی مامۆستایان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | تێکڕا | نێر | مێ | تێکڕا | نێر | مێ | تێکڕا |
| ١٩٧٦-٧٥ | ٤٣٣ | ١٥٤ | ٥٨٦ | ٤٢٩٤١ | ١٦٤٩٣ | ٥٩٤٣٤ | ٢٣٤٩ | ١٠٧٢ | ٣٤٢٧ |
| ١٩٧٤-٧٣ | ٤٠٣ | ١٤٠ | ٥٤٣ | ٣٦٥١١ | ٩٦٠٧ | ٤٦١١٨ | ٢٠٦٥ | ٨٤٧ | ٢٩١٢ |
| زیاد بوون | ٢٩ | ١٤ | ٤٣ | ٦٤٣٠ | ٦٨٨٦ | ١٣٣١٦ | ٢٨٤ | ٢٣١ | ٥١٥ |

(١٧٦) مجلة الثقافة الجديدة، تطور التعليم في محافظة اربيل، على سامي، العدد ٨٧ تشرين الثاني ١٩٧٦. ل٥٩-٦٥ . ڕێژەی ئافرەتان لەم قۆناغە (٢٧،٧٥٪)ە وەهی مامۆستا ئافرەتەکانیش (٣١،٢٨)ە.

دەبینین ئافرەتان بەڕێژەی (٥١،٧٪) کە نیوەی ڕێژەکە پترە زیادیان کردووە. لەقۆناغی دواناوەندیدا ڕێژەی ئافرەتانی قوتابی (٢٩،٤٪) و مامۆستای ئافرەتیش (٣٥،٧٪) پێکدەهێنن. ڕێژەی زیاد بوونی ژمارەی قوتابیە کچەکان (٧٢،٠٪) پێکدەهێنێت. لەو کاتەدا لە ١٩٧٤ مانگی ئازار ژمارەیەکی زۆری مامۆستایانی کورد چوونە ریزی شۆڕش و هەروەها ژمارەیەکی زۆری قوتابییانیش لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکوومەت و لەسایەی شۆڕش مانەوە تا نسکۆی ١٩٧٥. هەر لەخوێندنی ساڵی ١٩٧٥- ١٩٧٦ ژمارەیەکی زۆر بۆشاییی مامۆستایان پەیدا بوو کە بۆ هەر (١٢٧) قوتابی یەك مامۆستا هەبوو. کەمیی بینای قوتابخانە و ژمارەی مامۆستایان بەزەقی بەڕەوشی ئەو کاتەوە دیاربوو.

خشتەی ژمارە (٣٤) [١٧٧]

پەرەسەندنی واقیعی خوێندنی دواناوەندی ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ لە پارێزگای هەولێر

| ساڵ | ژمارەی قوتابخانە | | | ژمارەی قوتابی | | | ژمارەی مامۆستایان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | تێکڕا | نێر | مێ | تێکڕا | نێر | مێ | تێکڕا |
| ١٩٧٦-٧٥ | ٥٤ | ١٣ | ٦٧ | ١١٥٤٧ | ٤٨١٠ | ١٦٣٥٧ | ٣٥٦ | ١٩٨ | ٥٥٤ |
| ١٩٧٤-٧٣ | ٥٠ | ١٠ | ٦٠ | ١٠٨٣٥ | ٢٩٧٩ | ١٣٨١٤ | ٢٨٣ | ١٢٦ | ٤٠٩ |
| زیاد بوون | ٤ | ٣ | ٧ | ٧١٢ | ١٨٣١ | ٢٥٤٣ | ٧٣ | ٧٢ | ١٤٥ |

هۆکارەکەلەکەبووەکانی خوێندنی ئەوکات سەرباری کەمی ژمارەیی مامۆستا و ژمارەی قوتابخانەکان بریتی بوون، لە هۆکارێکی هەمیشەیی کە پلەی سەرەکی لە ئەنجامی نەبوونی پێویستە ئامادەکراوەکان لە سەرەتای ساڵی خوێندن و نەبوونی بەرنامە و نەخشەدانان لە دابەشکردنی کادر و مامۆستاکان لە نێوان هەموو ناوچە جیاکانی شارەکاندا بوو. حاڵەتێکی تر کە جێگەی ئەو بۆشاییە گەورەی لەو کاتەدا مامۆستا دروستیان کردبوو لە ئەنجامی گواستنەوەی ژمارەیەکی زۆری مامۆستایان بوو بەهۆی بەشداری کردنیان لە شۆڕش بۆ ناوچە دوورەکانی خواروو و ناوەڕاستی عێراق، یا دوورخستنەوەیان لە بواری پەروەردە.

---

(١٧٧) مجلة الثقافة الجديدة، تطور التعليمي في محافظة اربيل، على سامي، العدد ٨٧ تشرين الثاني ١٩٧٦، ٥٩-٦٥.

## خشتەی ژمارە (٣٥) (١٧٨)

### چۆنییەتی دابەشکردنی قوتابخانەکان لە نێوان گوند و شار و ناوچەکانی تری پارێزگای هەولێر لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٥ –١٩٧٦ دا.

| ناوچە | ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکان | | ژمارەی قوتابخانەی ناوەندی | | ژمارەی قوتابخانەی دواناوەندی | | ژمارەی قوتابخانەی ئامادەیی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان | کچان |
| ناوەندی هەولێر | ٥٩ | ٤٠ | ١٠ | ٥ | ٤ | ٢ | ٣ | ١ |
| قەزای ناوەندی هەولێر | ش | ٥٥ | ٧ | – | ١ | ١ | – | – |
| قەزای مەخموور | ١٠٣ | ٢٥ | ٧ | ١ | ٤ | – | – | – |
| قەزای شەقلاوە | ٥٧ | ٨ | ٣ | – | ٢ | ١ | ١ | – |
| قەزای کۆیسنجق | ٣٤ | ١٨ | ٥ | – | ١ | ١ | – | – |
| قەزای رواندز | ٣٠ | ٥ | ٢ | ١ | ١ | – | – | – |
| قەزای زێبار | ١٣ | ١ | ١ | – | – | – | – | – |
| قەزای چۆمان | ٣١ | ٢ | ١ | – | ١ | – | – | – |

لەم خشتەیەدا دەردەکەوێ کە دابەشکردنێکی نایەکسانی قوتابخانەکان لە قۆناغەکانی خوێندن هەیە، کە لەگەڵ پێویستییەکانی ناوچە جیاوازەکان ناگونجێ. جیاوازی لە نێوان کوڕان و کچان زۆر زەقە و هەروەها (٦٦٪)ی قوتابخانە سەرەتاییەکانی لە ناوەندی

---

(١٧٨) ثقافة الجديدة العدد (٨٧) تشريني الثاني ١٩٧٦.

هەولێر و قەزای مەخموور و قەزای ناوەند کۆکراوەتەوە و (٢٠٪)ی لە قەزای شەقلاوە و کۆیە و (١٤٪)ش کەوتووەتە قەزای ڕواندوز و چۆمان و زێبار. و لە قۆناغی ناوەندی (٧٠٪)ی لە ناوەندی هەولێر و قەزای مەخمور و قەزای ناوەند (٢٠٪)ی لە قەزای شەقلاوە و کۆیە و (١٠٪)شی کەوتووەتە قەزاکانی ڕواندز و زێبار و چۆمان. سەبارەت بەخوێندنی دواناوەندییش هەروایە لە کۆی (١٩) قوتابخانەی دواناوەندی (١٠)یان لە ناوەندی هەولێر و (٦)شیان لە قەزای مەرکەز و قەزای شەقڵاوە و کۆیە. یەك قوتابخانەی دواناوەندییش لە ڕواندز و چۆمان هەبووە. بەهەموو پارێزگاکەش تەنیا (٥) قوتابخانەی ئامادەیی هەبووە، (٤) یان لە ناوەندی هەولێر و پێنجەمیان لە قەزای شەقڵاوە بووە. لە تەواوی ناوچەکانی تر قوتابخانەی ئامادەیی لەو کاتدا نەبووە.

**خشتەی ژمارە (٣٦) (١٧٩)**

باس لە دابەشکردنی قۆناغەکانی خوێندن لە ساڵانی ١٩٧٨-١٩٩١ لە شاری هەولێر دەکا بەپێی پێداویستیی قوتابخانە بۆ مامۆستایان

| | ساڵ | باخچەی ساوایان | قۆناغی سەرەتایی | قۆناغی دواناوەندی | قۆناغی پیشەیی | قۆناغی پێگەیاندنی مامۆستایان | قۆناغی پەیمانگا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێکڕای قوتابی بۆ قوتابخانەکان | ٧٨-١٩٧٩ | ١٣٦ | ١٠٣ | ٢٩٤ | ٦٠٦ | ٦٠٨ | - |
| | ٨٥-١٩٨٦ | ٧١ | ١٩٩ | ٣١١ | ٣٤٨ | ٨٦١ | ١٥٦٤ |
| | ٩٠-١٩٩١ | ٧٥ | ٣٥٠ | ٣٥٠ | ٣٥٨ | ٩٤٢ | ٧١١ |
| تێکڕای قوتابی بۆ مامۆستا | ٧٨-١٩٧٩ | ٢١ | ٢٢ | ٣٠ | ١٨ | ٢٣ | - |
| | ٨٥-١٩٨٦ | ١٢ | ١٧ | ٢٦ | ١٣ | ٤٦ | ٣٩ |
| | ٩٠-١٩٩١ | ٦ | ٢٣ | ٢١ | ١٠ | ٢٦ | ١٧ |
| تێکڕای قوتابی بۆ هۆبە | | ١٢ | ٢٥ | ٣٠ | ٢٥ | ٣٦ | ٤١ |

(١٧٩). صلاح محمد حفيد، (الوضع الاقتصادي في كردستان العراق وأهم مشاكله) هەولێر، ١٩٩٣، ص٩٣ لە خوێندنی ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ ئەم بڕیارانە بۆ چاپکردنی باری خوێندن لە شاری هەولێر دراون.=

لەم خشتەیەشدا بۆمان دەردەکەوێ ژمارەی قوتابییانی بەرامبەر ژمارەی پێویستیی قوتابخانەکان زۆر زیادی کردووە، کە قۆناغی سەرەتایی ساڵی خوێندنی (١٩٧٨-١٩٧٩) (١٠٣) قوتابی قوتابخانەیەکی بەرکەوت، کەچی لە ساڵی خوێندنی (١٩٩٠-١٩٩١) گەیشتە (٣٥٠) قوتابی کە ڕێژەکە دوو هێندەو نیو بووەتەوە، لە دواناوەندییش لە (٢٩٤) قوتابی ساڵی (١٩٧٨-١٩٧٩) بووەتە (٣١١) لە ساڵی (٨٥-١٩٨٦) و (٣٥٠) لە ساڵی (١٩٩٠-١٩٩١). پێگەیاندنی مامۆستایانیش بەهەمان شێوە لە (٦٠٨ بووەتە ٨٦١ و ٩٤٢) لە هەرسێ ساڵی خوێندنی دیاریکراودا. ڕێژەی قوتابییش بۆ هەر مامۆستایەك وایە، لە هەندێکیان وەکو سەرەتایی لە (٢٢) بۆ (٢٣) و لە پێگەیاندنی مامۆستایانیش لە (٢٣ بووەتە ٢٦)، بەڵام لە هەندێك قۆناغی تری خوێندن دابەزیوە. بەمە دەردەکەوێ لە کوردستاندا خوێندن و پەروەردە لە ئاستێکی دیاریکراو نەڕۆیشتووە و پەشێوی و هەڵچوون و داچوونی زۆری پێوە دیارە.

---

=١- کردنەوەی دووبارەی (١٥٢) قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی.

٢-گێڕانەوەی (٤٤٦) مامۆستای سەرەتایی و ناوەندی بۆ مووچەکانیان.

٣- دیاری کردنی (٤٥٨٦٤)دینار بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکان و پێویستییەکانی قوتابی و چاککردنەوەی قوتابخانە و کڕینی شتە سەرەکی و پێداویستییەکان و تاقیگە.

٤- (١٠) سەیارە درا بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی هەولێر بۆ هەڵسووڕانی کاروبارەکانی.

٥- بڕیار دانی کردنەوەی (١٣٠) قوتابخانەی سەرەتایی پاش دابینکردنی خاڵەکانی پێویستی دامەزراندن.

٦- دانانی پێویستییەکانی (١٥) قوتابخانە لە کەرەستە و شتی سەرەکیی پێویست

٧- دیاریکردنی (١٣٠) پلە بۆ دامەزراندن.

٨- کردنەوەی خانەی مامۆستایان و خانەی مامۆستایانی کچان و ئامادەیی بازرگانی.

بڕوانە الثقافة الجديدة العدد (٨٧) تشرين ثاني ١٩٧٦.

**خشتەی ژمارە (٣٧) (١٨٠)**

ژمارەی قوتابی و منداڵانی تەمەنی خوێندن لە قۆناغی سەرەتایی و دوای سەرەتایی لە شاری هەولێر ساڵی ١٩٨٧.

| قۆناغ | ساڵی خوێندنی ١٩٨٧ | |
|---|---|---|
| سەرەتایی | ژمارەی قوتابخانەکان<br>ژمارەی قوتابییەکان<br>ژمارەی منداڵان لە تەمەنی (٦-١١) ساڵی | ٣٨٨<br>١٠٥٨٠٣<br>٢٠٢٢٢٠ |
| دوای قۆناغی سەرەتای، ناوەندی، دواناوەندی، پیشەییەکان و خانەی مامۆستایان و پەیمانگای مامۆستایان | ژمارەی قوتابخانە<br>ژمارەی قوتابی<br>ژمارەی ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان (١٢-١٧) ساڵی | ١٢٢<br>٣٧٤٢٤<br>١١٦٩١٢ |

بەپێی ئەو خشتەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ ژمارەیەکی یەکجار زۆری منداڵ لە تەمەنی خوێندن دانە و لە خوێندن بێ بەش کراون، چونکە ئەوانە تەمەنیان لە نێوان (٦-١١) ساڵییە (٢٠٢٢٢٠) منداڵی، تەنیا (١٠٥٨٠٣) چوونەتە بەرخوێندن، واتە (٤٧،٧٪)ی لە خوێندن دابڕاون، یاخود نەنێردراونەتە بەرخوێندن.

لە قۆناغی دوای سەرەتاییش ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان (١٢-١٧) ساڵییە ژمارەیان گەیشتووەتە (١١٦٩٢١) کەچی تەنیا (٣٧٤٠٤) کەس لەبەر خوێندن، واتە (٧٩٤٤٨) کەسیان نەچوونەتە بەرخوێندن کە دەکاتە (٦٨٪) ئەوانەی لەم تەمەنەدا لە خوێندن نین.

لە خشتەی ژمارە (٣٨)یشدا ئاستی بالاتری خوێندن و ڕێژەی قوتابیان دەردەکەوێت، خشتەکە لە خوێندنی ساڵی ١٩٨٥-١٩٨٦ دەکا، بەدیقەت دەردەکەوێ قوتابییە کوردەکان زۆر کەم، یا کەمترین ڕێژەیان لە کۆلیژی یاسا و پزیشکی وەرگیراون. هەندێك کۆلیژیش هەبوون بەدەگمەن قوتابیی کوردیان وەرگرتووە، وەکو عەسکەری و فڕۆکەوانی و پۆلیسی و ڕاگەیاندن.

---

(١٨٠) د. صلاح محمد حفید، ل٩٧.

## خشتەی ژمارە (٣٨)[١٨١]

ڕێژەی قوتابییان لە کۆلیژەکان و ژمارەی هەرقوتابییەك بۆ مامۆستایەکی زانکۆ ساڵی خوێندنی (٨٥-١٩٨٦).

| کۆلیژەکان | ڕێژەی قوتابییەکان لەهەر کۆلیژێك | تێکڕای قوتابیان بۆ هەر مامۆستایەك |
|---|---|---|
| کۆلیژی پزیشکی | ٪٨،٧ | ١٧ |
| کۆلیژی ئەندازە | ٪١٢،٦ | ١٩ |
| کۆلیژی کشتوکاڵ | ٪١١،١ | ٥ |
| کۆلیژی زانستی | ٪١٧ | ١١ |
| کۆلیژی ئیدارە و ئیقتصاد | ٪١٧،٨ | ٤٩ |
| کۆلیژی پەروەردە | ٪١٥،٣ | ١٥ |
| کۆلیژی ئەدەبیات | ٪١٦،٥ | ٣٦ |
| کۆلیژی قانون | ٪١ | ١٥ |
| تێکڕا | ٪١٠٠ | ٢١ |

لەخشتەی ژمارەی (٣٩) وەزعی خوێندن لەشاری هەولێر لە هەموو قۆناغەکان لە ساڵی خوێندنی (١٩٧٦-١٩٧٧) دەردەخا، ئەم خشتەیە ڕێژەی ژمارەی قوتابخانە و ئەو قوتابی و مامۆستا و قوتابخانە تازە کراوەکان پیشان دەدا.

---

(١٨١) د. صلاح محمد حفید، ل٩٦.

**خشتەی ژمارە (٣٩) (١٨٢)**

**سەرژمێرییەك دەربارەی چالاكیی پەروەردەی پارێزگای هەولێر ١٩٧٦-١٩٧٧.**

| قۆناغی خوێندن | ژمارەی قوتابخانە | بینا دروستكراوەكان بۆ قوتابخانەكان ١٩٧٤-١٩٧٧ | ژمارەی قوتابخانەكان، ئەوانەی تازە كراونەتەوە | ژمارەی قوتابییانی ساڵی خوێندنی ٧٦-١٩٧٧ | | ژمارەی ئەندامانی بنەماڵەی دەرس وتنەوە ٧٦-١٩٧٧ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | كوڕ | كچ | كوڕ | كچ |
| باخچەی ساوایان | ١٣ | – | ٧ | ٦٨٦ | ٦٤٤ | – | ٧١ |
| سەرەتایی | ٦١٦ | ٧٨ | ٤٨ | ٤٥٦٠٩ | ٢٠٢٥٤ | ٢١٧١ | ١١٤٦ |
| ناوەندی و سانەوی و ئامادەیی | ٦٩ | ١٤ | ٥ | ١٣٠٥٦ | ٣٧٨٧ | ٣٨٨ | ٢٢٣ |
| ئامادەییی پیشەسازی | ١ | – | – | ٦١٨ | – | ٤٢ | – |
| ئامادەییی كشتوكاڵ | ١ | – | – | ٥٦٩ | – | ٤١ | – |
| ئامادەییی بازرگانی | ١ | – | – | ٢٤٥ | ١١٣ | ١٦ | ٨ |
| خانەی مامۆستایان | ١ | – | – | ٧٦٨ | – | ١٤ | ٤ |
| خانەی مامۆستایانی كچ | ١ | – | – | – | ٧٦٥ | – | ٣١ |
| پەیمانگای مامۆستا كوڕ و كچەكان | ١ | – | – | ٤٦٤ | ٤٨٨ | ٢٧ | ٧ |
| پەیمانگای ئیسلامی | ١ | – | – | ٨٦ | – | ٧ | – |

تێبینی: ١- ژمارەی ئەو قوتابخانانەی خۆراكیان تیادا دابەش دەكرێ (١٥٠) قوتابخانەیە.
٢- ژمارەی مەڵبەندی قەڵاچوكردنی نەخوێندەواری لە پارێزگاكە (١٤٦) مەڵبەند و ٥٢٢٢ كەس تیایدا دەخوێنن.

(١٨٢) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارەكەی بەسەرەوە نەماوە. ل ٤٤ .

## خشتەی ژمارە (٤٠) (١٨٣)

## وەزعی خوێندن لە شاری هەولێر لە نێوان سالآنی (٧٩-١٩٩١)

| قۆناغی فێرکردن | | سالّەکان | | |
|---|---|---|---|---|
| | | ١٩٧٩-٩٧٨ | ١٩٨٥-٩٨٤ | ١٩٩١-٩٩٠ |
| باخچەی ساوایان | ژمارەی باخچەکان | ١٧ | ٣٦ | ٣٥ |
| | ژمارەی منداڵان | ٢٣١٩ | ٢٥٦٣ | ٢٦٤٤ |
| | ژمارەی مامۆستایان | ١٠٩ | ٢١٨ | ٢١٤ |
| قۆناغی خوێندنی سەرەتایی | ژمارەی قوتابخانەکان | ٩٣١ | ٤٩٨ | ٤٤٨ |
| | ژمارەی قوتابی | ٩٥٩٩٥ | ٩٩١٨٨ | ١٥٦٧٤٩ |
| | ژمارەی دەستەی مامۆستایان | ٤٣٠٧ | ٥٨٠٦ | ٦٦٨٦ |
| خوێندنی قۆناغی پیشەیی | کشتوکاڵ | ٢ | ١ | ١ |
| | پیشەسازی | ٢ | ٨ | ٨ |
| | بازرگانی | ٢ | ٣ | ٤ |
| | تێکڕا | ٦ | ١٢ | ١٣ |
| | ژمارەی قوتابی | ٣٦٣٤ | ٤٥٣٧ | ٤٦٥٧ |
| | ژمارەی مامۆستایان | ٢٠٤ | ٣٥٩ | ٤٦١ |
| قۆناغی خوێندنی دواناوەندی | ژمارەی قوتابخانەکان | ٧٧ | ١٠٥ | ١٣١ |
| | ژمارەی قوتابیان | ٢٢٦٤٥ | ٣٢٦٨٤ | ٣٧٦٥١ |
| | ژمارەی مامۆستا | ٧٥٣ | ١٢٣٨ | ١٧٨٢ |
| خانەی مامۆستایان و پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی کور و کچ | ژمارەی خانەکانی پەیمانگا | ١+٢ | ٢ | ٢ |
| | ژمارەی قوتابی | ٥٣٢+١٢٩٢ | ١٧٢٢ | ١٨٤٩ |
| | ژمارەی مامۆستا | ٣٣+٤٦ | ٤٨ | ٧١ |
| پەیمانگای هونەری | ژمارەی پەیمانگا | — | ١ | ١ |
| | ژمارەی قوتابییەکان | — | ١٥٦٤ | ٧١١ |
| | ژمارەی مامۆستایان | — | ٤٠ | ٤٣ |
| زانکۆ | ژمارەی زانکۆکان | — | ١ | ١ |
| | ژمارەی قوتابی | — | ٥٨٢١ | ٨٤٢٨ |
| | ژمارەی مامۆستا | — | ٥٤٣ | ٥٥٩ |

---

(١٨٣) د. صلاح محمد حفيد، الوضع الاقتصادي في كردستان العراق، ل٨٩.

## دوو وێنەی خوێندن لە پارێزگای هەولێر

بۆ پتر سەرنجدانە باری خوێندن لە شاری هەولێر و تەواوی پارێزگاکە، بەپێویستمان زانی وێنەی دوو هەوڵی خوێندن لە گوندی عەوێنە لە چلەکانی سەدەی بیست و بەحرکە لەهەمان ماوەدا بخەینە سەر باسەکەمان، کە لێرە و لەوێش نموونە و وێنەی تری ئەم بابەتە گەلێك زۆرن و پێویستییان بەتۆمارکردن و پێداچوونەوە هەیە. بەو ئاراستەیەی هەر هەوڵێکی خوێندن و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بەشێکی لە مێژووی ڕۆشنبیر و خوێندەواری کورد پێك دەهێنن، پێش لەبیرچوونەوە وەکو بیرەوەری و مێژوو تۆمار بکرێن... ڕەنگە ئەم حاڵەتانە لە ژمارەیەکی یەکجار زۆری قوتابخانە و گوند و ناوچە هەمە جۆرەکانی کوردستانیش بن.

## قوتابخانەی عەوێنە و پێداگرتن لەسەر خوێندن

کەم وا ڕێك کەوتووە ئاغا، یا کوێخای گوندێك لە چلەکانی کوردستاندا بەجۆری (حەسەن ئاغای عەوێنە) پێ لەسەر دانانی قوتابخانە و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری داگرێ و بەزانست و فێربوون ژمارەیەك گوندی تریش بەو چرایە ڕوون کاتەوە کە لە گوندی خۆی دایگیرساندبوو.

(حەسەن ئاغای عەوێنە ۱۹۰۷-۱۹٦۰) کە راپرسێکی بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە عەوێنە بەخزمەکانی کرد، دژی وەستان، وەڵێ ئەو پێی داگرت و لە کاتی مەولوود خوێندندا ڕایگەیاند کە قوتابخانە دەکاتەوە، ئەوەی حەز ناکات با بە(۲٤) سەعاتی تر ماڵی لە عەوێنە بار بکات و نەمێنێ.

بەم جۆرە لە (۱/۱۰/۱۹٤٦) یەکەم قوتابخانە لە سایەی هەڵوێستی ئەم پیاوە لە دێی عەوێنە کرایەوە و بڕیاریش درا ئەوەی منداڵی لە تەمەنی (٦-۱۰) ساڵانەی هەیە بینێرێتە بەر خوێندن، ئەگەر نا دەبێ بار بکات. بەپێی سەربردەکانی دەیگێڕنەوە (کوڕ و کچ) هەژار و دەوڵەمەند لەسەر یەك جۆر پەیڕە و پڕۆگرام و پەروەردە کردن و لەیەك هۆبە بەرامبەر مامۆستا دانیشتن(۱۸٤).

---

(۱۸٤) گۆڤاری هەولێر، عەوێنە مەڵبەندی ڕۆشنبیریی دەشتی هەولێر، جەلال سنجاوی، ژمارە (٥) زستانی ۲۰۰۰، ل٦۸.

دەڵێن لە تەك ئەوەشدا، ئێواران قوتابخانەیەكی تریش بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری بۆ گەورە و بەساڵاچووەكان كرایەوە و دەوامی دەكرد.

كەریم ڕەئوف عارف (كەریمە فەندی) یەكەم بەڕێوەبەر و مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بووە. هەروەها سەید كەمال محەمەد عەلی (١٩٢٧-١٩٩٩/٥/٧) كە پێشتر لە ساڵی ٤٥-١٩٤٦ بەڕێوەبەری قوتابخانەی گەلاڵە بووە، دێتە ئەم قوتابخانەیە تازە و (١٠) ساڵی ڕەبەق بەڕێوەبەر و مامۆستای قوتابخانەی عەوێنە بووە. ئەم مامۆستایانەش لە چل و پەنجاكان تێیدا مامۆستا بوون (كەریم ڕەئوف عارف، سەید كەمال محەمەد عەلی، تەها ئەفەندی، بویا جویرائیل، مەنسوور مەربین، عەبدولباقی و جەمال عوسمان...).

لەم گوندانەش ئەو كات منداڵ دەنێردرانە قوتابخانەی عەوێنە (عەلی مەلا داود، سیراوە، پێمەڕە، شێخ شەروان، بەرزە هەوار، زەمزەمۆك، تەڕاش، سەید ئەمین، ماجیداوە، زاگە...)

دیارە باسی ئەم قوتابخانەیە بۆیە هاتە گۆڕێ تا بەشێكی بچووك لە كۆششەكانی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری تۆمار بكەین، هەروا ڕۆڵی هەندێك كەس بۆ هاندانی خوێندن لەبیرنەكرێ و ئەوەش بكرێتە بەراورد دەگەڵ ژیانی پڕ مەینەت و دواكەوتووی ئەو گوندانەی كە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ خوێندن ئاشنا نەبوون و دەرفەتیان پێ نەدراوە سوود وەرگرن، چونكە هەبوونە حەزیان لە وریا بوونەوە و كرانەوەی چاو و مێشكی كوڕە جوتیار و ڕەشو ڕووتی گوندی نەكردووە تا هەر بەگوێڕایەلی و دواكەوتوویی بمێننەوە.

ساڵنامەی (ویلایەتی مووسڵ) بەم جۆرە باسی هەولێری لە ساڵی (١٣٠٨ك-١٨٩٠ز)ی و (١٣١٠ك-١٨٩٢ز)ی كردووە. «قەزای هەولێر دەكەوێتە ڕۆژئاوای مەڵبەندی لیوا» درێژییەكەی ٤٠سەعاتە ڕێ و پانییەكەشی ٢٠ سەعاتە ڕێ دەبێ، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە بەقەزای كۆیە و ڕانیە و لە ڕۆژئاواوە بەسنجەقی مووسڵ و لە باكورەوەش بەقەزای ڕواندز دەورە دراوە، ڕووباری زاب لە مووسڵ جیای دەكاتەوە و لە قەزای ڕواندزیشەوە دۆڵی بەستۆڕە.

ژمارەی دانیشتوانی قەزا (٣٧٦٣) كەسە، لەوانە (٣٢٦٦) موسڵمان و (٤٩٧)یشیان غەیرە موسڵمانن. شارۆچكەكە (١٨٢٢) خانوو و (٦٣٧) دووكان و مەغازە و (٣) حەمام و (٢) مزگەوتی گەورە و (١٠) مزگەوتی گچكە و (١١) قاوەخانە و (٦) قوتابخانە و (٥) مەكاتبی منداڵان و (١) قشڵە و (١) حەپسخانە و (٥) باغ و (٣) باخچە و هتد».

هەروەها ساڵنامەی (١٣٢٥ك-١٩٠٦ز) وا باسی هەولێری تێدا هاتووە: «ژمارەی دانیشتووانی شارۆچکەی هەولێر (٧٥٩٠) کەس دەبێت کە قەڵاتێك و سەرایەك و (١٨٢٠) خانوو و (٦٣٧) دووکان و (٣) حەمام و (٦) مزگەوتی گەورە و (٢) مزگەوتی گچکە و (١١) قوتابخانە و (٦) مەکاتیب منداڵان و (١) مەکتەبی روشدیە و (١) حەپسخانەی تێدایە».

که لە مەکتەبی روشدیەدا موعەلیمی یەکەم عەبدولحەکیم ئەفەندی و موعەلیمی دووەم عەبدولقادر ئەفەندی دەرسیان گوتووەتەوە. کاتب نەورەس ئەفەندی لە (١٨٩٢)ز لەوێ دەوامی کردووە.

دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە بەپێی سەرژمێریی (١٣٠٨ك-١٨٩٠ز) (٣٪) ی دانیشتووانی هەولێر خوێندەوار بوون.

لە مەکتەبی روشدیەدا بەپێی ساڵنامەی (١٣١٢ك-١٨٩٤ز) هەردوو موعەلیمی ناوبراوی سەرەوە هەبوونە و ژمارەی قوتابییەکان (١٨)کەس بوونە.

لە ساڵنامەی (١٣٢٥ك-١٩٠٦ز) یدا لە مەکتەبی ڕوشدیە موعەلیمی یەکەم عەبدولکەریم ئەفەندی و محەمەد ئەفەندی و ڕەئوف ئەفەندی) دەوامیان کردووە. ساڵنامەی (١٣٣٠ك-١٩١٢ز) بەم جۆرە باس لە مەکتەبی ڕوشدیە لە هەولێر دەکات.

موعەلیم: عەبدولقادر ئەفەندی

ژمارەی قوتابیان: ٢٩

معەلیمی یەکەمی ئیبتدائی: مەولود ئەفەندی

موعەلیمی دووەمی ئیبتدائی: عەبدولکەریم ئەفەندی.

ژمارەی قوتابیان: ٨٦

مەکتەبی قەڵاتی ئیبتدائی

موعەلیمی یەکەم: رەئوف ئەفەندی

موعەلیمی دووەم: مستەفا ئەفەندی

ژمارەی قوتابییان ٦٩ (١٨٥)

---

(١٨٥) گۆڤاری هەولێر، لە ساڵنامەی (ویلایەتی موسڵدا)، فەیسەڵ دەباغ، ژ (٥) زستانی ٢٠٠٠، ل٩٨.

## خوێندنی بەحرکە

لە ساڵی ١٩٤٤یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی لە بەحرکە بەناوی (قوتابخانەی بەحرکە) کراوەتەوە. ئەم تەنیا چەند ساڵێك خوێندنی تێدا بەردەوام بووە، تا بۆ جاری دووەم لە ساڵی ١٩٥٥ دەست بەخوێندن کرایەوە. ئەمە کۆنترین قوتابخانەی گەردییانە. چەند کەسێکی خەڵکی ئاوایی گەیشتنە پلە و پایەی بەرز، هەروەها نەبوونی شوێنی کات بەسەربردن لە ئاوایی و جگە لە تێکەڵاو بوونی قوتابییان لەگەڵ فەقێی مزگەوتان، تەنانەت هەندێك قوتابی لە هەردوو شوێن دەوامیان دەکرد. ئەم قوتابخانەیە هەتا ناوەندی لێ دەخوێندراوە دواتر ڕوویان دەکردە هەولێر بۆ تەواو کردنی ئامادەیی.

ساڵی ١٩٧٨ لەگەڵ دروستکردنی کۆمەڵگا قوتابخانەی دواناوەندیش لێ دروست کراوە و پێش حەفتا ڕێژەیەکی زۆر کەم لە خەڵکی گوندی کچەکانیان دەنارده بەر خوێندن و تا ئەمڕۆش واتە ساڵی ١٩٩٨ هیچ کچێکی ئاوایی خوێندنی تەواو نەکردووە[١٨٦].

لەگەڵ ئەوەشدا خوێندن بەڕێکی بەڕێوە نەچوو. دوای ڕاپەڕینیش گۆڕانکاری هاتووەتە ئاراوە و خوێندن لەم گوندە و لە کۆمەڵگای بەحرکە گرفتی هەیە، چونکە قوتابییان خوێندن تەواو ناکەن، یا منداڵان ناچنە بەر خوێندن، یاخود واز لە خوێندن دەهێنن ئەمەش هۆکارەکانی بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە باری خراپی و مەسرەفی خوێندن جۆش و خرۆشی لە خوێندن کەم کردووەتەوە، هەروەها لەو هۆکارانەی خەڵکی ڕۆڵەکانیان خستۆتە بەر کار و خراپیی باری ژیانی فەرمانبەران و دامەزراندنی دەرچووان لە دایەرەکانی حکوومەت و ڕووداوە جەرگبڕەکانی ئەم دواییيە بوونە هۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆر واز لە خوێندن بهێنن.

لەگەڵ ئەوەشدا بوونی قوتابخانە کاری لە دانیشتووان کردووە و ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی بەرزکردوونەتەوە، ئەمەش لەکاتی ئاخاوتن و دووركردنەوەی کتێبی ڕۆشنبیری و ئەدەبی دیارە[١٨٧] بەتایبەتی لە نێوان لاوان کە نەخوێندەواریان کەمە.

---

(١٨٦) گۆڤاری هەولێر، دابینکاری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی گوندنشین، نوری یاسین هرزانی، عەبدوڵڵا خورشید، ژمارە (١) زستانی ١٩٩٨، ل١٠١.

(١٨٧) هەمان سەرچاوە.

## چەند سەرنجێکی گشتی

خوێندن لە شاری هەولێر ڕەگوڕیشەیەکی کۆنی هەیە، دەگەڵ ڕووداوەکان دووچاری هەڵکشان و داکشان هاتووە، هەولێر یەکێك لە شارەکانی کوردستانی باشوورە لە سییەکانەوە بەزمانی کوردی قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە. بەڵام پرۆسەی خوێندن و خوێندەواری بەهۆی گەلێك هۆکار و بارودۆخی تایبەتی و گشتی بەسستی بەڕێوە چووە، لە دوای ڕووخانی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ ، خوێندن وەکو بەشێکی زۆری کوردستان دووچاری گەلێك کێشەو گرفت هاتووە. لەوانە:

فشار خستنە سەر نەتەوەی کورد و تۆڵە لێ کردنەوە و چاو ترساندنی و کەمکردنەوەی ئەم هەڵچوونە خێرا و بەرفراوانەی لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ لە بواری پەروەردە ڕوویان دا.

نا یەکسانی و بەئەنقەست هێشتنەوەی دامودەزگا زانستییەکان. هەروەها نایەکسانی لە نێوان ناوچەکانی ئەم پارێزگایە بەتایبەتی لە نێوان شار و گوندەکان و نزمیی ڕێژەی ئافرەتان لە خوێندندا کە نزیکەی (٣٠٪) یان پێك دەهێنا لە بواری خوێندن بوونی بۆشاییەکی زۆر لە ئەنجامی کەمبوونەوەی ژمارەی مامۆستا و کەمیی ژمارەی قوتابخانە و کەمیی پێداویستییە سەرەکییەکانی خوێندن و پەروەردە. هاندانی هێشتنەوەی عەقڵیەتی کۆن و پەیوەندیی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ و زاڵبوونی عەشایرەت لە بوارەکانی پەروەردە و زانست و ڕۆشنبیریدا.

- بایەخی زۆرتر بەلایەنی تیۆری دراوە لە بواری فێرکردن، نەك لێکۆڵینەوە و تاقیگە و پراکتیکی لە پرۆگرامەکان، ئەمەش دوورکەوتنەوە بوو لە خواست و ئاستی قوتابییانی ئەم شارە.

- زۆربوونی قوتابییان لە بەشەکانی زانستی و خانەی مامۆستایان، لەچاو بەشە پیشەییەکان.

لە هەمووشی گرینگتر لەم قۆناغە تازەدا لە ڕووی سیاسی و ڕەگەزپەرستییەوە دەسەڵاتدارانی حکوومەتی عێراق، بەخێرایی کەوتنە خۆ بۆ پاشگەز بوونەوە لەو بڕیارانەی لە ڕێککەوتنامەی ئازاری ١٩٧٠ دراون، لەمەڕ خوێندن و ڕۆشنبیری و سنوور دانان لەبەردەم گەشە کردنی خوێندنی کوردی و پەرەسەندنی هوشیاری و ڕۆشنبیری لای نەوەکانی کورد.

ئەمیش لەم شتانە خۆی دەنواند:

– لابردن و سڕینەوەی شوێنەواری ڕۆشنبیریی نەتەوەیی و کەلتووریی کوردی لە پرۆگرامەکانی خوێندن

– لابردنی باسی مێژووی نەتەوەی کورد و جوگرافیاکەی.

– گۆڕینی ناوی ئەو قوتابخانەی ناوی شاعیر و ئەدیبانی کوردیان لێ نرابوو.

– کێشانەوە و شاردنەوەی هەندێك کتێبی ئەدەب و مێژووی کورد، بەبیانووی ئەوەی ئەمانە دەچنە خانەی فکری نەتەوەیی بەرچاوتەنگ، بەئامانجی نەهێشتنیان لە قوتابخانە و مەکتەبە گشتییەکان.

– گۆڕینی سروودی "ئەی رەقیب" و سروودە شۆڕشگێڕییەکانی کوردی بۆ سروودی سادە و دوور لە ناوەڕۆکی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز(١٨٨).

– لە هەمووشی مەترسیدارتر هەڵگەڕانەوە بوو لە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە خوێندندا، و بەکارهێنانی زمانی عەرەبی وەکو زمانی سەرەکی لە خوێندن(١٨٩).

– پرۆگرامی خوێندن بەگشتی لەو تایبەتمەندییە دوورخرایەوە کە تایبەتە بەواقیعی کوردستان و کورد و نەتەوەکانی تر، پرۆگرامی خوێندن بەزەقی کەوتە پاشە کشە و ساڵ بەساڵیش ئاستی زانستی و توانای قوتابی بەرەو دابەزین چوو.

– بەهۆی فشاری ئەمنی، سەربازی، سوپای میللی، ژمارەیەکی زۆر لاوی کورد نەیانتوانی لەسەر خوێندن بەردەوام بن، دیاردەی وازهێنان و دابڕان لە خوێندن لە ریزی منداڵان پەرەی سەند. بەهۆی شەڕی بەردەوام دژی کوردستان و تەختکردنی گوندەکان و تێکدانی قوتابخانەکان(١٩٠).

---

(١٨٨) مجلة الثقافة الجديدة، العدد (...) ت٢ ١٩٧.

(١٨٩) ئەم بڕیارە لە ٩٧٧-١٩٧٨ دەرچوو بەرەسمی. کە ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی عێراق بڕیاریدا لە ناوچەکانی حوکمی زاتی بەعەرەبی بخوێندرێ و خوێندنەکەش (٤٠٪)ی دەگرتەوە، آ.ب. عن التعلیم في کردستان.
هەروەها ئەوکاتە خوێندن لە قوتابخانەکانی (پیشەسازی، کشتوکاڵ، بازرگانی واتە ساڵی ١٩٧٦) بەزمانی عەرەبی بوو. هەوڵی زۆر بۆ کەمکردنەوەی خوێندن بەکوردی بەشێوازی جۆراوجۆر دەدرا.

(١٩٠) بڕوانە آ.پ. عن التعلیم في کردستان العراق، ل٥٦، ل٣٥ لەم کتێبەدا دا هاتووە لە ساڵی ٩٨٥-١٩٨٦ (٥١٥) قوتابخانە لە هەرسێ پارێزگای کوردستان داخراون، لەم ژمارەیەدا (١٤٥) قوتابخانە لە پارێزگای هەولێر داخراوەهەروەها بەپێی بەرپرسەکان حکوومەتی =

## کۆیێ و خوێندن و خوێندەواری

شاری کۆیە مەڵبەندی ڕۆشنبیری و ناوداری وەکو (حاجی قادری کۆیی) شاعیر و مەلا محەمەدی گەورەی کۆیە و کەسانی تری ناودار و ڕۆشنبیر و قەڵەم بەدەست و کاران. کۆیە وەکو تەواوی شارەکانی تری کوردستان، هەوڵی تەژی هیوا و کاری بەکردەوەی بۆ دروستکردنی قوتابخانە و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری داوە. ئەو شارەی تەمەنی قوتابخانە تێیدا پتر لە (١٢٠) ساڵە.. یانی کۆیە مەڵبەندێکی چالاك و دیار و گەشەسەندووی کوردستانە لە باوەش گرتنی خوێندەواری .. پێش ئەوەش خوێندنی ئاینی ڕەگو ڕیشەی داکوتاوە و زانایانی ناوداری لێ هەڵکەوتوون و پێشوازیی گەلێك (مەلا و فەقێ)ی کوردیش کردووە، کە سەوداسەری خوێندن و فێربوون بوون. بیرەوەرییەکانی (چروستانی) و شیعرەکانی شاعیران و بیرەوەرییەکانی مەلایان، لێواولێوی ڕۆڵی ئەم شارە خوێندن لەباوەشگرەیە.

شەمسەدین سامی خاوەنی کتێبی (قامووسی ئەعلام)، کە لە ساڵی ١٨٩٩- بەرامبەر ١٣٠٦ - ڕۆمی چاپ بووە لە مەڕ کۆیە بەم جۆرە دواوە: مەڵبەندی قەزایەکە بەو ناوە و سەر بەسنجقی شارەزووری سەر بەویلایەتی مووسڵە. دەکەوێتە باکوری کەرکووك و ٧٠ کیلۆمەتر لێی دوورە، ژمارەی دانیشتووانی (١٠٠٠٠) کەس دەبێ و خاوەن قەڵایەکی کۆن و مزگەوتێکی گەورە و ١٠ مزگەوتی بچووك و ٣ قوتابخانە و ٦ مەکتەبی منداڵان و ٣ تەکیە و ٣٤٠ دووکان و ٣ حەمام و ١ فڕن و ١٨ ئاشی ئاوە. خەڵکەکەی هەر هەموویان کوردی موسڵمانن و ئاو و هەواشی تا ڕادەیەك خۆشە [١٩١].

ئەمە دەری دەخا ساڵی (١٨٩٩) ١١مزگەوت و ٣ قوتابخانە و ٦ مەکتەبی منداڵان و ٣ تەکیەکە هەریەکەیان بەجۆرێك بنکەو دامودەزگای بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و خوێندن بوون.

---

= عێراق لەهەمان ساڵدا (٣٠٪) قوتابخانەکانی سەرەتایی لە هەولێر و سلێمانی و دهۆك داخراون. هەر لەم زانیارییانە بەپێی بڕیاری (٢٢٧٩) ١/٩/١٩٨٥ لە ب. پەروەردەی هەولێر (٢٠٠) قوتابخانە داخران.

(١٩١) گۆڤاری هەولێر، شارو شارۆچکەکانی پارێزگای هەولێر لە قامووسی ئەعلامی شەمسەدین سامی، فەیسەڵ دەباغ، ژمارەی (١) زستانی ١٩٩٨، ل.٩٤ .

شاری کۆیە بنکەیەکی ڕۆشنبیریی دیاری کوردستانی باشوورە، شاعیر و نیشتمانپەروەر و ڕۆشنبیر و خوێنەری دیار و هەڵکەوتووی لێ دروست بووە. ڕاستە بەهۆی دواکەوتوویی دەسەڵاتی عوسمانییەکان و ملهوڕی لە بەڕێوەبەرایەتی و خۆخۆری و دواکەوتوویی و دەستڕۆیی دەربەگایەتی لە کوردستاندا، تا سەرەتای سەدەی بیستەم خوێندەوار و خوێندن و کردنەوەی قوتابخانە نەکەوتبووە نێو دیوان و نەبووبووە ئەشعار و کۆمەڵەی سیاسی و ڕۆشنبیری خورت نەبوون، تا ئامانجەکانی خوێندن ڕوون کەنەوە و بانگەشەی کردنەوەی قوتابخانە و بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاری و هۆشیاری و ڕۆشنبیریی خەڵك بکەن.. دەگەڵ پەیدابوون و هاتنە مەیدانی ڕۆشنبیران و دروستبوونی هەوەڵین کۆمەڵە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان لەلایەن ڕۆشنبیر و خوێندەوار و نووسەرانی کوردەوە، قۆناغێکی تازە لە ژیانی خوێندەواری دەستی پێ کرد.

حوجرە و مزگەوت ڕۆڵی سەرەکییان لە دەستپێکردنی خوێندن لە کوردستان بینیوە و ئەوانەی (سوختە و فەقێ)ش بوون، بەپەنجەکانی دەست دەژمێردران و بەدەردەسەری قۆناغ و پلەکانی فێربوون و گەیشتنە ئاستی زانستی ئاینییان دەبڕی، بەدووریش ناڕۆین ئەگەر بڵێین بە (١٠) گوندان لەوان سەردەمدا خوێندەوارێك دەست نەدەکەوت، نامەیەك بخوێنێتەوە. ئەمەش پێوانەیە بۆ زۆر ناوچە و دەڤەری تری کوردستان.

سوختەخانەکانی کۆیە لە ساڵی ١٩٠٠ ژمارەیان گەیشتە (١٧) و چواریان لە قەڵات و سێیان لە بایزاغا و (نۆ)ش لە بەفری قەندی و یەکێکیش لە (هەواو) بوو[١٩٢].

مەلای زانا و دیار دەرسیان تێدا دەگوتەوە.

دیاردەیەکی تری گەش و کەم وێنە لە مەسەلەی خوێندەواری لە کۆیە، مەسەلەی خوێندنی ئافرەتان لە قوتابخانە و بۆچوونی سەردەمانەی مەلای گەورە بووە، لە دەستپێشخەری و هاندانی کچان بۆ چوونە بەرخوێندن لە قوتابخانەکاندا. پێش ئەوەش کۆیە بووە مەڵبەندێکی تر بۆ ئافرەتان.

### سوختەخانەی ئافرەتان

لەم شارە زانست پەروەرەدا، کە کاروانی خوێندن و پێگەیاندنی خوێندەواری هەمیشە پڕبووە لە میوان و ڕێگەی کۆشانی گەرم و تەڕی بووە، ئافرەتان بەم شێوەیە فراوانە لە کوردستاندا نەبوونە و نەیانتوانیوە سوختەخانە بۆ خۆیان دروست بکەن، بەڵام لە کۆیە

---

(١٩٢) طاهر احمد حوێزی، مێژووی کۆیە، بەرگی دووەم بەشی یەکەم، ١٩٨٤، چاپخانەی، سمیر، بغداد، ل١٧٥.

پتر له شەش سوختەخانەیان دروست کردووە و دەرسیان تێدا خوێندووە. ئەمە لە چاو ڕێژەی خوێندەواری ئەم سەردەمە و تەنیا بوونی حوجرە و خوێندنی دینی و سەختیی گەڕان لە دەقەرە جیاکان بەدوای فێربوون و باری دواکەوتووی کۆمەڵایەتی، دیاردەیەکی گەش و پێشکەوتووە. ئەمانە ناو و شوێن و ژمارەی سوختەخانەکانی ئافرەتانی کوردە لە کۆیە:

١- (فەقێ فاتم) کچی عەبدورەحمان، ماڵی لە گەڕەکی بەفریقەندیان بوو، بەڕەکەریشی دەکرد. باوکی ئەحمەد ڕەشی وەسمانی. بەزۆری کچ و کوڕی گەڕەکی بەفریقەندی و منداڵە حەوێزییەکان لە لای دەیانخوێند.

٢- (فەقێ زەینەب) کچی وەسمانی ڕەسولی هەناری، کە لە فەقێ فاتم بوو. عەزیز محەمەد قادر سلێمانی و کافیە و زەکیە کچانی حاجی ئەسعەد و ئامینە و فەخریە کچانی حەمەد مستەفاغا لە لای خوێندوویانە.

٣- (فەقێ عەیشێ) ، کچی حاجی مەلا مستەفا نارنجی، کە دەکاتە ژنی وەستا تاهیری خەیات، (لەتیفە) و ٣ کچ و ٢ کوڕی ساڵح ئەفەندی زابت تەجنید لە سەفەر بەرلگی خەڵکی سلێمانی و کچە پۆلیسێك و گەلێکی دیکە لای خوێندوویانە و فەقێ ڕەحمەی کچیشی لای ئەو خوێندوویە، کە بووە ژنی حاجی قادری وەستا مەعروفی سۆلدروو.

٤- (فەقێ پیرۆز) کچی مەلا حەبیبی ئەحمەدی شەمامی لە گەڕەکی بایزغا بوو.

٥- (فەقێ حەبیب) خوشکی خەجێ دارکەر.

٦- (فەقێ گوڵێ) کە مێردی بەنەجیباغا کردەوە، پێکەوە بوونە فەڕاشی مەکتەبی کچان.

لە هاوینان دایە خەجێ فەقێکانی بۆ دەرس خوێندن دەبردە گوندی (فەقێیان) لە باکوری کۆیێ. جەلیزادەش فەقێکانی دەبردە (چناڕۆك)(١٩٣).

هەروەها لەسەر ژمێرییەکدا لە کۆیە و شەقڵاوە و هیران و ئەو دەڤەرەدا بەم شێوەیە ئاماژە بەژمارەی فەقێیکان و ناوی ئەو مەلایانە کراوە کە دەرسیان گوتووتەوە و ئێمەش بەم شێوەیە دەیکەینە خشتە، پێش ئەوە دەڵێن سەروەختێك لە کۆیە (٥٠٠) فەقێ هەبووە و کۆیە بەنێوبانگە لە ڕووتێکردنی فەقێ و زانست و ویستەکان بۆ فێر بوون و خوێندن.

خشتەی ژمارە (٤٠) ناوی ئەو گوند و ناوچانەمان بۆ تۆمار دەکات دەگەڵ ژمارەی فەقێکانیان و ئەو ماموستا و زانا ئاینییانەی دەرسیان تێدا گوتووەتەوە.

---

(١٩٣) هەمان سەرچاوە: ل١٧٦.

خشتەی ژمارە (٤١) (١٩٤)

| ناوچە و گوند | ژمارەی فەقێ | ناوی ئەو مەلایانەی دەرسیان گوتووەتەوە |
|---|---|---|
| بێتواتە | ١٥ | مەلا نەبی |
| هەرتەل | ٢٥ | مەلا عیسا و مەلا فەتحوڵلا |
| زێوە | ٢٠ | مەلا عەبدوڵلا هەرتەلی |
| بێلاوە | ٢٠ | |
| شیرێ | ١٥ | مەلا عەبدوڵلای سوور |
| بالیسانیمیر وسوی | ١٢ | مەلا مستەفا فازل |
| بالیسانی میر مەحمەڕیی | ٢٠ | مەلا شێخ عومەری بالیسانی و مەلا شێخ تەها |
| بالیسانی | | |
| خەتێ | ٢٠ | |
| شەقلاوە | ٣٠ | شێخ مەلا تەهای شەقلاوەیی |
| سیساوێ | ٢٠ | |
| هیران | ١٢ | مەلا ئیسماعیل ماویلی |
| بێلینگە | ١٢ | مەلا سەعید هەرتەلی |
| سکتان | ٢٥ | مەلا عەبدوڵلا و مەلا ئیسماعیل ماویلی |
| گەرۆتە | ١٠ | |
| نازەنین | ١٠ | |
| سێ گردکان-ئۆمەر گونبەت-کانی لەلە | ٧-٨ فەقی | حاجی مەلا قادر سێگردکانی مەدرەسە و فەقێکانی<br>لەگەڵ خۆێ لە نێوان ئەم سێ گوندە گەڕۆك بوونە |
| ئۆمەر گونبەت | — | مەلا سەعید ئاومالی |
| گۆپتەپە | ١٦ | حاجی مەلا قادر کانی دەربەندی |

(١٩٤) هەمان سەرچاوە، ل١٨٠.

هەروەها لەم گوندانەش مزگەوت و قوتابخانەی خوێندنی دینی هەبووە. مەلای چاك و فەقێی زۆر دەرسیان تێدا خوێندووە.

(قازی بەگی)، (کانی کوردە)، (بۆگد)، (خرابە)، (کانی بی)، (ئیلنجاغی گەورە)، (سێکانی)، (سێ گردن)، (ئۆمەر گونبەت)، (سماقوڵی سەروچاوە)، (سماقوڵی گرتك)، (جەلی)، (بەردەسپی)، (جل بەسەر).

## قوتابخانەی تورکی زمان لە کۆیێ

بەشی هەرە سەرەکیی خوێندن و خوێندەواری و قوتابخانەکانمان بۆ کۆششی تاهر ئەحمەد حەویزی دەگەڕێتەوە لە باسی (مێژووی کۆیە) باسی کردووە، بەپێی ئەو هەوڵانەی عوسمانییەکان داویانە بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە ساڵی ١٨٨٠ لە بەغدا و مووسڵ و کەرکووك و سلێمانی قوتابخانەیان کردووەتەوە، هەر هەمان ساڵیش لە کۆیە قوتابخانەیەکیان کردووەتەوە و بەڵام دوای ماوەیەکی کورت داخراوە و ئەم جارە لە ساڵی ١٩٠٠ دووبارە قوتابخانەیان کردەوە بەزۆریش مەبەستیان ئەوە بوو منداڵی ئەفسەر و مەئموورەکانی خۆیان دەرسی تێدا بخوێنن.

یەکەم جار لە خانووی (خورشید ئەفەندی) لە گەرەکی بەفریقەندی نزیك حەمامی حەسەن ئاغا دەرس دەخوێندرا و ناوی (کۆیسنجق ابتدائی) لە سەردەمی (ئیتحاد و تەرەقی) گواسترایەوە و خانووی (بلدیە) بەرانبەر مزگەوتی گەورە. لە ئاهەنگی کردنەوەی ئەم خانووە تازەیەی قوتابخانە (حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی) گوتارێکی خوێندەوە. بەپێی قسەکانی ناو کتێبی (مێژووی کۆیە) لەسەر دەرگای حەوشی ئەو مەکتەبە لەسەر مەرمەرێکدا نووسرا بوو (اتحاد و ترقی مدرسەسی). هەتا سالانی ١٩٤٠یش شوێنی مابوو. لێرەدا دەرس بەتورکی دەخوێندرا، سەرەتا(٣) ساڵ لە کۆیە دەخوێندرا و (٢) ساڵیش لە مووسڵ لە کۆتایی پۆلی شەشەم کرایەوە. ژمارەی قوتابییانی پۆلی سێیەم لەو سەردەمەدا (١٥–٢٠) کەس دەبوون. بەم جۆرە عوسمانییەکان بەناوی دینی ئیسلام حوکمڕانی وڵاتەکانی ژێر دەستیان دەکرد، هەر خەریکی باج سەندن بوون و نەدەبووایە بەزمانی کوردی بخوێندرێ و هێندەی بایەخیان بەباج و سەرانە وەرگرتن و رووتاندنەوەی خەڵك دەدا، هێندە گوێیان بەمەینەتییەکانی خەڵك نەدەدا.

ڕاستە دوو قوتابخانەیان لە بەغدا و کۆیە لە سەردەمی برایم بەگی قائمقامی عوسمانیدا کردەوە و بینایەیان بۆ دروست کرد.[١٩٥]

---

(١٩٥) هەمان سەرچاوە، ل١٨٠.

مەسعوود محەمەد لەمەڕ گۆڕانکارییەکانی ئەو سەردەم و زەمانە دەبێژێت ئەو ئینگلیزانە هەر چییەك بووبن لە عوسمانییەکان تێر و تەسەلتر بوون و شێوازی حوکمیان پتر بەرەو شارستانیەتی بوو. بەنموونە نەبیستراوە نەسۆجەر و نەلیڤیی سوپای ئینگلیز وەك هەیتەی عوسمانلی ڕاو رووتی کردبێ، بەپێچەوانە، یەکەم کاری ئینگلیزەکان دوای داگیرکردنی کۆیە، ئەوەبوو کە فەقیرخانەیان دانابوو، شاریان پاکژ کردبووەوە لە چڵکنی و ناساغی و جەردەیی شەوانە و ئەو تەرزە نامەردییانە. خەڵکی هەژار بەدیار کەسب و کارییەوە چ لەشار بووایە چ لە لادێ و هاوینە هەوار و ناوشاخ و داخ، ترسی پۆلیس و ئیجارەگر و مەڕانەستێنی و دەغل ترسێنی لێ تەکیبووەوە. خولاسە شەوەزەنگی حوکمی عوسمانلی و قاتوقڕی و گرانی و ڕاوڕووتی مەئموورەکان و دەستدرێژیی دەسەڵاتدارەکان گەلێك بەرەژێر بووبووەوە. لەمەشدا سەیر و سەمەرە پەیدا نییە، هەرچی ڕژێمی پێشکەوتووی وەکو ئینگلیزە چاو نابڕێتە سوودی بچوکی باغەڵبڕین و گیسك دزینی ئەم و ئەو کە ئەگەر هەرچی ببێ بایی سەدیەکی مەسرەفی داگیر کردنەکە ناکات. وابزانم ئەو فەرەحناییيە لە بیستەکاندا بەردەوام بوو تا ئەزمەی ئابووریی دەوروبەری ١٩٣٠(١٩٦).

ئەم گوتە کورتەی سەرەوە چۆن دەبێتە بەلەدی باسی قۆناغ و سەرە سەرەی هەڵگێڕ و وەرگێڕێکی تری باسی بەپیت و بەرەکەتی کێلانی فکر و پەروەردە لە کوردەواریدا، هەروا تخووبێکیشە بۆ ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری. ڕاستە حوزنی موکریانی ئەوان دەمان چاپخانەی دەرواندزێ دامەزراند و گۆڤار و کتێبی چاپ دەکردن و هانی خوێندەواری دەدا، ئینگلیز چاپخانەی هێنایە کوردستان و لە سلێمانی داینا و ڕۆژنامەی بەزمانی کوردی دەرکرد. کە ئەمە ئامرازێکی گرینگە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندەواری و فێرکردن و هاندانی خەڵك بۆ خوێندن، هەر لەوان زەمانی نوێنەرانی کورد لە عیراقدا داوای خوێندن بەزمانی کوردی و بایەخدان بەمەسەلەی مەعاریف و دابینکردنی پێداویستییەکانیان دەکرد. ئەگەر ئەو کاتە خوێندەوار لە شاری هەولێر ٣-٤٪ی سەرجەم ژمارەی دانیشتووان بووایە، بەڵام لەوە بەدوا بەرەو ژوور هەڵدەکشێت. لە کۆیەش هەروا:

لەبارەی کرانەوەی قوتابخانەی ڕەسمی لە کۆیە گوتراوە: لە دوای ئەوەی ئینگلیزەکان

---

(١٩٦) مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، بەغدا، ستۆکهۆلم، ١٩٩٢، ل٣١.

باری شاریان هێناوە سەرەخۆ و هەژارخانەکەی لە بینایەکە گواستەوە، دانیشتووان ئاهێکیان هاتەوە بەر، شەڕ و گرانی دوورکەتنەوە و تەمی پەژارە لەسەر وڵات رەوییەوە.

بڕیاری کردنەوەی قوتابخانەی ڕەسمی درا.

ڕۆژێکی مانگی (مایس ساڵی ١٩٢٠) سوختەخانەی مەلا سەعیدیان لە گەڕەکی بایزاغا کە لە ماڵی خۆی بووە بەهەموو شتێکەوە پێچایەوە و سندوق و دۆشەك و ماموستایان لەگەڵ گواستەوە. بینای مەکتەب و ئەو کاتە نزیکەی (٣٠) سوختە بوون. لە مانگی حوزەیران دەست بەخوێندن کرا. مەلا ڕەسوول بێتووشی بووە یەکەم مودیری ئەم مەکتەبە تازەیە و مەلا سەعد کوڕی مەحموود خەلیفە ئاکۆ و (عاکف ئەفەندی) کە هی زەمانی عوسمانی و کوردی لای ئاکرێ و ئامێدی بوو، بوونە ماموستا. سەرەتا دەرس بەتورکی و فارسی بوو ئینگلیزەکان گوتیان تورکی مەخوێنن و لە شوێنی ئەو کوردی بخوێنن و فارسی قەیدی ناکات[١٩٧].

لە ساڵی دووەم (١٩٢١-١٩٢٢)شدا سوختەکانی مەلا حەبیبش چوونە مەکتەب. دوای ماوەیەکی کورت فارسیش نەما و عەرەبی هاتە جێی و ئینگلیزیشیان دەخوێند و (سەدیق ئەفەندی) ئینگلیزی دەگوتەوە و دواتر عەلی ڕەفیق ئەفەندی خادم ئەلسەجادە و ئینجا (نامیق ئەفەندی) (مەلا حەوێز ئەفەندی سالح قوج ئاغا)ش لەوێ بوونە ماموستا. کتێبەکانیان لە میسر بۆ دەهات و ماموستاکان بۆیان دەکردنە کوردی و قوتابییەکانیش دەیاننووسییەوە:

ساڵی خوێندنی (١٩٢٥-١٩٢٦) هەندێك کتێبی ئاین و خوێندنەوە بەکوردی کە وەرگێڕدرابوون لە بەغدا چاپ بوون و هێنران. ئەم قوتابخانەیە سەرەتا ناوی (مدرسة التعالی بکوسنجق) بوو[١٩٨].

---

(١٩٧) ئەحمەد حەوێزی، مێژووی کۆیە، ل١٨٦

وەزیری مستعمراتی بەریتانی ساڵی ١٩٢٦ گوتوویەتی لە دادگای سلێمانی و کۆیە بەتەنیا لە هەموو کوردستاندا لە دادگا بەکوردی قسە دەکرێ. یانی لەتەك خوێندنی کوردیش، دادگاش بەکوردی بوو، کە بەپێی بڕیارەکانی ئەو کات دەبووایە لە هەموو کوردستاندا بەڕەسمی بەزمانی کوردی بخوێنن و لە دادگا و شوێنە ڕەسمییەکان بەکوردی قسە بکەن.

آ.پ. عن التعليم في كردستان العراق، ل١١.

١٩٨- هەمان سەرچاوە، ل١٨٨.

## یەکەم خوێندنی تێکەڵ لە کوڕان و کچان

کۆیە هەنگاوی خێرای بۆ پێشەوە دەنا، گۆڕانکارییەکان کاریان لەسەر خێرا گەشەکردنی هوشیاری و ڕۆشنبیریی خەڵك هەبوو، ئەو ئاسوودەییەی پەیدا بوو... ئەو سوختە خانانەی لەوە پێش ئافرەتانی کورد دەرسیان تێدا دەگوتەوە، هاندەرێکی باش بوون بۆ خوێندنی کچان وەلێ لەوەش لە پێشتر ئەوەیە کە مەلای گەورە لە کۆیە زۆر دلێرانە و بێ گوێدانە قسە و تانەی خەڵك، کۆتی کۆمەڵایەتی پچڕاند و بۆ یەکەم جار مەلایەکی زانا و دانای لێهاتووی وەکو مەلای گەورە کچەکەی خۆی لە ساڵی (١٩٢٣ - ١٩٢٤) کە ناوی (نەجیبە خان)بوو ناردە بەر خوێندن و (ناجیە محەمەد)ی خەڵکی کەرکووك و ساڵی ١٩٢٨-١٩٢٩ لەتیفە خانی مەلا سەدیق ئەفەندی و ناجیە خانی مەلا عەبدولرەحمان شەرەف دەگەڵ کوڕان تێکەڵ بوون و بەیەکەوە دەیانخوێند(١٩٩).

لەو کاتەی جەمیلاغا قایمقامی کۆیە بوو، وەکو سەرکردەیەکی نیشتیمانپەروەر دەجووڵایەوە. ئەو کاتەی مەندوبی سامیی بەریتانیا (سێر هەنری دۆبز) ساڵی ١٩٢٥ لە ڕێگەی شەقڵاوە و هیران هاتە کۆیە. جەمیلاغا مامۆستاکانی قوتابخانەی کۆیە هان دا تاکو قوتابییان سروودی وا بڵێن کە داخوازی میللەتی کوردی تێدا بێ و بەو هیوایەی بن لەسایەی بەریتانیا کورد بە ئامانجی خۆی بگات لە دەروازەی شار قوتابییان ئەم سروودەیان بۆ گوت:

یاخوا بەخێربێ، مەندووبی سامی

سێر هەنری دۆبز، زاتی کرامی

فەخرە بۆ کوردان ئەم زیارەتە

باعیسی نەجات لە ئەسارەتە!

تەرەقی دەکا، موڵکی کوردستان

لەسایەی عەزم و هیممەتی ئەوان

هۆنراوەکە مامۆستای قوتابخانەی کۆیە مامۆستا عەلی شەوقی ناسراو بە(عەلی ئاگا) نووسیویەتی. هەر لە سەردەمی جەمیلاغا (١٨٦٩-١٩٤٦) وەکو سلێمانی، شاری کۆیەش هەموو نووسراوێکی ڕەسمی فەرمانگەکانی حکوومەت و دادگاییکردن لە

---

(١٩٩) هەمان سەرچاوە، ل١٨٩.

دادگاکەیدا بەزمانی کوردی بوو، خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی چەند دەرسێکی نەبێ کە بەعەرەبی و ئینگلیزی بوون، دەنا هەموو بابەتەکان بەزمانی کوردی دەخوێندران.

دوای ٦ ی ئەیلوولی ١٩٣٠ بەر دەرکی سەرای سلێمانی، لە سەرەتای خوێندنی ساڵی ١٩٣٠-١٩٣١ لە قوتابخانەی کۆیە قوتابیانی پۆلەکانی پێنجەم و شەشەم لە دژی چەند ماموٚستایەکی کە مەیلی کوردایەتییان نەبوو مانیان گرت و ویستیان دەستیان بۆ درێژ بکەن، بەڵام جەمیلاغا نەیهێشت ئیشەکە گەورە بێ و خۆی بۆ لێکۆڵینەوە چووە قوتابخانە و کێشەکەی چارەسەر کرد و قوتابییەکانی لەگەڵ ماموٚستاکانیان ئاشت کردەوە(٢٠٠).

لەتەك ئەم بەرەو پێشڤەچوونەش دواکەوتن هەر مابوو، کوێرەوەری کاری خۆی دەکرد، خەڵکانێك هەبوون بەرامبەر ئەو هەڵوێستەی مەلای گەورە و کچی خۆی دەگەڵ کوڕان دەناردە مەکتەب، کەچی هەبوو لە ساڵی١٩٢٤ بۆ یەکەم جار جلکی (کەشافە) هاتە کۆیێ لەبەر ئەوەی سەرچۆکیان ڕووت بوو، خووزەشیان لەسەر دەکرد، هەندێك باوك کوڕەکانیان لە مەکتەب دەرێنا و لەسەردەهۆل هەڵگرتنیش هەندێك قوتابی وازیان لە قوتابخانە هێنا(٢٠١).

ئەگەر سەرنج بدەینە خشتەی ژمارە (٤٢) ڕێژە و ژمارەی دەرچووانی قوتابییانی بەکەلۆری لە شاری کۆیە پیشان دەدات لە نێوان ساڵانی (١٩٢٣-١٩٨٢). وێنەکە دەری دەخا باری خوێندەواری کوردی چەند کلۆڵ و بەستەزمان بووە ساڵی وا هەبووە تەنیا (١) قوتابی سەرکەوتووە. ژمارەی دەرچووان لە (١٣) ساڵی یەکەم لە (١٩٢٣-١٩٣٥) لە (١٠) قوتابی تێ نەپەڕاندووە. لە ساڵانی دواتر (١٩٣٦-١٩٤١)یش لە نێوان (١٦و٣٢) قوتابی بووە و هەڵکشان و داکشان هەبووە. لە ساڵی ١٩٤٢ جارێکی تر دابەزیوەتەوە سەر (١٠) قوتابی. ئەمەش پێوەندیی بەبارودۆخی وڵات و ڕووداوە سیاسییەکان و باری کۆمەڵایەتییەوە هەیە. لە شەش ساڵدا (١١٤١) قوتابی لە کۆی گشتی قوتابییەکاندا پۆلی شەش سەرەتاییان تەواو کردووە. یانی ئەگەر لێکی بدەینەوە ساڵانەدا لە کۆیە و کەمتر لە (١٩) قوتابی قۆناغی سەرەتاییان تەواو کردووە و بەشێوەیەکی گشتی کەچی ساڵی (١٩٢٩) تەنیا یەك قوتابی ئەم قۆناغەی بڕیوە. ئەم

(٢٠٠) گۆڤاری هەولێر، کارگێڕ و پیاوی سیاسیی کورد. جەمیلاغای حەوێزی ١٨٦٩-١٩٤٦، کەریم شارەزا، ژ (٥) زستانی٢٠٠٠ل١٣٤ هەروەها بۆ نارەزایی دەربڕین دژی دەسەڵاتداران و نەژاد پەرستی، ساڵی ١٩٣٦ قوتابییانی قوتابخانەی کۆیە مانیان گرت. اسماعیل شوکر، اربیل دراسة تأريخية. ل٣٧.

(٢٠١) طاهر احمد حوێزی، ل١٩٣.

ڕێژەیەش لە چاو دانیشتووان و خوێندەوار بوونی کۆمەڵگای کوردەواری ڕێژەیەکی جەرگبڕە و مایەی دامان و دواکەوتنە.

**خشتەی ژمارە (٤٢)** (٢٠٢)

ژمارەی ئەو قوتابییانەی لە بەکەلۆریا لە خوێندنی ساڵانی ١٩٢٣-١٩٨٢ لە کۆیە پۆلی شەشی سەرەتاییان بڕیوە و سەرکەوتوون

| ساڵ | ژمارەی قوتابییەکان |
|---|---|
| ١٩٢٣ | ٢ |
| ١٩٢٤ | ٢ |
| ١٩٢٥ | ٢ |
| ١٩٢٦ | ٢ |
| ١٩٢٧ | ٤ |
| ١٩٢٨ | ٤ |
| ١٩٢٩ | ١ |
| ١٩٣٠ | ٢ |
| ١٩٣١ | ١٠ |
| ١٩٣٢ | ٨ |
| ١٩٣٣ | ٢ |
| ١٩٣٤ | ٩ |
| ١٩٣٥ | ٨ |
| ١٩٣٦ | ١٦ |
| ١٩٣٧ | ٢٧ |
| ١٩٣٨ | ٢٥ |
| ١٩٣٩ | ١٨ |
| ١٩٤٠ | ١٥ |
| ١٩٤١ | ٣٢ |
| ١٩٤٢ | ١٠ |
| ١٩٤٣-١٩٨٢ | ٩٤٢ قوتابی پۆلی شەشەمی سەرەتاییان بڕیوە و سەرکەووتون. |
| کۆی گشتی | ١١٤١ |

(٢٠٢) هەمان سەرچاوە، ل٢٠٣.

## قوتابخانەی ثانیەی سەرەتایی کوڕان

١/١٠/١٩٣٣ قوتابخانەی دووەمی کوڕان بەناوی (ثانیە) لە سەردەمی قائممقام سالْح زەکی بەگ ساحێبقران لە گەڕەکی قەڵات کرایەوە. لە سەرەتا دوو پۆل بوو، عەبدوڵلا سامی مامۆستای یەکەم و عومەر جەلال مامۆستا بوو، فەرەجوڵلا فەراش بوو تێیدا. بەڕێوەبەرەکانی ئەمانە بوون: عەبدوڵلا سامی، محەمەد فاتح مستەفا جاری یەکەم، زەکی ئەحمەد، محەمەد فاتح مستەفا ١/١٠/١٩٤١ جاری دووەم، سابر ئیسماعیل ١/٩/١٩٤٢، عەبدولکەریم ئیسماعیل ١/١٠/١٩٤١ جاری دووەم، هاشم سەدیق ١/٩/١٩٤٢، عەبدولکەریم رەئوف عارف ١٣/٩/١٩٤٧، سابر ئیسماعیل ٢١/٩/١٩٤٩، سابر ئیسماعیل جاری دووەم ٢/٩/١٩٥٦، فەتحوڵلا عەبدوڵلا ٧/١١/١٩٦٦، غەریب مستەفا.

## قوتابخانەی قادریە

ساڵی ١٩٥٣ بەناوی حاجی قادری کۆیی ناونرا (قادریە) لە گەڕەکی هەواو کرایەوە، مامۆستا عەبدولحەمید نورەدین کرایە بەڕێوەبەر. دواتر زەکی ئەحمەد کرایە بەڕێوەبەر[٢٠٣].

## قوتابخانەی کچان

وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد سوختەخانەی ئافرەتان لە کۆیە کرایەوە و بۆ یەکەمین جاریش لە مێژووی خوێندەواری کۆیەدا گەورەترین زانا و مەلای کورد (مەلای گەورە) کچی خۆی ناردە بەر خوێندن لە قوتابخانەی تێکەڵ لە کوڕ و کچ.

ساڵی ١٩٣٣ یەکەم قوتابخانەی کچان لە کۆیە کرایەوە و سەرەتا لە خانووی عەبدورەحمان شەرەف لە نزیکی مزگەوتی گەورە لە گەڕەکی بەفریقەندیان بوو، پاش چەند ساڵێك بۆ گەرەکی بایزاغایان گواستەوە و ناونرا (کۆیسنجقی کچان) ئەم سەردەمی قایمقام سالح زەکی بەگ کرا یەکەمین بەڕێوەبەر فەزیلەی کچی سالْح زەکی قازی بوو، پاش ئەویش (عەتیە کچی ئەمین قازی) خەڵکی مووسڵ بووە بەڕێوەبەر. لە کاتی کردنەوەی قوتابخانەکەدا (فەتحیە خان)ی خێزانی مامۆستا جەلال حەوێز وتارێکی پێشکەش کرد بەدووری نازانم ئەم جۆرە وتاردانەش هەر تاقانە و ڕێچکە شکاندن بێ،

---

(٢٠٣) هەمان سەرچاوە، ل٢٠٧.

بەتایبەتی بۆ ئەو سەردەمە. وەکو باس کراوە دوو ئافرەتی دلێری کورد (نەجیبە خان)ی کچی مەلای گەورە و (فەقێ گوڵێ) بەخۆڕایی لەم قوتابخانەیەدا وەکو سەرەتایەك دەرسی دین و قورئانیان بەقوتابییەکان دەگوتەوە.

جێی خۆیەتی لێرەشدا ناوی ئەم کچانە تۆمار بکەینەوە کە مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی لە کتێبەکەیدا ناوی هێناون، کە بۆ یەکەم جار چوونەتە قوتابخانەی کچان لە کۆیە و ژمارەشیان کەم نەبووە (٢٤) قوتابی بوون ئەمە ناوەکانیانە(٢٠٤).

(ناجیە عەبدولرەحمان شەرەف کە لە پێشتر لەگەڵ کوڕان بەتێکەڵی دەیخوێند، بەڵام مەکتەبی تەرك کردبوو، خانە ئیسماعیل، جەمیلە ئەحمەد ئاغا، زەکیە حاجی سابر، رەحمە کاکە حاجی مەحموود، سەبریە حەمەد مستەفاغا، شوکریە مستەفاغا، سەبریە سلێمان تابو، خەجاوە عەبدولرەحمان، ئامنە حاجی محەمەداغا، عەیشێ محەمەداغا، زەکیە حاجی مەجید، لەعلی حاجی جەلال، دلارام بابا عەلی، حەلیمە عەبدولفەتاح ئاغا، سەبیحە ئەحمەد عوسمان، لەعلی عەبدوڵلاغا، عەیشێ حاجی حسێن، ئامنە مەلا سەعد، حەسیبە، سەعدیە مەعروف، عاسمە حوسێن حەسەن، حەسیبە خەلەف چاوەش، خەجاوە سەلیم)

هەر لەو دەمدا مامۆستا (حەیات ناسر) و (ماریە) کە دوو دیانی مووسڵ بوون بەزمانی عەرەبی دەرسیان پێ دەگوتن. دەبێ ئاماژەش بەوە بکەین لە ئاکامی ئەو رۆڵەی زانا و رۆشنبیرانی ئەم شارە لەمەڕ هاندانی ئافرەتان بۆ خوێندن و خوێندەواری نواندوویانە، تا هەشتاکانی سەدەی بیستەم پتر لە (٦٠) مامۆستای ئافرەت لە کۆیە پێ گەیین و دەرسیان دەگوتەوە، کە ئەم ژمارەیە بۆ شارێکی وەکو کۆیە لە ڕووی سەرژمێرییەوە کەم نییە و جێگەی بایەخ پێدانە.

## خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی

لەو سەردەمەدا لە شارەکانی کوردستان قۆناغی ناوەندی نەبوو، دەبووایە بچنە شارەکانی تر بۆ تەواوکردنی خوێندن، ئەمەش کۆسپ و رێگرێکی گەورە بوو لەبەردەم درێژەپێدانی خوێندن، چونکە زۆر کەس نەیدەتوانی بچێ لە شارێکی تر بخوێنێ و پارەی نەبوو. بۆ یەکەم جار بەنووسراوی ژمارە (١٧٨٧٣)ی ٦/١١/١٩٣٧ی (مدیریەتی معارفی گشتی) پۆلی یەکەمی ناوەندی لە کۆیە کرایەوە. لە ١٧/١١/١٩٣٧ ژوورێکیان لە قوتابخانەی کۆیسنجق اولی دانێ. عەلی موزەفەر کە مامۆستای سەرەتایی بوو،

---

(٢٠٤) هەمان سەرچاوە ل٢٠٨.

وەکالەی ئیدارەکەی وەرگرت و دەرسیشی دەگوتەوە. (سەدیق نورجان)یش کە مامۆستای سەرەتایی بوو، دەرسی دەگوتەوە. بۆ ساڵی دواتر گواستیانەوە خانووی سلێمانی حاجی عەبدولرەحیم لە گەڕەکی قەڵاتێ. ساڵی دواتریش گوێزرایەوە (حەسار)ەکەی لای (زەوییە میری) چەند ساڵێك لەوێ بوو. ئینجا بۆ بینا تازەکەی قوتابخانەی (زانستی)یان گواستەوە و دواتر گوازرایەوە بینا نموونەییەکە و لە ساڵی (١٩٣٧-١٩٨٢) حەڤدە (١٧) بەڕێوەبەری بەخۆوە دیتووە. ناوە ناوەش لە ناوەندی بۆ ئامادەیی دەگۆڕدرا. ١٩٥٣ بووە کرایە ئامادەیی و ساڵی ١٩٥٦ کرایەوە ناوەندیی و ساڵی ١٩٥٨ کرایەوە ئامادەیی.[٢٠٥] ساڵی ١٩٥٤ یەکەم وەجبەی قوتابی کە (١٢) کەس بوون تێیدا وەکو ئامادەیی دەرچوون. لەو کاتەوە (١٩٣٧-١٩٨٢) (٦٥٠) قوتابی لە ئامادەیی کۆیە دەرچوون و تاکو ساڵی خوێندنی ١٩٨٢-١٩٨٣ (١٥٨) مامۆستا دەرسیان تێدا گوتووەتەوە.[٢٠٦]

### ئامادەیی کچان

ساڵی ١٩٥٩ ناوەندی کچانی کۆیە کرایەوە و ساڵی ١٩٧٠ کرایە ئامادەیی، ئەم قوتابییانە یەکەم جار لەم ئامادەییە سەرکەوتوون و دەرچوون: فەخریە سەعید، زەکیە حەسەن، ئەدیبە نەجمەدین، نەجیبە نەجمەدین، فەهیمە ڕەسوول، نەسرین حەمید حاجی مەلا، قەدریە حەمید، سەمیرە عومەر، سەمیرە سەید حسێن، خەیریە حەمەدەمین، شیرین سەید حوسێن، گوڵبەهار حەمەدەمین، سەبریە ڕەسوول ئاغا، خەیریە عەبدوڵڵا.[٢٠٧]

### مەسەلەی خوێندەواری لە کۆیێ

هەوڵ دەدەین لەم باسەدا ئاماژە بەژمارەی ئەو ڕێژە خوێندەوارییە بدەین کە ساڵانێك لە کۆیێ فێربوون و پلەکانی خوێندنیان تەواوکرد و گەیشتنە پلەی زانستیی بەرز و کەسانی خوێندەوار و بەسوودیان لێ دەرچوو. کە بێگومانە ئەمەش ئەوە پێشان دەدات گەلی کوردستان ئاستەکانی پێشکەوتنی چەندە و خوێندەوارانی ڕێژەیان گەیشتووەتە چەند و ئەمە دەبێتە بنەمایەکیش بۆ بەدوا داچوونی هۆکارەکانی گەشەکردن و پێشکەوتن و فراوانبوونی خوێندەواری و پێچەوانەش ئەم ڕێژانە لە سەرەتای سەدەی بیستەم تا ١٩٨٢ دەگرێتەوە.

---

(٢٠٥) هەمان سەرچاوە، ل٢١٨.

(٢٠٦) هەمان سەرچاوە، ل٢١٩.

(٢٠٧) هەمان سەرچاوە، ل٢٢٠.

(٤٧) مامۆستای ئافرەت کە خەڵکی شاری کۆیەن.

(١٤٧) مامۆستای پیاو کە خەڵکی شاری کۆیەن.

(٢٦) دکتۆر لەگەڵ (١٣) دکتۆری بەیتەرییە.

(٢٠) کەسیش گەیشتوونەتە پلەی وەرگرتنی دکتۆرا.

(١٣) محامی.

(٤٩) ئەندازیار

(١١) حاکم

(٢٩) ئەفسەری سەربازی و (٩) ئەفسەری پۆلیس لەم شارە پێگەییون [٢٠٨].

**قوتابخانەی شەوێ**

بوارێکی تری پەرەپێدانی خوێندەواری و وریا کردنەوەی خەڵکی مەسەلەی بڵاوکردنەوەی خوێندەوارییە لە قوتابخانەکانی شەو.. کۆیە سەردەمانێکی زۆرە لەم بوارە قوتابخانەی شەوانی دروست کردووە و دەرسی تێدا گوتراوەتەوە.

ساڵی (١٩٢٧-١٩٢٨) بۆ یەکەم جار عەبدولخالق ئەفەندی قوتب کە مامۆستا بوو، بینای مەکتەبی کۆیسنجق، مەکتەبێکی شەوێی کردەوە و لەگەڵ عومەر ئەمین هەولێری دەرسیان تێیدا دەگوتەوە، عەبدولرەحمانە شڕ چاودێریان بوو، تا پۆلی چوار دەرسی تێدا دەخوێندرا. عەبدولخالق ئەفەندی بەهەندێك بازرگانی گوتبوو، دەتوانم بەشەش مانگ فێری خوێندنەوە و نووسین و خەتتان بکەم [٢٠٩].

مەلا کاکەش وەکو زۆر کەس و زانای تر لە کوردستاندا بەخۆڕایی و لە ماڵی خۆی هەوڵی فێرکردنی خەڵکی دەداو خوێندەواری و زانیاریی بڵاودەکردەوە. ئەو (مەلا کاکە)یەش کە خەڵکی بەری سلێمانییە لە بنەڕەتدا لە مزگەوتی بایزاغای (پەلك) دەیخوێند، دەرسی تایبەتیشی دەگوتەوە، هەر لەم مزگەوتەدا لە ژوورێکدا تەختە رەشێکی هەڵواسیبوو دەرسی ئەلفبای بەدانیشتووانی گەڕەکەکە دەگوتەوە.

هەروەها (محەمەد نافع عەبدولفەتاح ئاغا) ساڵی (١٩٣٣ - ١٩٣٤) زۆر هەوڵی بۆ

---

(٢٠٨) هەمان سەرچاوە.

(٢٠٩) هەمان سەرچاوە، ل٢١٠.

قوتابخانەی شەوێ دا، زۆر خەڵکی لە دانیشتووی بازاڕ پەیدا کرد، ئەو کاتە جگە لە خوێندن و وەرزش گیانی نەتەوایەتی و نیشتیمانپەروەرییان لە ناو خەڵکەکەش بڵاو دەکردەوە، ناوی کوردی و ڕۆژیاش و شەوباشیان خستە زاران، هەندێك وایان دەزانی ئەمە خیلافی ئایینە، دژایەتییان دەکرد، دوای ساڵی ١٩٣٠ هەندێك لە قوتابییە کۆیییەکان کە لە شاردا دەیانخوێند لەم بوارە بەخۆڕایی دەرسیان دەگوتەوە و بەشدار دەبوون(٢١٠).

ئەم قوتابخانەیە بووەتە مایەی زیاتر بڵاو بوونەوەی خوێندن لای بەتەمەن و کاسب و فەرمانبەر و پۆلیسەکان، هەروەها لە پەنای ئەم قوتابخانەیە کە سەر وەختێك لە هەردوو قوتابخانە سەرەتاییەکانی کۆیە دەرسی شەوێ دەخوێندرا، وای لێ هات تەنیا لەناو پۆلیسان (٢٠) کەس هەبن بخوێنن و حەز بەفێربوونی خوێندن و خەت بکەن. سەرباری دانیشتووانی تری شار، کە لەتەك خوێندن لەناو ئەو بەتەمەنانە مەسەلەی فکری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بڵاو دەکراوە و قوتابخانە جێگەی فێربوونی تەنیا خوێندن و نووسین نەبوو، جێگەی فێربوونی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسی بوو. هەر ئەوانە وێڕای خوێندن، لاتینیی کوردیشیان لە سییەکان فێر دەکردن ئەو کاتە تاهیر ئەفەندی مەلا سادق و عەبدولمەجید ئەفەندی نوورەدین و محەمەد فەخری ڕەئوف و محەمەد خدر و محەمەد حەوێز دەرسیان دەگوتەوە. لە دەشتدا تەمسیلیان دەکرد و یاری و گاڵتەیان ساز دەدا، چایخانەی تایبەتییان گرتبوو (مەبەست قوتابییەکانە). شەوی سێشەموان پێکەوە دەچوونە حەمام و شتی تر(٢١١) .

لە ١٩/١٠/١٩٥٥ (مدرسەی کۆیسنجق مسائی) کرایەوە و جەلال حەوێزی بەڕێوەبەری قوتابخانەی کویسنجق یەکەم ناوی خەڵکی قەید دەکرد. ٣١/١٠/١٩٥٩ ناوەکەی بووە (قەندیلی مسائی) ئەم قوتابخانەیە لە ٦-٧/١١/١٩٥٩ کرایەوە، عەبدوڵلا کاکە بووە یەکەم بەڕێوەبەری قوتابخانەکە. میلاکی تایبەتیشی لەو کات بۆ دانرا. ساڵی ١٩٦٣ دەرسی خوێندنی تێدا ڕاوەستا و ١٩٦٤ دەوامی تێدا کرایەوە و ساڵی ١٩٦٥ تاهیر ئەحمەد حەوێزی بووە بەڕێوەبەری لەو ماوەیەدا (٢٥) مامۆستا لەم قوتابخانەیە دەرسیان دەگوتەوە. (٢١٢)

---

(٢١٠) هەمان سەرچاوە، ل٢١٠.

(٢١١) هەمان سەرچاوە، ل٢١١.

(٢١٢) هەمان سەرچاوە، ل٢١١.

خشتەی ژمارە (٤٣) دابەشکردنی قوتابخانەکانی شارەوانی کۆیە دەردەخا، لە ساڵی (١٩٢٠-١٩٥٧) هەروەها دەرەوەی شاری کۆیەش دەگرێتەوە.

خشتەی ژمارەی (٤٣) (٢١٣)

## قوتابخانەکانی ناو شار و دەرەوەی شاری کۆیە.

| قوتابخانەی کوڕان | پلە | ساڵی کرانەوە | شعبە | هەیئەت | فەراش و حەرەس | ژمارەی قوتابی | ژمارەی خانوو | تیبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کویسنجق اول | سەرەتایی | ١٩٢٠ | ٨ | ١٢ | ٣ | ٢٥٠ | حکوومەت | |
| فرسان | سەرەتایی | ١٩٣٣ | ٦ | ٨ | ٣ | ٢٠٠ | حکوومەت | لە پێشدا ناوی ثانیة و دوایی زانست لەساڵی ١٩٧٠ |
| قادریە | سەرەتایی | ١٩٥٣ | ٨ | ١٢ | ٣ | ٢٥٠ | حکوومەت | ساڵی ١٩٥٩سنفی شەشی بۆ کراوە |
| الامل | سەرەتایی | ١٩٥٨ | ٦ | ٨ | ٢ | ٢٠٠ | ئەهلی | ناوی کرا (هیوا) |
| باواجی | سەرەتایی | ١٩٥٩ | ١٢ | ١٦ | ٣ | ٣٥٠ | حکوومەت | |
| قندیلی مسائی | سەرەتایی | ١٩٥٩ | ٦ | ٧ | ١ | ٨٠ | حکوومەت | |
| سەرباغ | سەرەتایی | ١٩٦٥ | ٦ | ٨ | — | ١٥٠ | حکوومەت | ناوی کرا بێستونی نێواران |
| بەیان | اولیة | ١٩٦٧ | ٤ | ٥ | ١ | ١٠٠ | حکوومەت | |
| سانەوی | ئەعدادی | ١٩٣٧ | ١٥ | ١٨ | ٤ | ٤٠٠ | حکوومەت | چەند ساڵێش کراوە ناوەندی |

(٢١٣) هەمان سەرچاوە ایلنجاغ ساڵی ١٩٤٧ قوتابخانەی لێ کراوەتەوە، ئێستا ناوەندییشی هەیە =

### قوتابخانەی کچان

| کویسنجق اولی | سەرەتایی | ١٩٣٣ | | | | | حکوومەت | ناوی کرایە چناروك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامنە | سەرەتایی | ١٩٥٤ | | | | | حکوومەت | ناوی کرایە ژیان |
| شیرین | | | | | | | | |
| تەقەدوم | | | | | | | | |
| احداث سۆلاف | اولیة | ١٩٥٩ | ٦ | | ٢ | ٢٠٠ | حکوومەت | |
| متوسطة | اولیة | ١٩٥٧ | | | | | | سالی ٥٧-١٩٥٨ فنوونی مەنزلی بوو |
| باخچەی ساوایان | سەرەتایی | | | | | | | |

### دەرەوەی شار

| طق طق | سەرەتایی | ١٩٣٠ | ٦ | ٨ | ١ | ١٥٠ | حکوومەت | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەرموتە | سەرەتایی | ١٩٤٨ | ٦ | ٨ | ١ | ١٤٠ | بەخشین | |
| گۆمە شین | سەرەتایی | ١٩٤٨ | ٦ | ٤ | ١ | ٨٠ | ئەهلی | |
| ایلنجاغ | سەرەتایی | ١٩٤٨ | ٦ | ٦ | ١ | ٧٠ | ئەهلی | |

لە سالی ١٩٧٨شدا (٧٨) قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لەناو شاری کۆیە و دەرەوەی شار و گوندەکان هەبووە، کە ئەمەش ناوەکانیان بەپێی دابەشبوونیان لە ناوچەکاندا.

### قوتابخانەکانی ناو شار

(کۆیسنجق، زانست، حاجی قادر، باواجی، هیوا، بەیان، چوار باغ، بێستونی ئێواران،

=زیاتر لە ٢٠٠ قوتابی لێ دەخوێنن، لە گۆمەشینیش ئێستا سەرەتایی و ناوەندی تا پۆلی دووەم هەیە. لە شاخەپیسکە ٤٠ قوتابی ئێستا هەیە. بەڵام بینایەی قوتابخانەیان نییە لەگەڵ (٣) مامۆستا لە گوندی بانی ماران ئێستا قوتابخانەی سەرەتایی هەیە و پۆلی ناوەندی یەکەمیش هەیە. لە بایزاغا سێ ساڵە واتە ١٩٩٩ قوتابخانە کراوەتەوە. تا پۆلی سێی سەرەتایی هەیە یەك مامۆستایان هەیە. بینایەکانیان قورە. بڕوانە ڕێگای کوردستان و گەشتێك بۆ گوندەکانی ڕۆژئاوای کۆیە. ژ (٤٥) ٢٠٠١/٤/٣٠ ل ٦.

"ئەلوەتەن" خوێندن بەزمانی عەرەبی) ئەمانە کوڕان و هی کچانیش ئەمانە بوون (کۆیسنجق، چنارۆك)، ئامنە (ژیان)، شیرین، ڕابەر، سۆلاف، کویسنجق ئێواران، روضة).

## قوتابخانەکانی دەرەوەی شار

(هەرمۆتەی کوڕان، هەرمۆتەی کچان، سکتانی تێکەڵاو، سینانی تێکەڵاو، شیلەی کوڕان، شیلەی کچان، سماقولی سەروچاو، سماقولی گرتگ، سوسە، نازەنین، جەلی کوڕان، جەلیی کچان، شەوگێڕی کچان، شەوگێڕی کوڕان، حاجی قەلا، پێبازۆکی کوڕان، پێبازۆکی کچان، تەق تەق کوڕان، تەق تەق کچان، شیوەشان، خرابە، سێگردکان، سارتك، ئیلنجاغ و ناوەندی تەکمیلی، تالەبانی گەورەی کوڕان، تالەبانی گەورەی کچان، باغەجنێر، کانی ڕەش (تەق تەق)، بانە کوڵان، شیوەجان، بۆگدی کوڕان، بۆگدی کچان، ساتو قەلا، جل بەسەر، تەکەول، شاخە پیسکە، نێرمگین، ئۆمەر گونبەت، دێگەلەی کوڕان، دێگەلەی کچان، گۆمەتاڵ بۆ أحداث، ڕەسوول بسکول بۆ احداث، باوەقووب، گۆك تەپەی کوڕان، گۆك تەپەی کچان، بانە موردی کوڕان، بانە موردی کچان، گۆمەشینی کوڕان، گۆمەشینی کچان، بانی ماران، کێشکە، بەلەبان، ئەشکەفت سەقا، شیوە پیران).

## ناوەندی و ئامادەییەکانی کۆیە

سانەویی کویسنجق کوڕان، سانەویی کویسنجق ئێوارانی کوڕان، ناوەندیی کویسنجق کوڕان، ناوەندیی (ئەلشەعب) خوێندن بەعەرەبی، ناوەندیی تەق تەق، ناوەندی تەکمیلیی ئیلنجاغی گەورە، سانەویی کۆیسنجق کچان.(٢١٤)

ئەمە پەرەسەندنی خوێندن و دروستبوونی و کرانەوەی قوتابخانە لە کۆیە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەوە پتر چاوەڕوانی ئەم شار و ناوچە بەرفراوانە دەکرا، وەکو هەموو ناوچەکانی تر بەر سیاسەتی نەژاد پەرستی و زوڵم و دواکەوتن خستراوە لەبەر ئەوە لە هەموو قۆناغەکاندا هەست بەبوونی لەخۆبردوویی مامۆستاکان دەکرێ لە هاندانی خوێندن و کارکردن لەم بوارەدا.

---

(٢١٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## خوێندنی کوردی...
## کەرکووکی کوردانی نەوت

کەرکووك بەهۆی ئەوەی نەوتی تێدایە و شارێکی گرینگە، یەکێکە لەو شارانەی بەردەوام تەعریب دەکرێتەوە و حکوومەتەکانی ناوەند دان بەوە نانێن کە ئەم شارە کوردییەو زمانی خوێندنی بەکوردی تێدا قەدەغەیە، زوڵمێکی زۆر لە هاووڵاتییانی کورد دەکرێ تا دەگاتە بەزۆر (راستکردنەوەی نەتەوە) و گۆڕینی نەتەوە لە کورد بۆ عەرەب، ئەگەر نا جێهێشتنی شارەکەو دەرکردنیان بۆ ناوچەکانی (حوکمی زاتی!!) کە تەنیا (هەولێر و سلێمانی و دهۆك) دەگرێتەوە، کەرکووك و هەندێك شارو ناوچەکانی تر دابڕێنراون لە کوردستان. مەسەلەی خوێندن بەزمانی کوردیش هەروایە. مەگەر وای ڕێککەوتنی ئازاری ١٩٧٠ دەرفەتێکی بۆ خوێندنی کوردی ڕەخساندبێت، ئەگەر نا ئەم شارە ڕۆژ بەڕۆژ مەترسیدار و ئاشکراتر کەوتووەتە بەر چەپۆکی چەوسانەوە و سڕینەوەی ئاسەواری کورد(٢١٥).

لە چوار ساڵی ڕێککەوتنامەی (١٩٧٠-١٩٧٤) ژمارەیەکی باش لە قوتابخانەی کوردی لە کەرکووك و دەورووپشتی کرایەوە کە لە شوێنێکی تری ئەم باسە ئاماژەی پێ کراوە.

ڕاستە بە ناوی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری ژمارە (٣١) لە ١٩٧٤/٣/٢٦ لە مەڕ خوێندنی زمانی کوردی لەناوچەکانی دەرەوەی بەناو سنووری حوکمی زاتی دا، لە ناوەڕاست و خوارو و دەرسی زمانی کوردی دەخوێندرا، بەڵام کەرکووك لەم ڕووەوە زۆر

---

(٢١٥) قوتابخانە مێژووی لە م شارەدا زۆر کۆنە، چۆن ویستیان مووسڵ لە بیر کورد بچێتەوە ئەوهاش هەوڵ دەدرێ کەرکووکی نەوت بکرێتە قوربانی و لە بیر بچێتەوە.... کەرکووك خاڵی ستراتیژی خەباتی کوردە و ناکرێ وازی لێ بهێندرێ. پاش شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨، لە ساڵی خوێندنی (١٩٥٩-١٩٦٠) بۆ یەکەم جار خوێندن لە قوتابخانەکانی کەرکووکدا بە ڕەسمی بوو بەکوردی، بەڵام زۆری نەبرد ناحەزانی کورد و خوێندنی کوردی لە ڕێگەی بەردەوام بوونیدا بوونە کۆسپ، بەبیانوی ئەوەی کەرکووك قوتابیی تورکمان و قل قلە عەرەب و ئاشووریشی لێرە و لەوێ هەن. بۆ ساڵی ئایندە خوێندنی کوردی هەڵگیراو ئەو هەموو منداڵە کوردەی ساڵی ڕابردوو بە کوردییان خوێندبوو، هەموویان لە مافی خوێندن و فێربوون بەزمانی زکماکی بێ بەش بوون.

بڕوانە: ڕۆژنامەی برایەتی، زاهیر ڕۆژ بەیانی، خوێندن لە کەرکووك بە زمانی زکماکی پۆڵ بە پۆڵ یا...؟ ژ (٢٧٧٩) چوار شەمە ١٩٩٩/٢/١٧ك.

چەوساوەتەوە.

دوای نسکۆی ١٩٧٥ ئابلۆقەیەکی توند لە سەر خوێندن و ڕۆشنبیری کوردی لە کەرکووك لە ئارادا بوو. هەموو قوتابخانە کوردییەکانی ناویان بۆ عەرەبی گۆڕا، یا نەهێشتران کە ئەمانە چەند نموونەیەکیەتی.

قوتابخانەی سەرەتایی:

قوتابخانەی (پیرەمێرد) لە گەڕەکی ئیسکان کرایە (بەکر)، قوتابخانەی (مەولەوی) بۆ (ئیدریسی) و (هەڵمەت) بۆ (ئەلعراقیە) و (بەرزانی) بۆ (ئوم ئەیمەن) و (بێکەس) بۆ (ئەلحەسەن ئیبن ئەلهەیسەم) گۆڕدران.

قوتابخانەی ئامادەیی:

ناوی (ئامادەیی ١١ی ئازار) یان بۆ (میسلون) گۆڕی و (کاوە) بۆ (معاذ بن جبل) و (ڕێزان) بۆ (ئەلڕافیدەین) و (ئامادەیی کوردستان) بۆ (عبدالملك بن مروان) و (زیوەر) بۆ (ئەندلس) گۆڕدران. ئەم قوتابخانانەش نەهێڵدران، ناوەندی باباگوڕگوڕ و شۆڕش و ئامادەیی کوردستان[٢١٦].

لە درێژەی باسی خوێندن لە شاری زۆر لێکراوی کەرکووك، مامۆستا مستەفا نەریمان وەها باسی خوێندەواری و خوێندن لە نێو شاری کەرکووك لە سییەکان دەگێڕێتەوە لە سییەکاندا قوتابخانەیەکی ناوەندی و دواناوەندی و ئامادەیی لە پارێزگای کەرکووکدا هەبوو، لەو ناوچانەی سەر بە کەرکووك بوون، قوتابخانەی سەرەتایی هەبوو، لە پارێزگاکانی (هەولێر و سلێمانی) سەر و قوتابخانەیەکی ناوەندی هەبوو، دەرچووانیان دەهاتن لە کەرکووك دواناوەندییان تەواو دەکرد لەبەر ئەمە قوتابخانەی ئامادەییەکەی کەرکوك بوو بە مەڵبەندی یەکترناسینی قوتابییانی ئەو سێ پارێزگایە.

ئێمە بیست قوتابی بووین چووینە تاقیکردنەوەی بەکالۆریا شانزدەمان سەرکەوتین لەم شانزدە قوتابییانە دوانیان لەبەر دەستکورتی قوتابخانەیان تەرك كرد و چواریشیان چوونە (دار المعلمین ریفی) لە ڕۆستەمیەی بەغدا. ئەوەی دوایمان لە قوتابخانە ناوەندییەکانی (بەعقوبە، سلێمانی، کەرکووك) چوونە بەر خوێندن لەوانەی چووینە قوتابخانەی ناوەندی کەرکووك ئەم قوتابییانە بووین (حوسین حاجی سەمین، جەلال ڕەشید، محەمەد ئیسماعیل، وەهاب قەمەر، مەدحەت ئیبراهیم، پێش ئێمەش ئەو قوتابییانەی کفری لە ناوەندی کەرکووك دەیانخوێند (خورشید کازم، برایم حاجی

---

(٢١٦) وريا جاف، كركوك دراسة سياسية واجتماعية، مطبعة وزارة الثقافة، ١٩٩٨ اربيل. ص٣٩.

حوسێن، جەلال مستەفا ڕێژی، عەبدولقادر محەمەد عەلی زەنگەنە، ئەحمەد قەرەداغی).
ئەوسا بودجەی عێراق کەم پارە بوو، قوتابی لە پلەی ناوەندی ساڵانە دوو دیناری دەدا، قوتابیی هەژار لەم پارەیە دەبەخشران. لە کەرکووک ناسیاو سەریان لێ دەدایەن، مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی مەلای مزگەوتی قەردارەکان بوو، دەچووینە زیارەتی و ڕێزی دەگرتین و ئامادەی یارمەتیدانمان بوو. لەو ساڵانەدا لە عێراق مامۆستا بۆ قوتابخانەکانی ناوەندی و ئامادەیی ئەوەندە نەبوو، لە سوریا و لوبنان و فەلەستینەوە مامۆستامان بۆ دەهات. لە باسی چلەکاندا کاتی شۆڕشی مارسی ١٩٤١، لەبارەی خوێندنەوە دەڵێ: حکوومەتی نوێی بەریتانیا دژی قوتابی وەستا و بەکەلۆریا دواخرا لە سەرەوەش پێش هەفتەیەك لە ئەیلوول تاقیکردنەوەی بەکەلۆریا جاڕدرا پرسیارەکانیش زۆر قورس بوون، ئیکمال لە ئارادا نەما، یان دەرچوون یان دواکەوتن. لە پۆلی سێیەم (١٥٠) قوتابی چوونە تاقیکردنەوە (١٦)مان سەرکەوتین و ناچار ئەوانەی دیکەمان مانەوە بۆ ساڵی داهاتوو لە پۆلی سێیەم دەوامیان دەکردەوە[٢١٧].

بەپێی سەرژمێرییەکی تر ژمارەی قوتابخانەکانی کەرکووك لە سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولسەلام عارف لە خوار لە ژمارەی قوتابخانەکانی شارەکانی تر بوو. بەتایبەتیش لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا. بڕوانە خشتەی ژمارە (٤٤).

**خشتەی ژمارە (٤٤) [٢١٨]**

ژمارەی قوتابخانەکانی ناوەندی و سەرەتایی ڕەسمی (بێ قوتابخانەی تایبەتی و ئەهلی و بیانی شەوانە) لە ساڵی خوێندنی ١٩٦١-١٩٦٢ لە کوردستاندا.

| ناوی لیوا | ژمارەی قوتابخانەی ناوەندی | ژمارەی قوتابخانەی سەرەتایی | خانەی مامۆستایانی کوڕ و کچ | ژمارەی دانیشتووانی لیواکە |
|---|---|---|---|---|
| مووسل | ٣٦ | ٤٧١ | ٢ | ٧٦٣٨٦٠ |
| هەولێر | ١٧ | ٢٣٦ | ٢ | ٢٨٢٤٨٧ |
| سلێمانی | ١٩ | ٢٢٩ | ٢ | ٣١٦٨٣٣ |
| کەرکووك | ١٥ | ٣٣٢ | ٢ | ٤٢٢٥٠٨ |

(٢١٧) مستەفا نەریمان بیرەوەرییەکانی ژیانم، بەغدا ل ٢٧. بەپێی قسەکانی مێژوونووس ئەمین زەکی بەگ لە سییەکاندا لەکۆی (٢٤) قوتابخانەی لە لیوای کەرکووکدا تەنیا قوتابخانەیەکی کوردی هەبووە، یانی دەری دەخات خوێندن لە کەرکووك لە سییەکانەوە دەستی پێ کردووە نەك لە پەنجاکان بڕوانە أ.پ.عن التعليم في كردستان و د.عبدلفتاح علي بوتاني»، مدرسه ١١ أدار.

(٢١٨) أ. پ. التعليم فى كردستان العيراق، ل ٤٨.

وەکو دەزانین بە هۆی سیاسەتی نەژاد پەرستانەی نەتەوەیی و هەوڵدان بۆ گۆڕینی سیمـای کـوردیـی ئـەم شارە، بـەتوندی کـەوتوونـەتـە نـانـەوەی جیـاوازیـی نـەتـەوایـەتـی و نەهێشتن و ڕێگەگرتن لـە بڵاوبوونـەوەی خوێندن بـەزمـانـی کوردی. لـەم بـارەوە کـەرکـووك بەزەقی و ڕاستەوخۆ کەوتووەتە ژێر فشاری دوژمنانەوە، ئەم سیاسەتەش لە کۆنەوە هەبووە و ئەمڕۆش لە جاران پتر بووە و پەرەی سەندووە. لە سییەکانەوە جیاوازی نایەکسانی لە نێوان نەتەوەکانی ناو کەرکووك پیادە کراوە، (٢٤٪)ی مووچە خۆرەکانی کورد دانراون و لە کۆی (٢٤) قوتابخانەش لەهەموو لیواکە تەنیا (١٣) قوتابخانەی کوردی هەبووە[٢١٩].

ئـەم حـاڵـەتـە تـا ڕێککـەوتـی ئـاداری ساڵـی ۱۹۷۰ درێژەی کێشا، لـەو چوار ساڵـەشدا (خوێندنی کوردی) دوای هەوڵێکی زۆر ئینجا جێبەجێ کراوە. یەکێتیی قوتابییانی کوردستـان. بـەخورتـی کـەوتوونـەتـە کـارکردنـی بۆ جێبـەجێ بـوونی خوێندن بـەزمـانـی کوردی لەم شارەدا.

بڕیار وا بوو لە ساڵی خوێندنی ۱۹۷۱–۱۹۷۲ لە ناوچە کوردنشینەکانی کەرکووکدا خوێندن بکرێتە کوردی، بەڵام کاربەدەستان کۆسپیان دروست دەکرد. دەیانگوت دەبێ پێ بەپێ و وردە وردە پۆل بەپۆل بکرێتەوە، ئەمەش بیانو بوو. یەکێتی قوتابییانی کوردستـان – لقی کەرکووك ئەوکات بۆ فشار خستنە سەر دەسەڵاتداران بۆ خێرا ڕێگەدان بەخوێندنی کوردی ڕاپرسییان لە کفری و کەلار تا پردێ و ئاغجەلەر و سەنگاو تا ریاز و حەویجەش ئەنجام داوە، ئاکام لە قازانجی خوێندنی کوردی کار بەرەو پێشەوە چووە. بەڵام بەرپرسانی پەروەردەی کەرکووك بەبیانووی ئەوەی هەموو قوتابییانی کەرکووك کوردنین هەڵسان لەناو قوتابییانی ناوەندی و دواناوەندی ڕاپرسییان کرد، ئەویش لە قازانجی خوێندنی کوردی تەواو بوو. بۆ جارێکی تر بەبێ ئاگاداری یەکێتی قوتابیانی کوردستان ڕاپرسییەکی تازەیان کرد و ئەویش لە قازانجی خوێندنی کوردی تەواو بووە ئـەگـەر چی هـەڕەشەو چارەسەرکردنـەوەشی لـەگـەڵ دابوو. لـەم پێنـاوە یەکێتی نـاوبراو خۆپیشاندانی سازدا و لەئاکامدا پرۆسەی خوێندن پەکی کەوت. (لێژنەی شوێن شمال) هـات و جارێکی تریش هـات، لە جاری دووەم خۆپیشاندان لە ئامادەییی کەرکووکی کوڕان و ئامادەییی کەرکووکی کچان رحلەکانیان هێنایە سەر شەقام.[٢٢٠]

---

(٢١٩) عن التعليم في كوردستان العراق. ص١١.

(٢٢٠) ڕۆژنامەی برایەتی، زاهیر ڕۆژبەیانی، خوێندن لە کەرکووك بەزمانی زگماکی پۆل بە پۆل ژ (٢٧٧٩) چوارشەممە ١٩٩٩/٢/١٧. ل٦.

مەسەلەی خوێندن بەزمانی کوردی لە شاری کەرکووکی نەوتدا پێویست بە پێداچوونەوە و بیرەوەری نووسینەوە هەیە. شارێکی کۆن، دەیان زانا و شاعیر و نووسەر و ناوداری گەورەی کوردی لێ هەلکەوتووە. لە سییەکان و شەستەکان بەم جۆرە، سیاسەتی نەژاد پەرستی و جوداخوازییان دژی بەکارهێناوە و لە (١٩٧٠-١٩٧٤) یش مەسەلەکە توندتر کەوتووەتە ناو باسانەوە. دوای ناونانی ئامادەیی کوڕانی (کوردستان) و (ئامادەیی کچان بە چەمی ڕێزان) ناحەزانی کورد پتر کەوتنەتە گومان و فشارهێنان، ئەم جارەیە بە بیانووی نەبوونی مامۆستا ویستوویانە یەکی خوێندنی کوردی بخەن، بۆیە کەوتوونەتە خۆ و مامۆستای (متطوع) کەوتوونەتە دەرس گوتنەوە بۆ ئەوەی خوێندن بە زمانی کوردی بەردەوام بێ. لەناو شاردا مامۆستای کورد و ئاشووری لەخۆ بردووانە بێ پارە دەستیان بە دەرس گوتنەوە کردووە، مامۆستاکانیش هەندێکیان ئەمانە بوون. محەمەد مەجید ژەنگاری بەڕێوەبەری ئامادەیی کوردستانی کوڕان و سەمیرە موفتی بەڕێوەبەری ئامادەیی چەمی ڕێزانی کچان. ئەم مامۆستایانەش ناویان تۆمارکراوە. محەمەد پیرۆز، سویحی داودی، محەمەد ڕەشید مەلا عومەر، ئەحمەد مەلا کەریم، سەرمەد زەکۆ (ئاشووری بوو)، جوان نامق، نەوزاد محەمەد ساڵح، ست سامیە (ئاشووری بوو)، یووسف سەعید، نەجمەدین کەریم حاجی، شێرزاد عەبدوالواحید و دەیانی تر. بەم جۆرە خوێندنی کوردی بووە واقیع و لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە تا شەشی ئامادەیی قوتابییان دەرسەکانیان تێکڕا بە کوردی دەخوێند[٢٢١].

خوێندن بە زمانی کوردی لەم شارە دێرین و مەزنەدا، گەلێك بەسستی و کزی بەڕێوەچووە. هەرچەندە گیانی کوردایەتی و نیشتیمان پەروەری بەهێز بووە، بەڵام ئابڵۆقەیەی توند خراوەتە سەر کوردەکانی ئەم شارە لە باری ڕۆشنبیری و بەکارهێنانی زمانی کوردی. تا دەگاتە ئەوەی جارێکی لە چوارچێوەی ڕاگواستن و بەعەرەبکردنی دەسەلاتدارانی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٠ ڕایان گەیاند کە بەرەسمی زمانی کوردی لە قوتابخانە کوردییەکان قەدەغەیە و هەرچی سەرپێچی ئەم بڕیارەش بکات، بەتوندی سزا دەدرێ.

---

(٢٢١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەپێ زانیارییەکانی کاك تارق جامباز کە لە ٢١/١/٢٠٠٠ لە دیدارێك بۆی باس کردم گوتی: لە سەرەتای حەفتاکان لێژنەیەك هات لە هەولێر تەنیا (٧) کەس داوایان کرد بە زمانی تورکمانی بخوێنن. بەڵام جێبەجێ نەکرا، چونکە دەبووایە (٢٠) کەس داوابکەن، بەڵام لە کەرکووك کرایەوە.

## کفری و قوتابخانەی کچان

ساڵی ١٩٣٣-١٩٣٤ یەکەم قوتابخانەی کچان لەکفری کراوەتەوە. بەهەرحاڵێك دە پانزدە کچ پەیدا کرا، خانووەکەی عوسمان ئەفەندییان بۆ گرت کە لە ناو کۆڵانێکدا بوو، مامۆستایەکی ئافرەت ناوی (ئەماستیك) بوو لە کەرکووکەوە نەقل کرا، ئەویش هەر عەبای بەشانەوە بوو، بەڵام پێچەی بەڕووەوە نەبوو. بووە سەیرکەری خەڵکەکە، ڕۆژێکیان شاگردە خەیاتێك خۆی سەرخۆش کرد و لە پێچی کۆڵانەکەدا پڕی بردە سەر (ئەماستیك) و ماچی کرد، ئەو ئافرەتە بەستەزمانە ڕۆژی دووەم گەڕایەوە کەرکووك و ئەو ساڵە قوتابخانەکە داخراو کوڕە خەیاتەکەش شەش مانگ حەپس کرا. (٢٢٢)

لە مەڕ خوێندن لە شاری کفریی سەر بەکەرکووك، مامۆستا مستەفا نەریمان لە یادداشتەکانیدا بەم جۆرە باس لە وەزعی پەروەردەی کفری و ناوچەکانی دەوروپشتی دەکا و دەڵێ: ساڵی ١٩٣١ چوومە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی و لە پۆلی پێنجەم (٥) کوڕە بەگزادەش لە کەلار هاتنە قوتابخانەی کفری، لە قەرە تەپەش دوو قوتابیی تر هاتبوونە هەمان قوتابخانەو لەهەمان پۆل، چونکە لەم دوو شوێنە هەتا پۆلی چوارەم قوتابخانەیەکی ئەوەلی هەبووە. بەڕێوەبەری قوتابخانەمان ڕەحمەتی (ڕەشید عاکف هورمزی) بوو، لە پۆلی شەشەم (سەعید بەسیم) لە کەرکووکەوە هات و بووە بەڕێوەبەر. ئەم زاتانەش مامۆستا بوون (خلووس بەگ، نامیق ئەفەندی کەرکووکی، جەلال ئەحمەد کەرکووکی، حاجی مەلا حسێن، حەکیمی مستەفا ڕێژی، مستەفا ڕێژی، مستەفا ئیبراهیم، بەهجەت فەتاح وەناوی، مەجید نەجم). سەرجەم مامۆستاکانمان تورکمان بوون، هەندێکیان تورکچێتیشیان دەکرد و کتێبی تورکییان بەسەرماندا دابەش دەکرد. ئەو کتێبانەی کە لە تورکیا لە سەردەمی مستەفا کەمال دەخوێندرا بەهۆی بڵاوبوونەوەی پیتی لاتینی لە ساڵی ١٩٢٨ لەغو کرابوون، من لە پێشدا تورکمانیم نەدەزانی، ناچار نیشتمە سەری و فێری بووم. هەندێك لەو مامۆستایانەمان ڕقیان لە قوتابییە کوردەکان دەبووەوە بە زۆری زۆردار تەنگیان پێهەڵدەچنین.

باوکی ڕەحمەتیم لە سییەکانەوە تا پەنجاکان لەچاو ئەو ڕۆژگارە لە ڕیزی ناودار و ڕۆشنبیر و دەوڵەمەندەکانی ناو شار بوو، ئەندامی شارەوانی بوو، پوولی مالیە و کتێبی کوردیی دەفرۆشت.

---

(٢٢٢) مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل٢٧ ساڵی ١٩٤٩ش قوتابخانە لە سەنگاو کراوەتەوە.

ئێمە لە پلەی سەرەتایی وەك مامۆستایانمان تورکمان بوون، کتێبەکانیشمان بەتورکی بوو. سروودیشمان هەر بەو زمانە بوو وەك (قیرلرنده گینرندگن بو طوپراغ): (اوزنده والغالانان ئالی بایراغ) واتە دەشت و دەری ئەم خاکە بگەڕێی دەبینی بەیداخی سووری لەسەر ئەشەکێتەوە. ساڵی ۱۹۳۳کە مەلیك فەیسەلی یەکەم کۆچی دوایی کرد، یەك دوو مامۆستای عەرەبیان بۆ فێرکردنی سروودی عەرەبی نەقلی ئێرە کرد (کفری) لەوانە (. یاسین و محەمەد سەدیق) بوون. دوایی چوونە کۆلیجی سەربازییەوە بوون بە ئەفسەر (محەمەد سەدیق) هونەرمەند بوو. (۲۲۳)

## یەکەم سروودی کوردی

لەدرێژەی باسی خوێندن، بەسەرهاتی یەکەم سروودی کوردی لە خوێندن بەڵگەیەکی پتەوە کە چەند لە ناوچەکانی کەرکووك دژی زمان و خوێندنی کوردی بوون بەڕادەیەك کە سادەترین سروودی پەروەردەیی منداڵانیشیان پێ هەزم نەکراوە و پێ تەنگەتاو بوون. یەکەم مامۆستا کە سروودی کوردیی بە قوتابییانی کفری وتبێت ئەوەبوو. (محەمەد خورشید داودی) ساڵی ۱۹٤۰ سروودی (ئەی تۆیەکە فتبۆڵەکە)ی فایق بێکەسی بەقوتابییەکان گوتووەتەوە و لەسەر ئەوە کەوتووەتە ژێر پرس و لێکۆڵینەوە (۲۲٤) یانی ناوهێنانی خوێندن بەکوردی بقە بووە، تەنیا خوێندنی سروودی کوردی و فێرکردن منداڵان بەزمانی کوردی، لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە و سزای بەدواوە بووە. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە خوێندن بە کوردی لە کفری و ناوچەکانی دەوروپشتی زۆر دواکەوتووە و خوێندن بەزمانی تورکی بووە.

## ڕۆشنبیرانی سییەکان

دەبێت لەمەڕ خوێندەواری و وشیاری لە کفری باس لە ڕۆڵی ڕۆشنبیریی ئەو سەردەم و ڕۆشنبیرانی کفری بکەین. لەو ڕۆشنبیرانەی کە شوێن پەنجەیان لەم شارەدا ماوەتەوە شاعیر (خەلیل منەوەرە ۱۸٦۳-۱۹۲۳) کە دژی چەوسێنەر وەستاوە. ئەو چەوسێنەرە هەرکێیەك و هەر چییەك بووبێ. لەم ناوچەیە (حەمە بەگی فەتاح بەگی جاف) کە ئەندامی پەرلەمان بوو، لەگەڵ حەوت نوێنەری پەرلەمان کە دوانیان خەڵکی ناوچەکە

---

(۲۲۳) مستەفا نەریمان بیرەوەرییەکانی ژیانم، دار الحرية للطباعة، بغداد ۱۹۹٤، ل۳۰

(۲۲٤) هەمان سەرچاوە . ل۳۱.

بوون یادداشتێکیان دایە میری، داوای مافی ڕۆشنبیری و زانستییان کرد، هەر حەمە بەگ خۆی ساڵی ١٩٢٩ لە شاری کەرکووك بەرامبەر سەرۆك وەزیران (جەعفەر عەسکەری) لە یانەی فەرمانبەران ڕاوەستاو داوای ئەو مافانەی کردووە. (سەید محەمەد جەباری و سەید ئەحمەدی خانەقا) پشتیان گرت. ئەوەش دەبێ لە بیرمان نەچێ کە (حەمە بەگ) یەکەم کەسە کە لە ئاوایی (کەلار) قوتابخانەی کردبووەوە. لە شەڕی ئاوباریك لە تەك عەشیرەتی جاف، شاعیر محەمەد ئەمین بەگ (مینە) بەشداریی شەڕی لە تەك شێخ مەحمود کرد[٢٢٥].

هەروەها لە سییەکان و چلەکاندا ئەم ئەدیب و شاعیرانە لە ناوچەی کفری و دەوروپشتی هەبوون. (حەقی داودی ١٨٩٦-١٩٧٩)، (محەمەد شوکری قەرەداغی ١٨٩٢-١٩٦٧)، (مەلا سمایلی ناوجاف ١٨٧٦-١٩٤٨)، (مەلا ئەحمەدی زەنگەنە ١٨٨٤-١٩٥٨)، (جمۆ بێ ناو ١٩١٠- ١٩٨٢)، (محەمەد قەرەداغی ١٩١٥-١٩٧٣)، (قادر میراخوڕ١٩٠٥-١٩٧٤)، (قەمەر بەگلەر ١٨٩٦-١٩٧٨)، (محەمەد سەعید جاف ١٩٢٩)، (د. موکەرەم جەمال تالەبانی ١٩٢٣)، (سامی عەلی دەلۆ ١٩٢٤)، (مستەفا نەریمان)، هتد... [٢٢٦]

**بەسەر هاتی قوتابخانەی دێ**

خوێندەواری لە گوند و لادێیەکاندا، بەسەرهات و چیرۆکی خۆی هەیە. ڕووبەڕووبوونەوەی خوێندەواری و زەمینە سازدان و هاندانی خوێندن دوو ئاراستەی پێچەوانەی یەکترن و گەلێك ڕووداوی بەدواوە هاتووە. کوێرەرەری و دەسەڵاتی ئاغا و کوێخای گوند و هەژاری و دواکەوتوویی و زاڵیی دەسەڵاتی ڕۆحی دینی، گەلێك جاران ڕاوی ئەو کۆششانەیان کردووە، کە پرۆژەی خوێندەواری و فێرکردنی لە گوندەکان بڵاو کردۆتەوە. بۆ ئەو کاتانە خوێندن لە مەکتەب «فەرمەسۆنی» بووە. بۆیە بەرەیەکی فراوان و دژوار لە ئارا بووە. ڕووبەڕووبوونەوەی سەخت و هەناسەی درێژی گەرەك بووە. لە پارێزگاری کەرکووکدا. لە گوندە دواکەوتوو و هەژارەکاندا کە نموونەی زۆربەی هەرە زۆری کوردستانە، بەم جۆرە خوێندەواری بڵاو کراوەتەوە.

---

(٢٢٥) هەمان سەرچاوە. ل ٣٨

(٢٢٦) هەمان سەرچاوە ل١١٠ .

ئەو ناوچانە هەژار و پڕ لە کوێرەوەری بوون، گەرماو نەبوونی و برسیەتی و نەخوێندەواری تاوی لێ هەستاندبوون... خەڵکێکی برسی و هەژار، ناوچەیەکی دواکەوتوو، پڕ لە نەخۆشی... پاشماوەکانی شەڕ و پێکدادان یەکجاری ناوچەکەی وێران کردبوو. شاعیری ئەم دەڤەرە شێخ ئەحمەدی شاکەلی (١٩٠٣-١٩٨٢) لەمەڕ مەینەتییەکانی ئەم ناوچەیە وەها دەبێژێت:

**وەرە (نازی) تەماشاکە کەلاوەی کاکی کولیایی**

**نیاز و نازی چی شێخم مەنازە چەرخی مینایی**

**گەلێ شێخی بەشاخا دا بناغەی ئاغەشی دەرکرد:**

**ئەمیری زۆری زۆرداری لە بن هێنا بە ئەسپایی**

ئینجا دەڵێت:

**هەموو فەننی ئەفەندی بوو هەژاری فەوتی نانێ کرد:**

**کە کاتێ شاری جێ هێنـا خزایە ژووری ئاوایـی**

**بەسە حەرفێ لەبۆ کەس، کاکە: نۆبەی خاڵۆ (حاجی)یە**

**ئەویشم لێ بووەتە ئاغایێ بە زۆری قاوەوچایی.**

مستەفا نەریمان لە باسی ساڵی ١٩٤٧ دا وەها لە مەڕ قوتابخانەی گوندەکان دەدوێت: وەك ماموستایەك چوومە (کوڵە جۆ) کە کەوتبووە ناوچەی (زەند ئاباد – زەنگابات)ەوە بەشوێنێکی پڕ لە نەخۆشی و دوور لە قەڵەم درابوو. چونکە ڕێگەی نێوان جەلەولا و سلێمانی هێشتا قیرتاو نەکرابوو. جارێ خوم بە تەنیا چووم ڕوانیم دەرگای قوتابخانە داخراوە. ناردم فەراشەکەی هات ناوی (ئەمین عیراقی) بوو دەرگای کردەوە و خۆم پێ ناساندو وتم من ماموستای نوێم هاتووم دەرس بڵێمەوە، زەردەخەنەیەك گرتی، وتی ماموستا پێش تۆ هەر ماموستایەك هاتبی وایان وتووە و نەیانبردووەتە سەر، وتم بێ ئێوارێ یەك بەیەك برۆ قوتابییەکانم بۆ بانگ بکە (مەلا حمە سعید)ی پێش نوێژی مزگەوتەکەشم بینی، بەویشم ڕاسپارد هەروەها ئامر مەخفەر (ئەحمەد بەگی دەلۆ)، بۆ ڕۆژی دووەم، ژوورەکانمان ئامادەکرد و (٢٠) منداڵمان بۆ حاز رکراو یەك یەك پرسیارم لێ کردن کە لەچی پۆلێکدا بوون، هەندێکیان پۆلی خۆیان لە بیر چوویبووەوە، تەماشای تۆمارگەکانم کرد ناوی (١٠) کەسیانمان دۆزییەوە هەندێکیان لە پۆلی یەکەم و

هەندێکیان لە دووەم و سێیەمدا بوون، ئەو هەفتەی لەوێ بووم توانیمان (٥) منداڵی کەش بێنین بەمە ژمارەیان گەیشتە (٢٥) منداڵ و دابەشم کردنە سەر دوو پۆل (یەکەم و دووەم) و ناوی خوام لێ هێنا لە بەیانی زووەوە تا عەسر خەریکی دەرس وتنەوە بووم.

لە دوا ڕۆژەکانی نیسانی ١٩٧٤ پشکنێر (فاتح مستەفا) هاتە قوتابخانەی (کوڵە جۆ) ئەمە یەکەم جار بوو پشکنێر ئەم ناوچەیە ببینێ، بە تاقی تەنیا بە دوو پۆل دەرس دەڵێمەوە زۆری پێ خۆش بوو.

زەنگەبات بریتی بوو لە (٤٠-٤٥) ئاوایی، ماڵم لە (بانسندووق) بوو، لەگەڵ پشکنێر دوو بە دوو بە پیاسە لە (کوڵە جۆ) گەیشتینە بانسندووق کە لێك نزیکن، عەلی بەگ خاوەنی دێ هاتە پێشوازییەوە بردنیە دیوەخانەکەی، زۆری خزمەت موفەتیش کرد ئەویش بە تورکی لە من هەندێك پرسیاری کرد دەربارەی قوتابخانەی ئەم ناوچەیە و عەلی بەگ لە تورکمانی دەگەیشت پێی وت من بۆ ساڵی داهاتوو قوتابخانەیەك دروست دەکەم، ئێوەش مامۆستام بۆ بنێرن ئەویش وتی لەم ناوچەیە هەر لە کوڵە جۆ قوتابخانە هەیە، لەبەر ناخۆشی و ناسازیی شوێنەکە هیچ مامۆستایەك ڕوی تێ ناکات، خانوویەکیش بۆ مامۆستا نییەو قوتابخانەکەشتان داڕزاوە، فاتح بەگ لێی پرسیم چی دەڵێت قوتابخانەکەی (کوڵە جۆ) بگوێزینەوە ئێرە (عەلی بەگ) هەڵیدایە و وتی زۆر باشە، منیش ئێرەم لەوێ پێ خۆشتر بوو، مامۆستاش لێرە زیاتر ئەحەسێتەوە. ئێوارە بۆ پیاسە چووینە دەرەوە، فاتح بەگ بە عەلی بەگی گوت، تۆ ئەگەر لەسەر ئەم گردە خانوویەکی سێ ژووری لەم هاوینە دروست بکەی و حەوش و خانوویەکیش بۆ مامۆستا و (٣٠) قوتابی پەیدا بکەی، ئەمر دەدەم قوتابخانەکەی کوڵەجۆ بهێنێتە ئێرە. ئەویش دەستی دا بە سنگییەوە بەمنی وت مامۆستا ئەم هاوینە لێرە سەرپەرشتیی ئەمە بکە، وتم بە مەرجێ ساڵی داهاتوو نەقلی کەرکووك بکرێم.

دوای گەڕانەوەی موفەتیش لە مایسی ئەو ساڵەدا هاتنی ئەو زاتە و بڕیارەکانیم لە دانیشتووانی ئاوایی (کوڵە جۆ) گەیاندو ئەوانیش بڕیارەکەیان لا گران بوو، منیش پێم وتن ئەمە (٢٠) ساڵێکە قوتابخانەتان هەیە، نەتانتوانیوە بینایەکی چاك دروست بکەن و مامۆستا بەخێو بکەن و (٤٠-٥٠) قوتابی پەیدا بکەن. ئەمە سەرەنجامی هەڵسوکەوتی ئێوەیە بەرامبەر زانست و مامۆستاو قوتابخانە[٢٢٧].

لە درێژەی چیرۆکی خوێندەواری لە دێهاتەکانی ئەم دەڤەرە مستەفا نەریمان درێژەی

(٢٢٧) هەمان سەرچاوە ل ١٠٣.

پێ دەدا و دەڵێ: لە دووەم هەفتەی ئەیلوول قوتابخانەکەی بانسندووقمان کردەوە لەم قوتابخانەیە (٢٠) منداڵ لە خودی ئاواییەکە بە کوڕ و کچەوە بۆ پۆلی یەکەم ئامادە کرا و (١٥) قوتابی لە قوتابخانەی کۆنی کوڵەجۆوە هەموو ڕۆژێ دەهاتن تا دوایی ساڵ دە کەسیان بەردەوام بوو کە لە پۆلی دووەم و سێیەم بوون و لە ئاواییەکانی دەورویشتەوە نزیکەی (١٠) قوتابی تر هاتن کە خۆم یەك بە یەك چوومە ئەم ئاواییانە بۆ منداڵ خڕ کردنەوە (قەرەبلاغ، سێ تەپان، تازە شار، حاجیلەر) بە ڕادەیەك ساڵی نوێی داهاتوو ١٩٤٧-١٩٤٨ ژمارەی قوتابیانمان نێوانی (٤٠-٤٥) قوتابی بوون. بۆ فێرکردنیان مەنهەج و جەدوەلێکی تایبەتیم دانا هەر لە بەیانییەوە تا سەعات دوو بە دوو وەجبە فێرم دەکردن لە سەعات (٨) بۆ (١١) بۆ پۆلی یەکەم و (١١) ەوە بۆ لە(٢) بۆ دووەم و سێیەم.

ئەو ساڵە چوومە ئاواییەکانی دەورویشت بۆ ئەوەی گەورەکانیان هانندەم چاو لە عەلی بەگ ببڕن و قوتابخانە بکەنەوە، وەك قەرەبلاغی گەورە، کە هی شێخ حە مەنەجیبی شێخ وەهابی تاڵەبانی بوو، ئەوەندەی پێ نەچوو ئەو ساڵی دووەم قوتابخانەی کردەوە، (سێ تەپان)ی (حەکیم ئەفەنیی وەناوی) لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانە نەبوو، (حاجیلەر) بەموڵکایەتیی عائیدی بەهجەت بەگی مەجید پاشای بابان بوو، برایم حەمە خانی گێژ کوێخا و وەکیل بوو، ئەویش وەعدی کردنەوەی قوتابخانەی دا (کۆکز) موڵکی حەمە ڕەشید بەگی جاف بوو، کە باسی کردنەوەی قوتابخانەم لە لا کردەوە پێی ناخۆش بوو وتی (کاك سەید بی قەزا بێ دەتەوێ منداڵە جووتیارەکان ببن بە مەحامی) لە سەر ئەمە مشتومڕمان بوو ئیتر نەچووم بەلایدا و ئەویش حەزی لە چارەم نەدەکرد[٢٢٨].

ئەمە واقیع حاڵی ئەم گوند و دەڤەرانە بووە، کە نەخوێندەواری و نەخۆشی و کوێرەوەری بەشی ژمارەیەکی یەکجار زۆری گوندەکانی کوردستان بووە. بۆیە مەسەلەی خوێندەواری ڕووبەڕووی گەلێك کێشە بووە، بە بێگومان (٥٠) ساڵی بەر لەویش وەزعەکە سەختر بووە. پاشکەوتن و دواکەوتوویی و زاڵبوونی عەشایری و خێڵەکی و دەسەڵاتی دەرەبەگی و فکری دواکەوتوویی و زاڵیی ڕۆشنبیری و پەروەردەی ڕۆحی دینی، کاریگەری فرە فرەی لە سەر کۆمەڵگا هەبووەو ئەم کاریگەرییە تا ئەمڕۆش لە شێوازی تر خۆی دەردەخاتەوە.

بەهۆی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمانە ناوچەکە بەجوولە کەوتبوو، ڕۆشنبیر و

---

(٢٢٨) هەمان سەرچاوە، ل ١٠٧.

خوێندەوارانی کورد، ئەوانەی گیانی کوردایەتییان تێدا بوو، هەوڵیان دەدا لە تەك بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری جموجۆڵی کۆمەڵایەتی، باسی سیاسی و مەینەتییەکانی کوردیش بێخنە نێو باسانەوە، دروست بوونی ڕێکخراوی نهێنیی سیاسی و بوونی کاریگەریی جوولانەوەی شێخ مەحموودی نەمر لە سەر ناوچەکە و کۆماری کوردستان لە مەهاباد و بڵاوکردنەوەی دەنگوباس لە نێو خەڵك، بوونی حزبی هیوا لە ناوچەکە و بڵاو بوونەوەی ئەندام و هەوڵەکانی لەو ناوچەدایە کاریگەریی زۆری لەسەر ڕەوشی ڕۆشنبیری و خوێندەواری بەجێ هێشت. لە چلەکاندا بووژانەوەی کوردایەتی و خوێندەواری هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بە تایبەتی (ژین و گەلاوێژ و دەنگی گێتی تازە) دەهاتنە کفری. ڕۆشنبیران و هەندێك لە دانیشتووانی شار و دەوروپشتی دەیانخوێندنەوە لە ناوچەکەدا نزیکەی (٥٠) ئابوونەیان هەبوو لە گۆڤاری گەلاوێژدا. سابیری خاڵی مستەفا نەریمان باوەڕ پێکراوی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانە بووە[٢٢٩].

بەم جۆرە خوێندن و کرانەوەی قوتابخانە لە ناوچەکانی کەرکووکی بە نەوت داخکراو، پەرەی گرتووەو ڕوویەڕووی دژواریش بووەتەوە. کەرکووك نەك هەر لەرووی گۆڕینی ناسنامەکەی، بەڵکە بەتوندیش کەوتووەتە ژێر فشاری نەهێشتنی خوێندن بەزمانی کوردی. ئەگەر کەرکووك ستراتیژی نەگۆڕی مەسەلەی سیاسیی کورد بێ، بەهەمان شێوەش لەڕووی زمان و خوێندن و ئەدەبیاتیش هەر وا دەمێنێتەوە. بەشێکی زۆری خوێنەرو ئەدیب و مامۆستا و دەرچووانی زانکۆ و قوتابخانە بالاکان لەم شارە چوونەتە بەر خوێندن و یەکتریان ناسیوە و گیانی تەبایی و هاوکاری و تێکەڵبوونی کوردایەتی تێیاندا دروست بووە.

بەداخەوە بەهۆی ئەو زوڵمەی لە کەرکووك کراوە، ئێمەش دەست کورت ماینەوە نەمانتوانی وەکو پێویست ئامار و ژمارە و سەرژمێری پێویست بۆ خستنە ڕووی پتری واقیعی خوێندن و خوێندن بەزمانی کوردی لەم شارە کوردییە نەوتاوییە بخەینە ڕوو.

---

(٢٢٩) هەمان سەرچاوە ل ١٠٩.

# خوێندن لە بادینان - پارێزگای دهۆك

دەڤەری بادینان، یانژی بلێین پارێزگای دهۆك، ناوچەیەكی بەر فراوان، دانیشتووانێكی سادەو دەستپڕۆیشتوویی پەیوەندیی كۆمەلایەتی دەرەبەگی عەشایری، روو لە شارستانی و خوێندن. دوژمنان بەهۆی گرنگی ئەم ناوچەیە هەمیشە هەولیان ئەوە بووە، بەدواكەوتوویی بیهێلنەوە، بەهۆی زاری ئاخاوتنی كرمانجیی سەروو. بەهۆی هۆكاری سیاسی دەیانەوێ، ئەم دەڤەرە وەكو بەشێكی جیاو جیاوازی لە دەڤەرەكانی سۆران لە كوردستانی باشوور سەیر بكەن، ئەمەش وای كردووە لە خوێندن زمانی عەرەبی تێدا زاڵ بێ.

تا درەنگانێكی سەدەی بیستەم، دهۆك و دەڤەرەكە وابەستەی ئیداری نەینەوا بوو. ئەگەر خوێندن بەزمانی كوردی لەم پارێزگایە دواش كەوتبێ، مانای ئەوە نییە لە كۆنەوە بەكوردی قوتابخانەی تێدا نەبووە، یا بەزمانی كوردی قوتابخانە نەكراوەتەوە، نەخێر ئەم ناوچەیە لە ژێر فشاری سیاسیی "پەرتكە و زاڵبەی" دوژمنان و بە ئەنقەست پشتگوێخستنی و پاشكەوتوویی هێشتنەوەی بووە.

لە سەردەمی عێراقی نوێی دروستكراوی سەردەمی ئینگلیزەكانیشدا، دژایەتیی خوێندنی كوردی لە نەینەوا و ناوچە كوردییەكانی سەر بەم پارێزگایە بەردەوام بووە. بەهۆی دژایەتیكردنی خوێندنی كوردی لەلایەن دەسەلاتدارانەوە، دژایەتیكردنی خوێندنی كوردی لە شاری مووسڵ بەشێك لەم سیاسەتە بوو(٢٣٠).

پێش ئەوەش بەهۆی بلاوبوونەوەی بزاڤی سیاسی لە دەڤەرەكە و گەیشتنی گۆڤار و رۆژنامە كوردییەكان و هەولی كەسایەتییە سیاسی و رۆشنبیرییەكان. مەسەلەی خوێندن بە زمانی كوردی بایەخی پێدراوە. لەویلایەتی مووسڵدا كوردیش هەولی داوە بایەخ بەباری رۆشنبیریی خۆی بدا. شێخ عەبدولسەلام بارزانی (١٨٧٤-١٩١٤) و

---

(٢٣٠) د. عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١ آذار، ل٤٧

لە دوای رێككەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، بایەخی زۆرتر بەخوێندن درا یەكیەتیی مامۆستایانی كوردستان لقی نەینەوا كەو تەخۆ بۆ ئەم مەبەستە و هانی خوێندن بە كوردی و كردنەوەی قوتابخانەی كوردی لە شاری مووسڵ دا.

ژمارەیەکیش کەسایەتیی کوردی لە شاری دهۆك، پاڵپشتی ئەو یادداشتەیان کرد، کە ساڵی ۱۹۱۱ بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەرز کردەوە، بۆ جێبەجێ کردنی خوێندن بە زمانی کوردی لە کوردستاندا، ئەم یادداشتەش بووە گرنگترین هۆکار بۆ ئەوەی سوپای عوسمانی پەلاماری بارزان لە نیسانی ۱۹۱٤ بدا شێخ عەبدولسەلامیش لە یەکی کانوونی یەکەمی ۱۹۱٤ لە مووسڵ لە سێدارە بدرێ.(۲۳۱)

یانی بانگەشەی خوێندن بەزمانی کوردی لای عوسمانییەکان مەترسی بووە بۆ سەر دەسەڵاتی پاوانخوازی ئەم دەوڵەتە زلە، وەکو چۆن ئەمڕۆش بەکارهێنانی زمانی کوردی و خوێندن و پەخشی ڕەسمی ڕاگەیاندن بەزمانی کوردی بە مەترسی بۆ سەر لەتبوونی تورکیا دەزانن.

عوسمانییەکان کە چوار سەدە حوکمی کوردستانیان کردووە، بایەخیان بە فێرکردن نەداوە. ساڵنامەی مووسڵ کە لە نێوان ساڵانی (۱۸۹۰-۱۹۱۲) دەرچووە دەری دەخات، کە لە چەند قوتابخانەیەکی ڕەسمی بەولاوە هیچ قوتابخانەی تر لە ناوچەی بادینان نەبووە. تەنیا یەك ئاماژە لە ساڵی ۱۸۹٤ هەیە کە (۱۱) مەکتەبی ئەهلی بۆ فێر بوونی منداڵان لە دهۆك هەبووە (۷) ی موسڵمانان و (۲) مەسیحی و (۲) جووەکان.(۲۳۲)

زاڵیی عوسمانییە دواکەوتووەکان، یەکجاری کێشەی ناوچەکەی قووڵتر کردبۆوە، دواکەوتن و نەخوێندەواری و کوێرەوەری و نەخۆشی، ئەو هێندە ژمارە کەمەی قوتابخانەش کە هەبوون، بەزمانی تورکی تێیدا دەخوێندرا، ڕاستە بزاڤی سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی گەلانی چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەهێز بوو، داوای خوێندنی بەزمانی زگماکی و چاپ و بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاریان بە زمانی خۆیان دەکرد، بەڵام زاڵی و باڵا دەستیی عوسمانییەکان تا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی درێژەی کێشا.

تا ساڵی ۱۸۹۲چ قوتابخانە لە دەڤەری بادینان، یانژی بێژین پارێزگای دهۆك نەبووە. دوای ئەم ساڵە یانزە مەکتەبی فێرکردنی ئەهلی لە دهۆك دامەزراوە. لەم قوتابخانانەدا تەنیا زارۆك فێری خوێندن و نووسین و دەرسی دینی دەکران.

لە دە ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەمیش لە دەڤەری بادینان هەندەك قوتابخانە لە شار

---

(۲۳۱) هەمان سەرچاوە ل۳۰.

(۲۳۲) هەمان سەرچاوە، ل۲۸.

و گوندەکان ڤەکران، بەم شێوەیە (٣) قوتابخانە لە ئامێدی و (٢) لە بامەڕنێ و (٢) لە ئەتروش و لەم گوندانەش هەریەکەو قوتابخانەیەکیان تێدابووە. مایێ بەرۆشکێ، سپیندارێ، بریفکا. سەرباری قوتابخانەکانی دهۆك و ئاکرێ و زاخۆ. بەپێی سەرچاوەکان پێداویستییەکانی ئەم قوتابخانانە لە لایەن خەڵکی دابین دەکران(٢٣٣).

لەم دەڤەرەدا وەکو سەرجەم کوردستان. خوێندن و خوێندەواری بۆ حوجرە و ڕۆڵی مەلایان دەگەڕێتەوە و ئەوانەی پیت پیت دەیانویست خوێندەواری لە کوردستاندا بڵاو بکەنەوە.

ساڵنامەی عوسمانی١٣١٠ کۆچی بەم شێوەیە باسی قەزای دهۆك دەکات ٦٦١٨ خێزان، (٤٥٧٠) موسڵمان و (١٥٥٨) مەسیحی و (٤٢٥) جوولەکە و (٧٥) یەزیدییە. ژمارەی دانیشتووانی نێرینەکان گەیشتە (٧١٦٢) کەس. هەروەها بەم شێوەیە باسی بینا و ئاوەدانکردنەوەی دهۆك دەکا. ژمارەی خانووەکانی (٣٩٩) و مزگەوت (٥)، تەکیە (١)، بارەگای حکوومی (١) خان (٤)، دووکان (٥٢) و ئاش (٦)، قوتابخانەی سەرەتایی و مەکتەبی منداڵان (٢)، کەنیسە (٢) بیستیان و باخچە (٣٥٨) کێڵگە (٣٢٤).

ساڵنامەی ساڵی ١٣١٢ش بەم شێوەیە ئاماژەی کردووە. خانوو (٣٩٢٩) دووکان و کۆگا (١٤٠)، خان (٧) ئاشی بەرد (٦)، کۆگای دانەوێڵە (٣٦٥)، مزگەوت (٤٥)، تەکیە (٤)، کەنیسە (٢٠) بارەگای حکومی (٢)، چایخانە (٢)، بیستان و باخچە (٥٠٨٠)، کێڵگەی کشتوکاڵی (١٩٦٩٦)، خەستەخانە (١) مەکتەبی ئەهلی (١٠) بۆ فێرکردنی منداڵان. هەر بەپێی ساڵنامە مەکتەبە تایبەتییەکان ژمارەیان گەیشتووەتە (١١)، کە (٧) یان هی موسڵمانان و (٢) ی مەسیحی و (٢) جووەکان بووە. (٢٣٤)

---

(٢٣٣) گۆڤاری دهۆك، ئێکەمین قوتابخانە ل دهوکێ، مسەدەق توڤی، ژمارە (٢) کانوونا دوێ ١٩٩٨، ل٤٠ بەپێی ساڵنامەی عوسمانی ساڵی ١٩٠٧-١٩٠٨ بەم جۆرە باسی چەند لایەنێکی زاخۆ کراوە، ژمارەی دانیشتووانی تەنیا نێرینە (٤٦٥٧) کەس بووە، دەوڵەتی عوسمانی سەرژمێری مێینەی نەکردووە. لەم شارەدا (١٩٠٠) خانوو، (١٥٠) دووکان و (٤) خان و حەمام و ئوتێل و (١٦) مزگەوت و دوو قوتابخانە و مەکتەب هەبوون دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١یش (٢٠) قوتابخانەی سەرەتایی و (١١) قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی و پیشەیی هەیە و ژمارەی دانیشتووانی پتر لە (١٦٠) هەزار کەس دەبن. بڕوانە گۆڤاری دهوك، نبذة عن تاريخ مدينة زاخو، د. عبدالفتاح علي بوتاني، المهندس جمال احمد خالد العدد (٢) كانون الثانى ١٩٩٨، ل١٠٨.

(٢٣٤) گۆڤاری دهۆك، دهوك فى السالنامات العثمانى، د. عبدالفتاح علي بوتاني، ژ (١) ل ٦١.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و چاوگێڕانەوە بە باری ڕۆشنبیری و مێژوویی کوردستاندا دەردەکەوێ کە مەسەلەی خوێندەواری بەشێوە ها و چەرخەکەی زۆر تازەیە و لە ناوچەکەش بە هۆی زاڵبوونی دەسەڵاتی عوسمانییەکان قوتابخانە و خوێندەواری لە تاریکی بوونە، حوجرە وژووری مزگەوتەکان شوێنی فێربوون بوونە، سەرباری سەختی گوزەران و ژیان و ئەوباج و سەرانەی لە خەڵکی هەژار و نەدار ستاندراوە، کە نەتەی لێ بڕیون بەوە ڕابگەن منداڵ و زارۆیان بنێرنە بەرخوێندن.

لە سەرجەم دهۆکدا ئەگەر لە سالانی (١٣١٠-١٣١٢کۆچی) (٤٩٢١) نێرینە هەبووبێ لە موسڵمانان و (١٧٤٧) مەسیحی و (٤٩٤) جوو هەبوون، بەپێی سەرچاوەکان ژمارەی قوتابییانی مەکتەبەکانی موسڵمان (٢٥٠) قوتابی و مەسیحییەکان (٧٥)، جووەکان (٤٢) قوتابی بوون. (٢٣٥)

دوای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق، وەزعی کوردستانیش لە هەندێك رووەوە گۆڕانی بەسەردا هات قوتابخانە لە سلێمانی و هەولێر و دهۆك و کەرکووك و هەندێك ناوچەی تر بەڕەسمی کرانەوە. لە دهوکیش ئەو گۆڕانکارییە سەرەکییە کاریگەریی هەبوو. ڕاستە بە پێی ساڵنامەی عوسمانی (١٩٠٧-١٩٠٨) ئاماژە هەیە کە قوتابخانەیەکی سەرەتایی ڕەسمی لە دهۆك هەبووە. (٢٣٦)

بەڵام وردەکاری و زانیاریی تەواو لەم بارەوە چەنگ نەکەوتووە، بەپێی قسەکانی (مسەدەق توڤی) لە کانوونی دووەمی ١٩١٩ قوتابخانەیەك دوای هاتنی ئینگلیزەکان لە دهۆك کراوەتەوە، بێ ئەوەی زانیاریی لە مەڕ تۆمار بکرێ. لە دهۆکدا بەم جۆرە دەست بەکردنەوەی قوتابخانە کراوە، کە لێرەدا هەندێك لەو سەرەتایە باس دەکەین.

## قوتابخانەی " المدرسة الملوكية الاميرية " لە دهۆك

قوتابخانەی (المدرسە الملوکیە الامیریە) یەکەمین قوتابخانەیە لە ڕۆژی ٧ ی تشرینی دووەمی ١٩٢٧ لە شاری دهوك کراوەتەوە، ئەم قوتابخانەیە هەندێك جار بە (المدرسة الاميرية)یش ناسراوە. بەڕێوەبەرەکەشی ئەحمەد حەمدی خەڵکی مووسڵ بووە. شوێنەکەی دەکەوێتە جێگەی هەفتەنامەی (پەیمان)ی ئەمڕۆ. هەر ئەم قوتابخانەیە لە

---

(٢٣٥) گۆڤاری دهۆك ژ (١) ل ٦١.

(٢٣٦) گۆڤاری دهۆك ژمارە (٢) ل ٤٠.

سەرەتایی سیێیەکان کرایە (قوتابخانەی دهۆکی کوڕان) و ساڵی ١٩٥١-١٩٥٢ قوتابخانەیەکی تر بە ناوی "قوتابخانەی دهۆکی یەکەمی کوڕان" دروست کرا و ساڵی ١٩٦٩- ١٩٧٠ ناوەکەی کرایە "سەلاحەدینی سەرەتایی".

ناوی مامۆستاکانی بەڕاستی دەست نەکەوتوون بەڵام لە نێوان ساڵانی (١٩٣٥-١٩٤٠) ئەم مامۆستایانە دەرسیان تێدا گوتووەتەوە (سەلمان داود)، (مەجید داود عەجاج)، (محەمەد سەعید مستەفا)، (محەمەد سەعید شاهین)، (بەشیر مستەفا عەبدوڵڵا)، (یوسف عەبدوڵڵا یوسف) ئەمانەش بەڕێوەبەرەکانی یەکەمین قوتابخانەی دهۆکن: (ئەحمەد حەمدی ١٩٢٢/١١/٧ تاکو ١٩٢٤/١٠/١)، (عەبدوڵڵا موخلیس لە ١٩٢٤/١٠/٧ تاکو ١٩٣٤/١٠/٢)، (نەزیر ئەلتالب لە ١٩٣٤/١٢/٣ تاکو ١٩٣٨/١٠/٣٠)، (ئەحمەد محەمەد ئەلدبونی لە ١ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٨ تاکو ٢٤ی ئابی ١٩٤٠)، (توفیق یونس شەریف ئاغا لە ١٩٤٠/٨/٢٤ تاکو ٢٤ئەیلوولی ١٩٤٨)، (ڕەشید عەبدوڵلاحەسەن لە ١تشیرینی یەکەمی ١٩٤١ تاکو ٦ی ئەیلولی ١٩٤٧)، (عەبدوڵڵا حاجی بەدری سندی لە ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٤٧تاکو ١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٥٧)، (فازل حەمید ئەلسەراف لە ٢ی شوباتی ١٩٥٧ تاکو ١٩٦٢/٩/٣٠)، (مستەفا حسێن پێدەیی لە ١٩٦٢/١٢/٩تاکو ١٩٦٤/٩/٣٠)، (سالح مەجید عباس ١٩٦٤/١١/١ تاکو ١٩٧٠/١١/١٩)، (نەسرەدین عەبدوڵڵا پێدەیی لە ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠ تاکو ١٩٧٢/٧/١)، (عارف سالح رەشید لە ١ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٢ تاکو ١٩٧٤/٢/٢٨)، (حەسەن حاجی نەعمان لە ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ تاکو ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٦)، (رەشید محەمەد مستەفا ئامێدی لە ٢٤ی تشرینی ١٩٧٦ (تاکو ١تیرمەهی ١٩٨٧)، (ئەحمەد محەمەد عەلی ساڵی ١٩٨٧ بووەتە بەڕێوەبەر)[٢٣٧].

بێگومان خوێندن لە دەڤەری بادینان بە زمانی عەرەبی بووە، ئەمە کاریگەریی تا ئەمڕۆش ماوە لە چاو ژمارەی دانیشتووانی دهۆك رێژەی وەرگیران و چوونە بەرخوێندن کەمە.

لە نێوانی ساڵانی ١٩٢٨ -١٩٣٥ تەنیا (٣٢٨) کەس چوونەتە قوتابخانە و لە ناویاندا تەنیا (١٥٠) کورد هەبووە ئەوانی تر (٦٣) عەرەب و (١٠) تورك و (٥) عێراقیش هەبوونە[٢٣٨].

---

(٢٣٧) هەمان سەرچاوە.

(٢٣٨) هەمان سەرچاوە.

وەلێ ئەگەر سەرنجی خشتەی ژمارە (٤٥) بدەین، مەینەتی خوێندەواریمان پتر بۆ دەردەکەوێ، کە نیشانی دەدا سالانە چەند قوتابی وەرگیراون و ئەم ڕێژەیەش لە هەلکشان و داشکان بووە. سالی وا هەیە هیچ قوتابییەك تۆمار نەکراوە و کەس نەچووەتە خوێندن.

**خشتەی ژمارە (٤٥)** (٢٣٩)

لیستی ئەوانەی لە سالانی ١٩٢٨–١٩٣٥ لە یەکەمین قوتابخانەی دهۆك خوێندوویانە بەپێی تەمەن و سالی لەدایکبوونیان

| سالی لەدایکبوون | ژمارەی قوتابی |
|---|---|
| ١٩١٤ | یەك قوتابی |
| ١٩١٥ | نییە |
| ١٩١٦ | ٦ |
| ١٩١٧ | ٨ |
| ١٩١٨ | ٨ |
| ١٩١٩ | ١٣ |
| ١٩٢٠ | ٧٤ |
| ١٩٢١ | ٣٣ |
| ١٩٢٢ | ٣٧ |
| ١٩٢٣ | ٤٨ |
| ١٩٢٤ | ٣٨ |
| ١٩٢٥ | ٣٠ |
| هەروەها (٩) قوتابیش سالی لەدایکبوونیان تۆمار نەکراوە لە نێوان سالانی ١٩٢٦–١٩٣٠. | |

(٢٣٩) هەمان سەرچاوە. ئەم قوتابخانانەش لە سالانی دواتر لەم شوێنانەدا کراونەتەوە. سالی ١٩٤٤ (لە ڕەبەسکێ و زرکە و سێمێل)، سالی ١٩٤٧ (لە شووشێ لە دەڤەری ئاکرێ) سالی ١٩٥١ قوتابخانەی باعەدرێ، شەنگار، سنیۆ، باران) کرانەوە، سالی ١٩٦٧ لە گوندی خورزای دەڤەری شێخان و سالی ١٩٧٥ لە گوندی نەپاخێی دەڤەری زێبار قوتابخانە کرانەوە.

بەپێی ئەو ناوچانەی مێژوونووس ئەمین زەکی بەگ لە سییەکان ئاراستەی کاربەدەستانی ئەوسای عێراقی کردووە. لە لیوای مووسڵ هیچ قوتابخانەیەکی کوردی (خوێندنی کوردی) نەبووە، لە هیچ لە قەزا کوردییەکانیشدا. لەم قسەیەدا پشتی بە کتابی بەڕێوەبەریەتیی مەعاریفی ناوچەی مووسڵ لە وەزارەتی مەعاریف ژمارە ١-٣٥١ مێژووی ١٩٣٠/١١/٢ بەستووە کە دەڵێن هیچ قوتابخانەیەك لە ناوچەکە نییە کە خوێندنی بە کوردی تێدا بێت. کەچی لەوکاتەدا (١٣) قوتابخانەی کوردی لەم قەزایانە لە ساڵی ١٩٢٧ هەبووە کە وەك مێژوو نووس بۆ خۆم (١٠) یانم ژماردووە.(٢٤٠)

وەکو ئاماژەمان کرد، خوێندنی کوردی ئەگەرچی لەم دەڤەرە کوردییە بەسستی بەڕێوە چووە، بەڵام هەمیشە داواکردنی خوێندن و کردنەوەی قوتابخانە و فێرکردنی داوای کەسانی نیشتمانپەروەر و ڕۆشنبیرانی دڵسۆزی کورد بووە. دەگەڵ هەموو ئەو کۆسپ و فشارانەی لەم ناوچەیە دژی پرۆسەی پەروەدە و فێرکردن بەڕێوە چووە. خوێندن هەنگاوی گەورەی بەرەوپێشەوە ناوە. زمانی کوردی زمانی فێربوون و بڵاوکردنەوە و خوێندنە. لە خشتەی ژمارە (٤٦) دا ئاماژە بەبوونی باخچەی ساوایانی دهۆك لە نێوان ساڵانی (١٩٧٢-١٩٨٥) دەکەین کە بەم جۆرە بووە.

**خشتەی ژمارە (٤٦)** (٢٤١)

باخچەی ساوایانی دهۆك

| ناوی باخچەکە | ژمارەی منداڵان | ساڵی دامەزراندن |
|---|---|---|
| باخچەی دهۆکی ساوایان | ١١٤ | ١٩٧٢ |
| باخچەی چیمەنی ساوایان | ١٢٠ | ١٩٧٣ |

(٢٤٠) أ.ب. عن التعليم فی کردستان العراق، مطبعة خەبات ١٩٨٦، ل ١٠.
بۆ هەمان مەبەست بنۆڕە د. عبدالفتاح علي بوتاني، مدرسة ١١ أذار، ل٣٦ قەزاکانی (دهۆك، شێخان، زاخۆ، ئامێدی، ئاکرێ، تا ٢٧ماسی ١٩٦٩ سەربە پارێزگای مووسڵ بوون. هەرلە باری زمانی کوردییەوە هەرچەندە لە نیسانی ١٩٣٥ زمانی کوردی بووە ڕەسمی بەڵام زۆر ناوچەی وەکو زاخۆ و دهۆك و ئاکرێ و شێخان و ئامێدی و خانەقین و مەندەلی و ژەنگار و تەلەعفەر لەم بارەوە پشتگوێ خران و بایەخ بە زمانی کوردی نەدرا.

(٢٤١) گۆڤاری دهۆك ، پەروەردە و فێرکردن ل پارێزگەها دهۆك، مۆسەدەق توڤی، ژمارە (٨) کانونی یەکی ١٩٩٩، ل٢٥.

| باخچەی گوڵزاری ساوایان | ٢٠٥ | ١٩٧٦ |
| --- | --- | --- |
| باخچەی مانگێشی ساوایان | ٧٤ | ١٩٨٥ |
| باخچەی زاخۆی ساوایان | ١٧٠ | ١٩٧٢ |
| باخچەی سەرسەنگی ساوایان | ١٧٣ | ١٩٨٣ |
| باخچەی ئامێدیی ساوایان | ١٧٠ | ١٩٧٨ |
| کۆی گشتی | ١٠٢٦ | |

هەروەها بەپێی سەرچاوەکان هەر لەم پارێزگایەدا ژمارەی قوتابخانەکان تا ڕاپەڕینی ئاداری ١٩٩١ بەم جۆرە بووە، کە دوای ڕێککەوتنی ئازاری ١٩٧٠ خوێندن بە زمانی کوردی تێیدا پەرەی سەند، دواتر لە دوای هەشتاوە رژێم زۆری هەوڵدا بۆ گۆڕینی خوێندن بە زمانی کوردی، ئەگەر زۆریشی لەم بوارە چەسپاندبێ، بەڵام نەیتوانی بنەبڕی گیانی فێربوونی زمانی کوردی و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری لە دەڤەرەکە بکات. بنۆڕە خشتەی ژمارە(٤٧).

خشتەی ژمارە (٤٧) (٢٤٢)

| قوتابخانەکان | ژمارەیان |
| --- | --- |
| سەرەتایی | ٥١٨ |
| ناوەندی | ٧٥ |
| دواناوەندی | ٣٨ |
| ئامادەیی | ١٢ |
| بازرگانی | ٢ |
| پیشەسازی | ٢ |
| ناوەندی ئیسلامی | ٢ |
| پەیمانگا | ٦ |
| کۆی گشتی | ٦٥٥ |

بۆ پتر ڕوونبوونەوەی پەرەسەندنی خوێندەواری لەم ناوچەیەدا، سەرنجدان لە خشتەی ژمارە (٤٨) کە تایبەتە بە خوێندن و ژمارەی قوتابخانە و قوتابی ومامۆستا و ژمارەی

(٢٤٢) هەمان سەرچاوە.

بیناکانی قوتابخانه له قۆناغه جیاکانی پارێزگای دهۆك، پتر بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم ناوچەیە چەند پێویستی بە پەرەپێدان و گەشەپێدانی خوێندەواری و کردنەوەی قوتابخانە هەبووە. لە سالانی ١٩٧٦–١٩٧٧.

خشتەی ژمارە (٤٧)(٢٤٣)

سەرژمێری دەربارەی چالاکی پەروەردەیی پارێزگای دهۆك ١٩٧٦–١٩٧٧.

| قۆناغی خوێندن | ژمارەی قوتابخانە | بینا دروست کراوەکان بۆ قوتابخانە سالی ١٩٧٤–١٩٧٥ | ژمارەی قوتابخانەکان ئەوانەی تازە کرانەوە | ژمارەی قوتابییانی سالی١٩٧٦–١٩٧٧ | | ژمارەی ئەندامانی بنەمای دەرس وتنەوە | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | کوڕ | کچ | کوڕ | کچ |
| باخچەی ساوایان | ٤ | ١٧ | ١ | ٣٠٣ | ٢٣٠ | – | ٢٥ |
| سەرەتایی | ٣٠٢ | ٦٧ | ٤٩ | ٢٢٨٨٥ | ٨٩٨٦ | ٨٢٥ | ٤١٠ |
| ناوەندی وسانەوی و ئامادەیی | ٢٦ | ٤ | ٦ | ٥٥٠١ | ٧٨٢ | ١٥٥ | ٦٠ |
| ئامادەیی پیشەسازی | ١ | – | – | ٢٠٩ | – | ١٥ | – |
| ئامادەیی کشتوکاڵ | ١ | – | – | ٢٣٧ | – | ١٧ | – |
| ئامادەیی بازرگانی | ١ | – | – | ٥٣ | ٩ | ١ | ٢ |
| خانەی مامۆستایانی کوڕ و کچ | ١ | – | – | ٤١٥ | ٦١٦ | ٢١ | – |
| پەیمانگای مامۆستایان | – | – | – | – | – | – | ٢٢ |
| پەیمانگای ئیسلامی | ١ | – | – | ٥١ | – | ٩ | – |
| تێبینی: ژمارەی ئەو قوتابخانانەی خۆراکیان تیا دابەش دەکرێ (٩٢) قوتابخانەیە | | | | | | | |

(٢٤٣) گۆڤاری ڕۆشنبیریی نوێ، ژمارەکەی تۆمار نەکراوە.

بەم جۆرە باری خوێندن و پەروەردە لە پارێزگای دهۆك گەشەی سەندووە. لەم ماوەیەدا کە نزیك سەدەیەك درێژەی کێشاوە، پرۆسەکە دووچاری گەلێك کێشەو گرفت بووەتەوە، ئەگەر دوای ڕێککەوتنی ئاداری ۱۹۷۰ خوێندن لە کوردستاندا هەنگاوی چاوەڕوان نەکراوی هاویشتبێ. ئەوەی دوای هەشتاکان، بەهۆی سیاسەتی ڕاگواستن و کاولکردنی کوردستان و سیاسەتی بەعەرەبکردن و گۆڕینی زمانی خوێندن بۆ عەرەبی و سەرکوتی نارەزایی قوتابییان، خوێندن بۆ دواوە ملی ناوە. قوتابخانەی زۆر لە گوندەکان کاولکران و داخران. ژمارەیەکی زۆر قوتابی دابڕان، یا بەهۆی هۆکاری سیاسی ئاوارە بوون و نەیانتوانیوە. بچنە بەر خوێندن.

دهۆك ناوچەیەکی بەرفراوان دەگرێتەوە. لەچاو دانیشتووانەکەی پێویستیی زیاتر بە قوتابخانە و پەرەپێدانی پرۆسەی خوێندن هەیە. لە ساڵی ۱۹۷٦-۱۹۷۷ ژمارەی قوتابییانی سەرەتایی (۲۲۸۸٥) کوڕ و (۸۹۸٦) کچ بوو. کە جیاوازیی نێوان هەردووکیان زۆرە. ئینجا لەم ساڵەدا بەهۆی نسکۆی شۆڕشەوە گەلی کوردستان دووچاری مەینەتی و ناخۆشی و ئاوارەیی بەرفرە هاتووە. تەنیا (۳۳۷) قوتابخانەش لە هەموو بادینان و سەرجەم قۆناغەکانی خوێندن بووە. کەچی لە سلێمانی لەوکاتەدا (۷٦۰) قوتابخانە و لە هەولێریش (۷۰٥) قوتابخانە دەستنیشان کراون. لە بیرمان نەچێ. ئەمە لە ساڵی دەست پێکردنەوەی شۆڕشی (۱۹۷٤-۱۹۷٥) دەگرێتەوە. کە لە هەولێر لە ماوەی سێ ساڵدا لە (۱۹۷٤- ۱۹۷۷) تەنیا (۹٤) بینایەی تازەی قوتابخانە دروست کراوە و لە سلێمانییش (٥۰) بینایەو (۸۸) بینایە دروست کراوە، گوایە لەم قۆناغەدا وای پیشان داوە بایەخی زۆر بەخوێندن و دروستکردنی قوتابخانە دەدات، بۆ ئەوەی کاردانەوەی سلبی رووخانی شۆڕش و ئیرهابەکانی دەسەڵاتدارانی ناوەندی لەسەر دانیشتووانی کوردستان کەم بکەنەوە. لە بیرمان نەچی جیاوازیی زۆریش لەرێژەی قوتابیان لە نێوان شارەکان هەیە، لە هەولێر (٤٥٦۰۹ قوتابیی کوڕ و ۲۰۲٥٤ قوتابیی کچ) لە قۆناغی سەرەتایی خوێندوویانە، لەسلێمانییش گەیشتووەتە (٥٦۹۹۸ کوڕ و ۲۳۹۸۰کچ) لە قۆناغی سەرەتاییی خوێندنی (۱۹۷٦-۱۹۷۷) تۆمار کراون.

لە بەشەکانی تردا باس لە پەرەسەندنی ئەم پرۆسەیە و بایەخی دەسەڵاتی کوردی بەخۆێندن و بڵاوکردنەوە خوێندەواری بە زمانی کوردی و پەرەسەندنی زانست و فێربوون دەدەین. کە چۆن ئێستا لە بادینان زانکۆ و پەیمانگا و هەزارەها بنکەی خوێندن و فێربوون کراونەوە و سەدان هەزار قوتابی سوودیان لێ وەردەگرن.

# خوێندنی پیشەیی لە کوردستاندا

کوردستان بە هۆی زوڵم و چەوسانەوەی لە مێژینە لە زۆر ڕووەوە دواکەوتووە، کورد ئەگەر لە ڕووی خوێندەوارییەوە دواکەوتوو بوو بێت، نەیتوانیبێت سوود لە دەرفەتە هەڵکەوتووەکانیش بە تەواوی وەرگرێ، دوژمنەکانیش لە هەر هەلومەرجێك بۆیان چووبێتە سەر دەنگیان کپ کردووە و سەرکوت و چاوبەستراویان کردووە.

گومانی تێدا نییە؛ کوردستان کانگا و سەرچاوەی کانزا و نەوت و گەلێك بەرهەمی خاو و گرینگە لە ڕووی ئابووری و پیشەسازییەوە، بنکەیەکی گرنگی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەهێلدراوە بەگیانی کوردستانی و پیشەسازی و پێگەیاندنی کوردییانە لە ڕووی خوێندەواری و پەروەردە و زانستی پیشەیی کە دەگەڵ واقیعی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی بەرهەمهێنان و پێگەیاندنی دەستی پیشەسازی و کادر و خوێندەواری پیشەیی بێتە ئاراوە. ئەگەر کوردستانی باشوور لە ئەنجامی پێشڤەچوونی تێکۆشانی سیاسی و فشاری شۆڕشە سەرکەوتووەکانی لە ڕووی خوێندەوارییەوە چەند هەنگاوێك چووبێتە پێش، ئەوە لە بەشەکانی تری کوردستاندا کپی و دواکەوتنێکی بەرچاوی مەترسیداری لە ڕووی خوێندەواری بەزمانی کوردی و پێگەیاندنی پەروەردەیی و پیشەیی هەیە.

بەباشمان زانی بەم جۆرە سەرەقەڵەمێك دەمەڕ ئەم باسە بەپێی تواناو بەپێی چنگ کەوتنی سەرچاوە و بەڵگە بخەینە نێو باسەکەمانەوە، تا ئاشنایی و ڕووناکییەك لە تاریکی مەسەلەکان هەڵایسێ و بەڵگە لە ئایندەدا هەبێ بەفوو کردن لە ترووسکە، خۆڵەمێش و پشکۆی بەشەکان چاکتر بگەشێنێتەوە.

مێژووی پیشەسازی لە عێراق و کوردستاندا هێندە کۆن نییە، بۆ ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم دەسەڵات و قەڵەمڕەویی عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە. ئینجا لە سەردەمی ئینگلیزەکان پەرەی سەندووە و دواتریش چووەتە چوارچێوەیەکی تر بەتایبەتی دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨.

نەهێڵدراوە لە کوردستاندا پیشەسازی و بەرهەمی پیشەسازی و کارگە و بنکەی بەرهەمهێنانی نیشتمانیی کوردستانی بگەن، چونکە پێشکەوتنی پیشەسازی کاریگەریی لەسەر جووڵانەوەی ئابووری و دواتر بزاڤی کۆمەڵایەتی و سیاسی و هوشیاریی و

نەتەوەییش جێ دەهێشت، بۆ ئەوەی کوردستان بەدواکەوتوویی بمێنێتەوە، نەهێڵدراوە لەم بارەوە نەئارامی بەخۆوە ببینێ، نە گەشەکردن و پێشکەوتنی بواری بەرهەمێنان و پیشەسازی زۆر بەرتەسك بووە.

بەپێویستی دەزانین لەم بارەوە، سەرنجی کتێبە بەنرخەکەی د. کەماڵ مەزهەر ئەحمەد، مێژووی چینی کرێکاری عێراقی بدەین، یاخود لەبارەی بوونی پیشەسازی، کشتوکاڵ و بازرگانی و بەرهەمی دەستکردو ناوخۆیی سەرنج بدەینە نووسراوو سەرچاوە بیانییەکان کە لەمەڕ ئەم باسە دواون. کاری دەستی و بەرهەمی ناوخۆیی میللی، سابوون، پیستە، چەخماخسازی و بەرهەمی کشتوکالی و خشتبڕی و کوورەچییەتی و دارسازی، کارگەی چیمەنتۆ و جگەرە و شەکر و مافوور و چنین و کارگەی نەوت وبەرهەمە هەمەجۆرەکانی تر لە کوردستاندا، یان کە سەرنجی وردە وردە پەرەسەندنی پێوەندی سەرمایەداری و سەرهەڵدانی جۆرێك لەم پەیوەندییە لەناو منداڵانی کۆمەڵگای کشتوکاڵی. دەرەبەگی خێڵەکی دەدەین، پیشەی بەرهەمهێنانیش پەرەی سەندووە، کە کاریان لەسەر پێویستیی بوونی خوێندەواری و قوتابخانەی پیشەیی لە کوردستان کردووە.

خشتەی ژمارە (٤٨)، باری دابەشکردنی دەزگا پیشەسازییەکان و ڕێژەی کرێکاران لە سەرجەم شارەکانی عێراق و کوردستان نیشان دراوە، کە دەبینرێت کوردستان چەند لە بارێکی نالەبار و دواکەوتوودا دژەیت.

**خشتەی ژمارە (٤٨)**(٢٤٤)

**دابەشکردنی دەزگا پیشەسازییەکان و ژمارەی کرێکارەکان بەپێی شارەکانی عێراق سالّی (١٩٦٥).**

| شار | تێکڕای پیشەسازییەکان | | کەرتی حکوومی | | کەرتی ئاو و بەکارەبا | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارەی دەزگاکان | ژمارەی کرێکار | ژمارەی دەزگاکان | ژمارەی کرێکارەکان | ژمارەی دەزگاکان | ژمارەی کرێکارەکان |
| بەغدا | ٦٨٧ | ٥١٩٦١ | ٨٥ | ٢٨٢٩٠ | ١٠ | ٥٧٥٧ |
| بەسرە | ١٥٩ | ٩٢٢٩ | ٢٧ | ٣٦٩٠ | ٩ | ١٢٢٠ |
| مووسڵ | ١٠٥ | ٨٢١٦ | ٢٥ | ٤٣١٧ | ٩ | ٦٤٠ |
| کەرکووک | ٣٦ | ١٦٥٥ | ١٨ | ١٢١٦ | ٨ | ٧٦٦ |
| هەولێر | ١٦ | ٦١٠ | ١٣ | ٥٥٤ | ٦ | ٣٣٩ |
| سلێمانی | ٦ | ١٣٨٢ | ٧ | ١٣٣٩ | ٢ | ١٦٢ |
| دیالە | ٢٤ | ١٥٦٥ | ١٧ | ١٣٢١ | ٩ | ٢٢٥ |
| ڕومادی | ٢١ | ٥٥٩ | ٧ | ٢٥٤ | ٦ | ١٧٨ |
| کوت | ١٦ | ٧٠٨ | ١٠ | ٣٦٧ | ٧ | ١٩٩ |
| عەمارە | ٢٥ | ١١٥٦ | ٦ | ٢٤٥ | ٤ | ١٣٣ |
| حلە | ٤٠ | ١٩٣٤ | ١٢ | ٨١٨ | ٧ | ٢٨٣ |
| کەربەلا | ٦٧ | ٢٤١٥ | ١٢ | ١٠٢٧ | ٤ | ٣١٢ |
| دیوانیە | ٢٦ | ١١٩٤ | ١٨ | ٧٧٥ | ١٣ | ٢٦٨ |
| ناسریە | ٢٤ | ٧٤٥ | ٩ | ٢٨٤ | ٦ | ٢١٠ |
| تێکڕا | ١٢٤٣ | ٨٣٣٢٩ | ٢٦٦ | ٤٤٥٠٠ | ١٠٠ | ١٠٦٩٢ |
| کۆمپانیای نەوت | ٣ | ١١١٢٨ | – | – | – | – |
| تێکڕایی گشتی | ١٢٤٦ | ٩٤٤٥٧ | – | – | – | – |

(٢٤٤) صالح عبدالله سرية، تطوير التعليم الصناعي في العراق، مطبعة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٦٩، ل٤٥.

هەروەها خشتەی ژمارە (٤٩) دەری دەخا لە بواری پیشەسازی ساڵی ١٩٦٥ لە کۆی (١٢٣٤) بنکە و دەزگای پیشەسازی لە عێراقدا، لە شارەکانی کوردستاندا گەیشتووەتە (٥٨) بنکەی پیشەسازی کەرکووك ٣٦ و هەولێر ١٦ و سلێمانی ١٦. ژمارەی ئەو کرێکارانەی لەم سێ شارە کاریان کردووە و بنکەی پیشەسازییان تێدا بووە لە تێکڕای کرێکارانی پیشەسازی (٨٣٣٢٩) تەنیا (٣٦٥٧) کرێکار لە کوردستان لەم بوارە بەم جۆرە تۆمار کراون (١٦٥٥– کەرکووك)، (٦١٠– هەولێر)، (١٣٨٢– سلێمانی). دهۆکیش ناوی نەهێنراوە. سەر بە پارێزگای مووسڵ بووە.

خشتەی ژمارە (٤٩) [٢٤٥]

دابەشکردنی دەزگا بچووکەکان و ژمارەی کرێکاران بەپێی شارەکان ساڵی ١٩٦٤.

| شار | ژمارەی دەزگاکان | ژمارەی کرێکاران |
|---|---|---|
| بەغدا | ٦٢٨٩ | ١٤٥٢٢ |
| بەسرە | ١٦٧٤ | ٣٧٧٤ |
| مووسڵ | ١٩٩٣ | ٣٩٦٣ |
| کەرکووك | ١٦٤٤ | ٣٢٨٧ |
| هەولێر | ٧٣٩ | ١٧٣٧ |
| سلێمانی | ٨٧٥ | ١٨٦٥ |
| دیالە | ٦٧١ | ١٣٥١ |
| ڕومادی | ٤٣٣ | ٧٦٧ |
| کوت | ٥٧٩ | ١٠٦٨ |
| عەمارە | ٨٣٣ | ١٦٥١ |
| حلە | ٩٧٣ | ٢١١٥ |
| کەربەلا | ٢٤٠٢ | ٦١٩٦ |
| دیوانیە | ٨٨٥ | ٣٠٨٨ |
| ناسریە | ٨٣٦ | ١٤٧٦ |
| تێکڕا | ٢٠٧٩٩ | ٤٥٥٦٧ |

(٢٤٥) هەمان سەرچاوە، ل٤٦.

بەم جۆرە گەشەکردنی پیشەسازی لە شارەکانی کوردستان دەردەکەوێت ئەمەش پێویستی بە پەرەپێدانی پیشە هەیەو دەبێ لە ڕووی زانستی و فێرکردنەوە بایەخی پێ بدرێ. مەبەستمان لەم خشتانە، پێویستیی بوونی خوێندن و کردنەوەی قوتابخانەی پیشەییە.

یەکەم قوتابخانەی پیشەسازی کە لە عێراق دروست کرابێت ئەوە بووە کە مەدحەت پاشا ساڵی ١٨٧١ ئەو کاتەی والیی عێراق بوو دروستی کردووە هەر ئەوکاتە چاپخانەیەکیشی بۆ ئەم ویلایەتە هێناو لەم قوتابخانەی دانا. ژمارەی قوتابییەکانی ساڵی (١٨٧١) (١٤٤) کەس بوون لە منداڵی هەتیو و هەژار پێکهاتبوون و ئەم قوتابخانەیە تا ماوەیەکی درێژ بە ناوی (دار الایتام) مایەوە. ئامانجی پێگەیاندنی دەستی کاری شارەزا و کرێکاری لێهاتوو بوو. هەروەها ئامادەکردنی کرێکاری شارەزا بۆ ڕێکخستنی کاری ئەو چاپخانەی هێنابووی. ماوەی خوێندن دوای تەواو کردنی خوێندنی سەرەتایی (٥) ساڵ بوو، دەستی ئیشی (تیۆری و کار) بوو.

لە دەرسە تیۆرییەکان بیرکاری و مێژوو و جوگرافیا و دین و زمانی عەرەبی و فەرەنسی و سەرەتاکانی وێنەی دەستی و وێنەی میکانیکی و زانستە پیشەسازییەکان دەخوێندرا و لە کاریش (عملي) ئاسنگەری و میکانیك و پیشەسازی و ڕستن و مافوور و ڕایەخ و پینەدۆزی و دروومان و چاپکردن هەبوو. لە بەسرەش هەوڵی دا قوتابخانەیەك ئەگەر ئەهلییش بێ دابمەزرێ، بەڵام ئەستەمبۆل ڕازی نەبوو[٢٤٦].

ئیتر لە هیچ شارێکی تری عەرەبی عێراقی، قوتابخانەی لەم جۆرە نەکرایەوە.

**یەکەمین قوتابخانەی پیشەسازی لە کوردستاندا**

مەدحەت پاشا کە هەوڵی پەرەپێدانی ئاوەدانکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانستی دەدا، لەکاتی دەسەڵاتی خۆی لە عێراقدا توانیی هەندێك خزمەت پێشکەش بکات ئەگەر خزمەتەکانی بەرتەسك و سنووردایش بووبن، بەڵام بۆ ئەو سەردەم گەورە و گرینگ بوون.

لە کوردستانیشدا مەدحەت پاشا یەکەم قوتابخانەی پیشەسازیی. ساڵی ١٨٧١ لە شاری کەرکووك لە بینایەکی تایبەت دوای کۆکردنەوەی کۆمەك لە دانیشتوانی ئەهلی

(٢٤٦) هەمان سەرچاوە ل ٥٦.

کردەوە، وەلێ دوای مەدحەت پاشا خوێندنی تێدا خراپ بوو، بەهۆی ئەوەی کە خەڵك کۆمەکی نەدەکرد. تاگەیشتە ئەوەی ساڵی ۱۹۱۳ تەنیا یەك مامۆستا و یەك کاتبی لێ مایەوە و ژمارەی قوتابییەکانیشی (۱٥) کەس بوون[٢٤٧].

ئەگەر ئەمە یەکەم قوتابخانەی پیشەسازی بێ لە کوردستاندا، دەتوانرێ بەیەکەم قوتابخانەی رەسمیش دابنرێ کە لەو ساڵەدا چ وەکو قوتابخانەیەکی ڕەسمیی هاوچەرخ، دوور لە زاڵبوونی خوێندنی دینی لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکوومییەوە دامەزراوە، چ وەکو یەکەمین قوتابخانەی پیشەسازی و یەکەم دامودەزگای فێرکردن و پەروەردە لە کوردستان، ڕاستە تەمەن و بەرهەمی درێژ و بەرفرە نەبوو، وەلێ لە ڕووی مێژووییەوە دەبێ هەڵسەنگاندن و بەدوا داچوونی تایبەتیشی لەمەڕ بکرێ.

پێویستە لە بیرمان بێت ساڵی ۱۹۲٥-۱۹۲٦ لە شاری مووسڵ دواناوەندیی پیشەسازی کراوەتەوە و هەمان بەرنامەی خوێندنی قوتابخانەی پیشەسازیی بەغدای هەبووە. ساڵی ۱۹٤۰-۱۹٤۱ قوتابخانەکە داخراو قوتابییەکانی نێردرانە قوتابخانەی پیشەسازیی بەغدا و ساڵی دوایی کرایەوە و ساڵی ۱۹٤۷-۱۹٤۸ جارێکی تر داخرایەوە و تا ساڵی ۱۹٥٦-۱۹٥۷ جارێکی تر سەرلەنوێ کرایەوە[٢٤٨].

ساڵی ۱۹٤٦-۱۹٤۷ قوتابخانەی پیشەسازیی کەرکووك کرایەوە. بەئامانجی بەدیهێنانی کرێکاری شارەزا و مەعلان بۆ ئەوەی لە شوێنی کرێکارە بیانییەکانی کۆمپانیای نەوتی بابا گوڕگوڕ سوودیان لێ وەربگرن، لەم قوتابخانەیەدا تەنیا منداڵی ئەو کرێکارانەیان قبووڵ دەکرد کە لە کۆمپانیاکەدا کاریان دەکرد[٢٤٩]. دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە ژمارەیەك منداڵی کورد لەم ڕێگەیەوە دەستیان بەخوێندن کرد، تێکەڵی بزاڤی سیاسی و چینایەتی بوون.

بەرنامەی خوێندنی پیشەسازی لەعێراقدا گۆڕانکاریی زۆری تێدا کراوە، سەرەتا لە بەر کەم شارەزایی ئینگلیزەکان قوتابخانەی پیشەسازیی بەغدایان بەڕێوە دەبرد و دواتر هەوڵ درا بۆ دارشتنی بەرنامەی گونجاوتر. لە بەغدا ساڵی ۱۹٥۷ ڕێبازێکی تازە لەلایەن وەزارەتی مەعاریفی عێراقی دانرا، بەڵام قوتابخانەی کەرکووکی نەگرتەوە. تا

---

(٢٤٧) هەمان سەرچاوە ل٥٦.

(٢٤٨) هەمان سەرچاوە ل ٦١.

(٢٤٩) هەمان سەرچاوە ل٦٩.

سالّی ١٩٥٧-١٩٥٨ خوێندن له پیشەسازیی کەرکووك هەر پێنج پۆل بوو، دوای ئەمە دەبووایە دەرچووانی پۆلی چوارەمی پیشەسازیی کەرکووك خوێندنیان لە دواناوەندیی پیشەسازیی بەغدا تەواو بکەن. (٢٥٠) شوێنەکەشی زۆرباش نەبوو، لەناو ئەو بینایە بوو کە بۆ کۆمەڵگەی ڕۆشنبیری سالّی ١٩٥٦ دروست کرابوو. قوتابخانەکە بەشی ناوخۆیی و ئیدارە و خوێندن و نادو چێشتخانەی تێدا بووە.

لە سالّی ١٩٥٥-١٩٥٦ بەپێی راپۆرتی سالآنەی مەعاریف دواناوەندیی پیشەسازیی سلێمانی کرایەوە، بەلاّم تا پۆلی پێنجەمی تێدابووە. بینایەکەی بە (١٢٥٠) دیناری سالآنەی ئیدارەی محەلی بەکرێ گیرابوو و بەشی سەرەوەی بەشی ناوخۆیی و پێویستی بە چاککردنەوە هەبوو. بە ئامانجی دروستکردنی کرێکاری هونەری و بەکارهێنان لە پرۆژە پیشەسازی و دەزگا حکوومییەکان کرایەوە. هەر لە سالّی ١٩٥٧-١٩٥٨ یشدا بەپێی راپۆرتی مەعاریف لە تەك بەغدا و بەسرە لە شاری کەرکووکیش قوتابخانەی پیشەسازیی شەوی کرایەوە و ماوەی خوێندن دوو سالّ بووە. سالّی ١٩٥٦ قوتابخانەیەك بۆ مەکینەو کەرەستەی کشتوکالّی لە بەغداو یەکێکی تر لە مووسڵ کرانەوە. (٢٥١)

دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ جارێکی تر هەوڵ درا بەرنامەکانی خوێندن و پەروەردە و شێوازی فێرکردن بگۆڕدرێ. دوای ئەوە بڕیار درا قوتابخانە پیشەسازییەکانی شەوان دابخرێن.

ئەگەر ئاماژە بەگۆڕانەکانی ڕەوشی خوێندن و خوێندەواری لەکوردستان لەچاو هەموو عێراق بکەین ، بۆمان دەردەکەوێت کورد بە هۆی بارودۆخی سیاسی و نەتەوەیی دووچاری گەلێك دواکەوتن هاتووە، قوتابخانەی پێویست و کادر و مامۆستای نەبووە، پەیمانگای هونەری و ئەکادیمیی نەدیتووە، زانکۆی نەبووە، تا کۆلێژی ئەندازەو کشتوکالّ و بازرگانی بخوێنێ. ئەو ئامادەییە پیشەسازییەی سەرەتا لەکەرکووك و دواتر لە سلێمانی و ئینجا لە مووسڵ هەبووە، کورد وەکو قوتابییەك لە ڕوانگەی کوردستانی و کوردێنی سوودی لێ وەرنەگرتووە. جا ئەگەر سەیر بکەین دەبێ ڕێژەی دەرچووانی قوتابی کورد لە شەستەکان لە کۆلێژی ئەندازە لە کارەبا و بیناسازی و میکانیك و هتد... چەند بووبێ، لەو کاتەی کرێکاری کورد لە کۆمپانیای نەوتی کەرکووك

---

(٢٥٠) هەمان سەرچاوە ل٧٠-٧١.

(٢٥١) هەمان سەرچاوە.

بەهۆی نەژاد پەرستیی دەسەڵاتداران و بەرچاوتەنگیی نەتەوە پەرستانە کوردیان دەردەکرد، چتۆ زەمینەیەکیان بۆ قوتابی و منداڵی کورد رەخساندبێ شارەزای هونەربن و مامۆستا و دەستی کاری مەعلان و شارەزای لێ دروست بووبێ.

## مەڵبەندی مەشقی پیشەسازیی نەوتی کەرکووک

ئەم مەڵبەندە ساڵی ١٩٥١ لەلایەن کۆمپانیای نەوتی عێراقی لە کەرکووک دامەزراوە، ئەم مەڵبەندە ئامانجی ئەوە بووە ساڵانە (٦٠) قوتابی بۆ ناوچەکە پێبگەیێنێت کە سێ بەشی لە چواران لە ناوچەی کەرکووک بن. مەڵبەندەکە دەرچووانی سەرەتایی وەردەگرت و خوێندن تێیدا (٥) ساڵ بوو. لە چەند بەشێك پێکهاتبوو.

قوناغی یەکەمی خوێندن پیشەسازی بوو بە دوو ساڵ تەواو دەکرا.

قۆناغی دووەم سێ ساڵ بوو، دوایی قۆناغی پیشەییەکە دەستی پێ دەکرد لەم قۆناغەدا سێ بەش هەبوو (ئەندازەی میکانیکی، کارەبا، نەوت) لەم مەڵبەندەدا (٥) بەشی تریش هەبوو لەوانە ١-بەشی بازرگانی ٢-بەشی خوێندنی شەوان بۆ مووچەخۆرە بچووکەکان ٣-بەشی ڕاهێنان لەسەر خوێندنی پیشەسازی بۆ چاودێر و سەرپەشتکاران و جێبەجێکاران ٤-بەشی ناردنی مووچەخۆران بۆ بەریتانیا بۆ تایبەتمەندی کاروباری پیشەیی ٥-بەشی فێربوونی زمانی عەرەبی بۆ مووچەخۆرە بیانییەکان. لە ساڵی ١٩٦١ەوە وەرگیرانی قوتابییانی تێدا ڕاگیرا، بە بیانووی ئەوەی ژمارەی شارەزایان و دەرچووان لەم قوتابخانەیە زۆر بووە. [٢٥٢]

لە خشتەی ژمارە (٥٠)دا قوتابییان و مامۆستایانی عێراق و بیانی دەخەینە بەرچاو کە لە نێوان ساڵی (١٩٥١-١٩٦٣) کە ژمارەی قوتابییانی کۆمپانیای نەوتی عێراقی لەم ماوەیەدا لە نێوان هەڵسان و دابەزاین بووە.

---

(٢٥٢) هەمان سەرچاوە. ل١٢٥

## خشتەی ژمارە (٥٠)[٢٥٣]

ژمارەی قوتابیان و مامۆستایانی کۆمپانیای نەوتی عێراقی لەڕۆژی دامەزراندنیەوە

| ساڵ | قوتابی | | مامۆستایانی | | تێکڕا |
|---|---|---|---|---|---|
| | وەرگیراو | دەرچوو | عێراقییەکان | بێگانە | |
| ١٩٥١ | ٢٠ | – | ١ | ٤ | ٥ |
| ١٩٥٢ | ٦٠ | – | ١ | ٧ | ٨ |
| ١٩٥٣ | ٦٠ | – | ١ | ١٤ | ١٥ |
| ١٩٥٤ | ٦٠ | – | ٢ | ٢١ | ٢٣ |
| ١٩٥٥ | ٦٠ | – | ٣ | ١٩ | ٢٢ |
| ١٩٥٦ | ٦٠ | ٩ | ٢ | ٢٣ | ٢٥ |
| ١٩٥٧ | ٦٠ | ٢٣ | ٢ | ٢٢ | ٢٤ |
| ١٩٥٨ | ٦٠ | ٢٢ | ٤ | ٢١ | ٢٥ |
| ١٩٥٩ | ٥٠ | ١٧ | ٤ | ٢٠ | ٢٤ |
| ١٩٦٠ | ٢٠ | ١٨ | ٦ | ١٠ | ١٦ |
| ١٩٦١ | – | ٢١ | ٦ | ١١ | ١٧ |
| ١٩٦٢ | – | ٢١ | ٥ | ٨ | ١٣ |
| ١٩٦٣ | – | ٢٠ | – | – | – |

(٢٥٣) هەمان سەرچاوە. ل١٢٥

دەبێ چەند قوتابیی کورد بەشدارییان کردبێ و چەندیان بەپلەی دەرچوون گەیشتبن و توانیبێتیان لەم مەڵبەندو کۆمپانیایانە بەشێوەیەکی ئەکادیمی سوود وەربگرن و ببنە کادری زانستی و لێهاتوو لەبواری بەرهەمهێنان و پیشەییدا.

لە دیقەتدانی خشتەی ژمارە (٥١) کە باس لە مەسرووفات و پێداویستییەکانی خوێندن لە قوتابخانە پیشەسازییەکانی هەندێك شار و پێداویستیی ساڵانەی هەر قوتابییەك دەکا، کە سلێمانی لەو شارانەیە کەمترین پارەی لە دوای نەجەف بۆ تەرخان کراوە. ئەمەش کاریگەریی لەسەر پرۆسەی خوێندنی پیشەیی کردووە، ساڵی خوێندنی ١٩٦٤–١٩٦٥ (٩٠) قوتابی لە شاری سلێمانی هەبووە، ساڵی ١٩٦٥–١٩٦٦ بووەتەوە (٨٥) قوتابی.

### خشتەی ژمارە (٥١) [٢٥٤]

رێژەی سەرفکردنی پارە لە قوتابخانە پیشەسازییەکان و پێویستی یەك قوتابی لە ساڵی ١٩٦٤–١٩٦٥ – ١٩٦٥–١٩٦٦

| قوتابخانە | ساڵی خوێندنی ١٩٦٤–١٩٦٥ | | | ساڵی خوێندنی ١٩٦٥–١٩٦٦ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | پارەی سەرفکراو بەدینار | ژمارەی قوتابیان | پێویستی قوتابیان | پارەی سەرفکراو بەدینار | ژمارەی قوتابیان | پێویستی قوتابیان |
| کەرخ | ٧٠٠٦٢ | ٣٠٢ | ٢٣٢ | ٧٧٢١٧ | ٢٨٠ | ٢٧٥٤٥٣ |
| بەسرە | ٣٩٢٣٢ | ٢٤٤ | ١٦٠٧٨٧ | ٤١٦٦٠ | ٣١٧ | ١٣١٤١٨ |
| سلێمانی | ٢٤١٤٢ | ٩٠ | ٢٦٨٢٣٩ | ٢٥٥٣١ | ٨٥ | ٣٠٠٣٦٢ |
| نەجەف | ٢١٢٣٠ | ١٥٠ | ١٤١٥٣٤ | ٢١٢٣٠ | ١٤٨ | ١٤٣٤٤٧ |
| کەرکووک | ٣٣٢٠٥ | ٢٠٦ | ١٦١١٩١ | ٣٩١٦١ | ٢٣٦ | ١٦٥٩٨٠ |
| مووسل | ٤١٨٩٦ | ٣٦٧ | ١١٤١٥٩ | ٤٣٥٥٣ | ٣٢٧ | ١٣٣٢٠٠ |

(٢٥٤) هەمان سەرچاوە. ل ١٤٥.

لە ساڵی ١٩٥٩-١٩٦٦ ڕێژەی پێویستی هەر قوتابییەك لە قوتابی پیشەسازییەکان (١٦٧٪) زیادی کردووە، وەکو لەم خشتەیە دەبینرێ[٢٥٥].

| ١٩٦٠-١٩٥٩ | ١٩٦١-١٩٦٠ | ١٩٦٢-١٩٦١ | ١٩٦٣-١٩٦٢ | ١٩٦٤-١٩٦٣ | ١٩٦٥-١٩٦٤ | ١٩٦٦-١٩٦٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١١٧-٧٨٢ | ١٧٨-٨٠٨ | ١٩٢-٨٧٤ | ١٧٧-١٤٥ | ١٧٥-٦٧٢ | ١٩١-٦١٣ | ١٩٦-٨٤٨ |

لە پێداچوون بە بەش و لقەکانی قوتابخانەکانی پیشەسازیی عێراقدا هەست دەکرێ کە هەندێك بەشی وەکو (ڕادیۆ و چاپخانە و بیناکردن) بە تەواوی پشتگوێ خراون، دیارە دەسەڵاتدارانی مەعاریف و پەروەردە لە عێراق حیسابیان بۆ ئەوە کردووە کە ئەم سێ بەشە بەتایبەتیش (رادیۆ و چاپخانە و بیناکردن) کار لەسەر ڕەوشی تری ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی و سیاسی دەکەن، بۆیە نابێ بایەخیان پێ بدرێ، بەتایبەتیش لە کوردستاندا کە بەهیچ جۆرێك ئەم بەشانە ناویان نایەت و لێیان نزیك نەبوونەتەوە. وەکو لەم خشتەیەی خوارەرە بەدیار دەکەوێ.

**خشتەی ژمارە (٥٢)** [٢٥٦]

بەشەکانی قوتابخانە پیشەسازییەکان لە ساڵی ١٩٦٦-١٩٦٧

| قوتابخانە | میکانیك | معادن | سباکە | کارەبا | بازرگانی | ئوتومبیل | رادیۆ | چاپ | بیناکردن | ژمارەی بەشەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کەرخ | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٩ |
| میکانیك | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٣ |
| مووسل | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٧ |
| کەرکووك | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٦ |
| بەسرە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٦ |
| نەجەف | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٥ |
| سلێمانی | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٥ |

(٢٥٥) هەمان سەرچاوە. ل١٤٧.

(٢٥٦) هەمان سەرچاوە .ل١٤٩.

له ساڵی خوێندنی ١٩٦٦- ١٩٦٧ دا، (٦٣) قوتابی له پیشەسازیی سلێمانی و (١٢٥) قوتابیش له پیشەسازیی کەرکووك و (١٤٩) قوتابی له مووسڵ له بەشی ناوەخۆیی بوون. له چاو تێکڕای هەر سێ قوتابخانەکە ڕێژەی قوتابییانی ناوخۆیی بەم جۆرە بووە، کە له بەشی ناوخۆیی دەخەوتن، سلێمانی (٧٢٪) و کەرکووك (٥٥٪) و مووسڵ (٤٤٪)[٢٥٧].

لێرەدا کە باس له ڕێژەی قوتابیان و خوێندەوار دەکەین نابێ، له سەر ژمارەی مامۆستایان پاز بدەین، چونکە نەبوونی مامۆستا له کوردستاندا و کەمیی ڕێژەکەی، گرفتێکی گەورە بووە، تا خوێندن و ئاستی خوێندەواری دوابکەوێت و قوتابخانەی تازە نەکرێتەوە و بە زمانی عەرەبی دەرسەکان بخوێندرێن و نامۆیی له خوێندن لەلایەن قوتابیانەوە دروست بێ. (سالح عەبدوڵلا سریە) کە له ساڵی ١٩٦٩ نامەی ماستەرەکەی لەمەڕ (فێرکردنی پیشەسازی له عێراق)دا چاپ کردووە و لەم ڕووەوە بەم جۆرە له خشتە (٥٣) ژمارەی مامۆستاکانی لەم چەند قوتابخانەیە دیاری کردووەو کەم بایەخدان بەژمارەی مامۆستایان له سلێمانی و کەرکووك بەبەراورد لەگەڵ شوێنەکانی تر بەدیار دەکەوێ بەتایبەتی سلێمانی له دواوەی هەر هەموویان دێت. ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە. باری پەروەردە بەتێکڕا دواکەوتوو بووە، لەو ساڵەشدا شۆڕشی کوردستان لە پەرەسەندن بووە، ژمارەیەکی زۆر ڕۆشنبیر و مامۆستا له ریزی شۆڕشدا بوون.

---

(٢٥٧) هەمان سەرچاوە. ل ١٦٣.

## خشتەی ژمارە (٥٣)(٢٥٨)

دابەشکردنی مامۆستا ئەکادیمییەکان بەپێی جۆرەکانیان و قوتابخانە و ئەو دەرسانەی دەیلێنەوە لە ساڵی خوێندنی ١٩٦٦-١٩٦٧ .

| دەرسەکان | | کەرخ | بەسرە | میکانیك | نەجەف | سلێمانی | موسل | کەرکوك |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زمانی عەرەبی و دین | ژمارەی سەعاتەکان | ١٨ | ٣٤ | ٨ | ١٣ | ١١ | ٣٢ | ٢٠ |
| | مامۆستا | ١ | ٢مع | – | ١ | | ٣٢ | ١ |
| | محازر | – | – | ١ك | – | ١ك | – | – |
| زمانی ئینگلیزی | ژمارەی سەعاتەکان | ٣٦ | ٤١ | ٢٠ | ١٢ | ١٢ | ٣٩ | ٢٦ |
| | مامۆستا | ١ | ١ | ١ | – | – | ١ | ١ |
| | محازر | ١ | ١ | – | ١ | – | – | ١ |
| | موعەلیم | – | – | – | – | ١ | ١ك | – |
| بیرکاری و زانست و میکانیك | ژمارەی سەعاتەکان | ٦٢ | ٨٠ | ٣٢ | ٢٧ | ٢٣ | ٧٤ | ٤٦ |
| | مامۆستا | ٣ | ٢٣ | – | ١ | ١ | ٢ | ١ |
| | محازر | – | – | ٢ف | – | – | ٢ك | – |
| کۆمەڵایەتی | موعەلیم | – | – | – | – | – | – | ١ |
| | ژمارەی سەعاتەکان | ١٠ | ١٦ | ٤ | ٨ | ٦ | ١٦ | ١٠ |
| | مامۆستا | ١ مع | ١ × | ١ × | ١ | – | ١ | ١ مع |
| | محازر | – | ١ | – | – | ١ك | – | ٢ |
| مسك ئەلدەفاتر | ژمارەی سەعاتەکان | ٦ | ٢ | ٤ | – | – | ٢ | ٢ |
| | مامۆستا | ١ + | – | – | – | – | – | – |
| | محازر | – | ١ | ١ | – | – | ١ | ١ |

(٢٥٨) هەمان سەرچاوە، ل ١٦٥. ڕەمزەکانیش بەم جۆرەیە م: بەڕێوەبەر، مع: جێگری بەڕێوەبەر، ك: مامۆستایە لە قوتابخانەیەکی تر، ف. مامۆستای هونەری. ×. هەمان قوتابخانە مامۆستای عەرەبی و کۆمەڵایەتی دەڵێتەوە، + : هەمان مامۆستا بیرکاری و دەرسی و مسك ئەلدەفاتر دەڵێتەوە.

بەپێی ئەم خشتەیە بۆمان روون دەبێتەوە، سەعاتەکانی دەرس گوتنەوە لە سلێمانی کە تێکڕا دەکاتە (١٥) سەعات لە هەر هەموویان کەمتر لە ڕێژەی سەعاتەکانی دەوام لە هەر سێ شاری (سلێمانی و کەرکووك و مووسڵ) کە (٢٨٦) سەعاتە، کەچی لە قوتابخانەکانی کەرخ و بەسرە و میکانیك و نەجەف گەیشتووەتە (٤١١) سەعات. لە کاتێکدا لە باسی مەسروفاتی پێداویستیەکاندا سلێمانی لە هەموو قوتابخانەکان پتر ناوی تۆمار کراوە، بەپێچەوانەشەوە ڕێژە و سەعاتەکانی دەرس گوتنەوە لە نزمترین ڕێژە دایە.

لەناو (٣١) مامۆستای هونەری قوتابخانەی پیشەسازیی سلێمانی، تەنیا (١) مامۆستای موعاونی بەرکەوتووە و کەرکووك (٣) مامۆستا و مووسڵ (٥) مامۆستا. هەر لەسەرژمێرییەکی تر دا لە کۆی (١٥٨) مامۆستا لە بەشەکاندا لەناو حەوت قوتابخانەی تر لە عێراقدا سلێمانی (٦) مامۆستای بۆ تەرخان کراوە، لە بەشی کارەبا (٢) و معاون (١) و بازرگانی (٢) وسباکە (١). لە کەرکووکیش بەهەمان شێوە (٦) مامۆستا هەن و مووسڵ (٣). ئەمانە مامۆستا و ڕاهێنەرن بەیەکەوە، یانی ڕێژەی مامۆستا زۆر کەم بووە و پێداویستییەکانی پڕ نەکردووەتەوە[٢٥٩].

بۆ ئەوەی پتر بایەخی خوێندنی پیشەسازی و کشتوکاڵی و بازرگانیمان لە شارەکانی کوردستان بۆ بەدیار بکەوێ، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە هەرچەندە قوتابخانەی پیشەسازی بۆ یەکەم جار لە شاری نەوتی سپی (کەرکووك) کراوەتەوە، بەڵام لەم شارە و لە شارەکانی تریش بایەخدان بەخوێندنی پیشەیی دواکەوتووە. چونکە ئەم شارە زوو کەوتووەتە بەر فشاری سیاسەتی گۆڕینی ناسنامە و نەژادی نەتەوەیی لە شارەکانی تریش قوتابخانەی پیشەیی زۆر درەنگ کراوەتەوە.

هەر لەباسی خوێندنی پیشەیی کە ئەو کاتە لە شارەکانی سلێمانی و کەرکووك و هەولێر و دهۆك تەنیا قوتابخانەی پیشەسازی کراوەتەوە و لە هەموو شارەکانیش نەبووە. لە خشتەی ژمارە (٥٤) بەم شێوە قوتابییەکانی قوبخانەکانی پیشەسازی لە سەر پۆل و بەشە جۆربەجۆرەکان دابەش کراوە لە هەرسێ شاری کەرکووك و مووسڵ و سلێمانی.

---

(٢٥٩) هەمان سەرچاوە. ل ١٧١.

## خشتەی ژمارە (٥٤) (٢٦٠)

## دابەشکردنی قوتابی لەسەر پۆل و بەشە عەمەلی و ناوخۆییەکان لە قوتابخانە پیشەسازییەکان لە ساڵی ١٩٦٦–١٩٦٧.

| قوتابخانە | پۆل | برادە | خراطە | حدادە | لحام | سمكرە | سباكە | کارەبا | نجارە | سيارات | راديو | طباعە | بناء | تێکڕا | داخل | خارجى | ژمارەی هۆبەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مووسل | یەکەم | ٤ | ٤ | ١ | ٢ | ١ | — | ١٥ | ٥ | — | — | — | — | ٢٢ | | ٢٢ | ١ |
| | دووەم | ١٠ | ١٢ | ٢ | ٣ | ٢ | ٩ | ١١ | ٧ | — | — | — | — | ٥٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٢ |
| | سێیەم | ١٠ | ٩ | ٢ | ٢ | ٢ | — | ١٣ | ٩ | — | — | — | ٤ | ٥١ | ٢٣ | ٢٨ | ٢ |
| | چوارەم | ١٤ | ١٥ | ٥ | ٤ | ٥ | ١٤ | ٢٢ | ١٣ | ٨ | — | — | ٢ | ١٠٢ | ٥٩ | ٤٣ | ٢ |
| | پێنجەم | ٦ | ١٧ | ٣ | ٣ | ٣ | ٦ | ٢١ | ١١ | ١٥ | — | — | — | ٨٥ | ٣٤ | ٥١ | ٣ |
| | شەشەم | ٢ | ٣ | ٣ | ٤ | ٤ | — | — | ٥ | ٤ | — | — | — | ٢٥ | ٩ | ١٦ | ١ |
| | تێکڕا | ٤٦ | ٦٠ | ١٦ | ١٨ | ١٧ | ٢٩ | ٧٢ | ٥٠ | ٢٧ | — | — | ٦ | ٣٤١ | ١٤٩ | ١٩٢ | ١١ |
| کەرکوک | دووەم | ٩ | ١٠ | ٦ | | ٢ | ٩ | ١٠ | ٥ | — | — | — | — | ٥١ | ٢٧ | ٢٤ | ٢ |
| | سێیەم | ٥ | ٩ | ٤ | ٣ | ٤ | ٥ | ٥ | ٧ | — | — | — | — | ٤٢ | ١١ | ٣١ | ٢ |
| | چوارەم | ٦ | ٣ | — | ٦ | — | — | ١٥ | ٣ | ٩ | — | — | — | ٤٢ | ٢٧ | ١٥ | ١ |
| | پێنجەم | ٦ | ١٠ | — | ٦ | — | ٣ | ٢٠ | ٦ | ٥ | — | — | — | ٥٦ | ٣٧ | ١٩ | ٢ |
| | شەشەم | ٦ | ٧ | — | ٥ | — | — | ١٢ | ٢ | ٣ | — | — | — | ٣٥ | ٢٣ | ١٢ | ١ |
| | تێکڕا | ٣٢ | ٣٩ | ١٠ | ٣٦ | ٦ | ١٧ | ٦٢ | ٢٣ | ١٧ | — | — | — | ٢٢٦ | ١٢٥ | ١٠١ | ٨ |
| سلێمانی | دووەم | ٤ | ٤ | ٢ | ١ | — | ٣ | ٤ | ٤ | — | — | — | — | ٢٢ | ١٤ | ٨ | ١ |
| | سێیەم | ١ | ٢ | ٢ | ٢ | — | ٢ | ٤ | ٣ | — | — | — | — | ١٦ | ١١ | ٥ | ١ |
| | چوارەم | ٥ | ٥ | ٣ | ٢ | — | ٥ | ٥ | ٥ | — | — | — | — | ٣٠ | ٢٥ | ٥ | ١ |
| | پێنجەم | ٤ | ٥ | ٢ | ٢ | — | ١ | ٣ | ٢ | — | — | — | — | ١٩ | ١٣ | ٦ | ١ |
| | تێکڕا | ١٤ | ١٦ | ٩ | ٧ | — | ١١ | ١٦ | ١٤ | — | — | — | — | ٨٧ | ٦٣ | ٢٤ | ٤ |

(٢٦٠) هەمان سەرچاوە، پاشکۆی ژمارە (٢).

ئەگەر سەرنجی هەندێك لەخشتەكانی پێشوو لەمەڕ خوێندنی شاری هەولێر و دهۆك و سلێمانی بدەین، لەساڵی خوێندن ١٩٧٦ – ١٩٧٧ بۆمان دەردەكەوێ خوێندنی پیشەیی بەم جۆرە پەرەی سەندووە، ئەمەش بۆ پێشكەوتن و هەنگاوە گرنگانە دەگەڕێتەوە كە دوای ڕێككەوتنامەی ساڵی ١٩٧٠ هاتە ئاراوەو تا ئەمڕۆش خوێندنی پیشەیی لە كوردستاندا، ساڵانە ژمارەیەكی زۆر قوتابی بەخۆوە دەگرێ، ئەگەرچی لەبەردەم خوێندنی ئامادەیی و دواتر چوونە كۆلێژ و ئامۆژگاكان لە پاشەكشەیە، بەڵام بایەخی خۆی هەر ماوەو ساڵانە ژمارەیەكی زۆری قوتابی لەم قوتابخانە پیشەییانەدا (پیشەسازی و بازرگانی و كشتوكاڵی) دەردەچن.

سلێمانی ساڵی ١٩٧٦–١٩٧٧ سێ قوتابخانەی پیشەسازی و بازرگانی و كشتوكاڵیی تێدا بووە و ژمارەی قوتابییانی بەم شێوەیە دابەش كراون.

| ناوی قوتابخانەكان | قوتابی | | مامۆستا | |
|---|---|---|---|---|
| | كوڕ | كچ | كوڕ | كچ |
| پیشەسازی | ٨٥١ | ١٠٦ | ٤٥ | ٧ |
| كشتوكاڵ | ٣٧٠ | – | ٢٧ | – |
| بازرگانی | ١٠٨ | ١١٠ | ٥ | ٦ |

هەروەها لە هەولێریش بەم شێوەیە بوو كە سێ قوتابخانەی لێ بوو.

| ناوی قوتابخانەكان | قوتابی | | مامۆستا | |
|---|---|---|---|---|
| | كوڕ | كچ | كوڕ | كچ |
| پیشەسازی | ٦١٨ | – | ٤٢ | – |
| كشتوكاڵ | ٥٦٩ | – | ٤١ | – |
| بازرگانی | ٢٤٥ | ١١٣ | ١٦ | ٨ |

هەر لە هەمان ساڵدا لە دهۆكیش سێ قوتابخانەی پیشەسازی و كشتوكاڵی و بازرگانی هەبووە.

| ناوی قوتابخانەكان | قوتابی | | مامۆستا | |
|---|---|---|---|---|
| | كوڕ | كچ | كوڕ | كچ |
| پیشەسازی | ٢٠٩ | – | ١٥ | – |
| كشتوكاڵ | ٢٣٧ | – | ١٧ | – |
| بازرگانی | ٥٣ | ٩ | ١ | ٢ |

لەم شێوە زانیارییانەدا، لە هەر سێ شاردا، ٩ قوتابخانەی پیشەیی کراونەتەوە کە تێکرای ژمارەی قوتابییەکانیان ( ٣٢٧٦ کوڕ و ٣٣٨ کچ) لەم نۆ قوتابخانەیە خوێندوویانە و ڕێژەی کچان لەچاو کوڕان زۆر کەمە. لە ساڵی ١٩٧٦ – ١٩٧٧ لە شاری دهۆك تەنیا (٩) کچ و لە هەولێر (١١٣) و سلێمانی (٢١٦) کچ لەم قوتابخانە پیشەییانە خوێندوویانە دوو بەشیان لە بازرگانی خوێندوویانە.

هەر لەم ساڵەشدا لە هەرسێ شاردا (٢٠٩ مامۆستای پیاو و ٢٣ مامۆستای ئافرەت لە قوتابخانە پیشەسازییەکاندا هەبوونە، کە بۆ ئەم سەردەمە، ڕێژەیەکی زۆر کەمە.)

# خوێندنی کوردی لە (خۆی)
# بۆ کۆماری کوردستان

کوردستان هەڵکەوتێکی جوگرافی و ستراتیژی گرینگی لە ناوچەکە هەیە وڵاتە زلهێزەکان زۆر هەوڵیان داوە لە کاتی ململانێ و شەڕەکانیاندا سوودی لێ وەرگرن، ئەم شوێنە پڕ بایەخە ڕۆژ بەڕۆژ پتر ڕۆڵی بەدیار دەکەوێ. لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لە هەوڵی کۆششەکانی کورد بۆ بایەخدان بەخوێندەواری و کردنەوەی قوتابخانە و خوێندنی کوردی، گەڕیدە و پیاوە ئاینییەکان و ڕۆژهەڵاتناسی وەکو ئۆربیلی ڕۆڵیان هەبووە.

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش بەهۆی کۆمەڵێك فاکتەر خوێندن بەزمانی کوردی دووچاری دواکەوتن و لە هەندێك سەردەمدا نەشبووە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە بایەخی کوردستان لە لای ڕووسەکان، پاڵی پێوە نابوون بۆ دامەزراندنی گەلێك کۆنسوڵخانە و ئەو قوتابخانەی تایبەتی و بنکەی ئاینی لە هەندێك شاری کوردستانی تورکیا و ئێراندا و تەنانەت پێش دەست پێکردنی شەڕ بەماوەیەکی کەم چاپخانەیەکیشیان لە شاری ورمێ دانا(٢٦١).

کار تەنیا بەوەندە نەوەستا، ڕۆشنبیرانی کورد کەوتنە خۆ بۆ ئەوەی سوود لەو هەلومەرجە وەربگرن و خوێندن بەزمانی کوردی دەست پێ بکەن و خوێندەواری بڵاو بکەنەوە. عەبدولڕەزاق بەدرخانی بەناوبانگ، جێگەی مامۆستا خەیالی لەناو کوردی ئێراندا گرتبۆوە و بەگەرمی لە هەوڵ و کۆششدا بوو بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری لە ناویاندا و یەکێك لە باسە گرینگەکانی دیوەخانی ئاوەدانی بریتی بوو لە باسی نرخی خوێندن و هاندانی خەڵك بۆ ئەوەی بایەخی پێ بدەن. لەسەرەتای ساڵی ١٩١٣ لە شاری (خۆی) کۆمەڵێکی ڕۆشنبیری دامەزراند و نیازی بوو چاپخانەیەکیشی بۆ دابنێ و ڕۆژنامەیەکی بەناوەوە دەربکا و لەژێر سەرپەرشتیی ئەودا چەند قوتابخانەیەکیش بکاتەوە. هەنگاوی هەرە گەورە و پڕ مانای ئەم کۆمەڵە بریتی بوو لە کردنەوەی **یەکەم فێرگە** (قوتابخانە)ی کوردی لە شاری (خۆی) بەپارەی کۆکراوەی دانیشتووانی ناوچەکە خۆیان. ئەم قوتابخانەیە لە ڕۆژی ٤ی تشرینی دووەمی ١٩١٣

---

(٢٦١) **د. کەمال** مەزهەر ئەحمەد – کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، ل ٢٣.

کرایەوە، بەم بۆنەیەوە لە شاری خۆی ئاهەنگێکی گەورە سازکرا، ژمارەی یەکەم دەستەی شاگردانی ئەم قوتابخانەیە (٢٩) کەس بوو کە بەزمانی کوردی دەرسیان دەخوێند و بەئەلف و بێی ڕووسی دەیاننووسی و زمان و ئەدەبی رووسیشیان دەخوێند. لەناو قوتابخانەکەدا نەخۆشخانەیەکی بچووکیش هەبوو[٢٦٢].

لەم بارەیەوە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کوردناسی ناودار ئۆربێلی ڕۆڵێکی بەرچاوی لە دانانی ئەلف و بێی کوردی بە رووسی بینیوە و هاریکاریی عەبدولڕەزاق بەدرخان بووە بۆ کردنەوەی قوتابخانەکە و خوێندن بەزمانی کوردی.

ڕاستە ئەو چالاکییەی سەرەتا لە کوردستانی باکور و ڕۆژهەڵات دەستی پێ کرد، لە کوردستانی باشوور بەم جۆرە نەبوو بەپێوەندیی نێوان هەردوو بەشی کوردستانی باکور و ڕۆژهەڵات چ لە ڕێگەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانەوە، چ لە ڕووی ئەو هەوڵە فەرهەنگی و ڕۆشنبیرییەی دەدرا، پتر بوو، بەڵام ئێستا مەسەلەی خوێندەواری و خوێندن بەزمانی کوردی و کردنەوەی قوتابخانە زۆر دواکەوتووە، زمانی کوردی بەرەسمی نەناسراوە، پێچەوانەی ئەوەی لە کوردستانی باشوور بەڕێوە دەچێت و پەرەی سەندووە. تاقە ئەزموونی خوێندن بەکوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ئەوەبوو کە لە (خۆی) دەستی پێ کرد و لە ماوەیەکی کەمدا بەکۆتا بوو.

وەزعەکە تا پێکهێنانی کۆماری کوردستان (مەهاباد) درێژەی کێشا و خوێندن بەکوردی و زمانی کوردی بقە بوو.

تا گەیشتووەتە ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٥ لە سەروبەندی پێکهێنانی کۆماری کوردستان پتر لە (٩٥٪)ی دانیشتوانی کوردستانی ئێران (ڕۆژهەڵات) نەخوێندەوار بوون و نەخوێندەواری لەنێو ژناندا سەدی سەد بوو. ئەمڕۆش وا مەزندە دەکرێ بەپێی بۆچوونەکانی قاسملوو پیاوان ٦٠٪ و ژنان ٧٥٪ یان نەخوێندەوارن، کە ڕادەی نەخوێندەواری لە نێو ژنانی لادێدا ئێستاش دەگاتە ٩٥٪، بەپێی ئامارەکانی حەفتاکانی سەدەی بیست لە کوردستان بۆ هەر (٥٠،٠٠٠) کەس یەك پزیشك هەبووە. ئێستاش وەزع لەمە باشتر نییە. چونکە زۆر لە پزیشکەکان کوردستانیان بەجێ هێشتووەو بۆ دەرەوەی وڵات ڕۆیشتوون[٢٦٣].

---

(٢٦٢) هەمان سەرچاوە ل ٣٩

(٢٦٣) عبدالرحمن قاسملوو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، چاپی دووەم، ١٩٨٨ ل ١٥.

ئەمە وێنەیەکی بچووکی هەلومەرجی ئەو سەردەمی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە، لە وڵاتێکدا ڕێژەی نەخوێندەواری (٩٥٪) بێ، دەبێ چ کڵۆڵی و کوێرەوەرییەك چاوەڕێی بکات و چتۆ دژە ئازادییەکی هەبێ، بۆ ئەوەی هەمیشە چرای زانست و پێشکەوتن و ڕووناکییان بەسەردا بکوژێنێتەوە. چ مەرگەساتێکە لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا نزیکەی پتر لە (٦٥٪) دانیشتووانەکەی نەخوێندەوار بن و بەزمانی زگماکی خۆشیان نەخوێنن.

لە ٢٢ی ژانیوەری ١٩٤٦ کۆمارێکی نیشتیمانیی کورد بەسەرۆکایەتیی قازی محەمەد، پێشەوای حیزبی دیموکراتی کوردستان دامەزرا، کە شەخسیەتێکی کۆمەڵایەتی و خەباتکەرێکی هەڵکەوتووی گەلی کورد بوو. ئەو حکوومەتە نیشتیمانییە کەمتر لە ساڵێك خۆی ڕاگرت، بەڵام هەر لەو ماوە کورتەدا قازانجی زۆری بەگەلی کورد گەیاند. زمانی کوردی بۆ یەکەم جار بوو بەزمانێکی ڕەسمی و منداڵانی کورد بەزمانی زگماکی خۆیان قوتابخانەیان بۆ کرایەوە و کتێب و کۆوار و ڕۆژنامەی کوردی بەچەشنێکی بێ وێنە بڵاوکرانەوە. بۆ یەکەم جار تیئاتری کوردی دامەزرا ژنی کورد بۆ یەکەمجار لە ژیانی سیاسی و فەرهەنگیی وڵاتدا بەشدار بوو[٢٦٤]. دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە بزوتنەوە سیاسییەکانی ئەو سەردەمە بایەخی زۆریان بەڕۆشنبیری بوون و زمانی کوردی و فەرهەنگی کوردی داوە. حیزبی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ دامەزرانی لە بەیانێکی سیاسیدا، ئامانجەکانی لە هەشت خاڵی سەرەکی، وەکو داوا و ئەرکی سەرەکیی ئەو سەردەم دەربڕیوە لەو هەشت خاڵەدا لە خاڵی دووەمدا هاتووە:

«مافی خوێندنی بەزمانی زگماکی خۆی هەبێت و بەتەواوی کاروباری ئیدارەکان بەهۆی زمانی کوردی بەڕێوە بچێت»[٢٦٥].

ئەگەر هەندێك بۆ دواوەتریش بگەڕێینەوە دامەزراندنی (کۆمەڵەی ژ-ك) بزاڤێکی بەرچاوی لەناو کوردستان دروست کردووە، بۆچوونەکانیان و ئەو هەلومەرجەی تێدا دروست بوون، بایەخی زۆریان لەسەر ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی ئەو کاتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان جێ هێشتووە. هەرچەندە ژمارەیەك شاعیر و ڕۆشنبیر دروست بوون و لە کۆڕی وشیار کردنەوە و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بوون، هاتنی ڕەزا شا بۆ سەر کار هەروەکو کارەساتێکی سیاسی و ئابووری بوو بۆ کوردستان،

---

(٢٦٤) عبدالرحمن قاسملوو، کوردستان و کورد، و:عبدلله حسن زاده، ١٩٧٣ ، ل٩١

(٢٦٥) عبدالرحمن قاسملوو، چل ساڵ خەبات لە پێناو ئازادی، ل٣٧.

هەروەها کارەساتێکی گەورەش بوو بۆ زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی.[٢٦٦]

لەو سەردەمەدا کۆمەڵەی ژ.ك بەپێی هەواڵێکی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) یاداشتێکی داوەتە حکوومەتی ئێران لەمەڕ (زمان و خوێندن بەکوردی) وەها یاداشتی کردووە:

١- لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە زمانی کوردی بەڕەسمی دابنرێ بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان کە ژمارەی دانیشتووانی ٣ ملیۆن پترە.

٢- زمانی کوردی ببێ بەزمانی خوێندن و بەڕێوەبەرایەتی و دادگەری لە کوردستاندا.

٣- فەرمانبەران لە هەموو کوردستاندا کورد بن.

٤- ئەو باجەی (ضريبة) لە کوردستاندا کۆ دەکرێتەوە دەبێ لە کوردستانیش بەکار بهێنرێتەوە.

بۆ دروستکردنی خەستەخانە و قوتابخانە و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان نەك بۆ ڕازاندنەوەی تاران[٢٦٧].

دەبێ لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کە ڕۆشنبیران و هەڵگرانی فکری ڕەوشنگەری لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی بایەخی زۆریان بەخوێندەواری و قەڵەم و ڕۆشنبیری داوە. حزبی دیموکراتی کوردستان لە مەرامنامەکەیدا لە سەردەمی کۆماری کوردستان وەها دەبێژێ: حیزب لەسەر ئەم بناغانە دامەزراوە حەقیقەت و عەداڵەت و تەمەدوون، هەروەها قەڵەم و گوڵەگەنم بۆ عەلامەتی حیزب قبوڵ کراوە. لە بەندی (١٣)شدا دەڵێت: «بەمەبەستی پەرەپێدانی زانست و شارستانێتی لەناو خەڵکی کوردستاندا، خوێندنی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی دەکرێتە ئیجباری و، لە هەموو قوتابخانەکاندا دەبێ بەزمانی کوردی دەرس بخوێنرێ». لە بەندی (١٤)شدا دا هاتووە: «بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی زانین و ژیان و شارستانییەتی خەڵك، ژمارەیەکی زۆر ناوەندی زانستی کتێبخانە، قەرائەتخانە، کلووب، تیاتر، مەیدانی وەرزش دادەمەزرێنێ»[٢٦٨].

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بایەخی زۆر بەباری خوێندن و ڕۆشنبیری دراوە و لایەنی گرینگی بەرنامەی کاری حیزب و کۆمار بووە. دیارە بەپێی ئەو سەرچاوانەی هەنگاوەکانی کۆمار بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و بایەخدان بەخوێندنی زمانی

---

(٢٦٦) نەوشێروان مستەفا ئەمین، حکوومەتی کوردستان، کورد لە گەمەی سۆڤیەتیدا، ١٩٩٣، ل٦٣

(٢٦٧) هەمان سەرچاوە، ل٦٢.

(٢٦٨) هەمان سەرچاوە، ل٨٨.

کوردی و باری ڕۆشنبیری باس دەکەن، بووە جێی پشتیوانیی خەڵکی کوردستان و ڕۆشنبیران و خوێندەوار و شۆڕشگێڕانی نەتەوە پەروەری کوردی ڕوویان تێ کرد و بۆیان تێ کۆشان و شەونخوونییان لە پێناودا کێشان.

## گوتاری پێشەوا قازی محەممەد

## لە ئاهەنگی ڕێبەندان

ڕۆژنامەی کوردستان، کە یەکێك لە ڕۆژنامە دیار و مێژووییەکانی زەمانی کۆماری کوردستانە، ڕێپۆرتاژێکی لەسەر ئاهەنگی ڕێبەندان، ئاهەنگی جەژنی سەربەخۆیی و ئازادیی کوردستان بڵاو کردووەتەوە. ئەو وتارەی پێشەوا قازی محەمەد، سەرکۆماری کوردستان لەم ئاهەنگە داویەتی، پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەباسەکەی ئێمەوە هەیە، بەتایبەتی لەو شوێنانەی باسی هەلومەرجی دژواری باری خوێندەواری و قەدەغە بوونی زمانی کوردی دەکا لەسەر باری بایەخی ئەو ئاماژانەی لەمەر خوێندن بەزمانی کوردی لە ناو گوتارەکەی پێشەوا هەیە. ئەمە دەقی گوتارەکەیە:

*نوطقی جەنابی پێشەوا رەئیس جمهوری بەرزی کوردستان*

*«کوردستان مەوقیعیەتی جوغرافیائیەکی مەخصوصی هەیە کە بێ پسانەوەو بێ ئەوەی نەتەوە و میللەتێکی کە لە نێوان دا فاصیل و لیکیان بپچرێتەوە کورد بەسەریەکەوە و پیکەوە سکونەتیان تێی دا هەیە و دارای مالکییەتی میللین دەوێدا. بەسەرهات و سەوابیقی تاریخییان یەکە و عمومەن تێدا شەریکن. خاوەنی ئاداب و عادات و رسومی میللیەکی وان کە هیچ جۆرە صەدمە و حەوادثیك نەی توانیوە سستییەك لە بناغەی میللیەتی ئەواندا پەیدا بکات.*

*کورد لە قەدیمدا پادشا و حوکمدار و تەشکیلاتیان بووە. هەر لەم کوردستانی ئازادی ئیستادا بنەماڵەی ئەومەرای موکری کە لەسەر سیلسیلەی ئەوان (میر سیف الدین) بوە تا ١٠٢٠ هـ بیلئیستیقلال یەك لە دوای یەك: امیر سیف الدین، صارم بەگ، شێخ حیدر، امیر بەگ، امیر پاشا تا دەگاتە قوباد خان بەدەسەڵات و قودرەتەوە حکومەتیان کردوە.*

*میللەتی رەشید و بەغیرەتی کورد لە هەموو دەورە زەمانێکدا هەر کەس خەیال ئیستیلای نیشتمان ئەوانی بوبی بەرەنگاری بون و بەربەرەکانییان کردوە و لە هیچ فیداکارییەك دەستیان دانەنواندوە. لەپاش دەست چونی سەڵطەنەت و حوکمداریشیان بو*

وەگیر خستنەوەی ئیستقلال و ئازادی بەملیۆن قوربانییان داوە لەبەر ئەوەی کە هەمیشە لە مویارەزە و ملەدا بوون هیچ جۆرە ئەزییەت و ئازارێك نەماوە نەی چێژن و نەی بینن.

لەگەڵ ئەوەشدا هەمو کوێرەوەری و کوشتن و برینێکیان تەحەمول کردوە و قەت لە ئامانج و ئارەزوی خۆیان شل نەبونەوەو لە ڕێی وەدەست خستنەوەی ئازادیدا وچانیان نەداوە، بەدلیکی ئەوەندە بەهێز و عەزمێکی هیندە ثابتەوە تێکۆشاون، هیزیکی وا پەیدا نەبوە بتوانی تێکڕا خەفەیان بکات. میرە کوێرەیان کوشتوە، بابان سەریان هەڵداوە، بابانیان بیدەنگ کردووە ئەردەلان بلیند بوون، ئەوانیان لە عەرزی داوە بتلیسی بەرز بونەوە و هەزاری دیکەی وەك ئەوان.

تا لەو دواییانەدا لە پاش شەڕی بەینە لمیلەلی پێشوەوە کە دیکتاتۆری ئیران و تورکیا هاتنە سەر کار و زمان و عادات و مەزهەب و خصوصیاتی میللی کوردیان بەجارێك لاواز و کز و کەنەفت کرد، لە هیچ وەحشییەت و درەندەییەك ڕانەوەستان، خوێندن و نوسینی زمانی کوردی مەمنوع و پۆشینی لیباسمان قەدەغە بو.

نەیان دەهێشت لە هیچ جۆرە مەزایا و حقوقیکی بەشەرییەت بەشمان ببی، ڕێگای فێر بونی عیلم و صنعەتیان لی بڕی بوینەوە، هەر روژە بەهانەیەك هەر دەمی بەتەشقەلەیەك دەستە دەستەو پۆل پۆل کوردی هەژار و بەدبەختیان حەبس و تەبعید دەکردو دەیان کوشتن و لە بەینیان دەبردن، حاصل و دەسرەنجی ئەو میللەتە بێچارەیان دەبرد بۆ خۆیان و ئەوانیشیان برسی و تینو و روتوقوت دەهێشتەوە.

تا لە شەهریوەری ۱۳۲۰دا فریشتەی ئازادی دەستگای دیکتاتوری و فاشیستی رضا خائی تیکشکاند. کورد سەری لەو هەموو فشار و ئەزتیە کەمێ فارغ بو، فەوری ئیحساسی کرد، چۆن دەبێ لە فرسەت ئیستفادە بکات و، ڕێگای صەلاح و وەدەست خستنی ئازادی ئەو میللەتە چیە و چبکا؟ پیاوانیکی بەبیر و هۆش و بەشەرەف کە زۆر لە میژ بو خویناوی دڵی خۆیان دەخواردەوە و بۆ زەلیلی ئەو میللەتە دوکەڵ لە دەرونیان دەهاتە دەرێ زۆر زو تەشخیصیان دا کە وەختی کارە و لەو فرصەتە دەبێ بەهرە وەربگیرێ و ئەوە تەواو ئەو ڕۆژەیە کە پشتاوپشتمان چاوەڕوانی بون. یەکجار و خێرا، بیوچان و راویستان، دەستیان بەکار کرد حیزبی دیموکراتی کوردستانیان تەشکیل کرد و بەدەستویرد خەریکی کاروباری میللی بون و بەچاوێکی ورد و بە دیقەت ئیحتیاج و پێداویستی کوردیان تەشخیص داو بەدی کرد.

له پێش هەموو شتیکدا ئیختیلاف و دوبەرەکی عەشایری کە بەدەسیسە و حیلەبازی ئستیعمارچی و دیکتاتۆران بۆ ئیستیعمار و خواردن و کروشاندنەوەی ئەو میللەتە بە قەولی خۆیان "تفرقه بینداز و حکومت کن" دەبەینی خست بون و تا ئەندازەیەك ئەو ئاورە بلیسەی ساندبو برای دایك و بابی لەیەك بەزاندبو، یەکەتی لە گوری هەلگیرا... ...

چەند مەدرەسەی کچان و کوڕانمان کردەوە، مەدرەسەی شەوانمان دایرکرد و کتێب بەزمانی کوردی تەرجەمە کران... کوڕ و کچ و پیاوی گەورە لە مەداریسی شەوانە و ڕۆژانە بەزمانی کوردی دەخوینن لە جیاتی ئەوەی شەش حەوت ساڵ خەریکی خوێندن و فێربونی فارسی بن لە مانگێك و دو مانگدا دەبنە خویندەوار هەمو شتێك دەخوینینەوە و دەنوسن.

بۆ ناساندنی لیاقەتی میللی و دەرخستنی حەیاتی ئەدەبی و فەرهەنگی کورد و بۆ ڕاگەیاندنی هاواری خۆمان بەگوێی دنیای بەشەرییەت و عەدالەت موحتاجی وەسیلەی چاپ و بڵاوکردنەوە بوین، چاپخانەی زۆر چاك تەئسیس کراو دانرا لە شاری خۆمان دا بەزمانی خۆمان بەچاپخانەی خۆمان گۆڤار و ڕۆژنامە دەردەچن و بیر و فیکر و داخوازی ئێمە لە دنیا بڵاو دەکاتەوە.

حاصل و بەروبوی ئێمە کە میقدارێکی زۆر و زەوەند و بەقیمەت بۆ فیرۆیی لە دەستیان دەردەهێنان و دەستی ئیستعمار سەدەیەکی لە پێش ئێمە و بازاڕی دنیا دروست کرد بۆ ڕزگاری حەکمان دییەوە و تیجارەت و ئیقتیصادی کوردستان زۆریاش تەئمین کرا.

له زەمانی دیکتاتۆریدا کە هەمو عەواریضیکیان لێ دەساندین کەم و زور وەسیلەی لەشساغی و موعالەجە نەحەکیم نەدەرمان نەمەریضخانەی بۆیان ساز نەکردین، ئێمە بۆ خۆمان مەریضخانەی زۆرباش بەو زوانە دایر دەکەین و لەشساغی وڵاتمان تەئمینی دەبێت.

هێزێکی میلیمان تەشکیل داوە کە بەشەجاعەتێکی تەواو حاضرە دیفاع لە نیشتمان بکات. دیارە موفەقیەتی ئێمە سەراسەر لە عەینی مەرامی دیموکراسی و لە نەتیجەی فەعالیەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان و بەپشتیوانی عالەمی دیموکراتە لەبەر ئەوە.... دەڵێین بژی موئەسیسینی دیموکرات...... ». (٢٦٩)

دەبێ لێرەدا وەکو تۆمارێکی مێژوویی پەنجە بێخینە سەر ئەوەی کە لە گوتارەکەی

---

(٢٦٩) هەمان سەرچاوە، ل١٠٧.

پێشەوا قازی محەمەد زۆر بەڕوونی باس لە هەنگاوەکانی کۆماری کوردستان بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و کردنەوەی قوتابخانەی شەووڕۆژ و نەخۆشخانە و دامەزراندنی چاپخانە و وەرگێڕانی کتێب و شتی تری ڕۆشنبیری کراوە.... بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچانی ئەوان خاتوو (یای ویلمەی صیادیان) کە قوتابخانەکە ناوی (مەدرەسەی پەروانەی کچانی مەهاباد) بووە، لەم بۆنە مێژووییەدا گوتارێکی پێشکەش کردووە و وەها دەستی پێ کردووە کە ئەمەیان دەقی وتارەکەیە و لە ڕۆژنامەی کوردستان بڵاو کراوەتەوە لەو ڕیپۆرتاژەی بەبۆنەی ئاهەنگی ڕێبەندان سازکراوە، دووریش نییە ئەمە یەکەمین وتاری ئافرەتێکی کوردی ڕۆژهەلات بێ، بەئاشکرا لەبەر دەم خەڵك پێشکەشی کردبێت.

*لە دنیای موتەمەدین و زانستدا. هەر میللەت و نەتەوەیەك، هەر طایفە و قەوم و تیرە و بەرەیەك، بە زمانی خۆی کە دایك لەسەر پشتی لانك حەرفێك و دو حەرف خستویەتیە لێویان و دەگەڵ شیر دەزاری کردوون، خوێندویانە و دەخوێنن، نوسیویانە و دەنوسن، لە چوار سنور و وڵاتانی خۆیاندا بەئازادی ژیاون و دەژین. بەڵام داخەکەم میللەتی کورد، ئەو میللەتەی کە تاریخ ئیفتیخار و شانازی شەش هەزارساڵی وانی لە بیرە و لەبەر ئەهمییەت وگەورەیی لەسەر دڵی کتێبانی داناوە، ئەو میللەتەی لەگەڵ هەموو بەرهەڵستێك لەگەڵ هەرکەسێك کە پەلاماری نیشتیمانی وانی دابی بەرەبەرەکانییان کردوە و بست بەبست بەخوێنی خۆیان ڕایان گرتوە، مودەیەکی زۆر گرفتاری چنگاڵی ڕەش و برش و پیسی ئیستبداد و دیکتاتۆری بون. زمان و عادات و ئادابی میللی ئێمە قەدەغە کرابوو. لەترسی ئەوەی مقامی دیکتاتۆری و قازانجی ئیستعماری خۆیان نەکەوێتە قولە، ئێمەیان لە تەرەقی و زانست و سەرکەوتن دەگێڕاوە و نەیان دەهێشت دنیا لە ئیستیعداد و لیاقەتی ئێمە: میللەتی کورد حالی ببن. تا لەم شەڕە گەورەیە دا کە پەڕی عەدالەت و ئازادی بەسەرمۆتەکە و دێوی فاشست و دیکتاتور غالب بو، بەفەرمانی یەکە پیاوی مەیدانی عەدالەت و بەشەردۆستی و ژنرالیسموس ستالین ئێمەش لە زیندانی دیلی هاتینە دەرێ و ڕێگامان بۆ کراوە. لە ژێر ئامۆژگاری حەکیمانە و شارەزایی کردنی پیاوانەی پێشەوای موعەظەمی کوردستان جنابی قاضی محەمەد دا زمان و دین و عادات و ئادابی میللی ئێمە ئازاد بو. ئیستیعدادی میللی و لیاقەتی حەقی ژیانی خۆمان بەموستەقیللی و سەربەخۆیی بەدنیا نیشان دا. دەستی بەهێزی ئەو پێشەوا مەزن و گەورەیە ئەوەتا باسکی ئێمە، میللەتی کورد کە تا چوار ساڵ لەوە پێش دیل و یەخسیر*

بوین، گرتووه و زۆر خیرا لە هەموو کەند کولۆ و هەورازێك وەسەری خستووین و ئەوا لە ژێر باڵی پیرۆزی و شاهیدی سەعادەت و خۆشبەختیمان دەباوەش گرتوە. ئێمە مامۆستا و قوتابیەکانی مەدرەسەی کچان موبارەکبادی ئەو موفەقیە گەورە بەدەرمالی پێشوای موعەظەم عەرض دەکەین و تەمەننای قبولمان هەیە و هەموومان وێکرا بەدڵێك و زارێك دەڵێین: بژی پێشەوای مەزنی کوردستانی گەورە(٢٧٠).

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێ دا زمانی کوردی لە دوای ئەو هەوڵە دڵسۆزانەیەی عەبدولرەزاق بەدرخان بەهاریکاری ئۆربیلی لە(خۆی) درا، ئیتر بە هیچ جۆرێك ترووسکاییەك بۆ خوێندن بەزمانی کوردی نەما، دوای هاتنی ڕەزا شاش بەیەکجاری بنیەی کورد گیرا و نەك خوێندەواران، و بەلکە ئەدیبانیش تەنگەتاو کران و هەناسە بڕکێیان پێ خرا. تاقە سەرچاوە و بنکەی خوێندەواری کوردستان مزگەوت و حوجرە بوو، ئەوانیش زۆر بەدەگمەن زمانی کوردی تێدا بەکار دەهێنرا و دەخوێندرا.

لە ئێران جگە لەو تاقە حەفتەنامەیەی سمکۆ لە ورمێ بۆ ماوەیەکی کورت بێ ڕێگە پێدانی قانوونیی حکوومەتی تاران دەری کردبوو، ئیتر ماوەی دەرچوونی هیچ گۆڤار و ڕۆژنامەیەك، یا چاپ کردنی هیچ کتێبێکی کوردی نەدراوە. بەکارهێنانی زمانی کوردی بۆ قسەکردنیش لە دائیرەکانی دەوڵەت و لە قوتابخانەکاندا قەدەغە بوو. کار بەدەستانی ڕژێمی پەهلەوی بوونی کوردیان ئینکار نەدەکرد، وەکو کەمالییەکان لە تورکیا دەیانکرد، بەڵام دانیان بەوەدا نەدەنا کە کورد نەتەوەیەکی سەربەخۆی جیاوازە لە فارس. وایان بڵاو دەکردەوە: کورد یەکێکە لە قەبیلە ڕەسەن خوێن پاکەکانی ئێران و، زمانی کوردی یەکێکە لە زاراوە پاکەکانی زمانی فارسی. چەندین مامۆستای زانستگای تاران و، زانای ئێرانی لەلایەن کاربەدەستانەوە ڕاسپێردران بۆ ئیسپات کردنی ئەو بۆچوونە لێکۆڵینەوە و باسی مێژوویی و جوگرافی و زمانەوانی و سوسیۆلۆجی بنووسن. لەبەر ئەوە هەمیشە کورد وای دەکرد کە زمانەکەی بەرەمزی خۆ ناسین و سەلماندنی ناسنامەی نەتەوایەتیی خۆی دابنێ. ڕۆشنبیرەکانی هەوڵی دارشتنی ڕێزمان و ڕێنووسی تایبەتی و ڕاگرتنی ئاخاوتنی زمانەکە بەپاکی و، بژارکردنی لە وشەی بێگانەی عەرەبی و تورکی و فارسی و نووسینی فەرهەنگ بدەن(٢٧١).

---

(٢٧٠) هەمان سەرچاوە، ل١٢١.

(٢٧١) هەمان سەرچاوە، ل١٤٣.

دەبێت لێکۆڵینەوەکەی نەوشیروان مستەفا لەمەڕ کۆماری کوردستان کە ڕاستەوخۆ شیکردنەوەی گوتار و نووسینی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سەردەمی کوردستانی بەبایەخی زۆرەوە سەیر بکەین، بەتایبەتیش لەم باسەی ئێمەدا جێگەیەکی باش و دیار پڕ دەکاتەوە، لەم بارەوە نووسیویەتی: قوتابخانەی حکوومەتی لە کوردستاندا یەکجار کەم بوو. بەشی هەرە زۆری خەڵك نەخوێندەوار بوون. ئەوەش وەنەبی ڕووداوێکی بەرێکەوت بوویێ. بەڵکو ئەمە سیاسەتێکی نەخشەکێشراوی ڕێژیەی پەهلەوی بوو. حکوومەتی کوردستان بۆ پڕکردنەوەی دەلاقەی پشتگوێخراوی دەیان ساڵە چەند هەنگاوێکی گرنگی هاوێشت. مەنافی کەریمی لە «هەیئەتی رەئیسەی میللی» دا دانرا بە «وەزیری فەرهەنگ» و لەپاڵ ئەوەدا «هەیئەتی فەرهەنگی»یش دامەزرێنرا. «هەیئەتی فەرهەنگی کوردستان» لە یەکێ لە کۆبوونەوەکانیدا چەند بڕیارێکی گرنگی بەم جۆرە دا:

*ڕۆژی چوارشەممە ١٢ ی ١٠ ی ٢٤ جەلسەی هەیئەتی فەرهەنگی کوردستان ساتی دو پێش نیوەڕۆ گیرا لە بابەت مەکتەب و دانانی دوو نەفەر پشکنیر بۆ مەکتەبەکان گفتوگۆی لازم کرا. ئاغایانی علی خسروی و رەحیم لشکری بۆ پشکنیری هەڵبژاردن و حوکمیان صادر کرا.*

*١- قەرار درا ئەو مندالانەی بێکەسن وە بەسواڵ مەشغولن کۆ بکرێنەوە لەناو میللەتدا بەش بکرێن و ڕۆژانە لە مەکتەبی گەلاوێژ بخوێنن و بۆ خرکردنەوەی ئەم هەژار و بێ کەسانە بەشارەوانی ئەمر درا کە خرپیان کاتەوە و بیان داتە دەست ئاغایانی حسین فروهرو مناف کریمی و ئەوانیش بەنێو میللەت دابەشیان بکەن.*

*٢- بەئەکثەریەتی ئارا پەسند کرا ئاغایانی فروهیرو کریمی خەڵکی بی سەواد حاضرکەن کە شەوانە لە مەکتەبدا بەزمانی کوردی بخوێنن.*

*٣- پەسند کرا هەموو نیشانەی (تابلۆ) ئیدارات و مەکتەب و تیجارەتخانان و عەمارەتان بگۆڕن و بەکوردی بنوسرێت.*

*٤- پەسندکرا ئەو مندالانەی کۆ دەکرێنەوە تەمەنیان لە ٦ تا ١٤ ساڵان زیاتر نەبێت.*

*٥- لە ئاخری جەلسەدا پەسند کرا کە جەلسەی دیکە جۆری لیباسی شاگردی مەکتەبەکان مەعلوم بکرێت*(٢٧٢).

---

(٢٧٢) هەمان سەرچاوە ل١٤٧.

## ناوی قوتابخانەکانی سەردەمی کۆماری کوردستان

کارێکی تر پاراستنی زمانی کوردی بوو، گۆڕینی ناوەکان لە فارسییەوە بۆ کوردی و ڕێگەگرتن لە بڵاوکردنەوەی زاراوە و وشەی بێگانە بوو، لەم بارەوە هەیئەتی تایبەتی بەفەرهەنگ و قوتابخانەکان بەم شێوە بڕیاریان داوە، ناوی قوتابخانەکانیان دیاری کردووە:

کوردستان ئەم «ئاگاداری»یەی بڵاو کردووەتەوە دەڵێت: «*بەپێی دەستوری پێشەوا رەئیسی جمهوری کوردستان لە ۲۰/۱۰ی ۲٤دا هەیئەتێك لە ئاغایانی فەرهەنگی لە ئیدارەی فەرهەنگ کۆ بوونەوە پەسند کرا کە مەدرەسەی پەهلەوی بەنێوی مەکتەبی کرمانجی کوردستان نێودار بێت. خواهیش دەکەین لەو تاریخەوە بەنێوێکی کە پەسند کراوە: «مەکتەبی کرمانجی» بناسن و قوتابخانەکان بەناوی «کوردستان» و «گەلاوێژ» و «پێشەوا» ناونراون.* وەنەبێت هەر ناوی قوتابخانەکان گۆڕابێ، بەڵکو زمانی خوێندن و جۆری خوێندن و، بەرنامەکانی بەگوێرەی هەلومەرجی سیاسیی نوێ گۆڕان.

کوردستان بەئیمزای (معاونی حیزب- طه زادە) لە کوردستان لەمەڕ خوێندن و بەناوی (کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی کوردستان) ئەم ئاگادارییەی بڵاو کردووەتەوە:

«*بۆ تەواوی ئەهالی خۆشەویستی سابلاغ ڕادەگەیەندرێ: لەسەر ئەمری پێشەوای موعەظەم و قەراری حیزبی دیموکراتی کوردستان لەوەی بەولاوە پێویستە بۆ پەرەپێدان و ڕەواجی زمانی کوردی خوێندن لە مەدرەسەکاندا بەکوردییە. لەو تاریخەوە تا ۱۰ ڕۆژی دیکە هەر کەسێك کوڕ و کچی هەبێت کە عومری ئیقتضای خوێندن بکات دەبێت بنێرێتە مەدرەسە. ئەلبەتە هەر کەسێ لەو ئەمرە ڕوو وەرگێڕێ بەتوندترین موجازات تەنبێ دەکرێت*». هەندێك قوتابخانەی نوێ لە سابلاغ و بۆکان و شنۆ کرانەوە، لەوانە قوتابخانەیەکی کچانە لە شنو(۲۷۳).

## کەمینە دینییەکان و خوێندن

هەردەم لە کوردستان هەوڵ دراوە ڕێزی کەمینە دینی و نەتەوەیییەکانی تر بگیرێت،

(۲۷۳) هەمان سەرچاوە ل١٤٨. ژمارە (۱)ی کوردستان ۲۱/۲/۱۹٤٦.

کۆماری کوردستانیش پەیڕەویی هەمان نەریتی باوی نێو کوردەواریی پەیڕەو کردووە و ڕێزی لە برایەتی و تەبایی گرتووە، وێڕای پەیڕەوی دیموکراتیەت و ئازادی دەرفەتی بۆ کەمینە دینییەکانیش ڕەخساندووە سوود وەربگرن. لەم بارەوە دەبێت پەنجە بۆ ئەو هەڵوێستە سیاسی و مرۆییە درێژ بکەین کە حکومەتی کوردستان ڕێزی مافی فەرهەنگی و دینی و کەمینە دینییەکانی گرتووە، ڕێگەی بەکلیمییەکان واتە بەجووەکان داوە قوتابخانەی تایبەتی خۆیان بکەنەوە.

کوردستان لەم بارە ئاگادارییەکی بڵاو کردووەتەوە و تێیدا هاتووە:

«*بەعمومی میللەتی کلیمییانی دانیشتووی مەهاباد ڕادەگەیەنم کە لە ژێر حیمایەتی حەضرەتی پێشەوای موعەظەم و مەحبوبی کوردستان و نەظارەتی ئیدارەی موحتەرەمی فەرهەنگ بەئیجازە لە مقاماتی بەرزی کوردستان مەدرەسەیەك بەنێو تێکەلی کوردی و عیبری دەکەینەوە، پێویستە لە بەرواری ئەو ئاگادارییەوە منداڵانی خۆتان کوڕ و کچ بەدەفتەری ئەو سەردەمە کە ڕوبەری عەمارەتی داودزادەیە بەموعەرەفی و ثەبتی بگەیەنێ. لە غەیری ئەو صورەتەدا مەجبورەن بەوەسیلەی شارەوانی حاضر دەکرێن. مدیر و سەرپەرشتی مەدرەسەی عیبری- داودزادە*»(٢٧٤).

دەردەکەوێ ئەگەر بارودۆخی چڕ و بەرژەوەندی زلهێزەکان و ململانێی ناوەوەی ئێران بار بووایە، ئاسۆیەکی گەش لە کار و هەنگاوەکانی کۆمار بەدی دەکرا، بەتایبەتی لە ئاسۆی بیر کردنەوەی و ئەو کۆششانەی بۆ پتەو کردنی دیموکراسیەت و ئازادی و ڕێزگرتنی بیروڕای جیاواز و نەتەوە و مەزهەبی دەنرا. بەڵام لە تەمەنی کورتی (١١) مانگەی کۆماری کوردستان و ئەو هەلومەرجەی هەبوو، توانای لەوە زیاتر لەبەر دەستدا نەبوو.

## گوتاری هەینی بەزمانی کوردی

ئەرکەکانی کۆمار لە ناوخۆ زۆر لەوە قورستر و فراوانتر بوون، بتوانرێت لە ماوەیەکی کورتدا بەسەریاندا زاڵ بێن، بڵاو کردنەوەی زمانی کوردی و چەسپاندنی ئەرکێکی لە پێشی کۆماری کوردستان بوو، چونکە ئەو کات و ئەمڕۆش چەسپاندن و پاراستنی زمانی کوردی ئەرکێکی نەتەوەیی و لەپێشە. ئامانجی زمان، بۆ ئامانجێکی سیاسی، چونکە دوژمنان دەیانەوێ زمانی کوردی بسڕنەوە تا ناسنامەی نەتەوەییی کورد نەهێڵن. ئەگەر مەلا کوردەکان گیانی نەتەوەییشیان بەهێز بێت و بەشێکی زۆریان لە

(٢٧٤) هەمان سەرچاوە ل١٤٩.

حوجره خوێندەوارییان بڵاو کردبێتەوە بەڵام زمانی کوردییان وەلا ناوە و زمانی عەرەبی «قورئان»یان، زمانی کار و خوێندەوارییان بووە. خانی داوای سەروەر بوونی زمانی کوردی و حاجی قادر بەڵا بۆ ئەوان دەنێرێت کە زمانی دایکی خۆیان نازانن و (نالی) لە سایەی شیعر نووسین بە سێ زمان خۆی بەخاوەنی سێ مۆڵکە دیوان دەزانێ. ئەگەر ڕۆژگارێکی بەکوردی شیعر نووسین و بەکوردی خوتبەدان عەیب و نەشیاو بووبێ، کورد لەمەش لەبەدبەختی لە پێشەوە بووە. لە مزگەوتی گەورەی شارەکاندا خەتیبی جومعە دەبوو بەزمانی عەرەبی یان بەزمانی رەسمیی دەوڵەت خوتبەی جومعە بخوێنێتەوە. حاجی قادری کۆیی مشتومڕێکی توند و تیژی خۆی لەگەڵ کابرایەکدا دەگێڕێتەوە لەسەر ئەوەی کابرا ڕەخنەی لە کاک ئەحمەدی شێخ گرتووە چونکە قورئانی بەکوردی لێکداوەتەوە.

حیزبی دیموکراتی کوردستان، بڕیاری دا کە ئیتر خوتبەی جومعەی بەکوردی بخوێندرێتەوە، بەم بۆنەوە ڕۆژنامەی کوردستان لە ژمارە (١ )ی ١١/١١/٢٤ ئەم هەواڵەی بڵاو کردووەتەوە:

*«هەوەڵ جارە کە خوطبەی جومعەی بەکوردی بخوێندرێتەوە»*

*وەکو برایان هەموو دەزاننساڵێکی تەواوە کە لەلایەن حیزبەوە دەستور بەئیمامی جومعە درا بوو کە خوطبەی جومعە بەکوردی بخوێندرێتەوەو، ئیمام لە پێشدا خوطبەکەی بەکوردی دەخوێندەوە و پاشان بەعەرەبی. بەڵام دوێنێ ١٢ی ١١ی ١٣٢٤ ئیمام پاش بسملە خوطبەکەی بەکوردی خوێندەوە»*

*بەئیمزای پێشەوا و رەئیسی جمهوری بەرزی کوردستان لەلایەن حیزبەوە بەجەنابی مەلا حسین مجدی ئیمام جومعەو سید محمدی حمیدی ئەمر دراوە کە خوطبەی جومعە لەسەر دەستوری ژێرو تەنظیم بکرێ:*

*موبارەزە دەگەڵ خورافات و، ئیحترامی قانون و دین بێمداری و ئیجادی بیمارستان. تەئثیری ئەمنیەت و ئەهمیەت سەربازی وەظیفە... تەهیەی کودەکستان، چلۆن دەبێ پێش بەتەراخوم بگیرێ روحی سیلەحشوری. وەحدەتی میللی و عەواقیبی تەبەهکاری، سوخەنی چینی و دوزیانی وە دەستور دراوە جەنابی ئیمام جومعەش ئەمانە ڕەچاو بکرێت و خوطبەی دێهاتیش لەم دەستورە پشتیوانی بکەن*[٢٧٥].

---

(٢٧٥) هەمان سەرچاوە. ل١٤٥.

لەم باسەدا بۆمان دەردەکەوێ کە لەسەردەمی کۆماری کوردستاندا بووژانەوەیەکی کەم وێنە لە ماوەی (١١) مانگی دەسەڵاتی کۆماری ڕووی دا، وێڕای کردنەوەی قوتابخانەی کوڕان و کچان و خوێندن ئیلزامی کراو هەتیو و بێ کەس و کارەکان لەلایەن شارەوانی کۆ دەکرانەوە و دەنێردرانە بەر خوێندن، ئافرەتان و کچان بۆ یەکەم جار لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەم شێوەیە هاتنە کۆڕی کارەوە و دەستیان بەخوێندن و بەشداریی ڕاستەوخۆی کۆمەڵگا و هێنادی مافەکانیان کرد.

زمانی کوردی نەك لە خوێندن بەڵکە لە مزگەوت، بۆنە ئاینییەکانیش کرایە زمانی رەسمیی حکومەتی کۆماری کوردستان. لێژنەی فەرهەنگی بۆ پاککردنەوەی زمانی کوردی و نووسین بەزمانی کوردی و تابلۆ و نووسینی سەر شۆستە و دوکان و کۆگاکان بەکوردی کرایە بڕیار.

پشکنەری خوێندنی قوتابخانە لە کۆمار دانرا، بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچان مامۆستایەکی ئافرەت بوو، ناوی قوتابخانەکان کرایە کوردی و نەك لە مەهاباد بەڵکە لە چەند شارێکی تریش قوتابخانە کرایەوە. چەند مامۆستایەکی کوردستانی باشوور وەکو (محەمەد وردی، عەبدولقادر ئەحمەد، عوسمان دانش، جەمیل بەهائەدین) [٢٧٦].

بۆ دەرس گوتنەوە و بەشداریکردن لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری چوونە مەهاباد و ڕۆڵیان بینی.

---

(٢٧٦) هەمان سەرچاوە، ل١١٨.

بێگومان لە پێکهێنانی حکوومەتدا لە بەشی فەرهەنگی بایەخی تایبەت بەمەسەلەی مەعاریف و پەروەردە و فێرکردن دراوە لە سەفەرەکانی وەفدی کۆمار بۆ ئازەربایجانی سۆڤیەتی (باکۆ) لە تەك کۆمەکی چەك و هێنانی چاپخانە، داواکراوە کە ژمارەیەك قوتابی کورد بۆ تەواو کردنی خوێندن رەوانەی ئەوێ بکرێ، ئەمەش لەوکاتەدا هەستکردن بەبەرپرسیتی و بیرکردنەوە بووە لە دواڕۆژی خوێندن و زانست و زانیاری لە کوردستاندا. هەروەها ساڵی ١٩٥٨ لە ژێر کاریگەریی ڕزگاری کوردانی عیراق و هاندانیان لەو ترسە، دەستی بەسەرکوت کردن و بەعەسکەر ناوچەکەی تەنییەوە و خستیە ژێر چاودێریی توندی ساواك و پۆلیسی نهێنیی و جووڵانەوەی کوردی لە گوندێك بۆ گوندێکی تر سنوور بەند کرد. زمانی کوردی لە خوێندن و فێربوون قەدەغە کرد. قوتابیان ناچار کران فێری خوێندنی فارسی بن، وەك بەشێك لە سیاسەتی نەهێشتنی ناسنامەی سەربەخۆی کوردان.

بڕوانە: هارفی مووس و جون بلوم لا اصدقاء سوى الجبال، ترجمة راج آل محمد، مراجعة و تقديم هادي العلوي. لبنان ل ١٨٨.

ڕۆژنامە و گۆڤار بەزمانی کوردی دەرچوون، کتابی کوردی چاپ بوون و بۆ قوتابخانە هەوڵ دراوە کتێب بکرێتە کوردی، چاپخانە دامەزراوە و ڕادیۆی کوردییان داناوە و بایەخیان بەکتێبخانە و سینەما و شانۆ داوە. کە ئەمانە هەموو بەڵگەی ئەوەن کۆماری کوردستان خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگی بواری خوێندەواری و خوێندن لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و پەرەپێدانی ڕۆشنبیری دروست کردووە، وتارەکانی ڕۆژنامەی کوردستان و گۆڤارەکانی ئەو کات بەڵگەی ئەوەن کە دەسەڵاتدارانی کۆمار پەرۆشی ئەوەبوون خوێندەواری بڵاو بکەنەوە و بیریان لەوە کردووەتەوە ژمارەیەك کەس بۆ خوێندن ڕەوانەی سۆڤیەتی پێشوو بکەن.

دوای کۆمار تا ئەم ساڵانەش خوێندن بەزمانی کوردی قەدەغەبوو، قوتابخانەکان خوێندنیان بەفارسی تێدا بڵاویبووە. پتر لە (٦٥٪)ی دانیشتووان بەنەخوێندەوار دانراون. ڕاستە دوای شۆڕشی ۱۹۷۹ی ئێران دەرفەتێکی تازە لەبەر دەم خوێندەوار و ڕۆشنبیر و فەرهەنگی کوردی کراوەتەوە. وەلێ دیسان ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە خوێندن لە قوتابخانەکان بەکوردی ئازادە. لە ۲۰۰۰ بەشی کوردی زانکۆی ئازادی لە سنە کرایەوە[۲۷۷] لە هەشتاکان بەدواوە فەرهەنگی کوردی و دەزگای سەلاحەدینی ئەیوبی لە

(۲۷۷) هەفتەنامەی گوڵان، غازی حەسەن، ڕۆشنبیری کوردی لە سەدەیەك ژمارە (۲٦۱) ۱۳/۱/۲۰۰۰ل٥۳.
بڕیاردرا بۆ یەکەم جار زمانی کوردی لە زانکۆی ئازادی ئیسلامی لە سنە بخوێندرێ بەرپرسی بەشەکە بارامی وەڵەدبەگی سەرنووسەری هەفتەنامەی ئاویەر دەڵێ: ئەم پرۆسەیە بەباش دەچێتە پێشەوە و لەزووترین کاتدا هاوکاری مامۆستایانی زانکۆکانی کوردستان نووسینی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی دەست پێ دەکا و قوتابییانی ئازیزی زانکۆ بۆ یەکەم جار زمانی زگماکی خۆیان دەخوێنن ئەم هەواڵە ناوەڕاستی ساڵی ۱۹۹۹ بڵاویبووەتەوە و ئەمەش بەهەنگاوێکی گرینگی ڕۆشنبیری لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دادەنرێت و هەر لە مانگی (۱۲)ی ۱۹۹۹دا بڵاویبووەتەوە کە زمانی کوردی لە زانکۆی تارانیش بخوێندرێ.
لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا چەند زانکۆیەك و ئامۆژگایەکی پێگەیاندنی مامۆستایان هەیە، هەرچەند خوێندن بەزمانی کوردی نییە و پرۆگرامەکانی خوێندن چ پەیوەندییەکیان بەمێژووی ڕەسەنی کوردەوە نییە. وەکو ئەمانە زانکۆی کوردستان لە پێش ساڵی ۱۹۷۹ دامەزراوە سەرەتا سەر بەدانشگای کرماشان بووە، ئێستا سەربەخۆیە و کەوتووەتە شاری (سنە) هەر لە شاری سنە زانکۆی (ئازادی ئیسلامی و پەیامی نور و پەیمانگاکانی هونەری و کشتوکاڵی و پەروەردەی مامۆستایان هەیە). لە سەقزیش زانکۆی پەیامی نوور هەیە.

ورمێ دامەزران و گۆڤاری سروە دەردەکەن و کتێب بەکوردی چاپ کراوە، گۆڤاری ئاوێنە و هەفتەنامەی ئاویەر و سیروان و چەند بڵاوکراوەیەکی تر لە شارەکانی کوردستان و تاران دەردەچن. لە زۆربەی شارەکانی کوردستان ناوەندی ئەدەبی دروست بوون و ژمارەیەکی یەکجار زۆری نووسەر و شاعیر و ئەدیب و هونەرمەند دروست بوون و بەکوردی دەنووسن و بەرهەمەکانیان بڵاودەکەنەوە، بەڵام هێشتا زمانی کوردی بەرەسمی نەبووەتە زمانی دەوڵەت و زمانی خوێندنی قوتابخانەکان نییە. وەلێ ژمارەی خوێندەوار و نووسەر و دانا و پسپۆڕ و خودان بڕوانامە و کەسانی شارەزا گەلێك زۆر بوون و هەندێکیان لە ئاستی ئێراندا ناسراون و جێگەی بایەخ و ناوهێنانن. خوێندەوار و نووسەری کوردی ئەوتۆ هەڵکەوتوون کە دەکرێ بۆ ئایندە بکرێنە بەردێکی پتەو بۆ بیناکردنی کۆمەڵگایەکی خوێندەوار و پێشکەوتوو. دەبێ لێرەدا بۆ مێژوو ئاماژە بەوە بکەین لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئەنجومەنە ئەدەبییەکان کە خودان قەڵەمن، ڕۆڵێکی گەورە لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و بەرەو پێشەوە بردنی زمانی کوردی دەبینن. لە ناوەڕاستی ١٩٩٩دا وەکو تاقە ئەزموون لە ڕێگەی ئەنجومەنی ئەدەبیی سنەوە هەردوو مامۆستا (شەریفی حسێن پەنانیی شاعیر) و (ناهید حسێنی شاعیر) بەشێوەیەکی نارەسمی قوتابخانەیان بۆ فێربوونی خوێندن بەزمانی کوردی لە شاری سنە کردووەتەوە و لە چەشنی بیستەکانی کۆمەڵگای کوردستان و هەڵگرانی چرای زانستی خەڵك فێری خوێندەواری دەکەن و دەرس دەڵێنەوە و زمانی کوردی فێری ئەو کەسانە دەکەن کە ڕوویان تێ دەکەن.

لە دیماهیدا پێویستە ئاماژە بەڕۆڵی لایەنە سیاسییەکانیش لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و خوێندن بەزمانی کوردی تێکڕا بکەین و بەتایبەتیش حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە پتر لە نیو سەدەیە تێ دەکۆشێت و گرینگیی زۆری بەکردنەوەی قوتابخانە و خوێندن بەزمانی کوردی داوە و ئەمڕۆش قوتابخانە تایبەتییەکانی جێگەی ئەم گرینگی پێدانەیە و زۆر کەس لێیەوە فێری خوێندن و نووسینی زمانی کوردی و خوێندەواری و ڕۆشنبیری بووە. چ لە سەردەمی کۆمار، یا لە شۆڕشی ١٩٧٩ ئێران لەماوەی دوو ساڵان هەوڵی بەرچاویان دا، ئەمڕۆش لە کوردستاندا چەند زانکۆ و ئامۆژگایەك هەن.

# کوردەکانی سۆڤیەت و خوێندنی زمانی کوردی

نامانەوێ بچینە نێو باسی مێژووی سەرهەڵدان و ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی کوردەکانی سۆڤیەت. ئەو هۆکارانەی کوردی لەم دەڤەرە خولقاندووە. پاشەکشە و ململانێ و ناکۆکییەکان چی بوون. ئێمە لە دوورەوە ئێرەییمان بەو هەواڵانە دەبرد و کە لەمەڕ کوردەکان لە ژێر سایەی سیستەمی سۆسیالیستی بڵاو دەبوونەوە... دۆزەخیان بەبەهەشت پیشان دەدا.

خۆ ئەوانەی لە ستایش و خۆش گوزەرانی و ئاوەدانی و ئازاد ژیان شتێکی تری باس بکردایە، یەکسەر دەخرایە خانەی کۆنەپەرستی... دەگەڵ ئەو مافانەی لە سەرەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەمەڕ خوێندن بەزمانی کوردی و ڕۆشنبیری و ئوتۆنۆمیی کوردان بەخشیبوونی، دواتر مەرگەسات و دۆزەخ بەچارەیان برا.

پرۆستریکا؛ گەلێك شتی ئاشکرا کرد، ژیانی کوردەکان لەو کاتدا کەوتە بەر باس و لێکۆلینەوە.. هەموو مەینەتییەکانی حەفتا ساڵەی حوکمڕانی بەناو (سۆسیالیستی) دەوڵەت ئاشکرا بوو. نەتەوەیەکی پەرتەوازە، گەلێکی بەش مەینەت، کە لەسەر چەندین ناوچە دابەش کراوە، نرکە لەبەر دەمکوت کراو.

پرۆفسیۆر شاکرۆیی خدۆ دەڵێ: لە سەردەمی کۆمۆنیستاندا ژمارەی کوردان لە ساڵی ١٩٢٦ زیاتر لە (٤١) هەزار کورد لە ئازەربایجان هەبوون (٧-٨) هەزاریش لە جۆرجیا و (١٠) هەزاریش لە ئەرمەنستان دەژیان. دوای سی چل ساڵ کۆی ژمارەی کوردە موسڵمان و ئێزیدییەکان گەیشتە زیاتر لە ٧٠ هەزار کەس و ئەوانەی جۆرجیاش ٤٥ هەزار کەس. بەڵام ئازەربایجان وردە وردە ژمارەی کوردانی کەم دەکردەوە تا لە سەرژمێری ١٩٧٠ ڕایگەیاند کورد لە ئازەربایجان نییە.

ناسیۆنالیستەکانی ئازەربایجان هەرچەندە کارتی کۆمۆنیستییان لە گیرفان بوو، ئەوانە بیریان دەکردەوە چۆن دەبێ لە تورکیا بگوترێ کورد نینە و زمانی کوردی بوونی نییە و لە هەمان کاتیشدا لە ئازەربایجانیش ناوچەی کوردان و زمانی کوردان و قوتابخانەی کوردی هەبێ، بۆیەش بەشێوەیەکی نائاشکرا و بەنهێنی و لەژێرەوە هەموو شتێکیان لەناوبرد و هاتنە سەر ئەو بڕیارە کە کورد لە ئازەربایجاندا بوونیان نییە. کورد هاتە سەرکوتکردن و دەرکردن، ئەوە سیاسەتی پارتی کۆمۆنیست بوو، گەلێك کەسی بەدواکەوتوو

و دژی شۆڕش تاوانبار دەکرد و سرگون (نفی) دەکردن. لە ژێر ئەو بیر و باوەڕەش هەوڵیان دا دیمۆگرافیای ناوچە کوردنشینەکان بگۆڕن، ئەگەر کورد پێشتر لە نێو چوار کۆماری ئەرمەنستان و جۆرجیا و ئازەربایجان و قازاخستان بوون، ئەوە ئێستا لەناو هەشت کۆماری پێشووی سۆڤیەتدا دەژین(٢٧٨).

میللەتێك ئەم دەردەی پێ کرابێ، تاوانبار و دواکەوتوو، ڕەش و ڕووت بن خوێندەواری پەرتەوازە و سەرگون کرابێ، بەسەر ژمارەیەك ناوچە و کۆماری جیاجیادا دابەش کرابێ، بەبیانووی دژی شۆڕش و دواکەوتوویی یاخود وەکو د. بەشیر سەبری دەڵێ. دیارە ئەمانەش کاتی خۆی بەبیانوی ئەوەی گوایە کوردن و موسڵمانن و پەیوەندیی خزمایەتی و ژن و ژنخوازاییان لەگەڵ تورك و فارسدا هەیە و سەرنجیان بەلای ئەڵمانییەکاندایە و پشتێنەی سنوور ئەوانی لێ دادەنیشن(٢٧٩). ئەمە بووەتە هۆی دەربەدەرکردن و سەرگون و ئاوارەیی کوردان.

ڕاستە لە سەرەتا قوتابخانە و خوێندن بەزمانی کوردی و دانانی کتێبی ڕێزمان و خوێندنی کوردی دەستی پێ کردووەو ڕۆژنامەی (ریا تازە) و ڕادیۆی کوردی کراونەتەوە: وەلێ بەهاری بووژانەوەی ڕۆشنبیریی کوردی زۆر گەشەی نەسەندووە. دووچاری سەرگون و ڕاگواستن و پەرتەوازەیی و نەفیکردن هاتوون.

لەم باسەماندا تیشك دەخەینە سەر باری خوێندن و پەرەپێدانی زمانی کوردی و کرانەوەی قوتابخانە لە ناو کوردەکانی سۆڤیەتی پێشوو ، کە تا ئێستا پەرێشان و پەرتەوازە دەژین. وەکو مێژوونووسان باسی دەکەن لە ناوچەی لاچین و کورد نشینەکان مستەفاییڤ کۆمارێکی دروست کردووە، بەڵام یەك ڕۆژ تەمەنی بووە، جا ئەگەر کۆمارێك بۆ یەك ڕۆژ ژیابێ، دەبێ باری زمان و خوێندنی کوردی چ هەناسەیەکی دابێ: ئەو شار و شارۆچکە و گوندانەی کوردیان تیا دەژیا لەو ناوچەیە کەوتبوونە سەرووی کەرەباغەوە، ئەگەر کوردەکان لەگەڵ ئەرمینیا بایەن ئەوا کەرەباغ ئۆتۆماتیکی دەکەوێتە ژێر دەستی ئەرمینیاوە و لە ئازەربایجان دەپچڕایەوە. ئەرمەنەکانیش ئەوسا بەکوردیان مۆر دەکرد. وەرن لەوێ دانیشن و بڵێن ئێمە دەمانەوێ لەگەڵ ئەرمەن بژین، نەك لەگەڵ

---

(٢٧٨) ڕۆژنامەی میدیا، دیدارێك لەگەل پرۆفیسۆر- شاکرۆی خدو. ژ(٧٩) ١٥/١١/٢٠٠٠ل٥.

(٢٧٩) ڕۆژنامەی میدیا دیدارێك لەگەڵ «بەشیر سەبری» ژ(٨٢) ١٥/١٢/٢٠٠٠ل٥ ناوبراو (٢٠) ساڵە لێکۆڵینەوەی لە مەڕ دۆزی کورد لە ڕووسیا دەکات و ئێستا ئەندامی لێکۆڵینەوەی کوردییە لە روسیا.

ئازەرییەکانی ئازەربایجان، ئیتر پڕوپاگەندەی زۆریشی بۆ کرا، وەك ئەوەی دەیانگوت لە ئەرمینیا ئیستگەی کوردی هەیە، کور و لە قوتابخانە بەکوردی دەخوێنن، لە ئازەربایجانیش ئەمانە هیچی نین. کە ئێوە خەڵکی ئازەربایجان و لەو مافانە بێ مافن، بەڵام کە هاتنە ناو سنووری ئەرمینیاوە، ئێمە لە هاووڵاتی ئەرمینیا حسێبتان دەکەین. مستەفاییڤ کە کوردێکە و لە ئۆزبەکستان دەژیا و پۆلیسی لەوێ تەواو کرد و خانەنشین کرا، دواتر هاتە ئەرمینیا و لەگەڵ (١٥–٢٠) پیاوێکی تردا (کۆماری سوور)یان ڕاگەیاند هەر لەوێ ئاڵاکەیان هەڵواسی و کۆمارێکیان دامەزراند و دیاریی کرد و لەژێر ئاڵاکە سەر کۆماریان داناو چەند وەزارەتێکیان ناو لێ نا و نان و چایەکیان خوارد و چوونەوە ماڵی خۆیان و هەر ئەو ڕۆژەش کۆمارەکە تێك چوو. ئەمەش لەبەر ئەوەی مستەفاییڤ گوتبووی ٢٠هەزار چەکدار ئامادە دەکەم و ئەمەش ترسی لە ئەرمەنییەکان بارکرد و لە نێو خۆیان هەوڵەکەیان لەناو برد[٢٨٠].

ئەم وەزعە وەها درێژەی کێشاوە، کورد لە چەند ڕوویێکەوە دووچاری چەوسانەوە بووە و سە رگون کراوە، د. خالیدی چەتۆ لە باسی ئیشی کوردەکانی سۆڤیەتی پێشوو دەڵێت: لەم کتێبەدا سوود لەو کەرەستانە بینراوە کە باسی دەستگاکانی پارتی کۆمۆنست دەکەن لە فیدراسیۆنی پشت قەفقاسیا لە ناو کوردان. چ لە مەیدانی بینادنانی ئابووریدا و چ لە مەیدانی نەهێشتنی نەخوێندەواری و قوتابخانە کردنەوە و کادر ئامادەکروندا و چ لە ئیشکردنی ناو ژناندا لە پەرەدانا بەبەشداریی دانیشتووان لە گورجوگۆڵیی سیاسیدا. کەرەسەی سەیرمان دەربارەی ئیشەکانی سۆڤیەت دەست کەوت لە کۆڕی زەویدان بەجوتیاری کەمایەتییەکان، کە ئەمە جوتیاری کوردیش دەگرێتەوە. زەوی و کرێی بۆ دانانیان، بۆ دامەزراندنی گوند و قوتابخانە، ڕێکخستنی دەزگای بڵاو کردنەوەی کتێبی قوتابخانە و ئەدەبیات و ڕۆژنامەی ناو کۆمار، پێگەیاندنی کادری دەرس وتنەوە و کادری ئەنجومەنی ئابووری و کۆڵخۆزو شتی تر [٢٨١].

---

(٢٨٠) هەمان سەرچاوە.

(٢٨١) گۆڤاری برایەتی، کتێبی برایەتی، کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیەتی، نووسینی دکتۆر خالیدی چەتۆ، وەرگێڕانی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوول، ژمارە (١) ساڵی (١) خولی دووەم ١/٦/١٩٧٠ ل٢٦. ئەم کتێبە مێژوونووسی کوردی سۆڤیەت، خالید مرادۆڤیچ چەتۆییف لە ساڵی ١٩٦٥ لە یەریڤان نووسیویەتی، ١٥٤ لاپەڕەو بەزمانی ڕووسی لە لایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی ئەکادیمیای زانستیی ئەرمەنستانی سۆڤیەتەوە بڵاو کراوەتەوە.

مێژووی خوێندەواری و بایەخدان بەزمان و فەرهەنگی کوردی لە سۆڤیەتی پێشوو، بەشێکە لە پرۆسەی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و خوێندنی کوردی و بایەخدان بەفێربوونی زمانی کوردی.

لەو کۆنگرەی لە ٢٥ ی ئابی ١٩٦٠ کە لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە لە مۆسکۆ بەسترا، تا ئەو کاتیش خوێندنی کوردی بەشێك بوو لە هۆیەکانی لێکۆڵینەوەی ئێرانی، کە لە زۆر ڕووەوە لێکۆڵینەوەی تێدا کراوە.

آ. جابا و فرناند جوستی دەستێکی باڵایان لە پاراستنی کەلتوور و نووسراوی کوردی هەبووە، کە لە ناویاندا ساڵی ١٨٧٩ فرناند جوستی فەرهەنگێکی (کوردی-فەرەنسی) داناوە. پێش شۆڕشی ڕووسیا کەسانی وەکو (پیتر لیرخ) و (خاچا دۆر) و (ئەبوڤیان) و (روما سکیفتیش) و (ئاخیا زورف) و (جیکوفسکی) و (خالاتیانتز) و (جانشاتوراف) و (ف.ب. شارسوا) و هتد ڕۆڵیان لە کوردلۆجی هەبووە.

نابێ ڕۆڵی پرۆفیسۆر ئوربیلی (١٨٨٦-١٩٦١) بەڕەچەڵەك ئەرمەنی لە بیر بکەین کە ساڵی ١٩١٦تا ١٩٣٧ بەزمانی کوردی خەریك بووە و پیتی لاتینی داناوە و داویەتە کۆمەڵەی (جیهاندنی)و بەکارهێنراوە.

لە ڕووسیا کەسانی وەکو (چرکس باکویف) لە ساڵی ١٩٣٢ کتێبی زمانی کوردی داناوە و لە تورکمانستان بەکارهێنراوە و (ڕۆسلاتسابالوف)ی گەنج، سەرباری خانم (ت. آ. ئەریستوڤا) کە زانایەکی ئەتنۆگرافی و کۆمەڵایەتییە، لێکۆڵینەوەی لەمەڕ عەشیرەتی کوردی و ڕۆشنبیریی فۆلکلۆریی کوردی کردووە.

لە لیننگرادیش کەسانی شارەزا و پیسپۆڕ وەکو (و. ل. فیلچفسکی) و (ی.ی. کوکرمان) و (کوردویف) و (م. با. رودینکۆ) و (ئەلکسانیان) کاری زۆر بایەخیان لە بواری کوردناسیدا کردووە و لە یەریڤانیش کەسانی وەکو (د. جورجین باگراتوفیتش ئەکابوف) و (حاجی جندی) و (ئەمیر ئەڤدال) و (موفسییزیا ئیکستاتوریان و زکریان و خاتوو بولاتوفا) ڕۆڵیان لە لێکۆڵینەوەی مێژوو و ئەدەبیاتی کوردی دیارە.

لە باکۆش ساڵی١٩٥٩ ئەکادیمیای ئازەربایجان بەشی کوردلۆجیی هەیە و پێنج لێکۆڵەرەوە و کاری تێدا دەکەن، دەبێ ئاماژە بەوە بکەین لە تورکمانستان و سەمەرقەندیش بایەخ بەلێکۆڵینەوە و کوردلۆجی دراوە و لەم بوارە چەند کەسێك کاریان کردووە. (٢٨٢)

---

(٢٨٣) گۆڤاری گوڵان العربی، الكوردلوجيا وتدريس اللغة الكردية في الاتحاد السوفيتي ، د. محمد موكري، ترجمة احمد الحنفي، العدد (٢٥) حزيران ١٩٩٨، ص١٠٩.

لێرەوە ڕاستەوخۆ دەچینە سەر باسی خوێندنی کوردی و مەسەلەی خوێندەواری لەناو کوردان. ئەو کاتەی بەشی هەرە زۆری کورد نەخوێندەوار بووە، سۆڤیەت تازە شۆڕشی تێدا کرابوو. شۆڕشێك کە بانگەشەی ڕزگاری و بەرزیی مرۆڤی دەکرد.

تا سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٠ (٩٩٪)ی کورد نەخوێندەوار بوون لەناو کۆمارەکانی سۆڤیەتدا. خوێندنەوە و نووسینیان نەدەزانی، چونکە ناوچەکەیان قوتابخانەی تێدا نەبوو، تەنیا سێ قوتابخانە لە ناوچەی کوردان لە قەفقاسیا و قەزای قارس هەبووە، قوتابخانەی سەرەتایی بوون و بەزمانی ڕووسی تێیاندا دەخوێند، بۆیە هەموو لاوەکانی ناوچەی (وان) فێری خوێندن و نووسین نەبوون. حکوومەتی سۆڤیەتی لە ساڵی ١٩٢٠–١٩٣٠ قوتابخانەی لە گوندەکانی کوردان کردەوە و خوێندن بەزمانی نەتەوەکان بوو. لە ئەرمینیا بەزمانی ئەرمەنی و لە ئازەربایجان و تورکمانستان و گورجستان بەئازەری و تورکمانی و گورجی دەخوێندرا. وەزعی کورد لە ئەرمینیا جیابوو لە شوێنەکانی تر. دوای ساڵی ١٩٢٠ هەوڵی کردنەوەی قوتابخانە بەزمانی کوردی درا. ڕێکخراوە دۆستەکانی ئەرمەنی و کەسێکی ڕۆشنبیری دۆستی کوردی وەکو لازۆ (هاکوب خازاریان) دەوریان لەم بوارەدا هەبووە. هەر بۆیە ئەم پیاوە کە حەزی لە پەروەردەکردنی منداڵی کورد بوو، ئەلفبایەکی کوردیی بەپیتی ئەرمەنی دروست کردو، بڕیاری چاپکردنی لە حکوومەتی ئەرمەنی وەرگرت و لە ژێر ناوی (ڕۆژ) دوای ئەوەی ساڵی ١٩٢١ لە چاپخانەی (Ecimyazine) چاپی کرد. لە تەك لازۆ ئیلخان شاکروف و نورا پولا نوڤا، ڕۆڵیان لە پەروەردەکردنی منداڵی کورد دیار بوو، بەم ئەلفوبێیەی کە لازۆ داینابوو.

لەم کاتەدا حکوومەتی ئەرمەنی و ڕۆشنبیرانی دەرگای کردنەوەی قوتابخانەی بەزمانی کوردی واڵا کرد، لەناو کورداندا ئەو وەختە کادری زانستی و مامۆستای لێهاتوو نەبووە بەزمانی کوردی دەرس بڵێنەوە، تەنیا ئەم دوو کەسە (نورا پولا نوڤا و ئیلخان شاکروف) نەبێ.[٢٨٣]

دەردەکەوێ تا ئەو کاتە کوردەکان نەیانتوانیوە دەرس بڵێنەوە، خوێندن بەڕووسی بوو. ئەرمەنەکان بەرچاوانە کەوتوونەتە تاودانی لاوانی کورد بۆ فێر بوون و بڵاوکردنەوەی

---

(٢٨٣) مجلة الحوار، تأريخ أكراد الاتحاد السوفيتي السابق، وزير اشو، ترجمة ريبر سيليفي، العدد (٢٦–٢٧) شتاء وربيع ٢٠٠٠ السنة السابعة ل٢٥–٣٧.

زمانی کوردی. ڕاسته وەکو پێشتر گوتمان ئامانجیان سیاسی بووه، بەڵام خزمەتێکی گەورەیان بەباری ڕۆشنبیری و زمانی کوردی کردووه.

پاش (٧) ساڵ له شۆڕشی ئۆکتۆبەر، یەکەم قوتابخانەی کوردی لەسەردەستی لازۆ له پایتەختی جۆرجیا کرایەوه و دواتر له ساڵی ١٩٢٤ چووه تەبلیسی و قوتابخانەیەکی تری کوردیی لەوێش دروست کرد بۆ فێربوونی منداڵی کورد. لازۆ بەهاریکاری ئەمینی ئەڤدال منداڵه هەتیوه بێ کەسه کوردەکانی له شەقامەکانی بەفلیس کۆکردەوه و له قوتابخانەی کوردی پێی خوێندن. له هەمان کاتدا له تەبلیس ڕۆشنبیرێکی کورد بەناوی (کامل بەدرخان) که له دەست تورکەکان رایکردبوو حوکمی له سێدارەدانی درابوو، مامۆستای قوتابخانەی تورکی بوو له یەکێك له قوتابخانەکانی تەبلیسدا که لەسەر بەحزبی شیوعی بوو، دەرسی دەگوتەوه. بەیارمەتیی حکوومەتی جورجیا قوتابخانەیەکی کوردیی بۆ کرێکاره کورده نەخوێندەوارەکان کردەوه(٢٨٤).

ئەم هەلومەرجه زەمینەی خۆش کرد بەهێواشی هەنگاو بۆ پێشەوه بنێن، ڕۆشنبیریی کوردی دەهات بەخاوەن بکرێ، زمانی کوردی زمانی خوێندن، (وەزیر ئیشۆ) گوتەنی، دۆستی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیری کوردی ئەو کاته دەستی پێ کرد که ئەلفبای کوردی بەپیتی لاتینی له لایەن هاووڵاتی (ئیسحاق مورو غولور)ی ئاشووری دانرا، بەهاوکاریی زۆری ڕۆشنبیری دیار (عەرەبی شەمۆ). ئەم ئەلف و بایه له ژێر ناوی (فێربوونی خودی بۆ زمانی کرمانجی) له یەریڤان چاپ بوو. له ئاکامی ئەم هەوڵ و کۆششه بوو که ڕۆژنامەی (ڕیا تازه) له ئازاری ١٩٣٠دەرچوو(٢٨٥).

ساڵی ١٩٣١قوتابخانەی باڵا بۆ دەرچوواندنی مامۆستای کورد له پێگەیاندنی قوتابخانەی کوردی کرایەوه، جاسمی جەلیلیه ڕۆشنبیر، کرا بەبەرپرسی ئەم قوتابخانەیه و حاجی خیری و ئەمینی ئەڤدال و وەزیری نادری و تینال موراد‌ۆف و بڕۆمامۆش وەکو مامۆستا دەرسیان تێدا دەگۆتەوه. لەمەشیاندا نابێت هاریکاریی

---

(٢٨٤) هەمان سەرچاوه ئەوکاتیش ڕۆشنبیرانی وەکو هۆگر بەدرخان و ئەحمەد مرازی و ئەسەد جنگۆ یانەی کوردیان بۆ پێشکەشکردنی شانۆگەری کردەوه. له ساڵی ١٩٢٨ کتێبی ئەلف و بای کوردی له یەکێتیی سۆڤیەت دانراوه، بڕوانه هاوڕێ نامه.ل١٧٦.

(٢٨٥) ئەم ڕۆژنامەیه تا ئەمڕۆش بەردەوامه، چەند ساڵێك بەپیتی سلاڤ چاپ دەکرا. به بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی دادەنرێ. دەبێ ئاماژه بەوه بکەین، ڕۆشنبیرانی ئەرمەنی وەکو (هراجیان کوجار) و (هاوتون مکر دیجیان) دەوری سەرەکییان له دەرچوونی ڕۆژنامەکەدا هەبوو.

ڕۆشنبیرانی ئەرمەنی (فارتان بیتویان، ڕوبین دیرامبیان ...هتد) لەبیر بکری[٢٨٦].

دوای دانانی ئەلفبای کوردی بەلاتینی کتێبی کوردی چاپ کران (جاسمی جەلیل) بووە بەرپرسی بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی سیاسی و ئەدەبی. دەست کرا، بەچاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی شاعیر و نووسەرانی کوردی وەکو (عەرەبی شەمۆ، حاجی خیری، ئەمینی عەڤدال، جاسمی جەلیل، وەزیری نادری، کوردۆ کیخۆ، عەتار شرۆ...) دوای ئەم هەنگاوە لە تەك چاپکردنی کتێبی ئەدەبی و فۆلکلۆری، کتێبی فێر بوون و خوێندنی کوردیش چاپ کران، وای لێ هات سەرەتای ساڵی ١٩٣٠ لە هەموو قوتابخانەکان بەزمانی کوردی دەخوێندرا[٢٨٧].

ساڵی ١٩٣٠ بەشی ئەدەبیاتی کوردی لە یەکێتیی ئەدیبانی ئەرمینیا کرایەوەو حاجی جندی بەشداریی لە کۆنگرەی گشتیی ئەدیبانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا کرد. لە جۆرجیا خوێندن بەزمانی کوردی بەڕێوە دەچوو. بەڵام ناوچە سنوورییەکانی تورکیا وەزعیان خراپ بووە کە ئەحمەد میرزا لە بیرەوەرییەکانی لە کاتی سەردانی ئەم ناوچانە گوتیەتی: لێرەدا یەك ڕۆشنبیری کوردی نییە، مەبەستی ناوچە سنوورییەکانی تورکیایە. بێگومان لەو سەردەمەدا لە تەك ئەو کارە خزمەتگوزارییانەی پێشکەشی کورد دەکران، هەوڵی تریش بۆ دەمکوت و لات هێشتنەوەیان هەبوو. هەرچی باسی دواکەوتن و نەزانی و کوێرەوەریی کوردان بخوێنێتەوە، هەرچی چاو لە سیاسەتی بەکارهێنان و قۆزینەوەی کورد لە ناوچەکە بکات، لەلایەن کۆمار و نەتەوەکانی ترەوە دەزانێ کورد لە پاشەکشە بووە. دوای ئەم ساڵە وەزع بەرەو خراپی دەچێ.

دوای ساڵی ١٩٣٠ پاشەکشە لە خواستەکانی کورد دەستی پێ کردووە زۆرشت لە

---

(٢٨٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٨٧) هەمان سەرچاوە. لە ساڵی ١٩٣٠ چەند لێژنەیەك ناردرا بۆ ناو گوندە کوردییەکان تاکو کەرەستەی زمانەوانی و ئەتنۆگرافی و فۆلکلۆریی کوردی کۆبکرێتەوە، کەدوو زانای بەناوبانگی (ئەمینی ئەڤدال و حاجی جندی) تێدا بوو بڕوانە هاوڕێ، باخەوان، هاوڕێ نامە، ل(٧). هەروەها (ئاخاچا تۆریان) ساڵی ١٩٣٢ کتێبی ڕێزمانی کوردی بەهەردوو زمان (کوردی و ئەرمەنی) لە یەریڤان بڵاوکردەوە. بڕوانە هاوڕێ نامە ل١٨٤ و کتێبی بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی ل ٩٦. هەروەها لە ساڵانی ١٩٢٠-١٩٣٠ کۆنفرانسی کوردی لە ئەرمینیا بۆ پەرەپێدانی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی دەبەسترا. لێکۆڵینەوە بۆ پێگەیاندنی کادری کوردی بۆ دەکرا، تا زمانی کوردی بزانێ.

سەردەمی سۆڤیەتی کرا. بەڵام چونکە ئازەربایجان لەژێر کاریگەریی تورکیادا بوو، پێوەندیی یەکێتیی سۆڤیەت و کەمالیستانیش گەرم بوون. ئەمانە هێدی هێدی کوردیان لە ئازەربایجان تواندەوە[٢٨٨]. بنکەی دەسەڵاتی کوردی گوازرایەوە شارۆچکەی (لاچین) خوێندنی زمانی کوردی بۆ منداڵان لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجان دەستی پێ کرد و چەند کتێبی خوێندن بەزمانی کوردی چاپ کران. قوتابخانەی پێگەیاندنی مامۆستای کوردی لە (شوشێ) کرایەوە ، بەڵام لەبەر نیەت خراپیی ئازەربایجانییەکان بەرنامەکان بەنیوە چڵی بەڕێوە دەچوو. بایەخیان بەفێربوونی منداڵانی کورد بەزمانی باوك و باپیرانیان نەدەدا.

وەزعی کوردەکانی تورکمانستان کەمێك لاگیرتر بوو. هەرچەندە کتێب و بڵاوکراوەکانیان دەگەیشتێ، ئەم شۆڕشە ڕۆشنبیرییە بەرپا بوو. بەهێواشی گەیشتە کوردەکانی تورکمانستان. کتێبی ئەدەب و خوێندن گەیشتە (عێشق ئاباد،،) بەڵام ئەمەش زۆری نەکێشا.

دوای هاتنی ستالین ساڵی ١٩٣٧ وەزعەکە بەتەواوی پێچەوانە بۆوە، سەرباری ڕاگواستن و تواندنەوەی کوردان ساڵی ١٩٣٧ ژمارەیەك ڕۆشنبیری کوردیشیان گرت و خستنیانە زیندانەوە، هەندێکیان نەفی کران وەکو (حاجی جندی، کوردۆ کیخۆ، ئەحمەد مرازی) یا لە یەریڤانی ئەرمینیا زیندانی کران، عەرەبی شەمۆ لە براسبۆرغ گیرا و بۆ سیبیریا دوورخرایەوە. سەرباری ئازاری جەستەیی. مەینەتیی زۆریان دیتووە بۆ ئەوەی بەزۆر دان بەوە دابنێن کە پێوەندییان بەکوردەکانی دەرەوە و بزووتنەوەی (خۆیبوون) هەیە. وەکو دەڵێن سووچی ڕۆشنبیرانی کوردی ئەرمینیا کە دەسەڵاتدارانیان تووڕە کردبوو، هەر تەنیا ئەوەبوو، کە چەند ژمارەیەك ڕۆژنامەی ڕیا تازە و کتێبی کوردییان بۆ کوردەکانی سووریا ناردبوو[٢٨٩].

---

(٢٨٨) ڕۆژنامەی میدیا ژمارە (٧٩).

(٢٨٩) مجلة الحوار العددان (٢٦–٢٧).

شاکرۆیێ خدۆ دەڵێت: ساڵی ١٩٣٧–١٩٣٨ هەم لە ئازەربایجان و هەم لە ئەرمەنستان و جۆرجیا گەلی کوردیش لەگەڵ زۆر گەلی دیکەدا هاتە سەرکوتکردن، جاری دووەم ساڵی ١٩٤٤ کورد لە ئازەربایجان و جۆرجیا کورد هاتنە سرگون کرن و جاری سێیەم ساڵی ١٩٤٩. دوای مردنی ستالین ئەوەی ویستی گەڕایەوە شوێنی خۆی و ئەوی ویستی لە شوێنی تاراوگەدا مایەوە.

بڕوانە ڕۆژنامەی میدیا ژ(٧٩) هەروەها د.بەشیر سەبری لەمەڕ هەندێك ناوچەی کوردان =

بەم جۆرە دەبینین خوێندنی زمانی کوردی و ڕۆشنبیریی کوردی پەرەی سەندووە. لەتەك ئەو بارە ئەرێیەی لەسەرەتاوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتی پێشوو ڕەخسێنرابوو، نەتەوەیەکی دیار لە ڕۆشنبیران و خوێنەرانی کورد پێ گەیێن، کە ئەمڕۆ بوونەتە کەسانی ناودار، بەرهەمەکانیان بەگەرمی و گەورەیییەوە سەیر دەکرێن. لە تەك فێربوونی زمانی کوردی بەرهەمی تری ڕۆشنبیرییان داهێنا، شانۆگەری و گۆرانی و مۆسیقا و بەرهەمی کۆکراوەی فۆلکلۆری و لێکۆڵینەوەی مێژوویی. ئەمڕۆش لە تەك هەبوونی ڕۆژنامە و ڕادیۆ و گۆڤاری بە کوردی، خاوەنی بنکەی ڕۆشنبیری و لێکۆڵینەوەی زانستیی بەسوودن. دوای لەبەر یەك هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت، کوردەکان پەراگەندەی دەستی سیاسەتی موڵکداری تایبەتی بوون بەجۆرێك کە دەڵێن ئەگەر ئەمڕۆ ڕووسیا ڕەوشی ناوەخۆی ڕووسیا وەها بێ و بەرژەوەندی ئەو وڵاتە چۆن بپارێزرێ و چۆن بەرگریی لێ بکرێ، کێ خاوەنی ئەم پارێزگارییەبێ، پارێزگاری لە چی بکات؟. ئەمانە هەموو بێ چارەسەر ماونەتەوە و کاتی چارەسەریشی دیار نییە، لەبەر ئەوە ناتوانرێ هیچ سیاسەتێکی ڕووسی سەبارەت بەکورد دیاری بکرێ و هیچ شتێکیش دیار نییە (٢٩٠).

کوردەکانی سۆڤیەتی کۆن لە هەموو کوردان زیاتر ئیرەییان پێ بردراوە و لە هەمووشیان پتر سەرگەردان و لەت و پەت کراون، بەجۆرێك دوای حەفتا ساڵ، ئینجا ئەمڕۆ مەینەتیی ئەم ژمارە زۆرەی کوردان دەردەکەوێ، کە بەناو خاوەنی (ئۆتۆنۆمی و کۆماری سوور) بوون؟!. لەو کۆنفرانسەی لە ٢٦ -١٩٩٠/٧/٢٧ لە گەرمەی هەرەسی سۆڤیەتدا پێك هات کوردەکان لە کۆتاییی کۆنفراسەکەدا داواکارییەکانیان بەم جۆرە کورت کردووەتەوە.

١- داوا دەکەین سۆڤیەت ماف بدا بەکورد و پێوەندیی ڕەسمیی ڕۆشنبیری لەگەڵ کوردەکانی دەرەوەی سۆڤیەت بکا.

٢- داوا دەکەین لە سۆڤیەت چیتر یارمەتیی ئەو ڕژێمانە نەدا کە کورد دەچەوسێنەوە.

---

= کە شۆشێی یەکێکە لەو ناوچانە دەڵێ: لاچین و قوبادلی و زەنگەنە و شۆش و ناوچەکانی تر کە هەموو کوردن، وەك بەهەشتی خوا خۆشن و چاکترین و بەپێزترین زەوی لەم هەرێمەدایە. بروانە ڕۆژنامەی میدیا ژ (٨٢).

(٢٩٠) بروانە میدیا ژ(٨٢) ئەمە بیروڕای د. بەشیر سەبرییە کە لێکۆڵینەویەکی تایبەتی لەمەڕ کورد هەیە و ٢٠ساڵە خەریکی ئەم بوارەیە.

٣- دامەزراندنی کۆمەڵەیەك بەناوی (کۆمەڵەی کورد لە یەکێتی سۆڤیەت).

٤- دروستکردنی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی کوردی لە مۆسکۆ لەگەڵ کردنەوەی چەند لقێك لە ناوچە کورد نشینەکان.

٥ - دامەزراندن و کردنەوەی دەزگایەکی چاپی کوردی لەسەر بنچینەی ئەلف و بێی لاتینی. (٢٩١)

هەنووکە (ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردی) لە ڕووسیا هەیە سەرۆکەکەی پرۆفیسۆر شاکرۆیی خدۆیە. چالاکی دەنوێنن. لە سەد ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردی ڤیستڤاڵێکی گەورەیان بەبەشداریی کورد لە زۆر لاوە سازکرد.

ڕەنگە وەزعی کورد ئەمڕۆ باشتر بێ، بەڵام ڕووبەرووی هەلومەرجێك بوونەتەوە کە نازانن لەناو ئایندەی ڕووسیا (یەلتسن و پۆتین)دا بەرەو کوێ دەچن. چونکە وەڵامی ڕوون و ئاشکرای ئەو هەموو ئەگەرانەیان لا نییە، لە ئەمڕۆ ڕووبەڕووی خودی ڕووسیان. چ جای کوردی پەرتەوازە و لات و بێ گیان. کە ئەمڕۆش دوای سێ چارەگە سەدە هەر لە هەوڵی ئەوەیە زمانەکەی بکاتە ناسنامە و پێی بخوێنێت و بیر بکاتەوە پەرەی پێ بدات. بێگومان ئەگەر لە سەردەمی دەرەبەگایەتی و نیمچە سەرمایەداری زمان نەیتوانیبێ لە پێشەوەی شتە گرینگ و چارەنووس سازەکان بێ، ئەوە ئەمڕۆ لە سەردەمی گەیاندن و تەکنەلۆژیا و دەسەڵاتی فراوانی وشە، زمان کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر ژیان و ئایندەی گەلان هەیە. زمانی کوردیش بووەتە بنەمایەکی گرینگی نەتەوەیی، کە لەو سەردەمەدا لە پێشەوەی هەرە پێشی خواستە نەتەوەییەکانیەتی.

---

(٢٩١) ڕۆژنامەی برایەتی، کورد لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و بارودۆخی نوێ، ژ (٦٣٤) ١٩٩٢/٨/٢٦ ل٣. نووسینی کەمال سید مەروانی، و. ئازاد بلال بەهائەدین.
شیاوی باسە تاکو چلەکان ئەلف و بێی لاتینی بەکار دەهێنرا و دواتر ناچار کران بیگۆڕن بۆ ئەلف وبێی (کیزیل ڕووسی).

# خوێندنی کوردی لە دەرەوەی کوردستان

بەهۆی بڵاوبوونەوەی کورد لە دەرەوەی خاکی کوردستان لە کۆنەوە تا ئێستا، ناوەناوەش بوونی زمان و خوێندنی کوردی دەبینرێ. ئەگەر دیقەت بدەین لە سەرەتای سەدەی بیستەم خوێندنی کوردی لە ئەستانە دواتریش لە دوای ساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا و زۆر شاری عیراق زمانی کوردی بەڕەسمی لە قوتابخانەکان دەخوێندرێ و بەشی زمانی کوردی لە کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغداش لە کۆتاییی شەستەکانەوە هەبووە، وا بڕیار بوو لە زانکۆی تاران زمانی کوردی بخوێندرێ ئەمانە هەموویان بایەخی بڵاو بوونەوەی زمانی کوردی دەگەیەنێت. ئێستا ئەنستیتوتی کورد لە پاریس لە سۆربۆن هەیە کە بەری ڕەنجی سی و چلەکانی خەباتی نەوەی بەدرخانییەکانە. بەپێویستی دەزانین ئەگەر بەکورتی و خێراش بێ هەندێك ئاماژە بەخوێندنی کوردی لە دەرەوەی خاکی کوردستان بکەین.

### لوبنان هەوڵەکانی کامەران بەدرخان

کورد چەند سەدەیەکە لە ڕێگەی جۆراو جۆرەوە لە لوبنان نیشتەجێ بوون، بەپلەیەك گەیشتووە کە کوردەکان لە سیاسەتی ئەمڕۆی دەوڵەتی لوبناندا شوێنی دیاریان هەیە، ڕاستە ئەوان وەکو لوبنانییەکی دڵسۆز و کارا کار دەکەن، بەڵام لە بیریان نەکردووە کە نەژادیان کوردە. کوردەکان لە لوبنان حزب و ڕێکخراو و یانەی کوردییان هەیە و ڕۆژانە بڵاوکراوە بۆ دەرخستنی کوردێنی خۆیان دەردەکەن، پێوەندییان بەبزاڤی کوردایەتییەوە هەیە. کامەران بەدرخان لەم بوارە شوێنی دیارە و نەخشی بەرچاوی لە سازدان و خستنە کاری کوردان لە لوبناندا هەبووە.

بەشی زۆری کوردەکانی لوبنان لە کوردستانی باشوورەوە هاتوون، پێشتر پێش سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی لەو شوێنە ئاکنجی بوون. کۆمەڵگای کوردی لە هەژاری و بێکاری و نەزانی و نەخوێندەواری دەژین، ڕێژەی خوێندن لە «ئەلمەحمەلیە» و «ئۆمەریان» تێکڕای ئەو ناوچانەی کورد لە وێدا کۆچیان بۆ لوبنان کردووە، یەکسان نین لەگەڵ ژمارەیەك لەو وڵاتە دواکەوتووانەی ئەفریقیا کە ئەمڕۆ بۆ پلەی پێشکەوتوو گەشەیان کردووە. تا ئێستا قوتابخانەی دواناوەندی لە «مەعصەرتی» کە دەیان گوندی

هەیە، نییە، لەبەر ئەوە حوجرە و خوێندن لای مەلا یاخود شێخ لە زۆربەی گوندە کوردییەکان تا ئەمڕۆش بڵاوە لەو ناوچانەی کوردی لوبنان تێیدا ژیاون و هاتوون زانکۆ و ئامۆژگا و قوتابخانەی پیشەسازی نییە، تەنیا ویلایەتی ماردین چەند قوتابخانەی دواناوەندی و سەرەتایی و دیاریکراوی تێدایە. هەموویان زمانی تورکی بەکار دەهێنن، لەبەر ئەوەی زمانی کوردی لەساڵی ١٩٢٥ ەوە قەدەغەیە، ئەمە سەبارەت بەچاپکراوی کوردیش هەروایە.

٨٠٪–٩٠٪ ی ڕۆڵەکانی جالیەی کوردی لوبنان لەڕووی زانستەوە هەژارن، منداڵیان نەناردۆتە قوتابخانە و بەخوێندنی قورئان یا (جزء عم) وازیان هێناوە. لەم دوایە هەندێکیان ئەم خاڵەیان هەست پێ کردووە و بایەخی زانستیان زانیوە و منداڵەکانیان بۆ قوتابخانەی (شیخ علی بری) لە (بسطة تحتا) ڕەوان کرد. ساڵی ١٩٣٧ هەندێك تەمەنیشیان گەورە بوو دەچوونە قوتابخانەی (عمر الداعوق) لە سوق سرسق.

ئەو سیفەتەی بڵاو بوو هیچ گوندێك بێ دەرەبەگ کارەکانی بەڕێوە نەدەبرا، بەپێی سروشتی حاڵەکە ئەمە هاتە لوبنان و کاروباری و ئیداریی کوردەکان لە ڕێگای پیاو ماقوڵەکانیانەوە ڕاپەڕێنران. ئەمەش هۆی سەرەکیی داخستنی قوتابخانەی (اللايیك)ی ئێواران کە کامەران بەدرخان دایمەزراندبوو. بەهۆی کێشەیەکی بچووك لە نێوان کامەران بەدرخان و یەکێك لەوانەی دەیانخوێند، بەخێرایی بووە هۆی گواستنەوەی ناکۆکییەکان بۆ گەورەی خێزانەکانیان، ئەویش بەڕۆڵی خۆی لە گۆڕەپانی (سوق الخضار) وەستا و جوێنی بەهەموو ئەو کەسانە دا کە لە عەشیرەت و گوندەکەی و ئەوانی تردا دەچوونە (قوتابخانەی کامەران). ئەمە هۆکاری سەرەکی بووە بۆ ئەوەی قوتابخانەکە دابخری[٢٩٢].

ڕەنجی دەروێشانەی کامەران بەدرخان بەهۆی ناکۆکییەکی بچووك، بەدەستی دەرەبەگ و خاوەن دێی توورە دەکات و قوتابخانەکە دادەخرێ، چونکە کەس ئامادە نییە قسەی گەورەی دێ بشکێنێ، بەڵام ڕەنجو وشیارکردنەوەی میللەت ناچێتە پایەی هیچ...!

کامەران بەدرخان کە بیست ساڵێك لە لوبنان مایەوە، لە سەرەتای چلەکان هەوڵی زۆری بۆ یارمەتیدانی جالیەی کوردی لە لوبنان داوە و کاری بۆ پەرەسەندنی باری کۆمەڵایەتیی

---

(٢٩٢) احمد محمد احمد، اكراد لبنان وتنظيمهم الاجتماعي والسياسي، الطبعة الاولى، لبنان ١٩٩٥ مكتبة الفقنية ص٧١ و ١٠٠.

جالیەکە کردووە ناوبراو، هەر تەنیا لەسەر چالاکی ڕاگەیاندن و سیاسی نەوەستا، ڕۆژنامەی (ڕۆژان و)ی لە بەیروت دەرکرد و هەوڵی دا لای فەرەنسییەکان بۆ یارمەتیدانی کوردەکانی لوبنان لە ئاستی فێرکردن بەو هیوایەی لە نەخوێندەواری ڕزگاریان بکا، مۆڵەتی کردنەوەی پۆلێك بۆ خوێندن، لە قوتابخانەی (اللاييك) لە ناوچەی (الناصرة) لە سەرەتای چلەکان وەرگرت. ئەو کات بەشێکی ئێوارانی بۆ فێربوونی زمانی کوردی تێدا دروست کرد، لەگەڵ نەهێشتنی نەخوێندەواری. بەڵام زۆر درێژەی نەکێشا، بەهۆی ئامادە نەبوونی خودی ئەوانەی تێیدا دەیانخوێند. هەندێك دەگێڕنەوە دوای گەڕانەوەیان لەکار بەمەبەستی ڕۆشنبیری ڕوویان تێ دەکرد. ئامانجی یەکەمی نەهێشتنی نەخوێندەواری بوو. ئینجا فێربوونی زمان. ئەو کاتە ئەوانەی دەیانخوێندەوە و دەیاننووسی لەناو کوردەکانی لوبنان بەپەنجەی دەست دەژمێردران، ژمارەی بەشداربووانی گەیشتە (٧٠-٨٠) کەس زۆریەیان کورمانج بوون. بەشێکی کەمیان لە (محملية) و (راجدية) بوون. هەندێك لە قوتابییە بەشدارەکانی ئەمانە بوون: ئیبراهیم خەلیلی مەتینی، فەرحۆ عەلی، حەسەن نەجیم، خەلەف عوسمان، جەمیل مەحو(٢٩٣).

هەندێك لەو کۆمەڵە کوردییانەی لە لوبنان دروست بوون، لەتەك ئامانجی سەرەکی و ئاشکرایان، هەمیشە هەوڵی هۆشیار کردنەوەو ڕاهێنانی نەوەکانی کوردیان لە بەرنامە و ئامانجی خۆیان داناوە و ویستوویانە خەڵك فێری خوێندنەوەو نووسین بکەن.

کۆمەڵەی ئەرزی وەرزشی و ڕۆشنبیری ساڵی ١٩٧٦ پرۆژەیەکی داڕشت بۆ دروستکردنی قوتابخانەیەك بۆ منداڵانی کورد لە لوبنان، هەموو لێکۆڵینەوەیەکی بۆ کرا، لێژنەی تایبەتی پێکهات بۆ دەستنیشان کردنی شوێنێکی گونجاو بەڵام ئەم پرۆژەیە سەری نەگرت، کۆمەڵەکە لە ١٨ی ئازاری ١٩٦٩ دامەزراوە.

هەروەها کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کۆمەڵایەتیی کوردەکانی لوبنان لە ١٩٧٥/٥/٣ بەژمارە (٤٩/أ-) مۆڵەتی کارکردنی ڕەسمیی وەرگرتووە بنکەی کۆمەڵەکە لە زیدانیە بووە لە شوقەیەکدا هۆڵێکی خوێندنەوە و کۆڕ و کۆبوونەوە و مەکتەبەیەك و ژوورێك بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری دامەزراندووە. ئامانجی کردنەوەی پۆلێك بووە بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری(٢٩٤).

---

(٢٩٣) هەمان سەرچاوە ل١٠٧-١٠٨ .

(٢٩٤) هەمان سەرچاوە ل١١٥-١١٨.

کوردەکانی لوبنان کە کەسانی هەژار و نەدار و نەخوێندەوار بوون، وەکو باس دەکەن هەرکەسێك روو لە لوبنان بکات یەکسەر کوردەکان دەناسێتەوە، بەوەی نا کە دیارن و جلوبەرگ و هەڵسوکەوتیان جیاوازە لەگەڵ خەڵکەکەی تر، نەخێر بەڵکە بەهۆی هەژارییانەوە یەکسەر دەتوانی دیاری بکەی کە کێ کوردە، هەموویان لە شۆستەو شوێنە هەژارەکان کاردەکەن. وەکو دەردەکەوێ بەهۆی زاڵیی پێوەندیی عەشایری و خێڵەکی نەیانتوانیوە پێشکەون و سوود لەو دەرفەتانە وەربگرن کە بۆیان هەڵکەوتووە.

ئەحمەد محەمەد ئەحمەد لەو لێکۆڵینەوەی لە نامەی ماجستێرەکەی دەربارەی کوردەکانی لوبنان کردوویەتی دەبێژێ: سوودیان لەم دەرفەتانە وەرنەگرت کە بۆیان پێك هێنرابوو، بەتایبەتی لە رێگەی کامەران بەدرخان وەکو قوتابخانەی شەوانەی (اللاييك) و ناسنامە و رۆژنامەی (رۆژا نو) و (ستێر) ساڵی ١٩٤٣و بەرنامەی رادیۆی شەرق ١٩٤١. هەروەها نەیانتوانیوە سوود لەو رۆشنایەتییە و ئەو دەرفەتانەی دروستی کردن لە پێناو بڵاوبوونەوەی فێربوون لە ناویاندا و راهێنانی هەندێك کار وەربگرن تا دواتر کارەکان راپەرێنن(٢٩٥).

بێگومان ناتوانین بڵێین وەزعی کوردەکان وەکو ساڵانی ناوەراستی سەدەی بیستەم ماوەتەوە، بەڵام نەشگەیشتووەتە ئاستی پێویست، ئەگەر لە چلەکان کار بۆ خوێندنی زمانی کوردی و فێربوون کرابێ، ئەمرۆ ئەم هەوڵە نابینرێ. راستە لە رووی سیاسییەوە کەسانی دیار و بەنێویانگ لە لوبنان دەرکەوتن وەکو جونبلاتییەکان، بەڵام دیسان کورد پێویستی بەزمان و رۆشنبیری و کەلتووری کوردی هەیە.

### لە ئەوروپا ... نموونەیەکی بچووکی خوێندنی کوردی

ئەوروپا کە لەم ساڵەی دواییدا ژمارەیەکی زۆری کوردی لە هەموو بەشەکانی کوردستان بەخۆوە گرتووە، هەوڵی زۆریشی بەخۆوە دیتووە لە مەر خوێندنی زمانی کوردی... هەندێك لە دڵسۆزانی کورد بۆ پاراستنی زمانی نەوەکانی کورد و ئاگا بوون لەو منداڵانەی لە ئەوروپا تێکەڵی کۆمەڵگای تازە دەبن ، بەخورتی کاردەکەن زمانی کوردی فێری منداڵان بکەن، لە هەندێك شوێن لە قوتابخانەکان دەرسی کوردی دەڵێنەوە. لەم باسەماندا تەنیا چەند نموونەیەکی بچووکی ئەم کۆششانە باس دەکەین، بەئومێدی ئەوەی لە ئایندەدا فراوانتر باسی بکرێ.

---

(٢٩٥) هەمان سەرچاوە ل١٧٧.

لە درێژەی کۆششەکانی دەرەوە بۆ بایەخدان بەفێربوونی زمانی کوردی و خوێندنی کوردی، کتێبێك بەناوی (ڕۆژباش) بۆ فێربوونی ئەلفوبێی کوردی لە ئەوروپا دوابەدوای بڵاوبوونەوەی کتێبی ئەلفوبێی نوێ دێ، هەر لەم بوارەدا کتێبی تر کەوتە بەردەستی منداڵان و مامۆستایانی کورد، کە لە ڕوویێکەوە تەواوکەری کتێبی ئەلفوبێی نوێیە و ڕۆڵێکی گرنگی دەبێ بۆ فێرکردنی زمانی کوردی. کتێبی (ڕۆژباش) کتێبی ڕاهێنانە بۆ فێربوونی ئەلفوبێی کوردی مامۆستا فەهمی کاکەیی ئامادەی کردووە، وێنەکان (ئێڤالۆتتالبز) کردوونی و فەرهاد شاکەلی لە رووی زمانەوانییەوە پێداچووەتەوە.

ئەم کتێبە (١٣٥) لاپەڕەیە و بۆ هەر پیتێکی کوردی سێ یا چوار لاپەڕە تەرخان کراوە، لەم لاپەڕانەدا سەرەڕای فێربوونی شێوەی نووسینی پیتەکە، کۆمەڵێك وێنەش دانراون کە دەنگی ئەو پیتەیان تێدا بەکار هاتووە و دەبیسترێ بێجگە لەوەش کۆمەڵێك مەشقی دیکە هەن منداڵ دەتوانێ کاریان تێدا بکا و بەو شێوەیەش لەسەر نووسین و بەکارهێنانی پیتەکان ڕابێ.

(کۆمەڵەی ئەلفوبێی کوردی) پرۆژەیەکەو وەکو بەشێك لە پرۆژەکانی کتێبی (ڕۆژباش) دەستی پێ کرووە، وای نیازە لە ماوەی یەك دوو ساڵان بەشێك لە پێویستییەکانی شاگرد و قوتابییانی کورد دابین بکات. (کۆمەڵەی ئەلفوبێی کوردی) لە چەند نووسەر و مامۆستا و زمانەوان پێك هاتووە و لە ماوەی سێ ساڵی رابردوودا بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و نەخشە بۆ دانراو خەریکی ئامادەکردنی کتێب بوونە بۆ خوێندن و فێرکردن و پەرەپێدانی زمانی کوردی بەتایبەت لە ناو منداڵان و لاوانی کورد لە دەرەوەی وڵات. ئا بەم شێوەیە نووسراوە و ئامادە کراوە منداڵ و قوتابی کورد لە هەر وڵاتێك هەن سوودی لێ وەرگرن و لە قوتابخانەکاندا بکرێنە بناغەیەك بۆ فێرکردنی کوردی.

ئەم کۆمەڵەیە خەریکی چاپکردنی کتێبێکی تر بووە بەناوی (گەرمیان) کە بۆ پلە دووەمەکان لە خوێندن بەکاردەهێندرێ، بۆ ئەو شاگرد و قوتابییانەی کە هەندێك کوردی دەزانن و شارەزای پیتەکانی کوردین و دەتوانن تێکستی کورت و بچووکی پێ بخوێننەوە.

لە پێشەکیی کتێبی "ڕۆژباشدا" نووسراوە «زۆربەی منداڵانی کورد ئەمڕۆکە لە دەرەوەی وڵات لەبەر چەند هۆیەك کە بێگومان یەکێکیان نەبوونی کتێبی گونجاوی خوێندنەوەی کوردییە، کتێبێك کە داخوازی پێویستییەکانی ئەوان دابین بکات و گونجاو بێ لەگەڵ پلانی قوتابخانەکانی ئەو وڵاتەی تێیدا دەژین زمانی خۆیان بەچاکی نازانن یان فێری

نابن یان لە بیریان دەچێتەوە ئەمەش مەترسییەکی گەورە دەخاتە سەر کەسایەتیی ئەو قوتابییانە و دەبێتە هۆی لەبیرچوون و فەوتانی کولتووری نەتەوایەتیمان و لە دواییشدا ئەو منداڵانە دەبنە خاوەنی کولتووری خۆیان و نە هی ئەو وڵاتەی تێیدا دەژین، چونکە ئاگاداربوون و زانین و پەیڕەو کردنی کولتووری نەتەوایەتی بەردێکی بناغەیە، بۆ تێگەیشتن و وەرگرتنی کولتوورێکی دی واتە پەروەردەکردنی مرۆڤی خاوەن دوو زمان و دوو کەلتوور»(٢٩٦).

دەبێ لە بیرمان بێ هەنووکە لە دەرەوەی کوردستاندا، بەتایبەتیش لە ئەوروپا بایەخێکی زۆر بە پرۆسەی فێربوون و خوێندنی زمانی کوردی دەدرێ و لە هەندێك شوێن کتێبی خوێندن لە قوتابخانەکاندا بەکاردەهێنرێ و پرۆسەیەکی دیاری چیرۆك و ئەدەبیاتی منداڵان هەیە لە زمانی سویدی، یا هیتر دەکرێنە کوردی و بەشێوەی قەشەنگ و ڕەنگاو ڕەنگ چاپ دەکرێن.

منداڵێکی کورد بەناوی سەربەست زەنگەنە کە (١٥) ساڵانە، لە پێشبڕکێیەکی چیرۆکی منداڵاندا کە ڕۆژنامەی (تایمز)ی لەندەن سازی دابوو، ئەم منداڵە خەڵاتەکەی بردەوە. جێی باسە چیرۆکەکە بەناوی (شارەکەم هەڵەبجە) بوو، هەروەها لە قوتابخانەی (والنکتون) لە لەندەن دەخوێنێ(٢٩٧).

ئەمە نموونەیەکی ترە لە پەرەگرتنی فێربوون لای منداڵی کورد لە ئەوروپا.

لە دەزگای بڵاوکردنەوەی (ڕۆژانوو) کتێبێکی فێرکردن بۆ منداڵان بەپیتی لاتینی چاپ کراو بڵاو کراوەتەوە ئەم کتێبە بەڕێز (هالك ئوزتورك) لە ستۆکهۆلم دایناوە و وێنەکانیشی (سرت والنیوس و زەردەشت سەرگول) کێشاویانە. کتێبەکە بۆ ئەو منداڵانەیە کە تازە دەست بەفێربوونی زمانی کوردی دەکەن لە لاپەڕەکانی سەرەتادا جەختی لەسەر پیتە کوردییەکان کردووەتەوە لە برگە و پیت و وشە، ئینجا چیرۆکی کورت. لە کۆتاییدا فەرهەنگۆکەك بۆ وشە قورسەکان هەیە و بەزمانی سویدی لێکی دەداتەوە(٢٩٨).

لە زۆر وڵاتی تری ئەوروپا، لە زۆر شار و دەڤەردا قوتابخانە بۆ خوێندنی زمانی کوردی هەیە، هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی منداڵانی کورد زمانی کوردی لە بیرنەکەن.

---

(٢٩٦) هەفتەنامەی گولان، چالاکیی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کورد لە ئەوروپا، ژ (٢٥٦)، ١٦/١٢/١٩٩٩ل٤٩.

(٢٩٧) ڕۆژنامەی خەبات ژ (٩٥٨)، ٧/١/٢٠٠٠ل١٦.

(٢٩٨) مجلة گولان العربي، العدد (٣١) كانون الاول ١٩٩٨، ص١٤٣.

لە ئوستراليا لەشاری ئەدەلايد قوتابخانەيەكی كوردی بۆ خوێندنی زمانی كوردی كراوەتەوە.

### خوێندنی كوردی لە كەنەدا

پێش ڕاپەڕينی ١٩٩١، پێش ئەوەی ئەم كۆچە بەكۆمەڵەی كوردان بۆ دەرەوە دەست پێ بكات هەوڵ و كۆشش بۆ خوێندنی زمانی كوردی هەبوو. لە كەنەدا لە ساڵی (١٩٨٩)ەوە قوتابخانە بۆ فێربوونی زمانی كوردی هەيە.

بەپێی هەواڵەكانی ڕۆژنامە و گۆڤارە كوردييەكانی ساڵی ١٩٨٩. لەو كاتەی لەناو وڵاتدا زمانی كوردی قەدەغە دەكراو قوتابخانە بەهەزارەها تەخت دەكران و بەسەدان هەزار منداڵی كورد لە خوێندن بێبەش دەبوون. لە وڵاتێكی وەكو كەنەدا قوتابخانەی كوردی بەڕەسمی دەكرێتەوە. گۆڤاری (ڕێگای ئاشتی و سۆسياليزم)[٢٩٩] بە سەردێڕی (قوتابخانەی كوردی لە كەنەدا) ئەم هەواڵەی بڵاوكردووەتە.. كە ئەمڕۆش بايەخێكی مێژوويی گرينگی لەمەڕ خوێندن و خوێندەواری بە كوردی و بايەخدان بەزمانی كوردی هەيە، لە هەواڵەكەدا هاتووە:

پاش هەوڵ و تەقەلايەكی زۆر و گفتوگۆيەكی بەپێز لەگەڵ (گريم براون) لێپرسراو لە بەڕێوەبەرايەتی گشتی پەروەردە و فێر كردنی شاری لەندەن لە ئونتاريوا بڕياردرا قوتابخانەيەكی سەرەتايی بۆ منداڵانی كورد بكرێتەوە. ئەوەی شايانی باسە لە ڕۆژی ڕێكەوتی (٢ ی) ئۆكتۆبەری ١٩٨٩ قوتابخانەكە كرايەوە و لە هەمان ڕۆژدا يەكەم وانەی فێركردنی زمانی كوردی وترايەوە.

قوتابخانەكە زۆر بەگەرمی و زۆر دڵخۆشی لەلايەن منداڵانی كورد و كوردەكانی دانيشتووی كەنەدا پێشوازيی كرا.

لەم قوتابخانەيەدا منداڵە كوردەكانی هەموو پارچەكانی كوردستان وانەی فێربوونی زمانی كوردی وەردەگرن. منداڵەكان زۆربەيان لەشاری لەندەندا دانيشتوون هەندێكيشيان لە شارەكانی دەوروپشتی لەندەنەوە دێن لە بواری فێركردندا ئەلفوبێ كوردی بەعەرەبی و ئەلفوبێ كوردی بەلاتينی پەيڕەو دەكرێت.

خوێنەری ئازيز: «كوردە بەڕێزەكان زۆر خۆشحاڵ دەبين كە پشتگيريمان بكەن چ لە بڵاوكردنەوەی هەواڵ و دەنگوباسی قوتابخانەكەمان يان بەناردنی شتی پەيوەند

---

(٢٩٩) گۆڤاری ڕێگای ئاشتی و سۆسياليزم، كانونی يەكەم ١٩٨٩ ل١٥٨.

بەمنداڵەوە و، بەهەموو جۆرە یارمەتییەك كە خزمەتی قوتابخانەكە بكات.

زۆر سوپاس                                    دكتۆر ئیبراهیم بەڕێوەبەری قوتابخانە.»

D.R.Ibrahim
station, 40
P.O.Box 9017
willing RD.1105
south
London, ontario
N6E2Y7
CANADA

هەروەها لە شاری سانتیاگۆ لە ساڵی ١٩٩٨ لە كالیفۆڕنیای ئەمریكا قوتابخانەی كوردی بۆ منداڵانی كورد كراوەتەوە. ئەمەش بەكۆششی چەند مامۆستایەكی كورد كراوە، بۆ ئەوەی منداڵانی كورد زمانی خۆیان لە بیرنەكەن(٣٠٠). لەم چەند دێڕەدا ئاماژەی خێرامان بۆ چەند هەوڵ و تەقەلایەكی دڵسۆزانەی مامۆستایانی كورد لە دەرەوەی كوردستان كرد، كە بۆ پاراستن و فێركردنی زمانی كوردی كۆشش دەكەن. ڕاستە تا ئێستاش لە ناو كوردستاندا لە هەندێك بەش زمانی كوردی بەكێوی و قەدەغەیە دەزانن لە كوردستانی باشووردا ئەگەر نیمچە سەربەخۆییەكی (ئیداری- سیاسی)مان هەیە، بەڵام زمان و خوێندنی كوردی ئەو بایەخەی پێ نەدراوە، كە سەنگەری نەتەوە بەهێز و گەش دەكا. ئاستەنگی لەبەردەم زۆرە. بەعەرەبی بیركردنەوە بەسەر زمانەكەمان زاڵە، لە بەشەكانی تر یەكسەر گێر دەگۆڕدرێت، یاخود هەندێك جار (چەند مەوج)ی دەبن. بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە، ئیتر كورد بووەتە خاوەنی زمانی خۆی و لە ئەورووپا تێكڕا بەكوردی دەخوێنن، نەخێر كێشە و ئاستەنگی مەزنیان لە پێشە... حزبەكان ڕۆڵی سلبی لە پاشخستنی زمانی كوردیدا دەبینن. ئەوەی سەرنجەكانی (د.عەبدوڵڵا پەشێو) بخوێنێتەوە و كە لەمەڕ میدیا و زمان دەری بڕیون كارەساتەكەی ڕوونتر دێتە بەر چاو. بەڕوونی لەو زمانە سەیر و سۆیەتە دەردەكەوێ كە زۆربەی خەڵكی ئاسایی و هەندێ لە ڕۆشنبیران قسەی پێ بكەن. جارجار ئەگەر یەكێك عەرەبییەكی باش نەزانێ تێیان ناگا... زمانی كوردی چەمكێكی سیاسەت ڕووە هەرە دیارەكەی مەسەلەی نەتەوەی كوردە. كوردستان سنوورێكی دیاری نییە و هەڵكشان و داكشانی ڕووبەرەكەی بەقەد هەڵكشان و داكشانی زمانی كوردییە... سەیری پلاكاتەكان خۆ نیشاندانە چڕوپڕەكانی برایانی باكور بكە، لە میدیا تیڤیدا. لەم ئەوروپایە ئازادە وشەیەكی كوردییان تێدا نییە. بۆچی

---

(٣٠٠) گۆڤاری گوڵانی عەرەبی، العدد (٢٥) حوزيران ١٩٩٨، ل١٤٦.

دەبێ لە ئەڵمانیا پلاکارت بەتورکی بنووسرێ؟ تۆ بڵێی کوردەکە باوەڕی بەوە هێنابێ، کە نەك هەرکورد، بەڵکو ئەڵمانەکانیش هەموو تورکی دەزانن؟[٣٠١]. بارەکە لەمەش تێ دەپەڕێ، پیتی عەرەبی و لاتینی لەلایەك و هەر بەشە و شێوازی خۆی تا دەگاتە حزب حزبانێی خۆی، لەزۆر شوێن دیالێکتەکانی زمانی کوردی، بوونەتە مایەی لێك هاوێر بوون و کێشە، مەخابن لە دام و دەزگا ڕەسمییەکانی ئەوروپا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی (بەکردەوە) وەك زمانی سەربەخۆ دانوستانیان لەگەڵدا دەکرێ. کورد خۆی دەورێکی باڵای بینیوە لە خولقاندنی ئەم کارەساتە نەتەوەییەدا. ئەگەر مێدیای کوردان لەم ڕووەوە هۆشیار نەبێ، ئەوا وەك پێشتریش گوتم لە داهاتوویەکی نێزیکدا، لە میللەتێکەوە دەبین بەچەند میللەتۆکەیەك[٣٠٢]. ئەمەی لەم چەند پەیڤەدا دەخوێندرێتەوە، دەری دەخا کە بەکردەوە کورد ڕووبەڕووی کارەساتن. لە ناوەوەی کوردستان، داگیرکەران دەیانەوێ هەموو شتێك کۆیلە بکەن، زمانمان لاڵ و خوار و خێچ بکەن. کەچی لەتەك هەندێك تەقەلادا، لە ئەوروپای ئازاد سیاسییەکان زمان دەکەنە ئامرازی سازش و لێك دابڕانی نەتەوەکەمان!

**قوتابخانەی بارزان لە (Waterbarg) ئەمریکا (*).**

ئەم قوتابخانەیە لە ڕۆژی ٢٠٠٢/٢/١٧ لە لایەن مامۆستا (تەیب بامەڕنی) کراوەتەوە بۆ فێربوونی زمانی کوردی. لەم قوتابخانەیەدا لەتەك فێربوونی مێژووی کوردستان و کەلتووری کوردی و فۆلکلۆری کوردی، دەرسی ئاینی و زمانی کوردی و ژیانداری و کشتوکاڵ و وێنە و وەرزش و سروود گوتراوە. ماڵی تەیب قوتابخانە بووە، (٢٥) منداڵی کورد دەرسیان تێدا خوێندووە. هەموو پێویستییەکان مامۆستای قوتابخانەی ڕای پەڕاندوون، دەرسەکان هەمان دەرس و کتێبی کوردستان بوون. قوتابییەکان پۆلی یەکەمیان تەواو کردووە، بەهۆی نەبوونی هاریکاری ئەم قوتابخانە لە ڕۆژی ٢٠٠٢/٩/١٥ داخراوە، چاوەڕێی هاریکاری و ئالیکاریی دەزگا کوردی و دڵسۆزانی کوردە، بۆ بەردەوامبوون لەسەر فێربوون و خوێندنی زمانی کوردی.

---

(٣٠١) ڕۆژنامەی میدیا، عەبدوللا پەشێو، چەند سەرنجێکی سەرپێیی دەربارەی مێدیا و زمان، ژ(٩١) ٢٠٠١/٤/١، ل٣.

(٣٠٢) هەمان سەرچاوە.

(*) ئەم زانیارییانە لە دیدارێکی تایبەت لە مامۆستای قوتابخانە (تەیب بامەڕنی) وەرگیراون لە سەرەتای مانگی ١٢ی ٢٠٠٢ لە ئەمریکا.

# خوێندن لە سایەی شۆڕش و ئەنفالی قوتابخانە

باری خوێندن و خوێندەواری لەباری سیاسیی گشتیی کوردستان و ئەو ڕەوشە دژوارە بەدوور نییە، کە دەیان ساڵە حکوومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عیراق بەئامانجی سڕینەوەی ناسنامە نەتەوەیی و زمان و کلتووری کوردان پیادەی دەکەن و گەرەکیانە لەڕەگ و ڕیشەوە کورد لە زەوی هەڵکەنن و بیکەنە میوان و نیشتەجێی ماڵوێرانکراوی بێ خاك و نیشتیمان، لەبەرامبەر ئەوەشدا نەتەوەی کورد بەشێوازی هەمە جۆر کەوتووەتە بەرگری و بەرەڤانی لە بوونی خۆی، وێڕای شۆڕش و ڕاپەڕینەکان و خەباتی چەکدارانە شۆڕشگێڕانە لە شاخ و دێهاتەکاندا، خەباتی کلتووری و فەرهەنگی و زمانەوانی زۆر بەنرخ شایستە شی کردووە... ڕۆشنبیر و خوێنەرانی کورد هەوڵیان داوە زمان و ڕێزمانی کوردی بچەسپێنن و زمانی کوردی بکەنە زمانی خوێندن و قوتابخانە بکەنەوە و نووسەر و ڕۆشنبیران بەشیعر و ئەدەبیات و وتار نووسین هەوڵیان داوە بوونی نەتەوایەتیی کورد بسەلمێنن و بەربەست لەبەردەم شاڵاوی گۆڕینی ناسنامەی کورددا پتەو و بەهێز بکەن.

ڕاگوێزان کە سامناکترین و کاریگەرترین شێوازەکانی سڕینەوەی ئاسەوار و ناسنامەی کوردە، سەردەمانێکە درێژەی هەیە. ڕاگوێزان لە شێواز و سیاسەتی تازە و ڕاشکاوانە لە کوردستانی باشوور لە ساڵی ١٩٦٣ دەستی پێ کردووە، تا گەیشتە دوا لووتکەی، ئەویش ئەنفال و کیمیا باران و سووتاندنی خاك بوو. ئەم سیاسەتەش بەم ڕێگایانە پیادە کرا.

یەکەم: ڕاگوێزانی کورد بۆ ئۆردووگا زۆرە ملێیەکان و دانانی عەشایری عەرەب لە جێگایان.

دووەم: ڕاگوێزان لە شار و گوندەکانی کوردستان بۆ ناوەڕاست و خوارووی عیراق.

سێیەم: ڕاگوێزان لەو شارانەی ڕژێم دەستی بەتەعریب کردووە، بۆ شارەکانی تری کوردستان.

چوارەم: ڕاگوێزانی کوردە فەیلییەکان.

پێنجەم: تاکتیکی زەوی سووتاندن و تەختکردنی گوندەکان. (٣٠٣)

---

(٣٠٣) گۆڤاری ڕێگای ئاشتی و سۆسیالیزم، دژی ڕاگوێزانی کورد، هاشم کۆچانی، ژ (٨) ساڵی دووەم ئابی ١٩٨٧ل١٠١.

لێرەدا ئەو پیلانە فراوانە گەلێك لایەنی لە ژیانی کوردەواری گرتەوە، بەتایبەتی کە پێوەندی بە بابەتەکەمانەوەیە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٣ سەدان کەسیان ڕاگواست و (٢١) گوندیان وەکو دەستپێك لە دەوروبەری دوبز ڕاگوێزا و پاشانیش نەیانهێشت ئاوەدان بکرێتەوە و عەرەبیان لە شوێن دانان. جارێکی تر لە دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئازار (١٣) گوندیان لە ناوچەی دوز و کفری ڕاگوێزا و عەشایری عەرەبیان لە جێگا دانان. لە ساڵی (١٩٧٣-١٩٧٤) بەبیانووی شەڕ لە کوردستاندا لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك (١٠٠٠) کرێکاری کوردیان لەکار دەرکرد و بۆ شارەکانی تر ڕاگوێزرانەوە. لە سەرەتای حەفتاکان(٦٠) هەزار کوردی فەیلی رەوانەی ئێران کران و بەعەرەبکردن لە ناوچەکانی ژەنگار و سیمێل و باعەدرێ و گوندەکانی پارێزگای مووسڵ و کەرکووك و خانەقین درێژەی هەبوو. دوای نسکۆکەی ١٩٧٥ نزیکەی (٣٠٠) هەزار هاوڵاتی کورد بۆ ناوەڕاست و خوارووی عیراق راگوێزران. لە ساڵی ٧٥-١٩٧٨ بەدرێژایی سنوری عیراق. ئێران و سوریا و تورکیا کە لە (٨٠٠) کیلۆمەتر زیاترە و بەقووڵایی (١٥-٢٠) کیلۆمەتر زیاتر لە (١٥٠٠) گوندیان راگوێزا و بەپێی سەرژمێرییەکانی حکومەت (٢٥٠) هەزار هاوڵاتی کوردیان لە جێگە و ڕێگەی ژیانی خۆیان هەڵکەند و ئاوارەی شوێنی تریان کردن.

لە هاوینی ١٩٨١یش دانیشتوانی شارۆچکەی گەڵاڵە و گوندەکانی ناوچەی چۆمان کە ژمارەیان لە (٢) هەزار خێزان زیاترە راگوێزران، هەر لە هەمان کاتدا بەناوی خستنە کاری بێکاران بڕیاری راگوێزانی (٢٠) هەزار خێزانی کورد لە شارەکانی کوردستانەوە بۆ خوارووی عیراق درا. دانیشتوانی بیارە و خورماڵ و تەوێڵە و پێنجوین و دەیان گوندی شارەزوور و ناوچەکانی تریش بەهەمان شێوە دوچاری راگوێزان بوونەوە. پتر لە ٥٦ ئۆردوگای زۆرەملێ دامەزرا[٣٠٤].

راگوێزان لە دوایین مانگەکانی ١٩٨٥ گەیشتە نزیکەی دوو هەزار گوند. هەر لەم ساڵەدا پتر لە ٢٠٠ گوند راگوێزرا و لە ساڵی ١٩٨٧دا (٤٩٢) گوندی تری کوردستان کاول کرا، ڕێککەوتنی عیراق و تورکیا بۆ هاتنە ناو خاکی یەکتر بەقووڵایی (١٥)کم، ئەمەش وای کرد ژمارەیەکی ئێجگار زۆر گوند و ئاوەدانی تەخت بکرێن و راگوێزرێن و خاکەکەش بسووتێنن. بەپێی سەرچاوەکانی ئەوکات گوندە راگوێزراوەکانی

---

(٣٠٤) هەمان سەرچاوە.

١٩٨٥-١٩٨٦ لە ناوچەی سلێمانی گەیشتۆتە (٢٥٠) گوند و شارۆچکە سووتێندران یا ڕاگوێزران و کاول کران. لە ناوچەی کەرکووك نزیکەی (١٠٠) گوند و لە ناوچەی هەولێر (١٦٢) گوند[٣٠٥].

هەروەها لە سەرچاوەیەکی تردا بەم شێوەیە باسی راگوێزران و تەختکردنی گوندەکان کراوە.

کە لە تەکیدا بەم جۆرە ژمارەی قوتابخانە داخراوەکانی کوردستان لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٥ دەکات. دەسەڵاتدارانی عیراق (٢٠٨) قوتابخانەی سەرەتایی لە پارێزگای دهۆك داخست بەبیانوی ئەوەی کەوتنەتە دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەت ئەم داخستنەش بەپێی بڕیاری ئیداری بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی دهۆك ژمارە (٥٧٥)ی (١٩٨٥/١٠/٢٠) بووە بەپێی گەڕانەوەیان بۆ بڕیاری لیژنەی ڕاگەیاندنی ئەمنی لە دهۆك ژمارە (٢٣٦)ی ١٩٨٥/٩/٢٢. هەروەها لە پارێزگای هەولێریش (٢٠٠) قوتابخانەی سەرەتایی لە گوندەکانی پارێزگاکە بەپێی بڕیاری پەروەردەی پارێزگای هەولێر ژمارە (٢٢٧٩)ی ١٩٨٥/٩/١ داخراوە. دەسەڵاتداران نزیکەی (٣٤٠) قوتابخانەی لە پارێزگای سلێمانی و کەرکووك داخستووە. بەم پێیە ژمارەی قوتابخانە داخراوەکانی کوردستان گەیشتە پتر لە (٧٠٠) قوتابخانە[٣٠٦].

ئەم ژمارەیە زیادی کردووە، چونکە پرۆسەی ڕاگواستن و کاولکردنی کوردستان بەردەوام بوو، بەجۆرێك پەرەی سەندبوو کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ژمارەی تێکدان و داخستنی قوتابخانەکان لە کوردستان لەتەك تەختکردن و ڕاگواستنی گوندەکان زیادی کردووە.

لەساڵی ١٩٨٥-١٩٨٦ بەم جۆرە، لە شارەکانی کوردستاندا قوتابخانەکان داخراون.

هەولێر (٣٧٧) قوتابخانە و دهۆك (٢١٠) قوتابخانە و سلێمانی (٢٥٧) قوتابخانە و دەورویشتی کەرکووك (٢١٣) قوتابخانە کە کۆی گشتی قوتابخانە داخراوەکانی لەم شارانەی کوردستاندا گەیشتووەتە (١٠٥٧) قوتابخانە[٣٠٧].

---

(٣٠٥) گۆڤاری ڕێگای ئاشتی و سۆسیالیزم، دژی راگوێزانی کورد، ژمارە (٩) مانگی دووەم تشرینی دووەم ١٩٨٧، ل١٠٩.

(٣٠٦) آ.ب. عن التعليم في كردستان العراق، مطبعة خەبات ١٩٨٦، ص٣٥.

(٣٠٧) گۆڤاری ڕێگای ئاشتی و سۆسیالیزم ژمارە (٩).

جێی خۆیەتی لێرەدا لە باسی پاشەکشە پێکردنی پرۆشنبیریی کوردیدا، ئاماژە بەوە بکەین کە چۆن حکوومەتی دەسەڵاتدار بڕیاری گۆڕین و داخستنی بنکە ئەکادیمی و ڕۆشنبیرییە کوردییەکانی داوە. بەپێی بڕیاری (١٦٣)ی ٤/١٠/١٩٧٨ حکوومەت کۆڕی زانیاریی کوردی داخست و بەپێی یاسای (٧٠)ی ساڵی ١٩٨٠ش هەموو بنکە ئەدەبی و کۆمەڵە هونەری و دەزگا پیشەییەکانی کوردی داخست، کە لە ڕێککەوتنی ئازاری ١٩٧٠ بەدەست هێنرا بوون(٣٠٨).

ئەگەر هەندێك بۆ دواوەش بگەڕێینەوە، لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ و دواتر لە ساڵی (١٩٧٤-١٩٧٥) شۆڕش بایەخێکی دیاری بەخوێندن و کردنەوەی قوتابخانە داوە. هەرچەندە باری خوێندن لە ئاکامی پەلاماری عەسکەری حکوومەت و ئاور بارانی فڕۆکە، زۆر بەسەختی بەڕێوەچووە، زۆر لە قوتابخانەکان لە ئەشکەوت و پەناو پەسیوان دەوامیان تێدا کراوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کورد ئەگەر لە دەستێکدا داکۆکی لە مانەوەی خۆی کردبێ، هاوکاتیش لە خولێکی تردا شەیدای خوێندن و خوێندەواری بووە.

لە سایەی شۆڕشی کوردستان وەکو باس کرا لە ساڵی (١٩٦١ -١٩٧٠) بایەخێکی بەرچاو بەپێی توانا بەمەسەلەی خوێندن و ڕاگەیاندن و پێگەیاندنی کادری سیاسی و ڕۆشنبیری درا، بێ گومان لە کوردستاندا ئەمە یەکەمین شۆڕش و ڕاپەڕینی چەکدارانەیە بەم جۆرە و لەم شێوە گرنگە بایەخ بەخوێندەواری و خوێندن و ڕۆشنبیری بدات.

لە دوای ١٩٧٠و لە کاتی ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بایەخی خوێندن و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و چاپ و دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و خوێندن بەزمانی کوردی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەرفراوان بوو، لە ١٩٧٤یش بۆ جارێکی تر شۆڕش دەستی پێ کردەوە لە تەنیا ساڵێکی تەمەنیدا لە ناوچە ئازاد کراوەکان باری خوێندەواری و ڕۆشنبیری بەم شێوەیە بایەخی پێدراو خوێندن پەرەی سەند و لەتەك ئەوەشدا لەسایەی شۆڕشی گەلی کورددا هەلومەرجی سەختی شەڕ و خەباتی چەکدارانە سێ ئەمینداری گشتی

---

(٣٠٨) آ.ب. عن التعليم في كردستان العراق. ص٣٦.

هەروەها بەپێی قسەی بەرپرسانی حکوومەتی عیراق لە ١٢ ئازاری ١٩٨٦کە باسی پەرەسەندن و پێشکەوتنی خوێندن لە پارێزگاکانی حوکمی زاتی دەکەن، دەڵێن (١٩١٧) قوتابخانە هەیە. کە ئەم ژمارەیە یەکجار کەمە. لەچاو ئەو هەموو قوتابخانەی گوندەکان تێك دراون تا ئەو کاتە.

(ئیعلام و پەروەردە و تەندروستی و کاروباری کۆمەڵایەتی) دروست کران.

لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شۆڕش (٢٣) مامۆستای زانکۆی سلێمانی کە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا و (١٠) خاوەنی بڕوانامەی ماجستێر و (١٧) مامۆستای زانکۆش خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس و (١٦) مووچە خۆری ئیداری و ئەندازیار و سەرباری ژمارەیەك مامۆستای زانکۆکانی تر و دوو ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد و (٣) مامۆستاش کە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا و ماجستێر بوون لە دەرەوەی وڵات پێوەندییان بەشۆڕشەوە کرد(٣٠٩).

ئەمە لەمەڕ ئەو مامۆستایانەی لە ئاستی زانکۆ و خودان بڕوانامەی بەرزبوون لە ڕیزی شۆڕش کاریان دەکرد، شۆڕش زانکۆی سلێمانی لە قەلادزێ کردەوە لە ٢٤نیسانی ١٩٧٤ ئەم زانکۆیە کەوتەبەر بۆمبارانی دوژمن و قەسابخانەیەکی دڵتەزێنی دروست کردو ژمارەیەك قوتابی بوونە قوربانی و ژمارەیەکیش بریندار بوون.

بەپێی ئەو زانیارییانەی تۆمار کراون، ژمارەی قوتابییانی زانکۆ کە پێوەندییان بەشۆڕشەوە کرد گەیشتە (١٥٠٠) قوتابی و (٥٥٠٠) مامۆستاش گەیشتنە ڕیزی شۆڕش و ژمارەی قوتابخانەکانی ناوچەکانی پارێزگای دهۆك و قەزای شێخان و ئاکرێ و پارێزگای هەولێر و سلێمانی و کەرکووك گەیشتنە (٨٥٠) قوتابخانە و ژمارەی قوتابییەکانیشیان (٦٣٥٠٠) بوو. لە قوناغی ناوەندی و ئامادەییش (٩٥٠٠) قوتابی دەیانخوێند(٣١٠).

ئەمانە ئاماری سەردەمی تەمەنی یەك ساڵەی شۆڕشی کورد و هەلومەرجی ئەو کاتی خوێندن بوو، کە لەتەك ئەمانەشدا (٦٣) ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کورد چوونە شاخ و(٣٢٠)(٣١١) کادیری ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری و هونەری لەو کاتدا لە ڕیزی شۆڕش بوون.

لەتەك هەلومەرجی سەختی ئەوان سەردەمدا، هەوڵ درا لە ڕێگەی ئەمینداریتیی گشتیی

(٣٠٩) گۆڤاری مەتین صفحات من اعلام البارتی. منذ عام ١٩٧٤حتی انتفاضة ١٩٩١، فلك الدین کاکایی، ژ(٥) نیسان ١٩٩٦، ل٦٥.

(٣١٠) هەمان سەرچاوە (٤٠٠٠) مامۆستای سەرەتایی (١٥٠٠) مامۆستای ناوەندی و ئامادەیی. (٦٠٠٠) هەزار قوتابی ناوەندی و (٣٥٠٠) قوتابیی دواناوەندی هەبوون و نزیکەی (٦٠٠٠) قوتابیی پۆلی شەشەمی سەرەتایی هەبوون، نەیاندەتوانی ئیمتیحان بکەن، بڕوانە. آ.ب.عن التعلیم في کوردستان العراق.ص.٢٨

(٣١١) هەمان سەرچاوە.

پەروەردەی شۆڕش بواری خوێندن ڕێك بخرێ و خوێندن لە سەدان قوتابخانە بەردەوام بوو لە خێوەتگاکانی ئاوارەیی خوێندن دەخوێندرا و شۆڕش توانایەکی دارایی زۆری بۆ ئەم بوارە تەرخان کرد و لە ماوەیەکی کورتدا سەدان هەزار کتێبی قوتابخانە چاپ کران و پێداویستییەکانی خوێندن و قوتابخانە دابین کران و سجلی وەرگیران و لایەنی بەرپرسی پێوەندیی ئێرانی، دانی بەبڕوانامەی دەرچوو لەلایەن پەروەردەیی ئاوارەکان نا. (٣١٢)

بۆ ئەوەی وردتر لە مەسەلەی خوێندن و بەردەوامی خوێندن لە ئاوارەیی ڕوون بێتەوە، پێویستە سەیری ئەم زانیارییانە بکەین کە لەم خشتانەی خوارەوە (٥٥،٥٦، ٥٨، ٥٧)(٣١٣)

بەدیار دەکەون ئەمانەش دوای نسکۆی ١٩٧٥ چوونە ئێران و بەسەر تێکڕای ئێراندا دابەش کران و پەرش و بڵاو کرانەوە و تا گرینگیی زیاتر بەزمانی فارسی بدەن و هێدی هێدی بکەونە ژێر فەرهەنگ و کارتێکردنی کۆمەڵایەتی و شێوە شارستانیەتی و ژیانی فارسی... ئەوەی جێگەی شانازییە سەرەڕای هەموو کۆسپ و سەختی و گرانییەکی ژیان، کە ئەویش هۆکاری وەك بەشداری ڕاستەوخۆی ئەو پەنابەرانەمانە بەدرێژایی تەمەنیان لە شۆڕشی خەباتی ڕزگاریخوازیی گەلەکەماندا.

لەم خشتەیەدا ژمارەی بەشداریی قوتابیانی کورد لە پەناهەندەیی لە ئێران لە ساڵی (١٩٩٠–١٩٩٨) دەردەخات:

---

(٣١٢) هەمان سەرچاوە بۆ زانیاریی پتر بڕوانە آ.ب عن التعليم في كردستان العراق لە ساڵی ١٩٧٤دا لە ئاوارەییدا (٢٥٠٠) قوتابی سەرەتایی و (٥٠٠٠) ناوەندی و (٥٥٠)ی ئامادەیش هەبوون تاقی کردنەوەی کۆتاییان کرد. بەهەزارەها قوتابیش لە سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و خانەی مامۆستایان و پیشەسازی و کشتوکاڵییەکان و زانکۆ بەهۆی فشاری حکوومەت لە خوێندن دابڕان بڕوانە آ.ب.عن التعليم في كردستان العراق.ص٢٨

(٣١٣) هەفتەنامەی گوڵان، پەنابەران و کێشەی بەرنامەی خوێندن، ژ(٢١٣) ١٣/٢/١٩٩٩ل٤١.

### خشتەی ژمارە (٥٥)

| ساڵ | ژمارەی قوتابییانی سەرەتایی و دواناوەندی | ئەو قوتابییانەی وازیان لە خوێندن هێناوە |
| --- | --- | --- |
| ١٩٩٠ | ١٧٥٠٠ | ٢٣٠٠ |
| ١٩٩٥ | ١٢٧٠٠ | ٧٥٠ |
| ١٩٩٨ | ٧٥٠٠ | ١٩٠٠ |
| سەرجەم | ٣٧٧٠٠ | ٤٩٥٠ |

### خشتەی (٥٦)

| ساڵ | ژمارەی قوتابییانی زانکۆ | ئەو قوتابییانەی وازیان لە خوێندن هێناوە |
| --- | --- | --- |
| ١٩٩٠ | ٨٢ | ٢٩ |
| ١٩٩٥ | ١٤٢ | ١٥ |
| ١٩٩٨ | ٢٤٠ | ٩ |
| سەرجەم | ٤٦٨ | ٥٣ |
| ئەوانەی خوێندنیان تەواو بووە | ٧٦ | ---- |

ئەو قوتابییانەی دوای ڕاپەڕین گەڕاونەتەوە کوردستان و لە زانکۆکانی کوردستان دەخوێنن و درێژەیان بەخوێندن داوە بەم شێوەیە کە لە خشتەی ژمارە (٥٧) تۆمار کراوە

### خشتەی ژمارە (٥٧)

لەم خشتەیەدا دەردەکەوێ کە ژمارەیەکی زۆری قوتابییانی ئاوارە کە گەڕاونەتەوە

| پارێزگا | ژمارەی قوتابییانی زانکۆ | ئەو قوتابییانەی وازیان لە خوێندن هێناوە |
| --- | --- | --- |
| هەولێر | ٣٨٤ | ١٤٨ |
| دهۆك | ٣٢ | ١١ |
| سلێمانی | ٢٥ | ٩ |
| سەرجەم | ٤٤١ | ١٦٨ |

کوردستان وازیان هێنا کە دەکرێ بەشێکی ئەو ژمارە دابنرێ کە لە زانکۆکان وازیان هێناوە ئەمەش پێوەندیی بەکۆمەڵێك هۆکارەوەیە، کە بە زیان بۆ سەر دوارۆژی ئەم ژمارە قوتابییە دەگەڕێتەوە، کە دوای مەینەتی ئاوارەیی، لە کوردستانی ئازادیش ناتوانن لەسەر خوێندن بەردەوام بن.

لە خشتەی ژمارە (٥٨)یشدا ڕێژە و ژمارەی قوتابییانی سەرەتایی و ناوەندی پیشان دەدەن دوای ڕاپەڕین هاتوونەتەوە کوردستان و دەخوێنن. کە ئەوانیش بەم شێوەی خوارەوە تۆمار کراون.

**خشتەی ژمارە (٥٨)**

| ساڵ | ژمارەی قوتابییانی سەرەتایی | قوتابییانی دەرچووی ئامادەیی | ئەوانەی وازیان هێناوە |
|---|---|---|---|
| ١٩٩٢ | ٣٤٠٠ | ٢٣٥٠ | ١٢٠٠ |
| ١٩٩٥ | ٤١٠٠ | ٤٧٠٠ | ١٩٠٠ |
| ١٩٩٨ | ١٥٠٠ | ٣٧١٠ | ٤١٠ |
| سەرجەم | ٩٠٠٠ | ١٠٧٦٠ | ٣٥١٠ |

ئەم بارۆدوخەی هەیە لە کوردستاندا کاریگەریی زۆری لەسەر خوێندن و دواکەوتن و وازهێنانی خوێندن هەیە دەکرێ لەم چەند هۆکارە کورتیان بکەینەوە (شەڕی ناوخۆی کوردستان و دیاردەی چاولێکەری کۆچ بۆ هەندەران، باری ئابووری سەخت و کزی باری هێمنیی مامۆستایان، سەبارەت بەئاوارەکانیش سەرباری ئەمانەش نەبوونی گونجاوی بەرنامە و باری ڕۆشنبیرییە لە نێوان ئاوارەکان و کەشی تازەی کوردستان)[٣١٤].

ئەمە کورتە بەرچاو خستنێکی بەسوودە بۆ باری خوێندن و بوونی خوێندەواری لە ڕیزی ئاوارەکان کە بەهۆی شۆڕش و بارودۆخی سیاسیی سەختی کوردستان و فشاری دوژمنانەوە ئاوارە بوون و پێوەندییان بەشۆڕشی کوردستانەوە هەبووە.

باری خوێندن و ژیانی قوتابییان لە ڕووی دەروونی و ئاسایشەوە بەسەختترین

---

(٣١٤) هەمان سەرچاوە.

قۆناغەکانی تێ پەڕیوە دوای نسکۆی ١٩٧٥ . بەتایبەتی لە هەشتاکاندا کە قوتابخانەکان بوونە مەڵبەندی هوشیاریی سیاسی و نیشتیمانی و قوتابییان بوونە پێشەنگی بزاقی جەماوەری و دەستیان بەچالاکیی سیاسی و خۆنیشاندان و ڕەفزکردنەوەی سیاسەتی داگیرکەران کرد.

لە ١٩٨٧/٥/١٩ لە قوتابخانەی ناوەندیی (وەتەن) لە سلێمانی لە لایەن عەبدوڵڵا کەرکووکلی سەر بەموخابەرات ٦ قوتابی دەستگیرکران بەناوەکانی (کامەران عەبدوڵڵا ئەحمەد ١٩٧٢، بورهان رەئوف رەحمان١٩٧٣، بژار سالح جەلال ١٩٧٣، ئازاد حەسەن سوورە ١٩٧٢، ڕێبوار عومەر فەتحوللا ١٩٧١، نزار جەلال سالح ١٩٧١)، کە دوو ڕۆژ پێش ئەوەش دوو قوتابیی تر لە هەمان قوتابخانە بەناوی (ئیسماعیل مووسا مەحموود قەرەداغی١٩٧٢، ئەسفندیار محەمەد مەجید ١٩٧٤) گیران.

دوای ئەوەی ڕەوانەی بەناو (دادگای شۆڕش) دەکرێن لەبەر تەمەن بچووکی ڕەوانەی ئەمنی سلێمانی دەکرێنەوە، وەکو چۆن هەمان کاریان لەوەپێشتریش لەگەڵ (٢٥) قوتابیی تر بەهەمان شێوە کردبوو[٣١٥].

لەمەڕ بارودۆخی قوتابییان و ئاستی خوێندن لە سایەی دەسەڵاتی حکوومەتی عێراقدا لە ساڵانی ١٩٨٠-١٩٩٠ و ئەو هەلومەرجەی قوتابییان لە کوردستاندا پێی تێپەڕبوون، بڵاوکراوەی (دەنگی لاوان و قوتابییان)[٣١٦]. لە وتارێکیاندا بەم جۆرە باسی هەلومەرجەکە دەکەن: (گومانی تێدا نییە زرووفی شەڕ و نائارامی کاری سلبیی ڕاستەوخۆ دەکەن لە وەزعی گشتیی قوتابییان و شێوەی بیرکردنەوە و ئاستی زانیاری و سیاسییان لەسەر ئەم بناغەیەش شەڕی ناڕەوای عیراق دژی ئێران بەشێوەیەکی ئاشکرا کاری خراپی لەسەر ئاستی قوتابیانی کوردستان و عیراق کردووە.

بەهۆی شێواندن و نزمبوونی ئاستی خوێندن و پێشێلکردنی یاسا بنەڕەتی و گرنگەکانی پەروەردە و فێرکردن و دروستکردنی گیروگرفتی جۆراوجۆر و خولقاندنی کۆسپ و تەگەرەکان. ئەمە جگە لە ڕۆڵی گومان لێکراوی خراپکارانەی بەناو (یەکێتیی نیشتمانیی قوتابییان و لاوانی عیراق). هەروەها بەدرێژاییی ئەوەندە ساڵە بەهەزاران

---

(٣١٥) جريدة (صوت الشبيبة والطلبة) العدد(٥) لسان حال اللجنة العليا للتنسيق في المنظمات الطلابية والشبابية الديمقراطية فو كردستان العراق، ص٣.

(٣١٦) دەنگی لاوان و قوتابیان، ژ (٩) تشرینی دووەم ١٩٩٠ل٢.

قوتابخانە تێك دران و بەدەیان هەزار قوتابی لە خوێندن بێ بەش بوون و سەدانیش شەهید و بێ سەروشوێن کراون بێ لە هەزارانیش دەربەدەر کراون. بەتایبەتی لە کوردستان ڕاستەوخۆش ئەو هۆیانە بەسلبی ڕەنگ دەدەنەوە، لەسەر نەوەکانی ئێستاو داهاتوو لە بری خوێندەواری، نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر سەر هەڵدەدەن لە نێو کۆمەڵدا لە حاڵەتێکدا کە جیهان هەمووی دەستباری یەکتر دەدەن بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری و دابینکردنی فێربوون بۆ قۆناغەکانی تەمەن جگە لە (٨) ساڵەی شەڕی ئێران و عیراق. ئەوا مەترسیی هەڵگرسانی شەڕی کەنداویشی هاتە سەر کە ئاکامێکی یەکجار ترسناکی دەبێ لەسەر خوێندن و خوێندکاران ئەمەش هەموو لەسایەی سیاسەتی دیکتاتۆرانەی ڕژێم و لەخۆباییبوونی سەرکردەکەیەتی هەر ئەم هۆیانەش دەبنە هاندەر بۆ پەرەپێدان بە هەموو شێوەکانی خەبات لەلایەن خوێندکاران و ڕێکخراوەکانیانەوە بۆ سووربوون لەسەر مافە ڕەواکان و مسۆگەرکردنی خوێندن بەئاشتی و ئاسوودەیی بۆ هەموو خوێندکاران بەبێ جیاوازی).

لە خوێندنی ساڵی ١٩٨٢- ١٩٨٣ دەرچووانی ئامادەیی ژمارەیان گەیشتۆتە (١٢٠) هەزار قوتابی کوڕ و کچ لە سەرتاسەری عێراق، کەچی تەنیا (١٧) هەزار قوتابی لە زانکۆکان وەرگیراون.

ئەو قوتابییانەی پلەیان لە خوار (٧٠) بێت لە هیچ شوێنێك وەرنەگیراون، کەمترین پلەش کە لە پەیمانگاکان وەرگیرابێ(٧٦) بووە[٣١٧]. ئەمەش بۆ ئەوە بوو زۆرترین ژمارەی قوتابییان و لاوان ڕاپێچی بەرەکانی جەنگی خوێناوی بکەن.

جەنگ و سیاسەتی تۆقاندن و ڕاگواستنی گوندەکانی کوردستان و فشاری دامو دەزگاکانی حکوومەتی ناوەندی کاریگەرییەکی سلبی لەسەر خوێندن جێ هێشتبوو، قوتابییانیش وەنەبێ بێبەش بووبن لەکارە نالەبارەکانی جەنگی قادسیە و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاری لە خوێندن کرد و مەڵبەندەکانی خوێندنی تووشی هەرەسهێنان کردووە. جا چ لە ئەنجامی بەکارهێنانی زەبروزەنگ بێ کە بۆ بەزۆر چەك پێ هەڵگرتنی قوتابییان و ڕاکێشانیان بۆ بەرەکانی جەنگ. یا بەهۆی باری گشتیی وڵات و پەشێویی کۆمەڵایەتییەوەی، یاخود بەهۆی ڕاکێشانی زۆربەی مامۆستایان بۆ ڕیزی سوپا لە سەرتاسەری عێراق هیچ مەڵبەندێکی خوێندن بەدی ناکرێ چەند مامۆستایەکی کەم

---

(٣١٧) خەباتی قوتابییان، گۆڤاری ناوەندیی یەکێتیی قوتابییانی کورد، دەرچووانی ئامادەیی بەرەو کوێ؟ بەرزان شێر ژ (٤)، ل٨، ١٩٨٤.

نەبێ و زۆربەی هەرە زۆری خوێندگاکان مامۆستاکانی بەشێوەیەکی ئەوتۆ کەمە کە قوتابییان ناتوانن هیچ جۆرە سوودێکیان لێ وەربگرن. وێڕای ئەوەی کە زۆر قوتابخانە دەرگاکانیان داخستووە، ئەم دیاردەیەش نزیکەی (٥٠٪)ی دێهاتەکانی کوردستانی گرتووەتەوە و دیاردەی بێ مامۆستایی شارەکانیشی گرتووەتەوە(٢١٨).

ئەم چەند دێڕەی سەرەوە سالی ١٩٨٤ی خوێندنی مەبەستە. لەو کاتەی کە شۆڕشی گەلی کوردستان لە پەرەسەندن و فراوانبووندا بوو. لە هەمان کاتیشدا کوردستان لە ژێر فشاری ڕاگواستن و گوند سووتاندن و تەقاندنەوەی قوتابخانەکان و بێ بەش کردنی قوتابییەکان لە خوێندن دەینالاند.

لە مەڕ ئەو سالانەی کە قوتابییان بەڕاپەڕین و مانگرتن دەسەلاتدارانیان تەنگەتاو کرد و ژمارەیەك قوتابی لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەزگا سەرکوتکەرەکاندا گیانیان بەخشی و فشاری سەر زانکۆی سەلاحەدین کە تازە لە سلێمانی گوێزرابۆوە بۆ هەولێر لە پەرەستاندن بوو، بەلام زانکۆ بوویووە سەرچاوەی هۆشیاریی نیشتیمانی و ڕووبەڕووبوونەوە. لە ڕیپۆرتاژێکدا گۆڤاری (خەباتی قوتابییان)(٣١٩) بەم جۆرە باسی بارودۆخ و هەلومەرجی زانکۆی سەلاحەدین و دابەشکردنی کۆلێژەکان لەناو شاردا دەکا کە لەبەشێکی بەم جۆرە هاتووە: (ڕژێمە فاشیستەکەی بەعسی کە بڕیاری ڕاگواستنەوەی زانکۆی دا، تەنیا یەك شتی حیساب کرد، ئەویش لایەنی سیاسی بەو مەبەستەی زانکۆی سلێمانی کە بوویووە مەلبەندی بلاوبوونەوەی بیرە شۆڕشگێڕییەکان، لەناو ببرێ و وێڕای ئەوەی کە شاری سلێمانییش بێ بەش بکا لەو دەسکەوتە مەزنە ئابووری و ڕۆشنبیرییە. شێوەی دابەشکردنی کۆلیجەکان لە هەولێر نەك هەر جێگەی سەرسوڕمانە، بەلکو زۆر بەئاشکرا ئەو مەبەستە گلاوەی ڕژێم دەردەکا، هەروەك بەم شێوەی خوارەوە دابەش کراون.

١- کۆلیجی بەڕێوەبردن- گەڕەکی سەیداوە.

٢- کۆلیجی پەروەردە - گەڕەکی مەنتکاوە.

٣- کۆلیجی زانیاری - گەڕەکی مهاباد.

(٣١٨) خەباتی قوتابییان، گۆڤاری ناوەندیی یەکێتیی قوتابییانی کورد، ژ (٥) شوبات و ئازاری ١٩٨٤ خوێندنە و قادسیەی دۆڕاو، ل١١.

(٣١٩) خەباتی قوتابییان، ژ (٤) کانوونی دووەم ١٩٨٤، زانکۆی سەلاحەدین لە نێوان چەوساندنەوەو ڕاپەڕیندا، توانا، ل٥.

٤- کۆلێجی کشتوکاڵ - ناحیەی ئەسکی کەلەك.

٥- کۆلیجی پزیشکی - گەڕەکی تەیراوە.

٦- کۆلیجی ئەندازیاری - گەڕەکی مهاباد (ڕێگای کەرکووك)

٧- کۆلیجی ئاداب - ڕێگای کۆیە.

ئەمەش بەمەبەستی دوور خستنەوەی قوتابییەکان بوو لەیەکتر بەو ئامانجەی نەتوانن بیرورِا بگۆڕنەوە و بە کردەوەی شۆڕشگێڕانە ئەنجام بدەن. هەروەها کۆمەڵێك کاری ناشەرعییان کردووە کە لەم خاڵانەی خوارەوە خۆیان دەنوێنن.

١ - ڕەفتارەکانی ڕژێم سەبارت بەقوتابییان لەناو زانکۆ. هەروەها دەزگا سەرکوتکەرەکان بۆ بڵاوە پێکردنی قوتابییان ئەم کارە نالەبارانەی خوارەوەیان کردوون.

ا- دووبارە دابەشکردنەوەی قوتابییان بەسەر پۆلەکان بەمەرجێك هەر پۆلێك دەستەیەك لە قوتابییە سەر بەرێکخراوەکانی بەعسی تێدا بێ.

ب- دانانی ٢-٣ لە پیاوە سیخوڕەکانی دائیرەی ئاسایش لە پۆلەکان لە بەرگی قوتابی بەمەبەستی چاودێریکردنی ڕاستەوخۆی قوتابییان.

جـ- دانانی پرسگەیەکی مەرکەزی لە زانکۆ بۆ تۆمارکردنی ناوی ئەو کەسانەی کە دێنە زانکۆ بۆ دیدەنیی قوتابییان.

هـ- نەهێشتنی سەردانی قوتابییان لە کۆلیجێکەوە بۆ کۆلیجێکی تری هەمان زانکۆ.

٢- ڕەفتاری فاشستەکان سەبارەت بەمامۆستاکانی زانکۆ بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی زانکۆ.

أ- دامەزراندنی چەند ئەفسەرێکی ئاسایش لە زانکۆکان بەناوی مامۆستا لە هەر کۆلیجێك و بوونیان بەئەندام لە ئەنجومەنی مامۆستایانی کۆلیج، ئەمەش بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر ئەنجومەنەکان و چاودێریکردنی مامۆستاکان.

ب- ڕاگواستنەوەی ئەو مامۆستایانەی کە سەر بەبەعس نین بۆ بەغدا و بەسرە و مووسڵ.

ج- دەرکردنی کۆمەڵێك لە مامۆستا نیشتمانپەروەرەکان و ڕاگواستنەوەیان بۆ بەڕێوەبەرایەتییە خزمەتگوزارییەکان کە بەهیچ شێوەیەك پێوەندیی بەپسپۆڕیی ئەوانەوە نییە.

هـ- گۆڕینی ئەمینی کۆلیجەکان بەو ئەمینانەی کە بەتەواوی ملکەچی فەرمانەکانی ڕژێمن.

و- دانانی لێپرسراوێکی ئاسایش لە هەر کۆلیجێك کە خۆی لێپرسراوی ڕاستەقینەیە بەرامبەر هەموو کاروبارێکی کۆلیج.

٣- ڕەفتارەکانی ڕژێم لە بەشە ناوخۆکان.

أ- دابەشکردنی قوتابییان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن دەزگای سیخوڕیی زانکۆوە، کە بەلیستەیەکی تایبەتی قوتابییەکانیان دەستنیشان دەکرد لەگەڵ دیاریکردنی ژوور و ژمارەی بەشی ناوخۆکە، بەمەرجێ هەر ژوورێك تەرخان کراوە بەیەکێ یا دووان لەو قوتابییانەی سەر بەدەزگاکانی عەفلەقییەکانن.

ب- دانانی پرسگەیەك لەبەر دەرگای بەشی ناوخۆ بۆ تۆمار کردنی ناوی ئەو کەسانەی سەر لە قوتابییەکان دەدەن.

جـ- قەدەغەکردنی مانەوەی قوتابییان لە سەعات ٩ی سەرلەبەیانی تا ٢ی پاش نیوەڕۆ لە بەشە ناوخۆکان بەمەبەستی بوارنەدان بەنواندنی هیچ جۆرە چالاکییەك.

د- دامەزراندنی چەند کەسانێکی سیخوڕ لە بەشە ناوخۆکان بەناوی لێپرسراو و پاککەرەوە بەئامانجی چاودێریکردنی بەردەوامی قوتابییان.

هـ- دانانی ئێشکگریی تایبەتی لە ریزی ڕێکخراوی بەعسە فاشیستەکان لەهەر بەشێکی ناوخۆیی بۆ گوێگرتن لە قوتابییان و جاسووسی کردن لەسەریان.

ئەمە کورتەیەکی واقیعی خوێندن لە کوردستان بوو. زانکۆ وای لێ هاتبوو لە چەشنی سەربازگە بەچەکداری و زرێپۆش و ئەمن ئابڵوقە درابوو، کە هەر لە بەرەکانی جەنگی دەکرد. لەزۆر قوتابخانەکانیشدا فشار و زۆری ڕژێم بەردەوام بووە. تا ئەوەی منداڵی هەرزەکاری خوار تەمەنی ١٨ساڵی لەناو پۆل و لەخوێندن بگرن و بێ سەروشوێنیان بکەن.

لەو سەرژمێرییەدا بەڕێوەبەرایەتیی سەرژمێریی سلێمانی ئامادەی کردووە لە دوای سەرژمێریی ١٩٧٧ەوە تاکو ساڵی ١٩٩١ لە پارێزگای سلێمانی و کەرکووك ... دەردەکەوێ کە مەڵبەندی (٥) قەزا و (٢٦) ناحیە و (٢٢٤٥) گوند وێران کراون. هەروەها (٥٧) گەڕەك لە ناحیە و قەزاکان و (١٨١١) مقاطعە لەگەڵ زەوی تەخت کراون. لەم

ماوەیەدا (١٠١٠٧٧) خانوو (١٣٥٤٨) بینای فەرمانگە و بینای خزمەتگوزاری و دوکان شوێنی پیشەسازی وێران کراون. بەم شێوە (١٤٠٣٠٥) خێزان کە ژمارەیان دەکاتە (٨٤١٨٢٩) کەس ئاوارە و ئەنفال و دەربەدەر کراون.

بێگومان ئەم کاولکارییە قوتابخانە و تەندروستیشی نەبواردووە، (٦٨٢) قوتابخانە و (١٦٥) دامەزراوەی تەندروستیش وێران کراون[٣٢٠].

لە ساڵی ١٩٨٨ دوای وەستانی شەڕ و لەدوای قۆناغی شەڕی جینۆساید دژی کورد، مەسەلەی تەختکردن و وێرانکردنی کوردستان گەیشتە چلەپۆپە. ئەنفال بەهەزارەها گوندیشی وێران کرد و (١٨٢) هەزار مرۆڤی منداڵ و پیر و پەککەوتە و ئافرەت و پیاوی لەگەرووی بیابان کرد و تا ئەمڕۆش بێ سەر و شوێنن کە بە چەند قۆناغێکدا تێ پەڕی وەکو (کەنعان مەکیە)ی نووسەری عەرەب دەڵێ پەلامارەکانی ١٩٨٨ لە ئەنفال بوونە هۆی وێرانکردنی (١٢٧٦) گوند. بەپێی سەرچاوەکان لە ساڵی ١٩٨٦ەوە نزیکەی (٣٥٠٠) گوند وێران کران کە نزیکەی (٨٠٪)ی گوندەکانی کوردستانی عیراق پێك دەهێنێت[٣٢١].

هەرچی بڵێین، ئازارەکەی ناگاتە ئەوەی کە منداڵی بێ تاوانی کورد نەك هەر قوتابخانەی لێ تەخت دەکرێ و تەختە ڕەشە و کتابی وەژێر گڵ و دارو ڕەردوو دەکەون، بەڵکە خودی ئەم منداڵەش دەکرێتە خۆراکی بیابان. لە بیابانیش لەبەر تیشکی گەرمای ڕۆژ وشك دەکرێنەوە و دواتریش ئەگەر سەگێك لاشەکەیان بەخوات... ئەگەر نا کەس نازانێ چییان بەسەردێ و چییان لێ هاتووە...!

لە ساڵی ١٩٨٤ – ١٩٨٥ لە شاری دهۆك بڕیاربوو لە سەرەتای ساڵی خوێندندا خوێندنی پۆلی یەکەمی سەرەتایی بەکوردی بێ، بەڵام هەر پێش دەستپێکردنی خوێندن، هەندێك لێپرسراو و فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی ئەم شارە کەسوکاری قوتابییەکانیان ئاگادار کردبووەوە گەر پرسیاریان لێ کردن کە خوێندن بە چ زمانێك بێ، بەعەرەبی بێ و هەر ئەوەشیان جێبەجێ کرد [٣٢٢].

---

(٣٢٠) گۆڤاری ئەنفال. ژمارە (١) ساڵی ٢٠٠٠، ل٥٥. گۆڤارێکی لێکۆڵینەوە و دۆکیومێنتە لە سلێمانی وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات.

(٣٢١) کنعان مکیە، «القسوة والصمت»، کتێبی تایبەتە لەسەر وەزعی کورد، ئەنفال و ئەو کارەساتانەی بەسەر کوردان هاتوون.

(٣٢٢) گۆڤاری کومەڵە، ژمارە (١) خولی سێیەم کانوونی دووەمی ١٩٨٥، ل٦٧.

لە گومان بەدەرە کە زمانی کوردی و خوێندن بەکوردی لە دوای حەفتاکان و لە ئاکامی پەرەسەندن و بەمیللی بوونی شۆڕشی کوردستان بووە ئامانجی سەرەکی، لە هەشتاکان بەربەرەکانێیەکی توند لە نێوان قوتابییانی ولاتپارێزی کوردستان و حکوومەتی ناوەندی بەرپا بوو، لەو کاتەی ویستیان خوێندن بکرێتە عەرەبی! یەك پارچە قوتابییان هاتنە شەقام... بەدروستی و بەکردەوە جەنگی زمان «ئامانجی زمان» خەبات بۆ زمان لەم ڕۆژانە بەدیارکەوت کە مەسەلەی خوێندن و خوێندنی کوردی بووە دروشمێکی سیاسی- نەتەوەیی بەرز.

کەس ئامادە نەبوو دەستبەرداری ئەم دەسکەوتانە بێ کە بەدرێژایی مێژوو وەدەست هاتوون و لە حەفتادا بووە خەونی واقیعیی کوردان و لە هەشتاکاندا زمان و خوێندنی کوردی بووە شۆڕش..

لە درێژەی باسەکەماندا لە سالّی ١٩٧٥-١٩٩١ ژمارەیەکی زۆری قوتابخانە و گوند تەخت کران. لە سلێمانی و کۆیە و پشتدەریش بەپێیێ سەرژمێرییەکانی (سەرژمێریی سلێمانی) لەم ماوەیەدا ئەم ڕێژە زۆرەی قوتابخانە تەخت کراون و داخراون . بێگومان ژمارەیەکی سەرسوڕهێنەر و بڕواپێکەریشە. ناوچەکانی کوردستان تێکڕا بەشۆڕش تاوانبار کراون. قوتابخانە تەخت کراون و منداڵی ساوای کوردیش لە خوێندن بێ بەش بوون، یا لە بارێکی دەروونیی دژواری ژێرفشاری حکوومەت، یا ئاوارەیی خوێندوویانە یان بەهەزارانیان بەر شالاوی بەدناوی ئەنفال کەوتوون. بەپێی ئەو ژمارەی لە سەرژمێرییەکەدا کە لە خشتەی ژمارە (٥٩)دا دەردەکەوێ لە سلێمانی، دەرەوەی شار (١٠٤) قوتابخانە و لە قەزاکانی هەڵەبجە (١١٢) و پێنجوین (٤٠) و شاربازێر (٩٢) و پشدەر (٥٥) و ڕانیە (٣٧) و دووکان (٤٦) و دەربەندیخان (١٦) و چەمچەماڵ (٨٠) و کەلار (١٦) و کفری (٢٧) و کۆیسنجق (٥٧) قوتابخانە تێکدران و داخراون کە تێکڕا دەکاتە (٦٨٢) قوتابخانە.

**خشتەی ژمارە (٥٩)** (٣٢٣).

**سەرژمێریی دانیشتووان و قوتابخانە و بینا تێکدراوەکانی قوتابخانەکانی پارێزگاکانی سلێمانی و کەرکووك و ئەو قەزا و ناحیانەی سەربەم پارێزگایایەن تا ساڵی ١٩٩١ لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە تێك دراون**

| ناوی یەکەی ئیداری | | ژمارەی دانیشتیووان | ژمارەی قوتابخانە | جۆری بینای قوتابخانەکان | | | | ژمارەی ئەو بینایانەی کە قوتابخانە بوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بلۆك | قوڕ | صریفه | هیتر | |
| ناوەندی قەزای سلێمانی | شار | -- | -- | -- | -- | -- | -- | -- |
| | گوند | -- | -- | -- | -- | -- | -- | -- |
| | تێکڕا | -- | -- | -- | -- | -- | -- | -- |
| تانجەرۆ | شار | -- | -- | -- | -- | -- | -- | -- |
| | گوند | ٢١١٩٤ | ٢٢ | ١٧ | ٥ | -- | -- | ٢٢ |
| | تێکڕا | ٢١١٩٤ | ٢٢ | ١٧ | ٥ | -- | -- | ٢٢ |
| قەرەداغ | شار | ٢٠٦٧ | ٣ | ٢ | -- | -- | -- | ٢ |
| | گوند | ٢٠٣٣٢ | ٣١ | ١٨ | ١٢ | -- | -- | ٣٠ |
| | تێکڕا | ٢٢٣٩٩ | ٣٢ | ٢٠ | ١٢ | -- | -- | ٣٢ |

(٣٢٣) گۆڤاری ئەنفال ژمارە (١) ساڵی ٢٠٠٠ لێکۆڵینەوە و دۆکیومێنتییە وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات – لە سلێمانی . ل٤٩–٥٦لەم سەرژمێرییەدا پشت بەسەرژمێری ١٩٧٧–١٩٨٧ی عێراق بەستراوە. لەم ماوەیەشدا (١٦٥) دامەزراوی تەندروستی تێکدراون (٢٩) پرۆژەی شار و (١٣٥)ی گوندەکان تێك دراوە.

| ناوی یەکەی ئیداری | | ژمارەی دانیشتووان | ژمارەی قوتابخانە | جۆری بینایەی قوتابخانەکان | | | | ژمارەی ئەو بینایانەی کە قوتابخانە بوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بلۆك | قوڕ | صریفە | هیتر | |
| بازیان | شار | | | | | | | |
| | گوند | ١٨٢٩٧ | ٢٠ | ١٩ | | | | ٢٠ |
| | تێکڕا | ١٨٢٩٧ | ٢٠ | ١٩ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٠ |
| سەرچنار | شار | | | | | | | |
| | گوند | ٢٥٧٨١ | ٢٨ | ٢٠ | ٦ | | | ٢٦ |
| | تێکڕا | ٢٥٧٨١ | ٢٨ | ٢٠ | ٦ | ٠ | ٠ | ٢٦ |
| تێکڕای قەزای سلێمانی | شار | ٢٠٦٧ | ٣ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ٨٥٦٠٤ | ١٠١ | ٧٤ | ٢٣ | | | ٩٨ |
| | تێکڕا | ٨٧٦٧١ | ١٠٤ | ٧٦ | ٢٣ | ٠ | ٠ | ١٠٠ |
| ناوەندی قەزای هەڵەبجە | شار | ٣٣٩٩٧ | ١٧ | ١٤ | | | | ١٤ |
| | گوند | | | | | | | |
| | تێکڕا | ٣٣٩٩٧ | ١٧ | ١٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٤ |
| سیروان | شار | ١٢٧٩ | ١٠ | ٢ | | | | ١٠ |
| | گوند | ٢٧٩٨٤ | ١٩ | ١٧ | ٢ | | | ١٩ |
| | تێکڕا | ٢٩٢٦٣ | ٢٩ | ١٩ | ٢ | ٠ | ٠ | ٢٩ |
| خورمال | شار | ٣٣٩٢ | ٤ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ١٦٥٨٥ | ١٥ | ١٤ | ١ | | | ١٥ |
| | تێکڕا | ١٩٩٧٧ | ١٩ | ١٦ | ١ | ٠ | ٠ | ١٧ |
| بیارە | شار | ٩٤١٥ | ٨ | ٦ | | | | ٦ |
| | گوند | ١٢٣٨٢ | ١٨ | ١٥ | | | | ١٥ |
| | تێکڕا | ٢١٧٩٧ | ٢٦ | ٢١ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢١ |
| شارەزوور | شار | ١١٩٧٧ | ٩ | ٩ | | | | ٩ |
| | گوند | ٢٢٤٦١ | ١٢ | ١٢ | | | | ١٢ |
| | تێکڕا | ٣٤٤٣٨ | ٢١ | ٢١ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢١ |
| تێکڕای قەزای هەڵەبجە | شار | ٦٠٠٦٠ | ٤٨ | ٣٣ | | | | ٤١ |
| | گوند | ٧٩٤١٢ | ٦٤ | ٥٨ | ٣ | | | ٦١ |
| | تێکڕا | ١٣٩٤٧٢ | ١١٢ | ٩١ | ٣ | ٠ | ٠ | ١٠٢ |

| ناوی یەکەی ئیداری | | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی قوتابخانە | جۆری بینایەی قوتابخانەکان | | | | ژمارەی ئەو بینایانەی کە قوتابخانە بوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بلۆك | قوڕ | صریفە | هیتر | |
| ناوەندی قەزای پێنجوین | شار | ١٢٩٧٦ | ٥ | ٤ | | | | ٤ |
| | گوند | ٢٠٩٣٣ | ١٨ | ١٨ | | | | ١٨ |
| | تێکڕا | ٣٣٩٠٩ | ٢٣ | ٢٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٢ |
| کرمك | شار | ٥٨١ | ١ | ١ | | | | ١ |
| | گوند | ٢٠٣٧٢ | ١٦ | ١٤ | ٢ | | | ١٦ |
| | تێکڕا | ٢٠٩٥٣ | ١٧ | ١٥ | ٢ | ٠ | ٠ | ١٧ |
| تێکڕای قەزای پێنجوین | شار | ١٣٥٥٧ | ٦ | ٥ | | | | ٥ |
| | گوند | ٤١٣٠٥ | ٣٤ | ٣٢ | ٢ | | | ٣٤ |
| | تێکڕا | ٥٤٨٦٢ | ٤٠ | ٣٧ | ٢ | ٠ | ٠ | ٣٩ |
| ناوەندی قەزای شارباژێر | شار | ٣٣٦٢ | ٤ | ٤ | | | | ٤ |
| | گوند | ٢٣٢٥٧ | ٢٥ | ٢١ | ٤ | | | ٢٥ |
| | تێکڕا | ٢٦٦١٩ | ٢٩ | ٢٥ | ٤ | ٠ | ٠ | ٢٩ |
| سیوەیل | شار | ١٨٦٦ | ١ | ١ | | | | ١ |
| | گوند | ١٦٣٢٠ | ١٨ | ١٧ | ١ | | | ١٨ |
| | تێکڕا | ١٨١٨٦ | ١٩ | ١٨ | ١ | ٠ | ٠ | ١٩ |
| ماوەت | شار | ٤١٨٧ | ٣ | ٣ | | | | ٣ |
| | گوند | ٢٤٩١٧ | ٢٣ | ٢٢ | | | | ٢٢ |
| | تێکڕا | ٢٩١٠٤ | ٢٦ | ٢٥ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٥ |
| سروچك | شار | ٢٢٣٠ | ٣ | ١ | | | | ١ |
| | گوند | ١٦١٧٤ | ١٥ | ١٥ | | | | ١٥ |
| | تێکڕا | ١٨٩٤٤ | ١٨ | ١٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٦ |
| تێکڕای قەزای شارباژێر | شار | ١١٦٤٥ | ١١ | ٩ | | | | ٩ |
| | گوند | ٨١٢٠٨ | ٨١ | ٧٥ | ٥ | | | ٨٠ |
| | تێکڕا | ٩٢٨٥٣ | ٩٢ | ٨٤ | ٥ | ٠ | ٠ | ٨٩ |
| ناوەندی قەزای پشدەر | شار | ٢٠٧٦٠ | ١٠ | ٥ | ١ | | | ٦ |
| | گوند | ١٧٨٦٣ | ١٤ | ١٤ | | | | ١٤ |
| | تێکڕا | ٣٨٦٢٣ | ٢٤ | ١٩ | ١ | ٠ | ٠ | ٢٠ |

| ناوی یەکەی ئیداری | | ژمارەی دانیشتووان | ژمارەی قوتابخانە | جۆری بینایەی قوتابخانەکان | | | | ژمارەی ئەو بینایانەی کە قوتابخانە بوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بلۆك | قوڕ | صریفه | هیتر | |
| هێرۆ | شار | ٢٧٥٣ | ١ | ١ | | | | ١ |
| | گوند | ٩٧٧٣ | ٧ | ٢ | ٥ | | | ٧ |
| | تێکڕا | ١٢٥٢٦ | ٨ | ٣ | ٥ | ٠ | ٠ | ٨ |
| ناودەشت | شار | ٤٩٢٦ | ٤ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ١٩٥٧٤ | ١٩ | ١٦ | ٣ | | | ١٩ |
| | تێکڕا | ٢٤٥٠٠ | ٢٣ | ١٨ | ٣ | ٠ | ٠ | ٢١ |
| تێکڕای قەزای پشدەر | شار | ٢٨٤٣٩ | ١٥ | ٨ | ١ | | | ٩ |
| | گوند | ٤٧٢١٠ | ٤٠ | ٣٢ | ٨ | | | ٤٠ |
| | تێکڕا | ٧٥٦٤٩ | ٥٥ | ٤٠ | ٩ | ٠ | ٠ | ٤٩ |
| ناوەندی قەزای رانیە | شار | | | | | | | |
| | گوند | | | | | | | |
| | تێکڕا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| مەرگە | شار | ٢١٢٢ | ٢ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ٢٥٢٠٢ | ١١ | ٩ | ٢ | | | ١١ |
| | تێکڕا | ٢٧٣٢٤ | ١٣ | ١١ | ٢ | ٠ | ٠ | ١٣ |
| رانیە | شار | | | | | | | |
| | گوند | ١٥٢٧٣ | ١٣ | ١٠ | ٢ | | | ١٢ |
| | تێکڕا | ١٥٢٧٣ | ١٣ | ١٠ | ٢ | ٠ | ٠ | ١٢ |
| بێتواتە | شار | | | | | | | |
| | گوند | ١٢٤٠٣ | ١١ | ١١ | | | | ١١ |
| | تێکڕا | ١٢٤٠٣ | ١١ | ١١ | ٠ | ٠ | ٠ | ١١ |
| تێکرای قەزای رانیە | شار | ٢١٢٢ | ٢ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ٥٢٨٧٨ | ٣٥ | ٣٠ | ٢ | | | ٢٤ |
| | تێکڕا | ٥٥٠٠٠ | ٣٧ | ٣٢ | ٢ | ٠ | ٠ | ٢٦ |
| ناوەندی قەزای دووکان | شار | ٥٩٧٧ | ٦ | ٥ | | | | ٥ |
| | گوند | | ٢ | ٢ | | | | ٢ |
| | تێکڕا | ٥٩٧٧ | ٨ | ٧ | ٠ | ٠ | ٠ | ٧ |

| ناوی یەکەی ئیداری | | ژمارەی دانیشتووان | ژمارەی قوتابخانە | جۆری بینایەی قوتابخانەکان | | | | ژمارەی ئەو بینایانەی کە قوتابخانە بوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بلۆك | قوڕ | صریفە | هاتر | |
| سوورداش | شار | ٦١١ | ١ | ١ | | | | ١ |
| | گوند | ٣٨٧٠٢ | ٢٦ | ٢٠ | ٦ | | | ٢٦ |
| | تێکڕا | ٢٩٣١٣ | ٢٧ | ٢١ | ٦ | ٠ | ٠ | ٢٧ |
| چناران | شار | ٢١٩٨ | ٣ | ٣ | | | | ٣ |
| | گوند | ١٠٥١٩ | ٨ | ٥ | ٣ | | | ٨ |
| | تێکڕا | ١٢٧١٢ | ١١ | ٨ | ٣ | ٠ | ٠ | ١١ |
| تێکڕای قەزای دوکان | شار | ٨٧٨٦ | ١٠ | ٩ | | | | ٩ |
| | گوند | ٣٩٢٢١ | ٣٦ | ٢٧ | ٩ | | | ٣٦ |
| | تێکڕا | ٤٨٠٠٧ | ٤٦ | ٣٦ | ٩ | ٠ | ٠ | ٤٥ |
| دەربەندیخان | شار | | | | | | | |
| | گوند | ٢١٧٨٣ | ١٦ | ١٠ | ٦ | | | ١٦ |
| | تێکڕا | ٢١٧٨٣ | ١٦ | ١٠ | ٦ | ٠ | ٠ | ١٦ |
| تێکڕای قەزای دەربەندیخان | شار | | | | | | | |
| | گوند | ٢١٧٨٣ | ١٦ | ١٠ | ٦ | | | ١٦ |
| | تێکڕا | ٢١٧٨٣ | ١٦ | ١٠ | ٦ | ٠ | ٠ | ١٦ |
| ناوەندی قەزای چەمچەماڵ | شار | | | | | | | |
| | گوند | ١٨٠٢٥ | ١٦ | ١٤ | ٢ | | | ١٦ |
| | تێکڕا | ١٨٠٢٥ | ١٦ | ١٤ | ٢ | ٠ | ٠ | ١٦ |
| ئاغجەلەر | شار | ١٨٨٠ | ٢ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ٢١١٩٧ | ١٠ | ٧ | ٣ | | | ١٠ |
| | تێکڕا | ٢٣٠٧٧ | ١٢ | ٩ | ٣ | ٠ | ٠ | ١٢ |
| سەنگاو | شار | ٣٤٧١ | ٣ | ٣ | | | | ٣ |
| | گوند | ١٥١٢١ | ١١ | ٨ | ٣ | | | ١١ |
| | تێکڕا | ١٨٥٩٢ | ١٤ | ١١ | ٣ | ٠ | ٠ | ١٤ |
| شوان | شار | ١٠٤٢ | ٢ | ٢ | | ١ | | ٢ |
| | گوند | ٢٤٥٨٩ | ١٨ | ٨ | ٩ | | | ١٨ |
| | تێکڕا | ٢٥٦١٣ | ٢٠ | ١٠ | ٩ | ١ | ٠ | ٢٠ |

| ناوی یەکەی ئیداری | | ژمارەی دانیشتووان | ژمارەی قوتا بخانە | جۆری بینایەی قوتابخانەکان بلۆك | قوڕ | صریفه | هیتر | ژمارەی ئەو بینایانەی کە قوتابخانە بوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| قادر کەرەم | شار | ١٨٩٣ | ٣ | ٣ | | | | ٣ |
| | گوند | ١٩٧٨٩ | ١٥ | ١٥ | | | | ١٥ |
| | تێکرا | ٢١٦٨٢ | ١٨ | ١٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٨ |
| ناوەندی قەزای چەمچەمال | شار | ٨٢٦٨ | ١٠ | ١٠ | | | | ١٠ |
| | گوند | ٩٨٧٢١ | ٧٠ | ٥٢ | ١٧ | ١ | | ٧٠ |
| | تێکرا | ١٠٦٩٨٩ | ٨٠ | ٦٢ | ١٧ | ١ | ٠ | ٨٠ |
| ناوەندی قەزای کەلار | شار | | | | | | | |
| | گوند | ٢٣٥٨٩ | ٧ | ٢ | ٥ | | | ٧ |
| | تێکرا | ٢٣٥٨٩ | ٧ | ٢ | ٥ | ٠ | ٠ | ٧ |
| پێباز | شار | | | | | | | |
| | گوند | ١٥٧٢٢ | ٥ | ٤ | ١ | | | ٥ |
| | تێکرا | ١٥٧٢٢ | ٥ | ٤ | ١ | ٠ | ٠ | ٥ |
| تیلاکۆ | شار | | | | | | | |
| | گوند | ١١٣٦٣ | ٤ | ٢ | ٢ | | | ٤ |
| | تێکرا | ١١٣٦٣ | ٤ | ٢ | ٢ | ٠ | ٠ | ٤ |
| تێکرای ناوەندی قەزای کەلار | شار | | | | | | | |
| | گوند | ٥٠٦٧٣ | ١٦ | ٨ | ٨ | | | ١٦ |
| | تێکرا | ٥٠٦٧٣ | ١٦ | ٨ | ٨ | ٠ | ٠ | ١٦ |
| سەرقەلا | شار | ٨١٠ | ٤ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ٧٩٦٤ | ٦ | ٤ | ١ | | | ٥ |
| | تێکرا | ٨٧٧٤ | ١٠ | ٦ | ١ | ٠ | ٠ | ٧ |
| نەوجول | شار | ٨١٦ | ١ | | ١ | | | ١ |
| | گوند | ١٤٩٤٤ | ١٨ | ٧ | ١١ | | | ١٨ |
| | تێکرا | ١٥٧٦٠ | ١٩ | ٧ | ١٢ | ٠ | ٠ | ١٩ |
| تێکرای قەزای کفری | شار | ١٦٢٦ | ٥ | ٢ | ١ | | | ٣ |
| | گوند | ٢٢٩٠٨ | ٢٢ | ١١ | ١٢ | | | ٢٣ |
| | تێکرا | ٢٤٥٣٤ | ٢٧ | ١٣ | ١٣ | ٠ | ٠ | ٢٦ |

| ناوی یەکەی ئیداری | | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی قوتابخانە | جۆری بینایە قوتابخانەکان | | | | ژمارەی ئەو بینایانەی کە قوتابخانە بوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بلۆک | قوڕ | صریفە | هیتر | |
| مەیدان | شار | لە بەرئەوەی ئەو ناحیانە لە پێش ساڵی ١٩٧٧ تێکدراون، بۆیە هیچ زانیارییەکیان لە مەڕ تۆمار نەکراوە | | | | | | |
| | گوند | | | | | | | |
| | تێکڕا | | | | | | | |
| قورەتوو | شار | | | | | | | |
| | گوند | | | | | | | |
| | تێکڕا | | | | | | | |
| تێکڕای قەزای خانەقین | شار | | | | | | | |
| | گوند | | | | | | | |
| | تێکڕا | | | | | | | |
| ناوەندی قەزای کویسنجق | شار | | | | | | | |
| | گوند | ٤٧١٤٢ | ١٧ | ٨ | ٤ | | | ١٢ |
| | تێکڕا | ٤٧١٤٢ | ١٧ | ٨ | ٤ | ٠ | ٠ | ١٢ |
| تەق تەق | شار | ٢٠٧٧ | ٣ | ٢ | | | | ٢ |
| | گوند | ٢١٧١٦ | ١٨ | ٨ | ٦ | | | ١٤ |
| | تێکڕا | ٢٣٧٩٣ | ٢١ | ١٠ | ٦ | ٠ | ٠ | ١٦ |
| شۆڕش | شار | ٥١٣ | ٢ | ١ | | | | ١ |
| | گوند | ١٢٨٨٨ | ١٧ | ١١ | ٣ | | | ٠ |
| | تێکڕا | ١٣٤٠١ | ١٩ | ١٢ | ٣ | ٠ | ٠ | ١ |
| تێکرای قەزای کویسنجق | شار | ٢٥٩٠ | ٥ | ٣ | | | | ٣ |
| | گوند | ٨١٧٤٧ | ٥٢ | ٢٧ | ١٣ | | | ٢٦ |
| | تێکڕا | ٨٤٣٣٦ | ٥٧ | ٣٠ | ١٣ | ٠ | ٠ | ٢٩ |
| تێکرای ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەلاتی حکوومەتی هەرێمن | شار | ١٣٩١٦٠ | ١١٥ | ٨٣ | ٢ | | | ٩٣ |
| | گوند | ٧٠٢٦٦٩ | ٥٦٧ | ٤٣٦ | ١٠٨ | | | ٥٢٤ |
| | تێکڕا | ٨٤١٨٢٩ | ٦٨٢ | ٥١٩ | ١١٠ | ٠ | ٠ | ٦١٧ |

لەم زانیارییە تۆمارکراوانەدا دەردەکەوێ، کە حکوومەتی عیراق، چەند بەفراوانی دژایەتیی گەلی کوردستان و خوێندن و بڵاوبوونەوە و فێربوونی خوێندەواریی کردووە. زۆر کات لە ناوچە ئازاد کراوەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕشدا، مامۆستایانی شۆڕش قوتابخانەکانیان بەپێی توانا ئامادە کردووە و دەرسیان تێدا گوتوونەتەوە، وەکو باسمان کرد لە ساڵی (١٩٧٤-١٩٧٥) لە ماوەی یەك ساڵدا لەتەك بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی سەر بە شۆڕش، هەزارەها قوتابی و سەدان مامۆستای زانکۆ و قوتابخانەی ئامادەیی و ناوەندی و سەرەتایی دەوامیان دەکرد. دوای هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش پاش نسکۆی ١٩٧٥، کە لە ئاکامی ڕێککەوتنێکی شوومی نێودەوڵەتی دژی شۆڕشی کوردستان کرا، دیسان حزب و لایەنەکانی ناو شۆڕش بەپێی توانا هەوڵیان داوە، بایەخ بەخوێندن و بەردەوام قوتابخانەکان بدەن. بەڵام ئەمجارە بەهۆی بەردەوامی و خێرایی و فراوانی سیاسەتی ڕاگواستن و تەختکردنی گوندەکان و رووخاندن و داخستنی قوتابخانەکان، سانا نەبووە خوێندن لەسایەی شۆڕشدا بەرێکوپێکی بەردەوام بێ، بەتایبەتی ئەمجارە درندەیی و جینۆسایدی حکوومەتی عیراق گەلێك سەخت بوو. هەم شێوازی تێکۆشانی پارتیزانی و شەڕی شار و دێ دەرفەتی کەم و هەلومەرجی سەقامگیر و نەگۆڕی تێدا نییە، تا شۆڕش بتوانێ بەدروستی و هێمنی و بەردەوامی بایەخ بەخوێندن بدا. ئەوەی دەزانرێ تا ناوەڕاستی هەشتاکانیش زۆر قوتابخانەی دێهاتەکان دەوامیان تێدا دەکرا، کە شەو و هەندێکیان بەڕۆژیش لە ژێردەسەڵاتی شۆڕش بوون، ئەمەش وای کردبوو پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ و پتەو لە نێوان مامۆستاکان و شۆڕش و قوتابخانەکاندا بۆ پێگەیاندنی هۆشیاریی نەتەوەیی و بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی سیاسی و خوێندەواری دروست کردبوو. وەلێ وەکو پێشتر بەژمارە و سەرژمێریی ورد ئاماژەمان پێ کرد، سیاسەتی قڕکردن و ئەنفال و کیمیاباران زۆر لەوە سەختتر بوو، شۆڕش بکارێت و دەسەڵاتی ئەوەی بۆ پەیدا بێ، خوێندن و قوتابخانە ڕاستەوخۆ بخاتە ژێر ڕکێف و ئیدارەی خۆی.

کورتبینی نییە، ئەگەر لە ئاکامی ڕاگواستن و کوشتاری گشتی لە کوردستاندا، ئاماژە بەڕۆڵی هەر ژمارەیەك مامۆستای دڵسۆز و شۆڕشی کوردستان بدەین، کە دوای قۆناغی ئەنفال لەلایەن حکوومەتی عیراق کە ژمارەیەك ئیجگار زۆر لە ترسی مەرگ ئاوارەی تورکیا و ئێران بوون. لە وێشدا بیری خوێندنی کوردی و کرانەوەی قوتابخانە نەکەوتە خانەی لە بیر چوونەوە. پاراستنی زمان کە بەهێزترین سەنگەری بەرگری لە مانەوەی

کوردە، لە جەرگەی ڕاونان و ڕەشەکوژی و ئەنفال و کیمیا باراندا لە ئاوارەیی و لەژێر سەختترین و دژوارترین حاڵدا ١٩٨٩ لەنێو خێوەتگاکانی ماردیندا، (قوتابخانەی بارزانی) ڤەکرایە.. (قوتابخانەی بارزانی) (١٥٠٠) قوتابیی لەخۆوە گرتبوو، (٤٥) مامۆستاش لە ژێر خێوەتگاکاندا ئەلفابێی کوردییان فێری منداڵی ئاوارە و رزگاربووی مەرگی ئەنفال و کیمیا باران دەکرد... چونکە بڕوای مامۆستایان وابوو، پێشمەرگایەتی هەر ئەوە نییە، تۆ چەك لە شان بکەی، بەڵکو فێرکردنی وشەیەکی کوردییان لە بۆمبایەك پێ چاکتر و بەهێزتر بوو، بۆ بەزاندنی داگیرکەران... سەرەتا لە نێو خێوەتگای ماردین نزیکەی (١٥) خوێندگای بچووك بچووك، لە شێوەی گرووپ کراونەتەوە، دواتر هەر هەموویان لە ژێر ناوی (قوتابخانەی بارزانی) ڕێك خران. مامۆستایانی شۆڕش (تەیب بامەڕنی) و (سەلیم بناڤی) و (عزیز بناڤی) و (فەریق قومری) و (شەفیق زاخۆیی) و (عەلی خانەقینی) پێشەنگی کردنەوەی قوتابخانە لە خێوەتگای ماردین بوون.

لەم قوتابخانەیەدا دەرس وتنەوە ڕێچکەی رەسمیی وەرگرتبوو. دەوامی بەردەوام و لێپێچانەوە و تاقیکردنەوە و کارت و تۆمارگە و بایەخدان بە بەهای پەروەردەیی کراوە. دەرسی (ئاین و زمانی کوردی و لاتینی و ماتماتیك و ژیانداری و کشتوکاڵی و وێنە و وەرزش) هەبوون. لە پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتاییدا (زمانی کوردی و عەرەبی و زمانی ئینگلیزی و بیرکاری و لاتینی و مێژوو و جوگرافیا و کۆمەڵایەتی و زانیاری و کشتوکاڵ و وێنە و وەرزش) دەوترانەوە[٣٢٤].

قوتابخانەکە لەلایەن لیژنەیەکی هەڵبژێردراو بەڕێوە براوە کە پێك هاتبوو لە مامۆستایان (تەیب بامەڕنی و سەلیم بناڤی و عەزیز بناڤی و فەریق قومری و شەفیق زاخۆیی) بەڕێز تەیب بامەڕنی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە و سەلیم بناڤیش کاروباری قوتابییانی لە ئەستۆ بوو.

دیارە لەم بارودۆخەدا خوێندن سەختە. باری دەروونیی منداڵانی ئاوارەی ڕزگاربوو لە مەرگ، نەبوونی شوێن و کەرەستەی خوێندن و کتێب و دەفتەر و قەڵەم... ئینجا چاودێری دەوڵەتی تورکیا. وەکو مامۆستا تەیب بامەڕنی وتی، سەرەتا لەسەر سێری نانی و بەردی سپی دەنووسرا، لەسەر (کاغەزی زەرفی ئەرزاق) کتێب دروست دەکران. هەر

---

(٣٢٤) دیدارێکی تایبەت لەگەڵ مامۆستا تەیب بامەڕنی لە سەرەتای مانگی ١٢ی ٢٠٠٢ لە ئەمریکا شاری (وەتەبەری) دەربارەی ئەم قوتابخانەیە کە خۆی بەبەڕێوەبەری هەڵبژێردراوە.

مامۆستایەکیش لەبن چادری خۆی دەرسی دەگوتەوە. هەروەها ئەم مامۆستایانەش لەوکاتدا لە ئاوارەبوون دەرسیان لەم قوتابخانە گوتووەتەوە کە بۆ ئاوارەکان دروست کرابوو ژمارەیان (٤٥) مامۆستایە (تەیب بامەڕنی، عەزیز بناڤی ، سەردار بناڤی، سەلیم بناڤی، مستەفا بناڤی، قاسم مائی، عەبدولڕەحمان شرتی ، ئەنوەر شرتی، سالم شەریفی، کیڤی بامەڕنی، سەعید بامەڕنی، سادق مائی، سادق تەلکیشکی، توفیق هەدێنی، سەباح هەدێنی، ناجیا سەیدی، مەهدی گەرەگوهی، مستەفا بیکداودی، عرفان تەلکیشکی، شەفیق زاخۆیی، ئازاد ئورەیی، شکری ئاسهی، سەعید ئورەیی، نەزمی قومری، جەمیل بێدهی، وەلید مائی، عەزیز بناڤی، شوکریا بێدهی، دلمان ئامێدی، مەلا سەعید ئامێدی، مووسا کوڤلی، ڕەشید ئیکمالەیی، سەلمان قومری، ئەمین گرکی، نەجمەدین گرکی، شەوکەت هرووری، عیسا ئۆرەیی، نەزیف ئێکمالەیی، ئیدریس ئەمین، فەریق قومری).

بەم جۆرە خوێندنی کوردی وەکو ئامانجێکی پیرۆز، کە مافی سەرەتایی هەر مرۆڤێکە لە دونیادا، بەڵام منداڵی کورد لەم مافە ئاساییە بێ بەری کراوە، هەربۆیە لەژێر ئامانجی (قوتابی گوڵی پاشەڕۆژن) لە ئاوارەییدا قوتابخانە بۆ منداڵی ئاوارەی کورد دەکرێتەوە، تا ئەوانەی بەر مەرگی ئەنفال و کیمیاباران نەکەوتن، بتوانن لەسایەی پاراستنی زمان و فێربوونی ئەلفابێی کوردیدا، کەسێتیی خۆیان و دواڕۆژی دۆزەکەیان ون نەکەن.

## سەرژمێریی ساڵی ١٩٤٧ و ئاستی خوێندەواری لە کوردستانی باشووردا[٣٢٥]

چاکترین بەڵگە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)ە. یا هەر سەرژمێرییەکی تر کە لە واقیعی بەدواداگەڕان و پشکنین نزیکمان دەخاتەوە. نابێ ئەوە وەشێرین کە کوردستان بەهۆی بارودۆخی سیاسییەوە هەتا نووکەژی سەرژمێرییەکی دروست و ڕەوا و ئازادانەی تێدا بەڕێوە نەچووە، بەڵام دەکرێ لە هەندێك ڕووەوە، بۆ نزیککەوتنەوە لە ژمارە و دەرنجەماکانی هەندێك بوار پشت بەم سەرژمێرییانە ببەسترێ.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا گەرەکمانە لە واقیعی خوێندن و خوێندەواری و ژمارەی دەزگاکانی فێرکردن و خوێندەواری نزیك بکەوینەوە. ئینجا لە ڕێگەی ئەم سەرژمێرییەوەش کە لە ساڵی ١٩٤٧ ئەنجام دراوە، واقیعی خوێندن و ئاستەکانی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری لە کوردستانی باشووردا ڕوون بکەینەوە. بێ گومان لێرەدا دەرفەتێکی وا نایێتە پێشەوە بۆ بەراوردکردنی دەگەڵ ناوچەکانی تری عێراق، یاخود ئاستی خوێندەواری لە دەڤەرەکە و جیهان.

هەر لەم خشتانەدا کوێرەوەریی نەخوێندەواری و نەهامەتییەکانی دواکەوتنی کوردستانمان بۆ دیار دەکەوێ کە چۆن دوژمنان هەمیشە ویستوویانە نەتەوەیی کورد نەخوێندەوار و دواکەوتوو بمێنێتەوە، چونکە بڵاوبوونەوەی خوێندەواری دەبێتە ڕێیەکی لەبار بۆ پەرەسەندنی هوشیاری و دوای ئەوەش فکری نەتەوەی و ڕزگاری و ئازادی کڵپە دەستێنێت. ئەم بۆچوونەش ساڵ بە ساڵ دەگەڵ پتر بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و فراوانبوونی ژمارەی قوتابخانەکان، پتر دەسەلمێت تا دەگاتە ئەوەی لە شەستەکان و پێشتریش لە ئاستێکی بەرتەسکتر ڕۆشنبیر و خوێندەواری دەرچووی مەکتەبە زانستییەکان واتە ئەفەندییەکان ڕۆڵیان لە بزاڤی سیاسی و ڕزگاریخوازی پتر دەبێ، تا دەگاتە وەرگرتنی سەرکردایەتیکردنی ئەم بزاڤە. لەتەك ئەوەشدا بەهۆی فراوانبوونی بنکەکانی خوێندەواری و زۆر بوونی ژمارەی قوتابخانە و پەرەسەندنی ڕێژەی خوێندەوار، باری کەلتووری و ڕۆشنبیری و هەتا کەسێتیی تاکی کوردیش بەرەو پێش هەنگاوی زۆری ناوە، بە جۆرێك کە ئەمڕۆ باری ڕۆشنبیری و نووسین، لە دەستی تەنیا

---

(٣٢٥) سەرژمێریی ڕەسمی ساڵی ١٩٤٧ی حکوومەتی عێراقی. کە هاوڕێم (هاوکار محەمەد) بەڕێزەوە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆی هێنام و سەرژمێرییەکانم لێ دەرهێناوە.

گرووپ و چەند کەسێك نەماوە، وەکو لە سەرەتای سەدەی بیستەم بینیمان بە کۆشش و هەوڵی تاکە کەسی بزاوتی ڕۆشنبیری و چاپەمەنی و خوێندەواری لە ئارادا بوو.

لامان ڕوونە بەشێکی زۆری کۆمەڵگای کوردستان لە ژێر فشار و هەنگاوی سەخت بوون بە تایبەتیش ژیانی خوێندەوار و فکر کراوە و خەمخۆرانی کورد هەمیشە لە ژێر پاڵەپەستۆی دەسەڵاتداران بووە، بۆیەشە باری خوێندەواری لە کوردستاندا ڕاشکاوانە کەوتە ژێر فشار و بە دوور نەبووە لە توندڕەویی دەسەڵاتدارن لەوان سەردەمدا دین و مزگەوت ڕۆڵی باڵا دەستیان هەبووە، (مەلا و فەقێ)یش لە کۆمەڵگای کوردەواریدا جێی ڕێزی تایبەتیان هەبووە، لە کۆتاییی چلەکاندا ژیانیان کەوتووەتە ژێر فشارەوە، بۆیە مەلاکانی سلێمانی پەنا وەبەر سکاڵانامەیەك دەبەن و دەردەدڵی خۆیان لە ئاکامی سەختی ژیان دەردەبڕن. بێ پەناش وەزعی ئەو ژمارە کەسەی مامۆستای قوتابخانە زانستییەکانیش لەمە چاکتر نەبووە.

دەقی سکاڵانامەکەی مەلایانی سلێمانی وەهایە(٣٢٦):

بۆ بەردەرگای جەنابی پایەبەرز پێ سپێردراوی تەخت و تاجی عێراق شانو شەوکەتی هەر پایەداربێ.

بەهۆی سەعادەتی فەرمانداری لیوای سلێمانییەوە عەرزی پایە بەرزتان دەکرێ

ئێمە کۆمەڵێ لە مەلایانی سلێمانین کە لە بنەوە ئیمزای خۆمانمان داناوە، کاتی خۆی ئەرکی پیرۆزی سەرشان و خزمەتی دڵسۆزانەمان کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی گیانی برایەتی موسڵمانی و ژیاندنەوەی پێوەندی ئاینی، سەرنج و بایەخپێدانی خاوەن شکۆ خوا لێخۆشبوو مەلیك فەیسەڵی یەکەمی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، کاتی کە تەشریفی هێنا بۆ لیواکەمان و بەو هاتنەی سەربەرزی کرد، ئەوەندەی لوتفی زۆر و زەبەندە و بەزەییی شاهانە دەربڕی تا دنیایە شوێنەواری کوێر نابێتەوە. ئەنجامێکی ئەو لوتف و بەزەییەی ئەوەبوو فەرمانی دا. نزیکەی ٦٠ ڕوپیە مانگانەی بۆ هەر یەکێکمان بڕییەوە. ئەو مانگانەیەیش لەبەر ئەوەی کە نیشانەی لوتفی خاوەن شکۆ بوو و بەشی ئەوەیشی دەکرد ئیحتیاجیمان نەهێڵێت، زۆر بەنرخ بوو لە لامان بەڵام بەداخەوە خرابووە خانەی (یارمەتی)یەوە و بەو هۆیەوە پەیتا پەیتا لێی کەم دەکرایەوە تا وای لێهات ڕادەی هەرە

---

(٣٢٦) گۆڤاری ڕەنگین عەرز و حاڵێکی ٥٤ ساڵ لەمەوبەری مەلا گەورەکانی سلێمانی. محەمەدی مەلا کەریم، ژمارە (٦٠) ١٩٩٣، ل١١.

زۆری بوو بە دوو دینار و نیو و لای کەمەکەیشی بەدیناریٚ ئێستاش کە لیواکەمان بە تەشریف هێنانی پیرۆزتان سەربەرز بووە و، هیوامان پتەوە کەوا ئەم تاقمە دڵسۆزەی رۆڵەکانی نیشتمان کە لە پێناوی داچاندنی تۆوی ڕەوشتی بەرز و کرداری چاك و بڵاوکردنەوەی پێڕەوە ڕاستەکانی ئاینی ئیسلامی ئیسراحەتی لەش و گیانی خۆیانیان کردووە بە قوربانی، لەم تەڵخ گوزەرانییە ڕزگار دەکەن.

جا لەبەر ئەمە و بەمەبەستی دابەشکردنی دادپەروەری و بەپێی بنەمای هاوسانی لە نێوان هەموو مەلایانی عێراقدا بیٚ هیچ جۆرە جیاوازی خستنە نێوانێکی رۆڵەکانی باکور و رۆڵەکانی باشوور و نەتەوە جیا جیاکان، هەموو بەیەك دەنگ داوای ڕەحم لە پایە بڵندتان دەکەین کە لایەکمان لیٚ بکەنەوە و بەزەییتان بگەیننە ڕادەیەکی وا بەشمان بکات تا بە ئاسوودە دڵی بژین و لە سایەی ئاڵای عێراق و لوتفی پایە بڵندتان بەماف پارێزراوی خزمەتی ئیسلامی بڵند و باڵا بکەین و، ئەمەیش لە نەژادی پاك و نیازی چاکی پایە بڵندتان دوور نییە.

ئەمە بوو داوامان، فەرمانیش لە دەستی خۆتاندایە.

دەرز بێژەوە موفتی عەبدولعەزیز

دەرز بێژەوە بابا عەلی

دەرز بێژەوە حوسەین

دەرز بێژەوە مەعروف

دەرز بێژەوە موحەمەد سەعید

دەرز بێژەوە موستەفا سەفوەت

دەرز بێژەوە موحەمەدول خال.

ئەم سکاڵانامە ساڵی ١٩٣٩ بەهۆی موتەسەریفی لیوای سولەیمانییەوە پێشکەش بەعەبدولئیلاهی خاوەن شکۆ کراوە. وێڕای باسکردنی وەزع خراپی، ئاماژە بەوەش دەکەن کە جیاوازی لە نێوان کوردستان و بەشەکانی تری عێراق نەبیٚ ئەمە نموونەیەکی بچووکی بەراوردە لە نێوان باری گوزەران و بوارەکانی خوێندن و خوێندەواری لە کوردستانی باشووردا. پێشتریش ئاماژەمان بەباری خوێندن و ئاستەنگەکانی لە ساڵانی سی کردووە، تا گەیشتووەتە ئەوەی «ئەمین زەکی بەگ» لە نامەیەکی کراوەدا کە ئاراستەی بەرپرسانی ئەوکاتی عیراقی کردووە، ئاماژە بەسەختی و نالەباری و

دواکەوتنی خوێندن و قوتابخانە لە شارەکانی کوردستان دەکا.

بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ شاری هەولێر ژمارەی دانیشتوانی (٢٦٨٨٥) کەس بووە، لە ناویاندا (٣٠٢٢) کەس دەتوانن بخوێننەوە و بنووسن کە (٢٤٤٧)یان پیاون (٥٧٥) کەسیشیان ئافرەتن. یانی ڕێژەیەکی یەکجار کەمی خوێندەوار هەبووە. لەناو شاری هەولێردا (٥) قوتابخانە هەبوون کە هەموویان هی کوڕان بوون.. هەروەها (١٤٥) مزگەوت هەبوون (١٣٣)یان بۆ پیاو و (١٢)شیان بۆ ئافرەتان بووە. ئینجا بۆ هەڵسووڕانی کارەکانی پەروەردە (٧٧) کەس کاریان کردووە (٥٨)یان پیاو و (١٩)شیان ئافرەت بوون بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە (٥٩).

ئینجا لە دەرەوەی شاردا خوێندن و قوتابخانە و ژمارەی مامۆستایان بەم جۆرە بوو. لە ناحیەی قوشتەپە و عەنکاوە و شەقلاوەدا کە تێکڕا (١٧٥) گوندیان بەسەرەوە بووە. ژمارەی دانیشتووانی عەنکاوە (٢١٢٢) کەس بووە (١٠٠٩) نێر و (١١١٣) مێ. لە ناویاندا (٢٥٦) نێری خوێندەوار و (٥٨) مێ دەرکەوتوون. لە قوشتەپەشدا (٤٠١٢٠) کەس ژیاون تەنیا (٩٣٦ نێر و ٦ مێ) خوێندەوار بوون (٩) قوتابخانەی کوڕان و (٤٤) دەزگای ئاینی هەبووە لە ناویاندا تەنیا (٣) بنکەی ئاینی بۆ ئافرەتان هەبووە تا ساڵی ١٩٤٧ هیچ قوتابخانەیەکی ئافرەتان لەم دەڤەرە پەرش و بڵاوەدا نەبووە. لە هەردوو ناحیەشدا قوشتەپە و عەنکاوە ١٢٤ مامۆستا و فەرمانبەری فێرکردن هەبوون تەنیا (٢)یان ئافرەت بووە. ژمارەی دانیشتووانی شەقڵاوە و گوندەکانی (١٦٦٤٣) کەس بووە، کە (٧٦٩٢) نێر و (٨٩٥) مێ بوون، لەناو ئەم ژمارەیەدا تەنیا (١٧٣ نێر و ٩ مێ) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە و لە هەموو دەڤەری شەقلاوە (٨) قوتابخانەی کوڕان و ١٢ دەزگای ئاینیی ئیسلامی هەبووە، ئاماژە بەکەنیسە و دەزگای ئاینی فەلەکان نەکراوە و لەناو (٥٠) کەس بواری فێرکردنیشدا تەنیا (١) ئافرەت هەبووە. هەر بۆ ئەم مەبەستە خشتەی ژمارە (٦٠).

لە خشتەی ژمارە (٦١)یشدا تەنیا ژمارەی مامۆستا و فەرمانبەرانی بواری پەروەردە لەناو شاری هەولێر و قوشتەپە و شەقڵاوە و گوندەکانی دەردەکەوێ (٢٥١) کەس لەم بوارە کاریان کردووە و (٧٣ پیاو و٢٠ ئافرەت) لە شارەکان و (١٥٦) پیاو و (٢) ئافرەت لە گوندەکان مامۆستایەتییان کردووە. ئەم ژمارەیەش لە چاو ڕێژەی ژمارەی دانیشتووان زۆر کەمە و تێری ئەوە ناکات، بواری فێرکردنی بەرفرە و پێویست بۆ سەرجەم منداڵانی کورد دابین بکرێ.

هەر لەم سەرژمێرییە و ئەگەر لە خشتەی ژمارە (٦٢) بنۆڕین بۆمان دەردەکەوێ ٨٣٥٢ کەس لە قەزای مەخموور ژیاون (٢٣٦ نێر و ٢٥ مێ) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە و هیچ قوتابخانەیەك ئاماژەی پێ نەکراوە، تەنیا (١٠) دەزگای ئاینی هەبووە (٢٥) پیاو لە بواری فێرکردندا کاریان کردووە، کە وێڕای گەڕەکەکانی ناو شاری مەخموور (١٠٤) گوندیش دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەم سەرژمێرییە.

لە ناحیەی گوێڕیشدا، کە (٥٠) گوندیشی بەسەرەوە بووە (١٣٦٩٢) کەس ژیاون و (٣٦٧ نێر و ٨ مێ) توانیویانە بخوێننەوە و بنووسن. (٤) قوتابخانەی کوڕانیان هەبووە و ئاماژە بەهیچ مزگەوتێك نەکراوە و (٢١) کەس لە بواری پەروەردە کاریان کردووە.

لە ناحیەی کەندێناوەشدا کە ناحیەی دیبەگە و ٦٩ گوندی گرتووەتەوە (١٩٨٥٢) کەس ژیاون تەنیا (٤٢٨ نێر و ٩ مێ) توانای خوێندن و نووسینیان هەبووە و هیچ قوتابخانەیەکیان نەبووە و (١٦) دەزگای ئاینی هەبووە. کە (٦٥) کەس کاری فێرکردنیان لە ئەستۆ بووە. بەپێی سەرژمێرییەکە دەردەکەوێت بۆ (٣١٨٩٦) کەس تەنیا (٤) قوتابخانەی کوڕان هەبووە دەگەڵ ٢٦ بنکەی ئاینی و (١١١) کەس لە بواری پەروەردەدا کاریان کردووە، هیچ ئافرەتێکیان تێدا بەدیار ناکەوێت. خشتەی ژمارە (٦٣)یش چاکتر واقیعی مامۆستا و ژمارەی فێرکەران ڕوون دەکاتەوە. لە شاری مەخموور و گوێڕ و کەندێناوە. تا ڕزگاریی عێراق لە ئەوپەڕی زوڵم و چەوسانەوە ژیاوە و سیاسەتی بە عەرەبکردنی تێدا گەیەنرابووە لووتکە.

لەناو ڕەواندز ساڵی ١٩٤٧ (١٨١٥٥) کەس ژیاون و (٧٨٣ نێر و ١٠٠ مێ) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە، هەروەها (٥) قوتابخانەی کوڕان و (١٠) مزگەوتی تێدابووە و (١٧) پیاو و (٣) ئافرەت لە بواری فێرکردن ژمارەیان تۆمار کراوە و لە دەرەوەی ڕەواندز و باڵەك و هەریر و برادۆست و مێرگەسووریشدا کە ناحیەی باڵەك واتە ناوەندی ناحیەی گەلاڵە و (٦٣) گوندی ئەو دەڤەرە پێك هاتبوو لە نێو (١٨٧٩٠) کەس دانیشتوواندا (٤٥١ نێر و ٢٧ مێ) توانای خوێندەواری و نووسینیان هەبووە و (١) قوتابخانەی کوڕان و دوو مزگەوت هەبووە لە شار و گوند ٢٥ کەس دەرسیان وتووەتەوە کە تەنا یەك کەسیان ئافرەت بووە. ئینجا لە ناحیەی برادۆست کە دەکاتە ناحیەی سیدەکان و (٨٠) گوندی دەڤەرەکە (٣٩٢٠) کەس ژیاون و تەنیا (٦٥ نێر و ١ مێ) توانای خوێندەوارییان هەبووە هەروەها دوو مزگەوتیان هەبووە هیچ قوتابخانەیەکیان نەبووە و (٨) کەس دەرسیان گوتووەتەوە. لە ناحیەی مێرگەسووریشدا (٤١٥٨) کەس دانیشتوون

و تەنها (٥٨) نێر توانای خوێندەواری تێدابووە، نە قوتابخانە و نە مزگەوتەکان لەم ناحیە تۆمار نەکراون. بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە خشتەی ژمارە (٦٤ و ٦٥ و ٦٦). ئینجا بەپێی سەرژمێرییەکە دەگەینە ئەو ئاکامەی کە لەو ساڵەدا لە ناو شارەکانی قەزای رەواندز و ناحیەی دێرە هەریر و ناحیەی باڵەك و ناحیەی برادۆست (٢٥ پیاو ٣ ئافرەت) و لە گوندەکانیشدا (٢٤ پیاو ١ ئافرەت) لە بواری پەروەردە کاریان کردووە.

ئەگەر بپەڕینەوە بەری بادینان، هەر لە ڕێگەی ئەم سەرژمێرییە دەتوانین تا ڕادەیەکی باش لە واقیعی خوێندن و خوێندەواری نزیك بکەوینەوە، ئەگەر ئەم سەرژمێرییانە بەشێوەیەکی کۆتایی تەواویش نەبن، بەڵام لە هەندێك بار لە واقیع نزیك دەکەونەوە.

لەناو شاری دهۆك (٥٦٢١) کەس ژیاون (٨١٤ نێر و ١٨٠ مێ) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە. (٨) قوتابخانەی کوڕان و ١٣ مزگەوتی پیاوان و (١) یەکی ژنان هەبووە و ٢٢ مامۆستا و دەرس بێژی تێدابووە، تەنیا یەکێکیان ئافرەت بووە. لە ناحیەی دهۆك و (١٠٣) گوندی سەر بەم دەڤەرە (١٣٨٢٤) کەس ژیاون (١٤٨ نێر و ٣ مێ) توانای خوێندەوارییان هەبووە تەنها (٨ ) مزگەوت و (٦) دەرس بێژەرەوەی هەبووە و ئاماژە بەهیچ قوتابخانە و مامۆستایەك لەم دەڤەرە بەرفرەیە نەکراوە. وەکو لە خشتەی ژمارە (٦٧) دەردەکەوێ. هەروەها لە ناحیەی (دۆسکی و مزووری)یدا بەم جۆرە تۆماری واقیعی ژمارەی دانیشتووان و ئەژماری خوێندەوار و مامۆستا و مزگەوتەکانی کراون. ناحیەی دۆسکی  کە ناوەندەکەی مانگێش بووە دەگەڵ (٥٤) گوندی سەر بەوناحیەیە (٩٥٣٤) کەس نیشتەجێ بوون و (٢٣١ نێر و ١٨ مێ) خوێندن و نووسینیان زانیوە تەنها ٤ مزگەوت و (٨) دەرس بێژیان هەبووە و هیچ قوتابخانەیەکی زانستییان تا ئەو ڕۆژە نەبووە. لە ناحیەی مزووریش کە ناوەندی ئەترووش بووە و (٦٤) گوندی لە سنوور بووە، ژمارەی دانیشتوانەکەی (٩٨٦٤) کەس بووە. ٢٨٧ نێر و ١٠ مێ خوێندەوار بوون و ٩ قوتابخانەی کوڕان و ٦ مزگەوتیان هەبووە و (١٢) مامۆستا و دەرس بێژیان هەبووە وەکو لە خشتەی ژمارە (٦٨) دیارە.

لە قەزای (ئامێدی)شدا هەر لە هەمان سەرژمێرییدا گوتراوە (٢٥٠٣) کەس ژیاون و ٣٣٦ نێر و ٥١ ئافرەت توانای نووسین و خوێندنەوەیان هەبووە. تەنیا ٩ مزگەوتی پیاوان و ٣ی ئافرەتانیان هەبووە، هیچ قوتابخانەیەکیان نەبووە و ٦ دەرس بێژی پیاو و یەکێکی ئافرەتیان هەبووە.

هەروەها لە گوندی ئەرادنی فەلانیش (١١٠٨) کەس هەبوون و ٣٧١ پیاو و ١٤ ئافرەت خوێندەوار بوون و هیچ قوتابخانەیان نەبووە هەر تەنیا ٢ کەنیسەی پیاوان و یەکێکی ئافرەتانیان تۆمار کراوە. لە (بامەڕنی)یش کە (١٢٩) گوندی بەسەرەوە بووە (٢١٢٠٦) کەس ژیاون لەناو بامەڕنی (٢١١ پیاو ٤ ئافرەت) خوێندەوار بوون و لە گوندەکانیشدا ١٦٩ پیاو و ٣ ئافرەت خوێندەوار بوون لە شارەکە و گوندەکانیدا هیچ قوتابخانەیەك ناوی نەهاتووە، تەنیا ٨ مزگەوت لە بامەڕنی و ٥ مزگەوتی پیاون و یەکی ئافرەتان لە گوندەکان هەبووە. ئەم زانیارییانەش پتر لە خشتەی ژمارە (٦٩)دا تۆمار کراون.

لە قەزای ئاکرێ و ناحیەکانی و ئەو گوندانەی کەوتوونەتە سنووری ئاکرێ و ناحیەکانی سوورچی و عەشایر سەبعە و بیرەکبیرە، لە خشتەی ژمارە (٧٠) و بەپشت بەستنی بەهەمان سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ی حکوومەتی عێراقی تۆمارەکانمان وەها چرکردەوە. لە ناحیەی (٢٥٧٩) کەس تۆمارکراون و لە ناویاندا (٥٥٨ نێر و ٤٩ مێینە) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە تەنیا یەك قوتابخانەی کوڕان لە گەڕەکی قابەگی هەبووە، هیچ مزگەوتێك تۆمار نەکراوە (٨) مامۆستای پیاو و ٣ی ئافرەت ژمارەیان تۆمار کراوە. ئینجا لە هەر سێ ناحیەی سوورچی و عەشایر سەبعە و بیربیرکبیرەدا ٢٦٥١٢کەس سەرژمێری کراون لە ناحیەی سورچی (٣٩ پیاو و یەك ئافرەت) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە و لە ناحیەی عەشایر سەبعە (١٤٤ نێر و ١ مێ) و لە ناحیەی بیرەکبیرەشدا تەنیا ٥٤ پیاو توانای خوێندەوارییان هەبووە. هیچ قوتابخانە و مزگەوتێك لەم دەڤەرە ئاماژەی پێ نەدراوە. تەنیا دەڵێن ٩ کەس لە پیاوان لە بواری فێرکردن کاریان کردووە.

قەزای شێخان-یش بەهۆی هەلومەرجی سیاسی. ئەو هەلومەرجەی ڕووبەڕووی کراوەتەوە وەزعی لە دەڤەرەکانی تر باشتر نەبووە، ئەگەر دژوارتریش نەبووبی سەیر بکەین لە قەزای شێخان و (٥٠) گوندی سەر بەقەزاکە ١٣٣٠٠ کەس ناویان تۆمار کراوە و لە ناویاندا (٢٠٨ نێر و ١٦ مێ) توانای خوێندەوارییان تێدا ڕاگەیاندراوە. هیچ قوتابخانەکیان نییە ، پێ دەچێ بەهەڵە ناوی (٦٧) دەزگای ئاینی تێدا تۆمار کرابێ. چوار دەرسبێژی پیاویان هەبووە. لە ناحیەی (عین سفنی) سەربەم قەزایەشدا (١٦٨٥ ) کەس و (١٣٥ نێر و ١٣ مێ) تێیدا خوێندەوار بوون، هەروەها گوندی سێخکەش کە هەر سەر بەم ناحیەیە (٧٨٣) کەس ژیاون تەنیا (٥) پیاو خوێندەوار بوون و لە

سەرژمێرییەکەدا (٨٨) گوندی سەربەم ناحیەش بەجیا تۆمار کراون، کە ژمارەی دانیشتووانیان (١٠٨٤٢ ) کەس بووە و (٦٨ نێر و ٣ مێ)ی خوێندەواریان هەبووە لەم دەڤەرە زل و بەرفرەیەشدا هیچ قوتابخانەیەکی زانستی نەبووە تەنیا لە گوندەکاندا (٢) مزگەوت تۆمار کراون و هاتووشە کە ١٣ دەرسبێژیان هەبووە لە سەرجەم ناحیەی (عین سفنی)دا. وەکو لە خشتەی ژمارە (٧١)دا هاتووە.

ژەنگار، دەمێکە کەوتووەتە بەر شاڵاوی شێواندن و داتەکاندنی لە کوردینی، گۆڕینی نەژاد و زمان و ڕەچڵەکی ڕەسەنیان. لە سەرژمێریی ١٩٤٧ وەکو لە خشتەی (٧٢) ئاماژەی پێ کراوە، قەزای سنجار و ناحیەی شیمال لە گوندەکانی سنووری، بەپێی سەرژمێریی دانیشتووانەکەی، ئاستی خوێندن و ڕێژەی خوێندەواری دەردەکەوێت. ژمارەی دانیشتوانی قەزای سنجار (٩٠٠٠) کەس بووە. و ئاماژە بەژمارەی خوێندەواری ئەم قەزایە نەکراوە، گوایە (٩) قوتابخانەیان هەبووە، لەگەڵ سێ بنکەی دینی پیاوان و (٣)ی ئافرەتان، (٩) مامۆستای پیاو و (٥ ) ئافرەتیان هەبووە. لە ناحیەی شێخانیشدا (٦٠٤) کەس ژیاون و (٢١ نێر و ١ مێ) دەخوێننەوە و لە بارەی خواروو و بارەی ژێری (٩١٩) کەس دانیشتوون و کەسیان خوێندەوار نەبووە و لە ستوونی (٩٠٤) کەس جێنشین بوون و کەسیان خوێندنەوەی نەزانیوە و لە گوندەکانی سەربەم مەڵبەندە (٨٢٩٣) کەس ناونووس کراون تەنیا (٢١ نێرینە) خوێندنەوەیان زانیوە. لەم ناحیە و گوند و مەڵبەندەکانی سنووری دەسەڵاتی ئیدارەیدا هیچ قوتابخانەیەکی زانستی تۆمار نەکراوە و تەنیا (٥) دەزگای ئاینیی پیاوان لە گوندەکاندا تۆمارکراون و (١) وانە بێژیش هاتووەتە ژماردن.

قەزای زێبار مەڵبەندێکی گڕگرتووی تەژی لە ناکۆکی و ململانێی درێژخایەن بووە و ناوەندەکەی لە (بلێ) بووە، ناوەندی ناحیەی بارزان و (١٣ ) گوندی سەربەم مەڵبەندە و ناوەندی ناحیەی شێروان مەزن (مزووری باڵا) و (٤٩) گوندی دەوروپشتی لە سەرژمێری ١٩٤٧ تۆمار کراون. لە خشتەی ژمارە (٧٣) ئاماژە بەتۆمارکردنی سەرژمێری ١٩٤٧ کراوە، لەو ساڵەی کە بارزانیی نەمر و لەشکرێکی بەهێز و گەورە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا لە پاڵپشتی (کۆماری کوردستان) بوون، ئەم دەڤەرە لە لایەن حکوومەتەوە جێگەی مەترسی و نیگەرانی و ناڕەزایی بووە، بۆیە ئاساییە کە دیقەت لە سەرژمێرییەکە دەدەین، بۆمان دەردەکەوێ ناوچەکی وێران و دوور لە خزمەت و قوتابخانە بووە، ژمارەیەکی یەکجار کەم ناونووس کراون. وەکو لە خوارەوە ئاماژەی پێ دەکەین:

ناوەندی قەزای زێبار (بلێ) (١٣٥) کەس ناویان تۆمارکراوە و (٣٣) نێرینە توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە. لە ناوەندی ناحیەی بارزان (٩٢) کەس نیشتەجێ بوون و (١١) نێرینە خوێندەوارییان هەبووە و لە (١٣) گوندی سەر بەناحیەی بارزان (٧٣٤) سەرژمێر کراون و کەسیان خوێندەواریان نەبووە و لە ناوەندی ناحیەی شێروان مەزن (مزووری بالا) (٢٤٢) کەس ناویان تۆمارکراوە (١٠ نێرینە) خوێندەوارییان هەبووە و لە (٤٩) گوندیشدا (٥٤٠١) کەس سەرژمێری کراون و (٢٩ نێرینە و ١ مێینە) خوێندەوار بوون. لە سەرجەم قەزا و ناحیە و مەڵبەند و گوندەکاندا هیچ قوتابخانە و بنکەیەکی ئاینی ئاماژەی پێ نەکراوە و ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە سەرژمێری لەم دەڤەرەدا بەرێکی ئەنجام نەدراوە، سەرباری ئەوەی ژمارەیەکی ئێجگار زۆری دانیشتووانەکەی بەهۆی شۆڕش و بەشدارییان لە کۆماری کوردستاندا ناونووس نەکراون، یا ناوچە سنوورنشینە دوورەکان دەستیان بەخۆ نووسین نەگەیشتووە.

قەزای زاخۆش لەگەڵ ناحیە و گوندەکانی سنووری دەسەڵاتی بەڕێوەری لەوکاتدا، بەرێکی ژمارەی دانیشتووان و قوتابخانە و ئامارەکان تۆمار کراون. لەناو قەزای زاخۆ و گەڕەکەکانی ناوشار ٣٥ گوندی سەر بەناوەندی زاخۆ (١٤١٧٨) کەس سەرژمێری کراون و تێکڕا (٨٦٦ نێر و ٢٠٣ مێ) خوێندەوار بوون (٦) قوتابخانەی کوڕان ٣١ مزگەوت و دەزگای ئاینی پیاوان و ٣ی ئافرەتان، هەبووە تێکڕا (٣٢) مامۆستا و وانەبێژی پیاو و (١٤)ی ئافرەت لە تۆمارەکە ئاماژەیان پێ کراوە.

ئینجا لە ناحیەی سلێڤانی و (٧٥) گوندی سنوورەکانی (٨٩٠٧) کەس سەرژمێر کراون و (٢١١ پیاو و ١٨ ئافرەت) خوێندەوار بوون و (١١) قوتابخانەی کوڕان و (١)ی کچانیان هەبووە. لەگەڵ ٢ مزگەوت و (١٥) مامۆستا و دەرسبێژی پیاو. لە ناحیەی سندی و ٥١ گوندی دەڤەرەکەی (٧٦٣٥) کەس ژیاون و لە ناویاندا (٦٩ پیاو و ٤ ئافرەت) خوێندەوار بوون و هیچ قوتابخانە و مزگەوتیان ئاماژەی پێ نەکراوە و (٢) مامۆستای پیاویان هەبووە لە ناحیەی گلی و ئەو (٥٨) گوندەی لەناو تخووبی ئەو بوون (٥٣٥٨) کەس سەرژمێری کراون و (٤٧ نێر و ٣ مێ) خوێندەوارییان هەبوو تەنیا ئاماژە بەیەك دەزگای ئاینی کراوە. وەکو لە خشتەی ژمارە (٧٤) تۆمار کراوە.

هەر لە ئاکامی ئەم بەدواداچوونەدا لەم خشتانەدا هەوڵمان داوە لە ژێر ڕۆشنایی سەرژمێریی گشتیدا تۆماری مامۆستا و وتاربێژ و ئەوانە بکەین کە لە بواری پەروەردەدا کاریان کردووە، کە بەم جۆرە شاری دهۆك (٢٠ پیاو و ١ ئافرەت) لەناو شار و (٦ پیاو

لە گوندەکان)، لە ناحیەی دۆسکی (٦ پیاو لە شار) و (٢)ی تر لە گوندەکان بووە. هەروەها لە ئامێدی و ناحیەی ئامێدی و ناحیەی نێروەورێکان و ناحیەی بەرواری بالا (٣ ) مامۆستای پیاو لە شارەکان و (٣)ی تر لە گوندەکان بوونە. هەروەها لە شاری ئاکرێ و ناحیەی سوورچی و عەشایر سەبعە و بیرەکبیرە ١٧ مامۆستای پیاو و ٣ی ئافرەت لە شارەکان هەبووە و گوندەکان هیچیان نەبووە. لە ناوەندی قەزای زێبار و ناحیەی بارزان و مزووریی بالا تەنیا (١) پیاو و (١) ئافرەت لە گوندەکان ئامازەیان پێ کراوە و لە ناوەندی قەزا و ناحیەکاندا هیچ مامۆستا و دەرسبێژێك نەبووە. لە قەزای شێخان و ناحیەکەدا تەنیا (١٢) کەس لە شار و (٥)ی تر پیاو لە لادێیەکان کاریان پێ سپێردراوە. لە قەزای سنجار و ناحیەی شیمالدا (١٠) مامۆستای پیاو و (٥) ئافرەت لە ناوەندی قەزا و ناحیە کاریان هەڵسووڕاندووە و لە گوندەکانیشدا هیچ کەس ئامازەی پێ نەکراوە.

لە ناو ناحیەی مزووری ٤ مامۆستای پیاو و لە گوندەکانی سنووری ئەم ناحیەشدا (٨) دەرسبێژ و ٥ مامۆستای پیاو کاریان هەڵسووڕاندووە. زاخۆش لەناو شارەکەدا ٢٦ مامۆستای پیاو و ٦ی ئافرەت هەبووە و لە دێهاتەکانی سنووری قەزای زاخۆدا ١٤ پیاوی تر کاری مامۆستایەتی و دەرسبێژییان ڕاپەڕاندووە. لە ناحیەکانی سلێڤانی و سندی و گلی تەنیا لە لادێیەکانیاندا (١٧) کەسی پیاو ژمارەیان تۆمارکراوە. بۆ پتر زانیاری بنۆڕە خشتەکانی ژمارە (٧٥،٧٦،٧٧،٧٨،٧٩،٨٠،٨١،٨٢،٨٣).

سلێمانی مەڵبەندێکی نوێ، مێژوویەکی پڕ لە جموجۆڵی سیاسی و ڕۆشنبیریی هەیە، تا دەگاتە ئەوەی لەم مەڵبەندەدا بزاوتی نەتەوەیی و شیعری و خوێندەواری دواتر دامەزراندنی بزاڤی سیاسی و دامەزراندنی یەکەم حکوومەتی کوردستان بەسەرۆکایەتیی شێخی نەمر، ببێتە هاندەرێکی لەبار بۆ بەگەڕخستنی پرۆسەی خوێندەواری. باسی بزاوت و بەگەڕکەوتنی فکری ڕۆشنگەری و جووڵانەوەی نەتەوەیی، پرۆسەی ڕۆشنبیری شیعری لەم دەڤەرە هۆشیار بووە لەسەر دەستی پێشەنگە ڕۆشنبیرەکانی باسێکی تایبەتە، پێویستی بە لێکدانەوەی زانستی هەیە.

گەرەکمانە لە ڕێگەی خستنەڕووی لایەنێکی سەرژمێری ١٩٤٧ وەکو دەڤەرەکانی تر لایەنی خوێندەواری و بزاوتی تر کرانەوەی قوتابخانە و دەرسبێژی و بوونی مزگەوتەکان بخەینە ڕوو، کە لایەنێکی گرنگی پەرەسەندنی پرۆسەی خوێندەواری و بڵاوبوونەوەی خوێندن و فێربوونی ئەلف و بێ وکرانەوەی قوتابخانەی زانستی ڕۆشن دەکاتەوە.

لەناو شاری سلێمانی و (٧٥) گوندی سەر بەقەزای سلێمانی (٤٣٠١٤) کەس ناونووسی کراون و (٤٥٤٢ کەسی نێر و ٩٨٦ مێ) خوێندنەوە و نووسینیان زانیوە و (٤٥ قوتابخانەی کوڕان و ٥ی کچان)، هەبوو لەگەڵ ٩٠٥ دەزگا و مزگەوتی ئاینی پیاوان و ٧ی ئافرەتان (١٣٦ پیاو ٢٩ ئافرەت)یش لە بواری پەروەردە و فێرکردن کاریان کردووە وەکو لە خشتەی ژمارە (٨٤) دەردەکەوێ.

لە ناحیەی سوورداش کە ناوەندی (سووورداش)ە (٥٣٤) کەس سەرژمێر کراون و لەناویاندا (٥٢ نێر و ٤ مێ) خوێندەوار بوون قوتابخانە و مزگەوتیان تۆمار نەکراوە، لە گوندی سەرگەڵووشدا (١١١٨) کەس ژیاون و (٢٧ نێر و ١ مێ) خوێندنەوە و نووسینیان زانیوە، تەنیا (٣ دەزگای ئاینی و مزگەوت) ئاماژەی پێ کراوە، دەگەڵ (١٣) پیاوی کارگەر لە بواری فێرکردن و دەرسبێژیدا. هەروەها لە (٦٦) گوندی سەر بەناحیەی سووورداشدا (١٠٢٩٩) کەس ژمارەیان تۆمارکراوە و لە ناویاندا (١٤٨ نێر و ٤ مێ) خوێندەوارییان زانیوە، هیچ قوتابخانەیەك دیاری نەکراوە، تەنیا هاتووە کە (٧) مزگەوتی پیاوان و ١٢ی تری ئافرەتانیان هەبووە.

ئینجا لە ناحیەی تانجەرۆ کە ناوەندەکەی عەربەت بووە (٨٠١) کەس سەرژمێر کراون و لە ناویاندا (١٢١ نێر و ٢ مێ) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە. و هیچ قوتابخانەیان نەبووە، ١ مزگەوت ئاماژەی پێ کراوە دەگەڵ (٦) پیاو کە لەم بوارە بۆ فێرکردن و دەرسبێژی کاریان کردووە. ئینجا لە (٦٥) گوندی سنووری ناحیەی تانجەرۆدا (٩٦٨٩) ناونووس کراون (٩٧ نێر و ١ مێ) ناویان بەخوێندەوار تۆمار کراوە و ئاماژە بەهیچ قوتابخانەیەك نەکراوە، ٨ مزگەوتی پیاوان و ١ی ئافرەتانیان هەبووە. لە ناحیەی قەرەداخ و (٧٤) گوندی نێو سنووری دەسەڵاتی ئیداری ئەم ناحیەدا پێکڕا (١٠١١٣) دانیشتووانی هەبووە بەپێی سەرژمێرییەکە و لە ناویاندا (٣٠٦ نێر و ٢٥ مێ) ناویان بەخوێندەوار تۆمار کراوە. (٥) قوتابخانەی کوڕانیان هەبووە. دەگەڵ ٢٦ مزگەوتی پیاوان و ٣ی ئافرەتان. لەم بوارە (٣٥) کەس ناویان بەکارگەر و دەرسبێژی ئەم بوارە تۆمار کراون کە هەر هەموویان پیاو بوون. ئینجا لە ناحیەی بازیان و (٣٦) گوندی سەر بەناحیەکە هەڤڕا (٤٢٠٠) کەس سەرژمێری کراون و (٥١ نێر و ٣ مێ) بەخوێندەوار تۆمار کراون و هیچ قوتابخانەیەك ئاماژەی پێ نەکراوە و (٨) مزگەوتی پیاوانیان هەبووە دەگەڵ ٣ دەرسبێژی ئەم بوارە بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە خشتەی ژمارە (٨٥).

قەزای هەڵەبجەی جەستە ساڕێژ نەبوو، مەڵبەندی وریا بوونەوە، کە دواجار لە ١٩٨٨/٣/١٦ لە لایەن حکوومەتی داگیرکەری عێراقییەوە بەر ژەهری کیمیاوی کەوت. بەم جۆرە و لە سەرژمێری ١٩٤٧ زانیارییەکانی تۆمارکراوە. ژمارەی دانیشتووانەکەی دەگەڵ (٩٨) گوندی سەربەم قەزایە (٢٢٧٣٨) کەس تۆمارکراوە (١٠٠٨ نێر و ٩٩ مێینە) توانای خوێندنەوە و نووسینیان هەبووە، لەناو هەڵەبجە گەڕەکی پیر محەمەد (١) قوتابخانەی کوڕان و لە گوندی عەبابەیلێ (١)ی کوڕان و لە گەڕەکی پاشا ٣ قوتابخانەی کچان هەبووە، دەگەڵ (٧٠ مزگەوتی پیاوان و ١١ی ئافرەتان) لە سەرجەم سنووری قەزای هەڵەبجەدا. (٦٩) کەسی نێر و (٤) مێ لە بواری فێرکردن و دەرسبێژی سەرژمێر کراون. وەکو لە خشتەی ژمارە (٨٦)دا تۆمارکراوە.

هەر لە هەڵەبجەدا دەچینە سەر ئەژمارەکانی ناحیەی خورماڵ کە ناوەندی ناحیە لە خورماڵ و گوندی مالیدەی تەوێڵەو بیارە و (٨٣) گوندی سەر بەم ناحیە دەگرێتەوە، ژمارەی دانیشتووانەکەی بە (١٩٥٧٠) کەس تۆمار کراوە و لەناو ئەم ژمارەیەدا (٢٧٧ نێر و ٥ مێ) خوێندەوار بوون. هیچ قوتابخانەیەکیان نەبوو، تەنیا ئاماژە بە (٧٣) مزگەوتی پیاوان و (٢٨) دەرسبێژی پیاو کراوە. لە ناحیەی وارماوا کە ناوەندەکەی (قلیجە) بووە و (١٥٥) کەس تۆمارکراون و تەنیا (١) پیاو خوێندەوار بووە، نە مزگەوت و نە قوتابخانەیان نەبووە. بەڵام لە (٤٤) گوندی سەربەم ناوەندە ئیدارییەدا (٦٧٠٢) کەس ژیاون و لەناو ئەم ژمارەیەدا (٧٢ نێر و ٢ مێ) بەخوێندەوار ناونووس کراون و قوتابخانەیان نەبووە و (٨) مزگەوت و (١١) دەرسبێژی پیاو لەم سەرژمێرییە تۆمار کراوە. هەروەها پێنجوین کە ناوەندی ناحیەکەی لە (بەری کەناو) بووە و تێکڕا دەگەڵ دانیشتووانی بەرکێو و یەنکەلە و (١٠٢) گوندی تری سەربەم ناحیەیە کە پێنجوینە. (٢٢٣٠٤) کەس سەرژمێر کراون و لە ناویاندا (٤٤٨ نێر و ٨ مێ) بەخوێندەوار ژمارەیان دیاری کراوە. هیچ قوتابخانەیەکیان نەبووە، تەنیا (٢٣) مزگەوت و (٣٥) دەرسبێژی پیاویان ئاماژەی پێ کراوە. بۆ پتر زانیاری دیقەتی خشتەی ژمارە (٨٧) بدە.

قەزای شارباژێڕیش کە پێوانەیەکی فراوان و بە بەرەکەتی هەیە، مەڵبەندێکی دیاری گەشەکردن و بەناوبانگە لە کۆنەوە ژیان لەم مەڵبەندەدا دۆزراوەتەوە لە گەڕەکەکان و (١١١) گوندی ئەم سنوورەدا (١٧٣٤١) کەس سەرژمێری کراون و لە ناویاندا (٣٠٢ نێر و ١٤ مێ) خوێندەوار بوون، ئاماژە بەبوونی هیچ قوتابخانەیەك نەکراوە، دوو مزگەوتی پیاوان و ١١ دەرسبێژی پیاو و (١)ی ئافرەت لەناو قەزاکە و (١٠ مزگەوتی پیاوان و

سێی ئافرەتان) لە گوندەکاندا تۆمار کراون.

لە ناحیەی ماوەتیشدا کە ناوەندی ناحیە لە ماوەت و (٥٤) گوندی ئەم مەڵبەندە دەگرێتەوە (١١٥٩٤) کەس ژیاون، (٢٦٧ نێر و ٣ مێ) توانای خوێندن و نووسینیان هەبووە و لە سێ مزگەوتی ئافرەتان هیچی تر ئاماژەی پێ نەکراوە و باسی قوتابخانە نییە و (١٢) دەرسبێژی پیاوی هەبووە. پێ دەچێت ئەم زانیارییانە گەلێك جێگەی بڕوا نەبن. هەروەها ناحیەی سروچك کە ناوەندەکەی لە (بەرزنجە) بووە، دەگەڵ (٥٤) گوندی نێو ئاقاری دەسەڵاتی ئەم ناحیە (١٠٠٥٦) کەس تۆمارکراون بەنیشتەجێی ئەم ناحیە و گوندەکانی بوون، کە تەنیا (١٣٣ نێر و ٣٥ مێ) بەخوێندەوار تۆمارکراون و قوتابخانەیان نەبووە و (١) مزگەوت تۆمارکراوە دەگەڵ (١٢) دەرسبێژی پیاو. ئەم زانیارییانە دەتوانی لە خشتەی ژمارە (٨٨) بەوردی تۆمارکراون و دەتوانی سەرنجیان بدەی.

ئینجا بۆ پتر دەرخستنی تواناکانی فێرکردن لەم دەڤەرە بەرفرە و ئەژمار زۆرەدا لە سەرژمێری ١٩٤٧دا بەم جۆرە ئاماژە بە ژمارەی ئاگاداری بواری پەروەردە لە شار و لادێکان کراوە لە پارێزگای سلێمانی وەکو لە خوارەوە دەردەکەوێت.

لەناو سلێمانی و ناحیەی تانجەرۆ و قەرەداغ و سووورداش و بازیان ١١٤ مامۆستای پیاو و ٢٩ ئافرەت هەبوون و لە لادێکانیشدا تەنیا ٨٣ پیاو سەرژمێری کراون. کە تێکرایان (٢٢٢) کەس بوون بڕوانە خشتەی ژمارە (٨٩) دەردەکەوێ. لەناو شاری هەڵەبجە و ناحیەی خورماڵ و ناحیەی وارماوا و ناحیەی پێنجوینیش (٧٤ مامۆستای پیاو و ٤ ئافرەت) تۆمار کراون و لە لادێیەکانیشاندا تەنیا (٧١) پیاو ژمارەیان دیاری کراوە کە تێکڕا دەکەنە ١٤٧ کەس. بڕوانە خشتەی ژمارە (٩٠).

سەبارەت بەناوەندی قەزای شارباژێڕ و ناحیەی ماوەت و ناحیەی سروچك (١٩) مامۆستای پیاو و (١)ی ئافرەت هەبوون و لە تێکڕای گوندەکانی ئەم سنوورە بەرفرەیەشدا (١٦) پیاو ژمارەیان دیاری کراوە. کە تێکڕا (٣٦) کەس پێك دەهێنن. بڕوانە خشتەی ژمارە (٩١).

شاری کۆیە بنکەیەکی دیاری بزاڤی ڕۆشنبیرییە، لە سەرەتای سەدەی بیستدا قوتابخانەی لێ کراوەتەوە، کچ چووەتە بەرخوێندن، ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەر و سیاسیی دیاری لێ هەڵکەوتوون. لە سەرژمێریی ١٩٤٧دا بەم جۆرە سەرژمێریی

دانیشتووانی شاری کۆیە و گوندەکانی و ناحیەی تەق تەق کراوە. لەناو گەڕەکەکانی شاری کۆیە و (٧٥) گوندی ناو سنووری ئەم شارەدا (٢٠١٠٥) کەس ژیاون و لە ناویاندا (١٠٨٢ نێر و ١٤٤ مێ) خوێندنەوە و نووسینیان توانیوە، تێکڕا یەك قوتابخانەی کوڕان و یەکی کچانیان هەبووە، هەروەها ٣٣ دەزگا و مزگەوتی ئاینی پیاوان و ١ی ئافرەتانیان هەبووە و لەم بوارەدا (٦٠ پیاو و ٤ ئافرەت) کاری فێربوونیان ڕاپەڕاندووە. لە ناحیەی تەق تەق کە ناوەندی (تەق تەق)ە و (٥٩) گوندی لە باوەش گرتووە. (١٠٠٩٦) کەس سەرژمێری کراون و (١٣٢ نێر و ٤ مێ) خوێندەوار بوون، هیچ قوتابخانەیەك ئاماژەی پێ نەکراوە، تەنیا (٥) مزگەوتیان هەبووە و لەم بوارەشدا (١٤) پیاو کارەکانیان هەڵسووڕاندووە بۆ دەرسبێژی و فێرکردنی خوێندەواری وەکو لە خشتەی ژمارە (٩٢) دەردەکەوێ. ئینجا لە لایەنی کارمەند و مامۆستا و دەرسبێژەکانەوە هەر لەم سەرژمێرییەدا وەکو لە خشتەی (٩٣) چڕکراوەتەوە دەردەکەوێ لەناو شارەکاندا ٥٢ پیاو و ٤ ئافرەت کاریان کردووە و لە گوندەکانیشدا (٢٢) پیاو ئاماژەیان بۆ کراوە.

دەڤەری پشدەر، کە بنکەیەکی گرینگ و ستراتیژی و خودانی مێژوویەکی کۆن و کاریگەری لە بزاڤی سیاسی هەبووە، ناوەندی قەزای پشدەر (لە قەڵادزێ) ژمارەی دانیشتووانەکەی (٢٧٨٩) کەس بووە و (٢٩١ نێر و ٧ مێ) خوێندەوار بوون لە ساڵی ١٩٤٧ هیچ قوتابخانەیەك ئاماژەی بۆ نەکراوە ٢٠ مزگەوتی پیاوان و ٢ی ئافرەتان ئاوابووە. دەگەڵ بیست دەرسبێژی پیاو. ئینجا لە ناحییەی بنگرد و (٥١) گوندی دەسەڵاتی ئیداری ئەم ناحیە (١٢٤٧١) کەس سەرژمێر کراون و لە ڕیزیاندا (٢٤٦ نێر و ٢ مێ) توانای خوێندن و نووسینیان هەبووە، (٨) قوتابخانەی کوڕانیان لەم ساڵەدا هەبووە لەگەڵ (٥٠ مزگەوتی پیاوان و ٢٤ی ئافرەتان)، کە پێ دەچێت هی دواییان هەندێك لە ڕاستی دوور کەوتبێتەوە. لەم بوارەشدا (٣٢) دەرسبێژ و مامۆستای پیاو کاریان لە بواری فێرکردن کردووە. هەر لە ناحیەی قەڵادزێ کە گوندی (هەڵشۆ و هێرۆ) و (٧٤) گوندی تری گرتووەتەوە بەم جۆرە ئامارەکان تۆمارکراون (١٩٨٣٤) کەس ژیاون و (٢٨٨نێر و ٢ مێ) خوێندەوارییان زانیوە، ١٢ قوتابخانەی کوڕان و ٢٣ مزگەوتی پیاوانیان هەبووە، (٤٤) پیاو لە بواری فێرکردن و دەرسبێژی کاریان ڕاپەڕاندووە. ئەم زانیارییانە لە خشتەی ژمارە (٩٤) چڕ کراونەتەوە و دواتریش بۆ کارمەندانی بواری فێرکردن و هەڵسووڕێنەران و دەرسبێژەکان وەها هاتووەتە سەرژمێریکردن کە لە خشتەی ژمارە (٩٥) وەدیار دەکەوێت لەناو شارەکاندا (٢٤)ی

تەنیا پیاو لە دێهانەکانیشدا ٧٢ی تری پیاو کاریان ئەنجام داوە لە کۆی (٩٦) کەس هیچ ئافرەتێك نابینرێ.

ڕانیە کە ئێستا بووەتە دەروازەی ڕاپەڕین، سەنگاییەکی جیدیی لە بزاڤ و پەیوەندیی ئەم دەڤەرە هەیە. ناوەندی قەزای ڕانیە (١٣٤٣١) کەسی تێدا ژیاوە و (٢٨٦ نێر و ١٠ مێ) تێیدا خوێندەوار بوون، (١) قوتابخانەی کوڕان و (٥) مزگەوتی پیاوانیان هەبووە دەگەڵ (١٣) مامۆستا و دەرسبێژ. ئەم سەرژمێرییە (٥٨) گوندی سەر بەقەزاکەشی گرتووەتەوە. هەروەها ناحیەی چناران کە ناوەندەکەی لە (میرزا ڕۆستەم) بووە ژمارەی دانیشتوانەکەی (٥٥٠) کەس و (٣٠) گوندی سەربەم ناحیەش (٤١٨٦) کەسی بەخۆوە گرتووە تێکڕا (٨١ نێر و ٢ مێ) خوێندەوار بوون (٤) قوتابخانەی کوڕان لە میرزا ڕۆستەم هەبووە دەگەڵ ٨ مزگەوت هەر لە ناحیەدا. (٣) مامۆستا ئاماژەی پێ کراوە.

لە ناحیەی ناودەشت کە ناوەندەکەی لە سەنگەسەر بووە (١٨٧) کەسی تێدا ژیاوە و تەنیا (٢٥ نێر و ١ مێ) خوێندەوارییان زانیوە. نە قوتابخانە و نە مزگەوت ئاماژەی پێ نەکراوە. لە (٦٩) گوندی سەر ناوەندی ناحیەی ناودەشت (٨٧٩٨) کەس سەرژمێری کراون و (٥٤ نێر) خوێندەوار بوون (٤) قوتابخانەیان هەبووە. لەگەڵ (٧) کارمەندی بواری فێرکردن. ئەم زانیارییانە چاکتر لە خشتەی ژمارە (٩٦) تۆمارکراون. لە خشتەی ژمارە (٩٧)یشدا ژمارەی کارمەندان لە شار و دێهاتەکان بەم جۆرە سەرژمێری کراون (٦) پیاو لە شارەکان و (٢٧) پیاوی تر لە گوندەکان، لەناو ئەم (٣٣) کەسەدا هیچ ئافرەتێك کاری نەکردووە.

کەرکووك کە خودانی نەوت، مەزنترین کێشەی ئەمڕۆی کوردستانە، بەهۆی سەروەتی نەوت داگیرکەران دەیانەوێ لە کوردینی داماڵن و ساڵانێکی درێژە پیلانی گۆڕینی ناسنامە و بەعەرەبکردنی تێیدا پێڕەو دەکرێت، کەرکووك نەك هەر مەلبەندێکی ئابووریی دەوڵەمەند و ستراتیژییە، بەڵکە مەڵبەندی ڕۆشنبیری و خوێندەواری و کوردایەتیشە، بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە و (٨٣) گوندی سەربەشارەکە (٩١٥٨٢) کەس بووە و (١٢١١٢ نێر و ٣٠٢٥ مێ) خوێندەوار بوون و هاتووە کە ٥٩ قوتابخانەیان هەبووە، پێ دەچێت هەڵەیەکی مەزن لە تۆمارکردنەکە کرابێ کە هاتووە (٤٧) قوتابخانە لە گەڕەکی ساری کەهیە هەبووە، ڕەنگە ٧ بووبێ، نەك (٤٧). لە ناویاندا تەنیا (٣) قوتابخانەی کچان هەبووە. دەگەڵ ٢١٩ دەزگا و مزگەوت و بنکەی ئاینی پیاوان و (٣٤)ی ئافرەتان تێکڕا لەم شارەدا (١٨٥ نێر و ٧٢ مێ) کار هەڵسووڕێنەری

بواری فێربوون و دەرسبێژی بوون. ئەمە لە خشتەی ژمارە (٩٨) دەردەکەوێ.

ئینجا لە ناحیەی قەرەحەسەن و (٥٥) گوندی سنووری دەسەڵاتی ئیداریی ئەم ناحیە و ناحیەی پردێ و (٥٠) گوندی سەر پێی، (٢٨٨١٨) کەس سەرژمێری کراون و لە ناویاندا (٦٥ نێر و ٥٥ مێ) توانای خوێندن و نووسینیان هەبووە و لە تێکڕای ئەمانەدا تەنیا لە گەڕەکی (تسن)ی پردێ ١ قوتابخانەی کوڕان و یەکێکی کچان و (٥)ی تری کوڕان لە گوندەکانی سەر بەم ناحیە هەبوونە، دەگەڵ سێ مزگەوتی پیاوان و تێکڕاش ٤٦ پیاو و ٤ ئافرەت لە بواری پەروەردە و فێرکردن لە هەر دوو ناحیەدا لەناو ٢٨٨١٨ کەس کاریان کردووە، وەکو لە خشتەی ژمارە (٩٩) تۆمارمان کردووە.

هەر لەم پارێزگایە پانوپۆڕە و بەرفرەیەدا، دەردەکەوێ لە ناحیەی ملحە و (٧٦) گوندی سنووری ناحیەکە (١٥٣٢٦) کەس ژیاون و (٢٨٤ نێر و ٥ مێ) خوێندەوار بوون و تەنیا (١) قوتابخانەی کوڕان لە ناوەندی ناحیە هەبووە و هیچ مزگەوتێك ئاماژەی پێ نەکراوە، (٥) کارمەندی پیاو لە بواری فێرکردن کاریان کردووە و لە ناحیەی (شوان)یش کە (٧٦) گوندی بەخۆوە گرتووە لەم ساڵدا، (١١٢٠٠) کەس لەم ناوچەیە ژیاون بەپێی سەرژمێرییەکە (١٣٢) نێر خوێندەوار بوون هیچ قوتابخانە و مزگەوتێکیان نەبووە، یا ئاماژەی بۆ نەکراوە. هاتووە کە (١٧) کەس لە بواری فێرکردن کاریان کردووە، واتە هەر دەبێ هیچ نەبێ مزگەوتیان هەبووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە خشتەی ژمارە (١٠٠).

قەزای چەمچەماڵ و ناحیەی ئاغجەلەر و سەنگاویش کە سەر بەپارێزگای کەرکووکن ژمارەیەکی زۆر حەشیمەتی هەبووە، تا ئێستاش بەدەست کوێرەوەری نەبوونی و زوڵمی شۆڤینییانەوە دەناڵێنێ. گەرمیان گەرمەگەرمی چەوسانەوەیە. بەپێی خشتەی ژمارە (١٠١) بەم جۆرە سەرژمێری کراون. ناوەندی قەزای چەمچەمال و (٦٥) گوندی سەربەم قەزایە (١١٩٣٧) کەس ژیاون و (٢٩٤ نێر و ٣١ مێ) خوێندەوار بوون و قوتابخانەیان نەبووە و ٤ مزگەوتی پیاوانیان هەبووە دەگەڵ ١٣ دەرسبێژی پیاو.

لە ناحیەی ئاغجەلەر و (٥٥) گوندی تری سەر بە ناحیەکە (٩٥٦٧) کەس ژیاون، لە ناویاندا (١٩٣ نێر و ٥ مێ) توانای خوێندن و نووسینیان تێدا بووە نە قوتابخانە و نە مزگەوت تۆمارنەکراون و (١٧) پیاو لە بواری فێرکردن کاریان کردووە، لە ناحیەی سەنگاو (٦٦) گوندی سەر بەناحیەکە (٨٣٠١) کەس سەرژمێر کراون و (٨٤ نێر و ٢ مێ) خوێندەوار بوون قوتابخانەیان نەبووە و ٤ مزگەوتی پیاوانیان هەبووە و (٥) پیاو کاری لە بواری دەرسبێژی کردووە.

شاری کفری و ناحیەکانی (پێباز و قەرەتەپە و شێروانە)ش. ناوەندی قەزای کفری (٦١) گوندی سەر بەم ناوەندە ئیدارییە، (١٠٦٤٠) کەس ژیاون و لە نێو ئەم ژمارەیەدا (٧٦٣ نێر و ١١٦ مێ) خوێندەوارن و دوو قوتابخانەی کوڕان و ١١ مزگەوتی پیاوان و ١ی ئافرەتان هەبووە، کە ٢٤ پیاو و ٤ ئافرەت لە بواری فێرکردن و دەرسبێژییەوە کاریان کردووە، لە ناحیەی قەرەتەپە و ٩٨ گوندی سەر بەناحیەکە ، (٢١٠٥٦) کەس سەرژمێری کراون و (٤٣٢ نێر و ١٩ مێ) خوێندەوار بوون و قوتابخانەیان نەبووە و یەك مزگەوت ئاماژەی پێ کراوە و (١٥) پیاو و لە بواری دەرسبێژی و فێرکردنەوە کاریان کردووە. هەروەها لە ناحیەی شێروانە، کە سەرقەڵا ناوەندی ناحیە بووە لەگەڵ گوندی کەلار و (١٣٠) گوندی تری سەر بەئیدارەی ناحیەی شێروانە (١٧٥٦٦ ) کەس ژیاون و (٢٨٠ نێر و ٢٠ مێ) خوێندەوار بوون و دوو قوتابخانەی کوڕان و دوو مزگەوتی پیاوانیان هەبووە (٥) پیاو لە بواری دەرسبێژی و فێرکردنەوە کاریان کردووە، وەکو لە خشتەی ژمارە (١٠٢)دا دەردەکەوێ.

هەر بەپێی سەرژمێریی ١٩٤٧، کە لە خشتەی ژمارە (١٠٣) چڕکراوەتەوە لە قەزای (داقووق) ناحیەی (توزخورماتوو). کە لە ناوەندی ناحیەی توزخورماتوو سەربەم گوندەکانی نێو سنووری ناحیەکە (٨٨) گوند هەبووە (٢٩٦٨٦) کەس سەرژمێری کراون و لە ناویاندا (١٢٧٢ نێر و ٧٩ مێ) خوێندەوار بوون ئاماژە بەهیچ قوتابخانەیەك نەکراوە و تەنیا (١) مزگەوت تۆمارکراوە، لەگەڵ (٣٨) کارمەند و مامۆستا و وتاربێژی پیاو و (٣) ئافرەت.

ئینجا لە قەزای داقووق و ٦٩ گوندی سەر بەناوەندی قەزا (١٤٦٤١) کەس سەرژمێری کراون و لەناو ئەم ژمارەیەدا (٤٣٦ نێر و ٢٩ مێ) خوێندەوار بوون، (٢) قوتابخانەی کوڕان و (٧ ) مزگەوتی پیاوان هەبووە و (١٠) پیاو لەم بوارەدا کاریان کردووە. لە ناحیەی قادرکەرەم و (٨٦) گوندی سنووری ناحیەکە (١٤٦٨٩) کەس سەرژمێری کراون (٢٠٩ نێر و ٦ مێ) توانای خوێندوە و نووسینیان هەبووە، هیچ قوتابخانەیەکیان نەبووە و ٣ مزگەوتی پیاوان و (٥)ی ئافرەتان هەبووە و تەنیا (٦) کەس لە بواری دەرسبێژییەوە کاریان کردووە. ئەمانە لە خشتەی ژمارە (١٠٤) تۆمارکراون.

بۆ زانیاریی زیاتر لە مەڕ ژمارەی مامۆستا و کارمەند و دەرسبێژەکانی ناوشار و لادێیەکانی سەر بەپارێزگای کەرکووکی کوردان و قەزا و ناحیەکانی سەربەم ناوەندە ئیدارییە بنۆڕە خشتەکانی ژمارە (١٠٥) و (١٠٦) و (١٠٧) و (١٠٨). کە بەم جۆرە بووە

له کۆی (٣٢٩) کەس لەناو شاری کەرکووك و ناحیەی قەرەحەسەن و پردێ و ملحە و شوان (٨٧) پیاو و (٧٣) ئافرەت لەناو شار و لە گوندەکانیشدا (٦٦) پیاو و (٣) ئافرەت تۆمارکراون. لە شاری چەمچەماڵ و ناحیەی ئاغجەلەر و سەنگاویشدا لە کۆی (٣٥) کەس (١٦) پیاو لە شار و (١٩) پیاوی تر لە دێهاتەکان سەرژمێر کراون و هیچ ئافرەتێك نابینرێ و لە ناوەندی قەزای کفری و ناحیەی قەرەتەپە و ناحیەی شێروانەشدا لە کۆی (٤٤) کەس ٣٠ پیاو و ٣ ئافرەت لەناو شار و ١٤ پیاوی تر لەناو دێهاتەکان ناویان تۆمارکراوە. دوا دەڤەر، قەزای داقووق و ناحیەی قادر کەرەم و ناحیەی توزخورماتووە کە تێکڕا (٥٦) کەس وەکو کارمەند و مامۆستا و دەرسبێژ تۆمارکراون و لە ناویاندا (٣٣) پیاو (٣) ئافرەت لە ناو شار و (٢١) پیاویش لە دێهاتەکان کاریان کردووە.

ئەم سەرژمێرییە زۆر کارئاسانی بۆ خوێندنەوەی مێژووی کوردستان دەکا، دەگەڵ ئەوەشدا لە کورتبینی و کەموکوڕی و هەڵە بەدەر نییە، بەڵام بەگشتی نەخشەیەکی ورد لە بواری سەرژمێری و واقیعی خوێندەواری و سەرجەم قوتابخانە و بنکە ئاینییەکاندا دەخاتە ڕوو، لە هەندێك شوێن کاریگەریی ڕووداوە سیاسییەکان بەئاشکرا بەدیار دەکەوێ و لە هەندێکی تریش نادروستیی هەندێك زانیاریی تۆمارکرا و بەزەقی ڕووبەڕووت دەبنەوە. ئینجا دەردەکەوێ ژمارەی ئافرەتان لە پیاوان لە زۆربەی دەڤەر و ناوچە و شار و دێهاتەکان پترە، بەڵام ڕێژەی خوێندەواری لەناو پیاوان بەڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە ئافرەتان پترە. زۆر ناوچە و گوند و شار تا ساڵی ١٩٤٧یش قوتابخانەیان نەبووە، لە زۆر خزمەتی مرۆڤانە بەدوور بوونە، سەرباری سیاسەتی جینۆساید و ڕاگواستن و پشتگوێخستن، کۆمەڵگای کوردستان لەو ساڵاندا بەدەست کوێرەوەری و نەخوێندەوارییەوە ناڵاندوویەتی.

لەم سەرژمێرییەدا ئاماژە بەژمارەی (ئەدیب و نووسەر و ڕۆژنامەنووسانی) کورد لەناو شار و دێهاتەکان کراوە، کە هەوڵ دەدەین لێرەدا بیانخەینە سەر لاپەڕەوە. لەناو شاری هەولێر هاتووە کە (١٠) ئەدیب و ڕۆژنامەنووس و هونەرمەند هەبوونە و هیچیان ئافرەت نین، لە شاری دهۆکیش (٢) کەسی تر هەن کە ئافرەتیان لە ڕیزدا نییە، لە ناوەندی ناحیەی مانگێش لە گەڕەکی بەڕۆشکی (١) کەس کە پیاوە ناوی تۆمارکراوە و چوار پیاوی تریش لە گوندەکانی سەر بەناحیەی ئەترووش ناویان تۆمارکراوە. لە ناوەندی قەزای ئاکرێ (٢) کەسی تر ناویان تۆمارکراوە ئەدیب و هونەرمەند بوون ئەمانیش ئافرەتیان تێدا نییە، لە قەزای شێخانیش (١) پیاو ناوی لەم بوارە تۆمارکراوە و ئینجا لە

قەزای سنجار (٢) پیاو ناویان تۆمارکراوە و لە ناحیەی شێخانی سەر بەژەنگاریش (٣) ئەدیب و ڕۆژنامەنووس و هونەرمەند هەن. لەناو شاری سلێمانیشدا (١١) پیاو ناویان تۆمارکراوە لە قەزای هەڵەبجەشدا، پیاوێکی تر هەیە هەروەها لە ناحیەی ماوەتی سەر بەقەزای شاربازێڕ (١) ئەدیبی تر تۆمارکراوە و لە کۆیەشدا بەهەمان جۆر (٢) پیاو ناویان لەم ڕیزە تۆمارکراوە لە پشدەریش بەهەمان جۆر لە قەڵادزێ (٢) پیاو هەبوونە و لە کەرکووکدا (١٢) کەس هەن هیچ ئافرەتێکیان لەگەڵدا نییە، لە ناحیەی شوان (١) کەسی تر هەیە. لە توزخورماتووشدا (٣) کەسی تر کە ئەوانیش هیچ ئافرەتێکی نەگرتووەتەوە. کۆی گشتیی تۆمارکراون لەئەدیب و هونەرمەند و ڕۆژنامەنووس (٥٨) کەسە. لەم ژمارەیەدا هیچ ئافرەتێك ناوی تۆمار نەکراوە یاخود بەدروستی ئافرەتمان نەبووە لەم بوارە وەدیارکەوتبێ. بێ گومان کوێرەوەرییە لە کۆی ژمارەی نەتەوەیەکدا تەنیا (٥٨) کەس کاری ڕۆشنگەری و وشە و ئەدەبیان لە ئەستۆ گرتبێ.

هەروەها لە سەرجەم شار و دێهات و شارەدێیەکانی کوردستانی باشووردا (١٦٦٩) مامۆستا و دەرسبێژ لە بواری پەروەردە و فێرکردن و دەرسبێژییەوە لە قوتابخانە و مزگەوتەکاندا تۆمارکراون کە قەت جێگەی بەراوردکردن لەگەڵ ژمارەی دانیشتووان نییە، چونکە پێویستی مامۆستا و فێرکەر دەبێ چەندەها قات لەمە زۆرتر بووایە و ژمارەی قوتابخانەکانیش لەمە پتر بوونایە. کە لەناو ئەم ژمارەیەدا تەنیا (١٧٢) ئافرەت لەم بوارە کاریان کردووە.

(٢٢٣) قوتابخانەی کوڕان لە سەرجەم شار و شارۆچکەکان تۆمارکراوە، هەروەها (٢٢) قوتابخانەی کچانیش بەپێی سەرژمێریی ١٩٤٧ هەبووە.

تێکڕای ژمارەی دانیشتووانی هەرێمی کوردستان (٩١٥١٦٦) کەس بووە، دیارە لەم سەرژمێرییەدا ئاماژە بۆ کوردانی دانیشتووی بەغدا و مووسڵی لە بیرکراوی کوردستان و ناوچە عەرەبییەکانی تری عێراق نەکراوە، کە ژمارەیەکی زۆری کوردیان تێدا دەژێ بەتایبەتی ناو بەغدا و مووسڵ. ژمارەی ئافرەتان زۆر لە ژمارەی پیاوان زۆرترە.

ئەگەر لێکدانەوەیەکی ورد بکەین بۆمان دەردەکەوێ لەناو نزیکەی یەك ملیۆن کەس، کە بێ گومانە ژمارەی دانیشتووانی کوردستانی باشوور لە ساڵی ١٩٤٧ لەم ژمارەیە زۆرتر بووە، بەڵام بەبەراورد دەگەڵ ئەم ژمارەیەدا دەردەکەوێ ڕێژەی خوێندەواری زۆر نزم بووە (٣٩٦٢٨ نێر و ٧٦٥٦ مێ) توانای نووسین و خوێندنیان هەبووە، کە تێکڕا دەکاتە (٤٧٢٨٤) کەسی تواندار بۆ خوێندوە و نووسین تەنیا لەم وڵاتە گڕگرتووەی

ڕۆژهەڵاتدا (١٩،٣٥٪) خوێندەوار بوون. ئەگەر بەراوردی بکەین دەبینین نزیکەی (٣٧٠٤٠) کەس یەك قوتابخانەیان بەر دەکەوێ. ئەم ژمارەیەش دەردەسەری و کوێرەوەرییەکی زۆری بەدواوەیە هەر لەبەر ئەوەشە شاعیرانی سەدەی بیستەم یەك ئامانجی جەماوەرییان هاندانی خەڵك بووە بۆ خوێندەواری، ئەو بوارەی کە داگیرکەران دەستیان بەسەر داگرتبوو، تا میللەت لێی دووربکەوێتەوە و نەخوێنێ. هەر کۆیلە چاوبەستراو بمێنێتەوە، هەروەك لایەنی دووەمیان دەرکەوتنیان لە قاوغی مزگەوت. ڕووکردنە خوێندنی زانستی بووە، چونکە مزگەوتەکان لە چوارچێوەی دیاریکراو و ژمارەیەکی یەکجار کەم توانیویانە دەرس بخوێنن، خوێندنەکەشیان هەر لە چوارچێوەی زانستی قورئانی و ئیسلامیدا بووە، سەرباری ئەوەی کە ڕەشە خەڵکەکە بەهۆی گرانی و نەبوونییەوە نەیتوانیوە منداڵی ڕەوانەی شار و دێهاتە دوورەکان بکا بۆ خوێندن. یا ئاغا و کوێخا و دەرەبەگی لادێکانی کوردستانیش تەگەرەیەکی گەورەیان لە بەردەم ئەم پرۆسەیەدا دروست کردووە، بەدوو ئامانج تا دەسەڵاتی خوێندەواری و زانست و مەعریفەت هەر لە چوارچێوەی مزگەوتدا بێنێتەوە کە خۆیان دەتوانن بەسانایی دەستی تێوەردن و ئاراستەی بکەن، دووەم تا منداڵی جوتیاری کرێ گرتە بەزەوییەوە هەر وابەستەی وەهمی دەسەڵات و چارەنووسی گرێدراو بەزەوییەکانەوە بمێننەوە، تەنیا نەوە و نەوەزادی خۆیان سوود لە هەلومەرجی خوێندن وەربگرن، ئینجا ڕۆڵی مەلاش هاوشان و تەبا دەگەڵ هەڵوێستی ئاغاکان، پروپاگەندەی زۆریان دژی ئەم پرۆسەیە دەکرد کە ئەوەی بچێتە مەدرەسە، فەرمەسۆنە! لە دین وەردەگەڕێت و فێری عیلمی شەیتان دەبێ.

دەبێ ئاماژە بە سەرهەڵدان و دەرکەوتنی بزاڤی ڕۆشەنگەری کوردی لەو ئان و ساتەدا بکرێ، کە لە ڕوانگەی پێشکەوتن و وریاکردنەوەی گەل، هاوکات دەگەڵ سەرهەڵدانی بزاڤی سیاسیی نوێخواز لە ژێر کاریگەریی گۆڕانکارییەکانی پێش و دوای شەڕی دووەمی جیهانی، پەیدا بوون گرووپی سیاسیی کوردی تازە بەعەقڵ و پرۆژەی تازە و لە دایکبوونی پارتی و ڕووداوەکانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد ئەمانە هەر هەموویان، ڕێگەخۆشکەرێك و هاندەرێك بوون بۆ وریابوونەوەی خەڵك و ڕووکردنە قوتابخانە. بزاڤی ڕۆشنگەری داوای خوێندن و خوێندەواریی کردووە، داوای هەڵکردنی چرای زانستی کردووە، سەرباری بزاڤی سیاسی کە ئامانجی هاندان و داواکردنی کردنەوەی قوتابخانەی کوردی و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بووە لەناو کۆمەڵگای کوردستاندا. و خوێندن بەتاکە ڕێگەی دەرباز بوون لە کوێرەوەری و نەزانین بەگەیشتن بەڕزگاری زانیوە.

## خشتەی ژمارە (٦١)

### سەرژمێری ئەوانەی لە بواری پەروەردە بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
### شار(هەولێر) ناحیە ( )

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| ناوەندی قەزای هەولێر | ٥٨ | ١٩ | — | — |
| ناحیەی قوشتەپە | — | — | ١٢٢ | ٢ |
| ناحیەی شەقلاوە | ١٥ | ١ | ٣٤ | — |
| تێکرا | ٩٣ | ٢٠ | ١٥٦ | ٢ |

## خشتەی ژمارە (٦٢)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧
### شار – قەزای (مەخمور) ناحیەی ( گوێڕو کەندێناوە)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و رۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| گەڕەکی سەرای | ٢٢٣ | ١٩٥ | ٦٥ | ١٤ | ١٢٧ | ١٥٣ | — | — | — | — | | | — | — |
| گەڕەکی بندیان | ٣٣٥ | ٣٢٤ | ٥١ | ١ | ٢٢٩ | ٢٧٣ | — | — | — | — | | | ٢٥ | — |
| گەڕەکی شێروان | ٢٢٦ | ٢٥٥ | ٤٧ | ٥ | ١٧٢ | ٢٠٣ | — | — | — | — | | | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی ١٠٤ گوندە | ٥٤١٤ | ٦٢٦٩ | ١٧٣ | ٤ | ٣٩٢٣ | ٤٩٣٠ | — | — | ١٠ | — | | | — | — |
| ناحیەی گوێڕ | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیە | ٣٤٧ | ٣٥٣ | ٧٥ | ٢ | ١٩٤ | ٢٩٩ | — | — | — | — | — | — | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٥٠ گوندە | ٦٢٠٩ | ٦٧٨٤ | ٢٩٢ | ٦ | ٤٥٣٩ | ٥٤٤٦ | ٤ | — | — | — | — | — | ٢١ | — |

| ناحیەی کەندێناوە | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ناوەندی ناحیەی دیبەگە | ٤٩٨ | ٥٢٠ | ٦٧ | ٢ | ٣٠٦ | ٤٠٦ | — | — | — | — | — | — | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی١٤٨ گوندە | ٩٨٠٢ | ٩٠٣٢ | ٣٦١ | ٧ | ١٣١٥١ | ٧٧٩٦ ١ | — | — | — | — | — | — | — | — |
| | ١٩٣٢٧ | ٢٢٩١٥ | ١١٩٢ | ٦٤ | ٥٤٥٢ | ٧٠٥٦ | — | — | ١٦ | — | | | ٦٥ | — |
| تێکڕا | ٤٧٧٨٥ | | ١١٧٢ | | ٣٣٧٠٨ | | ٤ | | ٢٦ | | | | ١١١ | |
| ناحیەی شەقڵاوە | | | | | | | | | | | | | | |
| گەڕەکی ئیسلام | ٩٦١ | ١٠٣٩ | ٢١١ | ١٨ | ٥٨٢ | ٨٢٩ | — | — | ٩ | — | | | — | — |
| گەڕەکی نەساری | ٦٦١ | ٦٩٣ | ١٣٧ | ١٢ | ٤٠٤ | ٥٤٦ | — | — | — | — | | | ٤٩ | ١ |
| ژمارەی گوندەکانی ٢٧ گوندە | ٦٠٧٠ | ٧٢١٩ | ١٧٣ | ٩ | ٤٧٥٢ | ٦٠٨١ | ٨ | — | ١ | — | | | — | — |
| | ١٣٥٢ | ٨٩٥١ | ٥٢١ | ٣٩ | ٥٧٣٨ | ٧٤٥٦ | | | | | | | | |
| تێکڕا | ١٠٣٠٣ | | ٥٦٠ | | ١٣١٩٤ | | ٨ | | ١٢ | | — | | | ٥٠ |
| کۆی گشتی هەردوو ناحیە | ٥٢٥٤٥ | | ١٨١٦ | | ٤٥٦١٧ | | ١٧ | | ٥٦ | | — | | ١٧٤ | |

### خشتەی ژمارە (٦٣)

### سەرژمێری ئەوانەی لە بواری پەروەردە بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە شاری (مەخمور) ناحیە ( )

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| ناوەندی قەزای مەخمور | ٩ | — | ١٦ | — |
| ناحیەی گوێڕ | — | — | ٢١ | — |
| ناحیەی کەندێناوە | ٤ | — | ٦١ | — |
| تێکڕا | ١٣ | | ٩٨ | ١١١ |

## خشتەی ژمارە (٦٤)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (ڕواندوز) ناحیەی (  )

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | مزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| گەڕەکی ژووروێ | ١٢٦٦ | ١٣٥٣ | ٤٢٤ | ٩٠ | ٦٢٥ | ١٠٤٥ | ٥ | — | ٤ | — | | | — | — |
| گەڕەکی کاولۆك و کانی قوڕ | ٣٣٠ | ٢٦٢ | ٢٩ | ٣ | ٢٣٤ | ٢٨٨ | — | — | — | — | | | — | — |
| گوندی دیانا | ٩٨١ | ٦٧٥ | ١٩٨ | ٦ | ٦٧٨ | ٥٥٨ | — | — | ٣ | — | | | — | — |
| گوندی خەیلانی | ٣٨٥ | ٧٧٥ | ٢ | — | ٣١٣ | ٦٦٦ | — | — | — | — | | | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی٧٨ گوندە | ٥١٢٦ | ٦٩٢٢ | ١٣٠ | ١ | ٣٩٦٦ | ٥٨٠٥ | — | — | ٣ | — | — | — | — | — |
| تێکڕا | ١٨١٥٥ | | ٨٣٣ | | ١٤١٧٨ | | ٥ | | ١٠ | | — | | ٢٠ | |

## خشتەی ژمارە (٦٥)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (ڕواندوز) ناحیەی (باڵەك ودێرە حەریرو برادۆست ومێرگەسۆر)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | مزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| ناحیەی باڵەك | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی گەلاڵە | ٣٦٩ | ٣٣٨ | ٥٤ | ٥ | ٢٤٦ | ٢٨٠ | ١ | — | — | — | | | — | — |
| ڕۆست | ٤٧١ | ٥٣٥ | ١٢ | — | ٣٥١ | ٤٤٩ | — | — | — | — | | | ١٠ | ١ |

|  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی گوندەکانی ٦٣ گوندە | ٣٤٠٢ | ٤٦٣٤ | ١٣٧ | ٤ | ٢٥٨٧ | ٣٨٩٩ | — | — | — | — |  |  | — | — |
| ناحیەی حەریر |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |
| باتاسی و ئیسلام و ئاشوری | ٤٥٤ | ٤٦٢ | ١١٦ | ١١ | ٢٧٦ | ٣٩١ | — | — | ٢ | ١ | — | — | ١٤ | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٧٣ گوندە | ٣٥٥٥ | ٤٥٧٠ | ١٣٢ | ٧ | ٢٧٠٣ | ٣٧٩٣ | ١ | — | — | — | — | — | — | — |
| تێکرا | ٨٢٥١ | ١٠٥٣٩ | ٤٥١ | ٢٧ | ٦١٦٣ | ٨٨١٢ | ٢ | ١ | — | — | — | — | ٢٤ | ١ |
|  | ١٨٧٩٠ |  | ٤٧٨ |  | ١٥٠٧٥ |  | ٢ |  | ٣ |  | — |  | ٢٥ |  |
| ناحیەی برادۆست |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |
| ناوەندی ناحیەی سیدەکان | ٢٤٣ | ٢٢٤ | ٣١ | — | ١٧٤ | ١٨٧ | — | — | ٢ | — |  |  | — | — |
| گوندەکانی ٨٠ گوندە | ١٣٢٧ | ٢١٢٦ | ٣٤ | ١ | ١٠٠٨ | ١٧٨٥ | — | — | — | — |  |  | – | — |
| تێکرا | ١٥٧٠ | ٢٣٥٠ | ٣٤ | ١ | ١١٨٢ | ١٩٧١ | — | — | — | — |  |  | ٨ | — |
|  | ٣٩٢٠ |  | ٦٦ |  | ٣١٥٤ |  |  |  | ٢ |  |  |  | ٨ |  |
| ناحیەی مێرگەسوور | ١٤٧٨ | ٢٦٨٠ | ٥٨ | — | ١٠٩٨ | ٢٢٩٣ | — | — | — | — | — | — | — | — |
| تێکرا | ٤١٥٨ |  | ٥٨ |  | ٣٣٩١ |  |  |  |  |  |  |  |  |  |
| تێکرا | ٣١٨٦٨ |  | ٦٠٢ |  | ٢١٦٢٠ |  | ٢ |  | ٤ |  | — |  | ٣٣ |  |

**خشتەی ژمارە (٦٦)**

**سەرژمێری ئەوانەی لەبواری پەروەردە بە پێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە**

**شار (رواندز) ناحیە (  )**

|  | شار |  | لادێ |  |
|---|---|---|---|---|
| شوێن | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| ناوەندی قەزای ڕواندوز | ١٤ | ٣ | ٣ | — |
| ناحیەی حەریر | ٦ | — | ٨ | — |
| ناحیەی باڵك | ٢ | — | ٨ | ١ |
| ناحیەی برادۆست | ٣ | — | ٥ | — |
| تێکرا | ٢٨ |  | ٢٥ | ٥٣ |

## خشتەی ژمارە (٦٧)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (دهۆک) ناحیەی (دهۆک)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و رۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| گەڕەکی سەلام | ١٥٤٣ | ١٥٧٩ | ٤٧٣ | ١٣٢ | ٨٢٢ | ١٢٠٨ | — | — | ١٢ | — | | | — | — |
| گەڕەکی شیلی | ٤٠٨ | ٤٠٧ | ٧١ | ١٣ | ٢٦٧ | ٣٢٨ | — | — | — | — | | | ٢١ | ١ |
| گەڕەکی نەساری | ٣٨١ | ٣٦١ | ٨٧ | ١٦ | ٢٢٠ | ٢٩٩ | — | — | ١ | ١ | ٢تەنیا پیاو | | — | — |
| گەڕەکی یەهود | ٦٢٢ | ٣٠٢ | ١٨٣ | ١٩ | ٣٩٧ | ٢٤١ | ٨ | — | — | — | — | — | — | — |
| | ٢٩٥٤ | ٢٦٦٧ | ٨١٤ | ١٨٠ | ١٧٠٦ | ٢٠٧٦ | ٨ | — | ١٣ | ١ | ٢ | — | ٢١ | ١ |
| تێکڕا | ٥٦٢١ | | ٩٩٤ | | ٣٧٨٢ | | ٨ | | ١٤ | | ٢ | | ٢٢ | |
| ناحیەی دهۆک | | | | | | | | | | | | | | |
| ژمارەی گوندەکانی ١٣٠ گوندە | ٦٧٢٨ | ٧٠٩٦ | ١٤٨ | ٣ | ٥٢٣٨ | ٥٧٩٤ | — | — | ٨ | — | | | ٦ | — |
| | ١٣٨٢٤ | | ١٥١ | | ١١٠٣٢ | | — | | ٨ | | | | ٦ | |
| تێکڕا | ٩٦٨٢ | ٩٧٦٣ | ٩٦٢ | ١٨٣ | ٦٩٤٤ | ٧٨٧٠ | ٨ | — | ٢١ | ١ | ٢ | | ٢٧ | ١ |
| | ١٩٤٤٥ | | ١٠٤٥ | | ١٤٨١٤ | | ٨ | | ٢٢ | | ٢ | | ٢٨ | |

## خشتەی ژمارە (٦٨)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لە شار و دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (دهۆك) ناحیەی (دۆسکی و مزوری)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| ناوەندی ناحیە مانگیش | ٥٨٠ | ٩١٥ | ١٣٥ | ١٤ | ٣٦٥ | ٥٠٨ | — | — | — | — | | | — | — |
| بەرۆشکی | ٤٢٩ | ٤٥٨ | ٢٤ | — | ٣١٦ | ٣٥٥ | — | — | ٢ | — | | | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٥٤ گوندە | ٣٥٠٦ | ٣٩٤٦ | ٧٢ | ٤ | ٢٦٧٣ | ٣١٢٦ | — | — | ٢ | — | ١پیاو | | ٨ | — |
| | ٤٥١٥ | ٥٠١٩ | ٢٣١ | ١٨ | ٣٣٥٤ | ٣٩٨٩ | — | — | ٤ | — | | | — | — |
| تێکڕا | ٩٥٣٤ | | ٢٤٩ | | ٧٣٤٣ | | — | | ٤ | | ١ | | ٨ | |
| ناحیەی مزوری | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی ئەتروش | ٨٠٠ | ٨٢٧ | ١٢١ | ٤ | ٤٩٨ | ٦٥٩ | — | — | — | — | | | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٦٤ گوندە | ٤٠٠٤ | ٤٢٣٣ | ١٦٦ | ٦ | ٢٨٣٧ | ٣٢٨٠ | ٩ | — | ٦ | — | ٤پیاو | | ١٢ | — |
| | ٤٠٨٤ | ٥٠٦٠ | ٢٧٨ | ١٠ | ٣٣٣٥ | ٣٩٣٩ | ٩ | — | ٦ | — | ٤ | | ١٢ | — |
| تێکڕا | ٩٨٦٤ | | ٢٩٧ | | ٧٢٧٤ | | ٩ | | ٦ | | ٤ | | ١٢ | |
| تێکڕا | ٩٣١٩ | ١٠٠٧٩ | ٥١٨ | ٢٨ | ٦٦٨٩ | ٧٩٢٨ | ٩ | — | ١٠ | — | ٥ | | ٢٠ | — |
| | ١٩٣٩٨ | | ٥٤٦ | | ١٤٦١٣ | | ٩ | | ١٠ | | ٥ | | ٢٠ | |

## خشتەی ژمارە (٦٩)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (ئامێدی) ناحیەی ( )

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| ناوەندی قەزای ئامێدی | | | | | | | | | | | | | | |
| گەڕەکی سرویکی | ٤٠٥ | ٤٥١ | ١٥٢ | ٢٧ | ١٧٧ | ٣٥٢ | – | – | ٩ | ٣ | | | – | – |
| گەڕەکی یەهود | ١٤٦ | ١٦٣ | ٢٥ | ١ | ٩٩ | ١٣١ | – | – | – | – | | | – | – |
| گەڕەکی مەیدان | ٢٣٧ | ٢٢٧ | ٨٠ | ١٨ | ١٣٤ | ٣٦١ | – | – | – | – | | | – | – |
| گوندی ڕۆیاڵ | ٤٣٣ | ٤١١ | ٧٩ | ٥ | ٢٦٢ | ٣٦١ | – | – | – | – | | | – | – |
| گوندی ئەدران نەساری | ٥٧١ | ٥٣٧ | ٣٧١ | ١٤ | ٩٢ | ٤٠٠ | – | – | ٢ | ١ | | | – | – |
| بامەڕنێ | ٩٤٤ | ٩٩٤ | ٢١١ | ٤ | ٥٥٦ | ٨١١ | – | – | ٨ | – | | | – | – |
| ژمارەی گوندەکان | ٨٨٧١ | ٩٢٨٧ | ٧٥١ | ٢١ | ٦٨١٩ | ٧٤٦٤ | – | – | ٥ | ١ | | | – | – |
| | ١١٦٠٧ | ١٢١٠٢ | ١٠٨٧ | ٧٢ | ٨١٣٩ | ٩٦٨٦ | – | – | ٢٤ | ٥ | | | ٦ | ١ |
| تێکڕا | ٢٣٧٠٩ | | ١١٥٩ | | ١٧٨٢٥ | | – | | ٢٩ | | | | ٧ | |

## خشتەی ژمارە (٧٠)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (ئاکرێ) ناحیەی (سورچی و عەشایر سبعەو بیرەکبیرە)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فیرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| گەڕەکی کوارە | ٩٠٧ | ١٠٤٤ | ١٩٠ | ٣٠ | ٥٥١ | ٨٣٧ | – | – | – | – | | | – | – |
| گەڕەکی قابەگی | ٥٦٤ | ٥٥٥ | ١٢٤ | ١٢ | ٣٣٥ | ٤٤٥ | – | – | – | – | | | – | – |
| گەڕەکی جوستیە | ٩١٧ | ٩٣٧ | ١٣٦ | ٧ | ٦٠١ | ٧٨٦ | – | – | – | – | ٢پیاو | | ٨ | ٣ |
| گەڕەکی زیوکە | ٥٤٣ | ١١٦ | ١٠٨ | – | ٤١٤ | ٩٦ | – | – | – | – | | | – | – |
| ناحیەی سورچی | ٣٠٢٩ | ٤٣٨٤ | ٣٩ | ١ | ٢٤٦٥ | ٣٧٣٦ | – | – | – | – | | | ٣ | – |
| ناحیەی عەشایر سبعە | ٤٢٤٤ | ٦٠٢٧ | ١٤٤ | ١ | ٣٣٨٥ | ٤٩٤١ | – | – | – | – | | | – | – |
| ناحیەی بیرەکبیرە | ٣٩٠٢ | ٤٩٣٠ | ٥٤ | – | ٢٩٦٣ | ٤٤٢٦ | – | – | – | – | | | – | – |
| | ١٤١٠٢ | ١٥٣٤١ | ٢٣٧ | ٢ | ١٠٧١٤ | ١٥٢٦٧ | ١ | – | – | – | ٢ | | ١٧ | ٣ |
| تێکڕا | ٢٣٠٩١ | | ٨٤٦ | | ٢٥٩٨١ | | ١ | | ٢ | | | | ٢٠ | |

## خشتەی ژمارە (٧١)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار - قەزای (شێخان) ناحیەی (عین سفنی)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| قەزا | | | | | | | | | | | | | | |
| گەڕەکی تەختانی | ٧٠٩ | ٧٤٩ | ١٩٣ | ٣٠ | ٣٧٠ | ٦٠٢ | — | — | — | — | | | — | — |
| گەڕەکی سینا | ٧٢١ | ٧٤٤ | ١١٧ | ١١ | ٤٦٠ | ٦٠٨ | — | — | — | — | ١پیاو | | ٤ | — |
| گەڕەکی قاشا | ٤٦٣ | ٤٨٠ | ٩٧ | ٢٢ | ٢٧٠ | ٣٧٨ | — | — | — | — | | | — | — |
| گەڕەکی ئورو | ١٢٩ | ١٣٦ | ٤٠ | ١٦ | ٦٨ | ١٠١ | — | — | — | — | | | — | — |
| گوندی چنارەی گەورە | ٥١٧ | ٥٣٢ | ١ | — | ٤١٧ | ٤٢٥ | — | — | ٦٧ | ٢ | | | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٥٠ گوندە | ٤٨٠٨ | ٦٠٣٤ | ٦٨ | ٣ | ٣٨٣٨ | ٤٩٤٤ | — | — | ٢ | — | | | — | — |
| ناحیەی عین سفنی | ٨٤٤ | ٨٣١ | ١٣٥ | ١٣ | ٥٨٨ | ٦٦٣ | — | — | — | — | | | ١٣ | — |
| گوندی شێخکە | ٣٦٦ | ٤١٧ | ٥ | — | ٢٩٥ | ٣٣٣ | — | — | — | — | | | — | — |
| ژمارەی گوندەکان | ٤٨٠٨ | ٦٠٣٤ | ٦٨ | ٣ | ٣٨٣٨ | ٤٩٤٤ | — | — | ٢ | — | | | — | — |
| | ١٣٣٧٠ | ١٥٩٥٧ | ٧٢٤ | ٩٨ | ١٠١٤٤ | ١٢٩٩٧ | — | — | ٧١ | ٢ | ١ | | ١٧ | — |
| تێکڕا | ٢٩٣٢٧ | | ٨٢٢ | | ٢٣١٤١ | | — | | ٧٣ | | ١ | | ١٧ | |

## خشتەی ژمارە (٧٢)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار - قەزای (سنجار) ناحیەی (شیمال)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاریدەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| گەڕەکی مەزی | ١٦١٨ | ١١٦٩ | — | — | — | — | ٩ | — | ٣ | ٥ | | | — | — |
| گەڕەکی برسهی | ٤٠٥ | ٤٠٦٠ | — | — | — | — | — | — | — | — | ٢پیاو | | ٩ | ٥ |
| گەڕەکی بروش | ٥٦٣ | ٦٠٩ | — | — | — | — | — | — | — | — | | | — | — |
| گەڕەکانی (بورج، کلاهی، پیرزکی نوروان | ٢٨٢ | ٢٩٤ | — | — | — | — | — | — | — | — | | | — | — |
| ناحیەی شیمال | ٣٢٢ | ٢٨٢ | ٢٠ | ١ | ٢٤١ | ٢١٥ | — | — | — | — | | | — | — |
| بارەی خواروو، بارەی ژێری | ٤١٢ | ٥٠٧ | — | — | ٣٢٨ | ٤٢٠ | — | — | — | — | ٢ئەدیب و ڕۆژنامەنووس و هونەرمەند/پیاو | | — | — |
| ستونی | ٣٧٠ | ٥٣٤ | — | — | ٣١٢ | ٤٥١ | — | — | — | — | | | ١ | — |
| گوندەکان | ٣٨٣٣ | ٤٤٦٠ | ٢١ | — | ٣٠٠٧ | ٣٧٥٢ | — | — | ٥ | — | | | — | — |
| | ٧٨٠٥ | ١١٩١٥ | ٤١ | ١ | ٣٨٨٨ | ٤٨٣٨ | ٩ | — | ٨ | ٥ | ٥ | | ١٠ | ٥ |
| تێکڕا | ١٩٧٢٠ | | ٤٢ | | ٨٧٢٦ | | ٩ | | ١٣ | | ٥ | | ١٥ | |

## خشتەی ژمارە (٧٣)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (زێبار) ناحیەی (بارزان و مزوری بالآ)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کارەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| ناوەندی قەزای زێبار(بلە) | ٩٨ | ٣٧ | ٣٣ | – | ٥٨ | ٣١ | – | – | – | – | | | – | – |
| ناحیەی بارزان | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی بارزان | ٦٥ | ٢٧ | ١١ | – | ٥٠ | ٢٤ | – | – | – | – | | | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ١٣ گوندە | ٣٣٧ | ٣٩٧ | – | – | ٢٥٤ | ٣٤١ | – | – | – | – | | | – | – |
| ناحیەی مزوری بالآ | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی (شیروان مەزن) | ١٢٢ | ١٢٠ | ١٠ | – | ١٠٣ | ١٠٣ | – | – | – | – | | | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ٤٩ گوندە | ٢٤٠٠ | ٣٠٠١ | ٢٩ | ١ | ١٦٨٢ | ٢٤٦٣ | – | – | | – | | | ١ | ١ |
| | ٣٠٢٢ | ٣٥٨٢ | ٨٣ | ١ | ٢١٤٧ | ٢٩٦٢ | – | – | – | – | | | ١ | ١ |
| تێکڕا | ٦٦٠٤ | | ٨٤ | | ٥١٠٩ | | – | | – | | | | ٢ | |

# خشتەی ژمارە (٧٤)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار - قەزای (زاخۆ) ناحیەی (سلیڤانی و سندی و گلی)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و رۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| قەزای زاخۆ | | | | | | | | | | | | | | |
| گەڕەکی ئەلعەباسی | ٤٠٠ | ٤٥٢ | ٦٨ | ١٨ | ٢٦٤ | ٣٦٣ | – | – | – | – | | | – | – |
| گەڕەکی ئەلنەساری | ٣٩٦ | ٣٣٣ | ١٣٣ | ٦٤ | ٢٣٣ | ٢٢٢ | – | – | – | – | | | – | – |
| گەڕەکی کندك | ٥١٨ | ٤٨٦ | ٧٢ | ١٧ | ٣٤٦ | ٣٨٩ | – | – | ٢ | ١ | | | ٣٢ | ١٤ |
| گەڕەکی یەهود | ٧٦١ | ٧١٤ | ١١١ | ٢٨ | ١٨٧ | ١٢٣ | – | – | – | – | – | – | – | – |
| گەڕەکی روت | ٣١٦ | ٣٣١ | ١١٨ | ٢٥ | ١١٥ | ٧٦ | – | – | ٧ | – | – | – | – | – |
| گەڕەکی حوسێنیە | ٣٦٧ | ٣٩٣ | ٦٦ | ٩ | ٢٤٥ | ٣٢٦ | – | – | – | – | – | – | – | – |
| ژمارەیەك گەڕەك: کیستە کوان سوق قەسابان | ٤٠٣ | ٤٠٦ | ١٢٤ | ٣٦ | ٢١٢ | ٣١٤ | – | – | ٩ | – | – | – | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ٣٥ گوندە | ٤٠٤٤ | ٣٨٥٨ | ١٧٤ | ٦ | ٣١١٤ | ٣٢٠٦ | ٥ | – | ١٣ | – | | | – | – |
| ناحیەی سلڤانی و ٧٥گوند | ٤٢٤٧ | ٤٦٦٠ | ٢١١ | ١٨ | ٣٢٦٧ | ٣٨٠٠ | ١١ | ١ | ٢ | – | | | ١٥ | – |
| ناحیەی سندی و ٥١گوند | ٣٨٩٩ | ٣٧٣٦ | ٦٩ | ٤ | ٣٠٩٧ | ٣٠١٥ | – | – | – | – | | | ٢ | – |
| ناحیەی گلی و ٥٨گوند | ٢٦٩٦ | ٢٦٦٢ | ٤٧ | ٣ | ٢١٠١ | ٢٠٧٢ | – | – | ١ | – | | | – | – |
| تێکڕا | ٣٦٠٧٨ | | ١٤٢١ | | ٢٨٠٣٨ | | ١٧ | | ٣٧ | | – | | ٦٣ | |

## خشتەی ژمارە (٧٥)

سەرژمێری ئەوانەی لەبواری پەروەردە بە پێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شار (دهۆك) ناحیە (دهۆك)

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| قەزای دهۆك | ٢٠ | ١ | — | — |
| ناحیەی دهۆك | — | — | ٦ | — |
| تێکرا | ٢١ | | ٦ | ٢٧ |

## خشتەی ژمارە(٧٦)

سەرژمێری ئەوانەی لە بواری پەروەردە بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شاری ( دهۆك) ناحیە ( دۆسکی )

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| قەزای دۆسکی | ٦ | — | ٢ | — |
| تێکرا | ٦ | | ٢ | ٨ |

## خشتەی ژمارە (٧٧)

سەرژمێری ئەوانەی لەبواری پەروەردە بە پێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شار (ئامێدی) ناحیە ( )

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| مەرکەزی قەزای ئامێدی | ٣ | — | — | — |
| ناحیەی ئامێدی | — | — | ٣ | — |
| ناحیەی نیرومرێکان | — | — | — | — |
| ناحیەی بەرواری بالآ | — | — | — | — |
| تێکرا | ٣ | | ٣ | ٦ |

## خشتەی ژمارە (٧٨)

سەرژمێری ئەوانەی لە بواری پەروەردە بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شاری (ئاکرێ) ناحیە (ناحیەکانی ئاکرێ)

| | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| شوێن | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| قەزای کفری | ٨ | ٣ | — | — |
| ناحیەی سورچی | ٣ | — | — | — |
| ناحیەی عەشایر سبعە | ٦ | — | — | — |
| ناحیەی بیرەکبیرە | — | — | — | — |
| تێکڕا | ٢٠ | | — | ٢٠ |

## خشتەی ژمارە (٧٩)

سەرژمێری ئەوانەی لەبواری پەروەردە بە پێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شار (زێبار) ناحیە ( )

| | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| شوێن | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| ناوەندی قەزای زێبار | — | — | — | — |
| ناحیەی بارزان | — | — | — | — |
| ناحیەی مزوری باڵا | — | — | ١ | ١ |
| تێکڕا | — | | ٢ | ٢ |

## خشتەی ژمارە (٨٠)

سەرژمێری ئەوانەی لە بواری پەروەردە بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شاری (شێخان) ناحیە ( عین سفنی)

| | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| شوێن | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| قەزای شێخان | — | — | ٤ | — |
| ناحیەی | ١٢ | — | ١ | — |
| تێکڕا | ١٢ | | ٥ | ١٧ |

## خشتەی ژمارە (٨١)

سەرژمێری ئەوانەی لەبواری پەروەردە بە پێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شار (سنجار) ناحیە (شیمال)

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| ناوەندی سنجار | ٩ | ٥ | — | — |
| ناحیەی شیمال | ١ | — | — | — |
| تێکڕا | ١٥ | | — | ١٥ |

## خشتەی ژمارە (٨٢)

سەرژمێری ئەوانەی لە بواری پەروەردە بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شاری (دهۆك) ناحیە (مزوری)

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| مزوری | ٤ | — | ٨ | — |
| تێکڕا | ٤ | | ٨ | ١٢ |

## خشتەی ژمارە (٨٣)

سەرژمێری ئەوانەی لەبواری پەروەردە بە پێی سەرژمێری ١٩٤٧ کاریان کردووە
شار (زاخۆ) ناحیە (سلێڤانی ، سندی ، گلی)

| شوێن | شار | | لادێ | |
|---|---|---|---|---|
| | پیاو | ئافرەت | پیاو | ئافرەت |
| قەزای زاخۆ | ٢٦ | ٢ | ١٤ | — |
| ناحیەی سلێڤانی | — | — | ١٥ | — |
| ناحیەی سندی | — | — | ٢ | — |
| ناحیەی گلی | — | — | — | — |
| تێکڕا | ٣٢ | | ٣١ | ٦٣ |

## خشتەی ژمارە (٨٤)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (سلێمانی) ناحیەی ( )

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کارەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| گەڕەکی کانی ئاسکان | ٣٠٨١ | ٣٠٧٢ | ٧٩٨ | ١٩٢ | ١٨٠٦ | ٢٤٣٤ | — | — | ٧٥ | — | | | — | — |
| گەڕەکی مەلکەندی | ٣٤٩٩ | ٣٤٠١ | ٨٨٠ | ١٧٠ | ٢١٠٠ | ٢٦٣٥ | — | — | ٤ | — | | | — | — |
| گەڕەکی چوارباخ | ١٩١٨ | ١٩٨١ | ٣١٦ | ٢٦ | ١٢٩٧ | ١٦٢٦ | ١٢ | — | ٤ | — | | | — | — |
| گەڕەکی کمویاشرە | ٣٣٣٩ | ٣٦٦٨ | ٩١٣ | ٣٥٣ | ١٨٥٣ | ٢٧٥٣ | ٢ | ٢ | ١٥ | ٤ | | | ١٣٦ | ٢٩ |
| گەڕەکی دەرکەزین | ١١٦٣ | ١٢٦٣ | ٣٩٧ | ١٢٥ | ٥٧٤ | ٩٨١ | — | — | ٣١ | — | ١١ پیاو | | — | — |
| گەڕەکی سەرشەقام | ٢٣٦٤ | ٢٥١٣ | ٥٦٧ | ١٠٤ | ١٤٠٢ | ١٩٩٨ | ٢ | ٣ | ٢٨ | ٢ | | | — | — |
| گەڕەکی یەهود | ١٤٤٨ | ٧٦٥ | ٥٠٣ | ١٥ | ٨٢٩ | ٦٣٧ | — | — | ٧٠٨ | — | | | — | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٧٥ گوندە | ٤٦٥٩ | ٤٨٨٠ | ١٦٨ | ١ | ٣٣٦ | ٤٠٧٩ | ٧٩ | — | ٤٠ | ١ | | | — | — |
| | ٢١٤٧١ | ٢١٥٤٣ | ٤٥٤٢ | ٩٨٦ | ١٣٥٢٦ | ١٧١٤٣ | ٤٥ | ٥ | ٩٠٥ | ٧ | ١١ | | ١٣٦ | ٢٩ |
| تێکڕا | ٤٣٠١٤ | | ٥٥٢٨ | | ٣٠٦٦٩ | | ٥٠ | | ٩١٢ | | ١١ | | ١٦٥ | |

## خشتەی ژمارە (٨٥)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (سلێمانی) ناحیەی (سورداش و تانجەڕۆ و قەرەداغ و بارزان)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| ناحیەی سورداش | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیە سورداش | ٢٤٩ | ٢٨٥ | ٥٢ | ٤ | ١٥٥ | ٢٣٦ | — | — | — | — | | | — | — |
| گوندی سەرگەلو | ٤٩٢ | ٦٢٦ | ٢٧ | ١ | ٣٨٧ | ٥٢٠ | — | — | ٣ | — | | | ١٣ | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٦٦ گوندە | ٤٦٩٧ | ٥٦٠٢ | ١٤٨ | ٤ | ٣٦٨٩ | ٤٥٧٧ | — | — | ١٧ | ١٢ | | | — | — |
| ناحیەی تانجەڕۆ | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیە عەربەت | ٤٤٠ | ٣٦١ | ١٢١ | ٢ | ٢٣٥ | ٢٩٢ | — | — | ١ | — | — | — | ٦ | — |
| ژمارەی گوندەکانی ٧٤ گوندە | ٤٥٢٧ | ٥١٦٢ | ٩٧ | ١ | ٣٥٨٠ | ٤١٣٧ | — | — | ٨ | ١ | — | — | — | — |
| ناحیەی قەرەداغ | | | | | | | | | | | | | | |
| ژمارەی گوندەکانی ٧٤ گوندە | ٤٧٨٣ | ٥٣٣٠ | ٣٠٦ | ٢٥ | ٣٥٣٠ | ٤٢٠٩ | ٥ | — | ٢٦ | ٣ | | | ٣٥ | — |
| ناحیەی بازیان | | | | | | | | | | | | | | |
| ژمارەی گوندەکانی ٣٦ گوندە | ١٩٠٦ | ٢٢٩٤ | ٥١ | ٣ | ١٥٧٤ | ١٩٢١ | — | — | ٨ | — | | | ٣ | — |
| | ١٧٠٩٤ | ١٩٦٦٠ | ٨٠٢ | ٤٠ | ١٣١٥٠ | ١٥٨٩٢ | ٥ | — | ٦٣ | ١٦ | | | ٥٧ | — |
| تێکڕا | ٣٦٧٥٤ | | ٨٤٢ | | ٢٩٠٤٢ | | ٥ | | ٧٩ | | — | | ٥٧ | |

## خشتەی ژمارە (٨٦)

### خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (هەڵەبجە) ناحیەی ( )

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| گەڕەکی پیر محەمەد | ٤٩٣ | ٤٩١ | ١٥٢ | ٣٣ | ٢٧٥ | ٣٩١ | ١ | — | — | — | | | — | — |
| گەڕەکی سەرای | ٩٥٤ | ٩٤١ | ١٩٧ | ٢٤ | ٥٦٨ | ٧٤٣ | — | ٣ | ٨ | ٤ | | | — | — |
| گەڕەکی پاشا | ١٠٩٩ | ٩٢٢ | ٣٠٢ | ٣٩ | ٦٥٠ | ٧٤٤ | — | — | — | — | | | — | — |
| گوندی ئابا عبیدە | ٧٤٩ | ٧٤٣ | ١٠٤ | ١ | ٥٢٤ | ٦٠٢ | ١ | — | ١٥ | ١ | ١پیاو | | ٦٩ | ٤ |
| ژمارەی گوندەکانی ٩٨ گوندە | ٧٣٨٠ | ٨٩٦٦ | ٢٥٣ | ٢ | ٥٦٩٨ | ٧٣٧٥ | — | — | ٤٧ | ٦ | | | — | — |
| | ١٠٦٧٥ | ١٢٠٦٣ | ١٠٠٨ | ٩٩ | ٧٧١٥ | ٩٨٥٥ | ٢ | ٣ | ٧٠ | ١١ | ١ | | ٦٩ | ٤ |
| تێکڕا | ٢٢٧٣٨ | | ١١٠٧ | | ١٧٥٧٠ | | ٥ | | ٨١ | | ١ | | ٧٣ | |

## خشتەی ژمارە (٨٧)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

## شار - قەزای (هەڵەبجە) ناحیەی (خورماڵ و وارماواو پێنجوین)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| **ناحیەی خورماڵ** | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی خورماڵ | ٢٨٠ | ٢٣٥ | ٨١ | ٣ | ١٥٩ | ١٨٨ | – | – | ١٥ | – | | | – | – |
| گوندی مالیدەی تویلە | ٧١٠ | ٧٦٧ | ٧٣ | – | ٣٤٧ | ٥١٧ | – | – | – | – | | | ٢٨ | – |
| ناحیەی جەلانە | ٧١٤ | ٧٤٠ | ١١٢ | ٧ | ٤٤٥ | ٥٨٦ | – | – | ١٦ | – | | | – | – |
| بیارە | ٦٤٨ | ٧٨٤ | ١٤٠ | ٦ | ٣٧٦ | ٦٤٧ | – | – | – | – | – | – | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ٨٣ گوندە | ٧٠٢٠ | ٧٦٧٢ | ٢٢٧ | ٥ | ٥٣٩٧ | ٦٣٠١ | – | – | ٤٢ | – | – | – | – | – |
| **ناحیەی وارمارا** | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی قلیجە | ٥٥ | ١٠٠ | ١ | – | ٣٢ | ٨٨ | – | – | – | – | – | – | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ٤٤ گوندە | ٢٧٤٢ | ٣٩٦٠ | ٧٢ | ٢ | ٣٣١٥ | ٥٤٨٥ | – | – | ٨ | – | | | ١١ | – |
| **ناحیەی پێنجوین** | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی (بەری کەناو) | ٦٤٣ | ٧٩٤ | ٨٣ | ٤ | ٤٤٠ | ٦٠٤ | – | – | – | – | | | – | – |
| گوندی بەرکێو | ٧٧٢ | ٩٠٨ | ١١٧ | ٢ | ٤٨١ | ٧٢٦ | – | – | ٥ | – | | | ٣٥ | – |
| یەنکەلە | ١٢٦ | ١١٨ | ٣٠ | ١ | ٧٥ | ٩٧ | – | – | – | – | | | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ١٠٢ گوندە | ٦٩٢٨ | ١٢٠١٥ | ٢١٨ | ١ | ٤٩٦٣ | ١٠٠٦٥ | – | – | ١٨ | – | | | – | – |

# خشتەی ژمارە (٨٨)

## خشتەی سەرژمێری و ژمارەی خوێندەوارو نەخوێندەوارانی کورد لەشارو دێهاتەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٤٧

### شار – قەزای (شارباژێڕ) ناحیەی (ماوەت و سرۆچك)

| شوێن | ژمارەی دانیشتوان | | ئەوانەی دەخوێننەوە دەنووسن | | نەخوێندەوار | | ژمارەی قوتابخانە | | دەزگا ئاینیەکان | | ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەرمەند | | ئەوانەی لە بواری فێرکردن کاردەکەن | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | نێر | مێ | کوڕ | کچ | | | نێر | مێ |
| ناحیەی شارباژێڕ | | | | | | | | | | | | | | |
| گەڕەکی سەرچاوە | ٨١ | ٧٨ | ٣١ | ٢ | ٣٨ | ٥٩ | – | – | – | – | | | – | – |
| گەڕەکی حاجیان | ١٢٣ | ١٣٠ | ٣٧ | ٦ | ٦٣ | ٩٧ | – | – | ٢ | – | | | – | – |
| گەڕەکی حوسێناغا | ١٧٣ | ١٧٣ | ٤٦ | ٤ | ٩٠ | ١٣٧ | – | – | – | – | | | ١١ | ١ |
| گەڕەکی شافی | ٩٤ | ٨٠ | ١٤ | – | ٥٩ | ٥٩ | – | – | – | – | | | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ١١١ گوندە | ٧١٥٠ | ٩٢٥٩ | ١٧٦ | ٢ | ٥٤٢١ | ٧٦٢٢ | – | – | ١٠ | ٣ | | | – | – |
| ناحیەی ماوەت | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی ماوەت | ٣٤٩ | ٣٦٦ | ١١٢ | ١ | ١٨٦ | ٢٩٢ | – | – | – | ٣ | – | – | – | – |
| ژمارەی گوندەکانی ٥٤ گوندە | ٤٣٩٨ | ٦٤٨١ | ١٥٥ | ٢ | ٣٣٤٧ | ٥٤٦٨ | – | – | – | – | ١پیاو | | ١٢ | – |
| ناحیەی سروچك | | | | | | | | | | | | | | |
| ناوەندی ناحیەی (بەرزنجە) | ٩٢٠ | ٨٤٨ | ٨٠ | ٢ | ٦٣٢ | ٦٦١ | – | – | ١ | – | | | ١٢ | – |
| ژمارەی گوندەکانی ٥٤ گوندە | ٣٨٠٥ | ٤٤٨٣ | ٥٣ | ٣٣ | ٣٠٧٥ | ٣٦٤٥ | – | – | ١ | – | | | – | – |
| | ١٧٠٩٣ | ٢١٨٩٨ | ٧٠٢ | ٧٢ | ١٢٩١١ | ١٨٠٤٠ | – | – | ١٤ | ٦ | ١ | | ٣٥ | ١ |
| تێکڕا | ٣٨٩٩١ | | ٧٤٤ | | ٣٠٩٥١ | | – | | ٢٠ | | ١ | | ٣٦ | |

